

# ناسنامەی پەڕتووك

ناوی پەڕتوك: "ڕێگا سەختەکانی هەندەران "
نوسیــنــی: "ڕەنج شێخانی "
دیزاینی ناوەوە: " عبداللە خاکی "
دیزاینی بەرگ " عوسمان مەمەند "
پێداچوونەوە: " پروا زەڵمی "
ساڵی بڵاوکردنەوە: " ٢٠٢٠/١٤٤١ "



# پێشکەشە

- ❖ بەو گەنج و لاوانەی کە بەهۆی سەختییەکانی ژیان و ناڕەحەتییەکانی ڕۆژگارەوە تەنگیان پێ هەڵچنراوە و بەویستی خۆیان یان بەناچاری کوردستان بەجێدێڵن و وادەزانــن بەگەشــتنیان بــۆ وڵاتێکــی ڕۆژئــاوایی ئیتــر دەگەن بە هیــوا و ئاواتەکانیان و سەختیەکانیان لەکۆڵ دەبێتەوە!
- ❖ بەو کەسانەی کە تائێستاش لەڕووکەش دا دەڕوانـنە خۆشی و جوانیەکانی هەندەران و بێ ئاگان لە ناوەڕۆك و دیوە خراپەکانی.
- ❖ بــەو کەســانەی کەتائێســتاش پێیــان وایە مــافە تاکەکەســیە کــان و ئــازادی ڕادەربڕین تەنها لەوڵاتانی ڕۆژئاوا بوونی هەیە!
- ❖ بەهەمــوو خوشــك و برایەکــی دڵســۆزم کە بەگــرنگییەوە چیرۆکــی ژیــانم دەخوێنێتەوە.

## ڕەنج شێخانی





# پێشەکی:

پاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان،وە سەڵات و سەلامی خوا بڕژێت بەسەر ، پێغەمبەری کۆتا زەمان محمد ﴿ﷺ﴾.

دوا بەدوای دابەزاندنی چەند بەشێك لە چیرۆك و ڕووداوەکانی ژیانم کە لە ڕێگای هەندەران و لە نێوانی هەردوو وڵاتی(تورکیا - یۆنان) دا بەسەرم هاتبوو، وەك یادەوەری و بۆ پەند و ئامۆژگاری خستمە پێش چاوی خوێنەرانی کورد زوبان و گەنج و لاوە سەربەرزەکانی وڵاتەکەم، دواتر لەڕێگەی ڕاپرسیەکەوە و لەسەر داوای زۆرێك لە برایان و خوشکانی بەڕێزم کە بە بەڵێ داوایان لێکردم بەردەوام بم لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ڕێگای هەندەران لەساتەوەختی یەکەمین سەفەرمەوە تا کۆتا سەفەرم، منیش بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بڕیارم دا بەردەوام بم لەسەر نووسینەوەی بەوردی و بەپێی توانا و بوونی کات و دەرفەت بۆ نووسینەوەی سەرجەم ئەو گەشتانەی کە لەو ڕێگا سەختانەدا ئەنجامم داوە.

داواکارم لەخوای گەورە بیکاتە هۆی پەند و ئامۆژگاری بۆ نەوەی نوێی وڵاتەکەم و لەهەڵە و کەموکورتیەکانیشم ببورێت کە لەم ڕێگەیەدا بەسەرم هاتووە و هەنگاوە چاك و باشەکانیشمان بەپاداشت بۆ نووسرابێت لای خوای گەورە و بەبەزەیی.

پشتیوان بەخوای گەورە هەوڵم داوە بە دوور و درێژی لەم پەرتوکەدا باس لەسەرجەم ئازار و خۆشی و ناخۆشی و ناڕەحەتییەکانی ئەو ڕێگایە بکەم تاوەکو ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ سەرجەم خوێنەرانی بەڕێز بەتایبەتی ئەو کەسانەی کەبەنیازن بەڕێبکەون بۆ هەندەران و بەداخەوە پاش گەشتنیان هەر زوو پەشیمان دەبنەوە، چونکە وەك کوردەواری فەرموویەتی: دەنگی دەهۆڵ لەدوور خۆشە!

**ڕەنج شێخانی**

**ساڵی ٢٠١٤ فنلەندا**





# بۆچی ڕێی هەندەرانم هەڵبژارد؟

ماڵمان لەگەڕەکی (شێخان) بوو لەشاری سلێمانی بەرامبەر نەخۆشخانەی ئێمر جنسی، خوای گەورە بە هۆی برا گەورەکەمەوە کە بازرگانی دەکرد لە نێوان (کوردستان و ئێران) دا، سەروەت و سامانێکی باشی پێ بەخشیبووین بەشێوەیەك کەوا خاوەنی دوو خانوی گەورە بووین لەگەڵ دوکان و شوێنی کار و کەسابەت لە بازاڕی سۆران و بەردەمی قەیسەری(نەقیب) دا!. لەبەر ئەوەی ژیانی دونیا ژیانێکی کاتییە ، مرۆڤ دەبێت بزانێت خوای گەورە بۆ پەرستن دروستی کردوە، لەو ژیانەشدا تاقیکردنەوەی زۆری بەسەردا دێت،کە نە بۆ هەمیشە لە خۆشییەکی بەردەوام دایە و نە بۆ هەمیشەش لە ناڕەحەتی دا ژیان دەباتە سەر، بەڵکو دەبێت چاك بزانین بەردەوام لە ژێر تاقیکردنەوەی خوای گەورەداین. لەنیوەی نەوەدەکاندا بوو کە نەوتەکەی (عێراق) ڕۆشت و ئێمەش وەك هەموو ئەو خەڵکەی کە توشی زەرەر و زیانێکی زۆری ماددی بوونەوە، ئێمەش خوای گەورە تاقیکردینەوە، بەشێوەیەك کە سەرجەم ماڵ و کار و کەسابەتمان لەدەست دان و زوڵمێکی باشمان لێکرا لە لایەن کەسانێکی بەناو دۆست و هاوبەشی براکانمەوە و سەرباری لەدەستدانی ماڵی دونیاش چووینە ناو کرێ نیشینەوە و لە ترسی خاوەن قەرزی ئێران و کوردستانیش هەر ڕۆژەو لە شوێنێك ژیانمان دەبردە سەر، ئەگەرچی سوپاس بۆ خوای گەورە هەمیشە سفرە و خوانمان قەرەباڵغی پێوە دیاربوو بەڵام ویستی خوا وابوو کەوا زۆرینە پشتیان تێکردین، دیارە تاقی کردنەوەکەی خوای گەورە هێندە سەخت بوو، بەداخەوە زۆرێك لەو برا و خوشکانەشی کە هاتووچۆیان دەکردین، بێجگە لە هەندێکی کەمیان نەبێت کە بە پەنجەی دەست هەژمار دەکران بەتەواوی خۆیان لێ دوور خستینەوە و سەرەڕای ئەوەش هەندێکیان نەك پشتیوانمان نەبوون بەڵکو توشی چەندین کێشە و ڕووداوی ناخۆشتریان دەکردین!






پاش چەندین جار گیرانی براکانم لە سلێمانی و داگیرکردنی هەندێك لەو کەلوپەلانەی کە مابوویان بە ناهەق لەلایەن چەند کەسێکەوە بەهێزی چەك و حیزب، لە ئێرانیشدا بـرا گەورەکەم قاچـاخ بـوو، نەیـدەتوانی بە ئاشـکرا سـەفەری شـاری(مەریوان) بکات،بەڵام براکەم دەیوت: نابێت خۆم لە خاوەن قەرزەکان بشارمەوەو سەفەری ئەو شـارەی کـردو، بـۆ مـاوەیەکی زۆر لەماڵی یەکێك لە خـاوەن قەرزەکانـدا دەسـت بەسـەر کرابـوو، ئـێمەش حاڵمـان زۆر لەو باشـتر نەبـوو لە دیـوی کوردسـتانداو، ئەو هەمـوو خێزانە لە خـانویەکی سـەقف داری دوو ژووری کـرێ دا دەژیـاین مـانگی بە سـێ سـەد دینارو، کاتێك باران بباریایە دەبوایە هەرچی قاپ و قاچاخمان هەیە بمان خستایەتە بەر دڵۆپەی باران و لەجیاتی گەرم کەرەوەش بەتانیمان لە خۆمان دەپێچا!.

ئەم حاڵەتە بەردەوام بوو تا ماوەی چەند ساڵێك و لە هەر شوێنێکیش خاوەن قەرزێك هەواڵی ماڵمـانی ببیسـتایە خۆیـان دەگەیانـدە سـەرمان و هی وایـان هەبـوو کاتێـك بەو شێوەیە دەیبینین سۆزی بۆمان دەجولاو، هی واشیان هەبوو وەك هەندێك لە نزیك و بەناو دۆست دەیان وت: درۆ دەکەن هەیانەو شاردویانەتەوە!.

تا ئەوەی برا گەورەکەم ڕێی هەندەرانی هەڵبژارد بۆ ئەو مەبەستەی کە بتوانێت لەو ڕێ یەوە قەرزەکانی بـداتەوە، مـاوەی چەنـدین سـاڵ هەواڵیمـان نەدەزانی کەوا چی بەسـەر هـاتووە،چونکە ئەو کاتە وەك ئێسـتا مۆبایل و تەلەفـون بەکار نەدەهـات و تەنها لەڕێی فاکسـەوە هەواڵ دەزانـرا، لە کۆتـایی نەوەدەکانـدا فاکسـێکمان بـۆ هـات لە تورکیـاوە لە لایەن بـراکەمەوە کەوا، پـارەیەکی نـاردۆتەوە بۆمـان کە بەشـێکی بـۆ خۆمـان و بەشـێکی تریشـی بـدەینەوە خـاوەن قەرزەکـان، بەڵام لەڕێی کەسـێکی نزیکمـانەوە پـارەکە خـورا بووا!،وە لە جیاتی ئێمە ناردبۆیەوە بۆ کەسوکاری خۆی!، دیارە هەمیشـە بـرا گەورەکەم بەهـۆی دڵی پـاکی یەوە چـواردەوەرەکەی فێڵیـان لێکـردووەو مافیـان خـواردووە، ئەویـش هەمیشە دەڵێت: دادگایەك هەیە کە سەرجەم مافەکانمی تێدا وەرگرمەوە!.







پاش ئەوەی ماڵمان چووە گەڕەکی مامە یارەو خانویەکی ترمان بە کرێ گرت، منیش بووم بە شاگردی دووکانێکی شامپۆو بۆنی خۆش فرۆشتنی جوملە فرۆش لە بازاڕی قەیسەری نەقیب دا، سەرەتا مانگی (٥٠٠)سەد دینارم هەبوو، دواتر بۆم زیاد کرا تا گەشتە (٨٠٠) سەد دینار لە لایەن خاوەن دووکانەکەوە چونکە زۆریان خۆش دەویستم و حەزیان نەدەکرد لایان بڕۆم،تەنانەت جاری وا هەبووە بە هۆی سەفەرکردنمەوە بۆ ماوەی یەك هەفتە دووکانیان داخراوەو، تا ئەو کاتەشی گەشتمە(ئەسینا) ی پایتەختی وڵاتی یۆنان هەر چاوەڕێم بوون و شاگردیان نەگرتوە، ئەویش بۆ ئەوەی سەفەر نەکەم بۆ هەندەران و لایان بمێنمەوە، کە جێگای دەست خۆشی و ڕێزن لام بەڕاستی و پێیان دەڵێم: خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە بۆ متمانەیان بەم بەندە تاوانبارە!.

سوپاس بۆ خوا بەو شێوەیەش تا توانیبێتم دیراسەی خوێندنی زانستی و شەرعیشم کردوەو وازم لێ نەهێناوە ئەویش هاندانی دایکی سەربەرزم بووە، خوا بۆمانی بهێڵێت یارەبی لەگەڵ باوکم و باقی براو خوشکە سەربەرزەکانم دا، پاش ئەوەی بەبەردەوامی بۆ چەندین جار قەرزار دەهاتەوە سەرمان و داوای پارەکانیان دەکردەوە و، ویستی خوای گەورەش وابو کەوا برا گەورەکەشم پاش ئەو چەند ساڵە بەدەستی بەتاڵ سنورداش کرایەوە لە وڵاتی (تورکیا)، بڕیارم دا سەفەری لەگەڵ بکەم بۆ هەندەران و بەڵکو بتوانم وەك پشتیوانێك هاوکاری بم لە دانەوەی قەرزەکاندا چونکە ئەو هەمیشە وەك قەڵایەکی بەهێزو پتەو وابوە بۆمان!. لە ساڵی(٢٠٠٠) هەزارەوە تا ئێستا کە ساڵی (٢٠١٩) یە،

سێ جار بەقاچاخ خۆم گەیاندۆتەوە وڵاتانی ڕۆژئاواو جارێکیان خۆم بووم و دووجاریشیان خۆم و خێزانم و هەر سەفەرێکیشیان، بە هۆیەکی تایبەتی یەوە بووە، کە پێم خۆشە بە کورتی بیخەمە پێش چاوی خوێنەرانی بەڕێز!.







سەفەری یەکەم: هۆکاری قەرزاری بووە و ، پاش ئەوەی لە کوردستان بەهۆی دابەزینی باری ئابوری وڵاتەوە بەتەواوی ژێر خانی ئابوری ڕوخا بوو، هەر ئێمەش نەبووین بەڵکو زۆربەی خەڵکی هەرێمی کوردستان پاش ڕۆشتنی نەوتەکە زەرەمەند بوون!،
ئەم سەفەرەش لە ساڵی (٢٠٠٠) هەزارەوە دەستی پێ کردو پاش چەندین جار سنورداش کرانەوەم، ماوەی دوو ساڵم پێ چوو لە ڕێی(کوردستان_ ئێران_ تورکیا) و پاشان سوپاس بۆ خوا ساڵی (٢٠٠٢) گەشتمە شاری(ئەستەمبوڵ) ی تورکیاو پاش چەند مانگێك لەوێشەوە گەشتمە وڵاتانی ڕۆژئاوا.
سەفەری دووەم: لەبەر چەند هۆیەك ناچاربووم دووبارە کوردستان بەجێ بهێڵمەوە و وە پێشتریش لە ساڵی(٢٠٠٣) تا ساڵی(٢٠٠٦) بەهۆی زوڵمی وڵاتی (ئەڵمانیا)و پەنجەمۆری ئەو وڵاتەوە چەندین جار سنورداش کرامەوەو بەوهۆیەوە مۆڵەتی مانەوەم وەرنەگرت لەهیچ کام لەو وڵاتانەی داوای مافی پەنابەرێتیم کردبوو وەخێزانیشم مارە بڕم بو،بۆیە بەناچاری گەڕامەوە بەدوای خێزانم دا،بەڵام ئەم جارە نەمهێشت هیچ کەسێك لەخزمان و دۆستان بە گەڕانەوەکەم بزانن و پاشان خێزانم لەگەڵ خۆمدا بردەوە بە نارەحەتی بەرەو وڵاتی(یۆنان).
سەفەری سێهەم: پاش بڕیاردانم بەگەڕانەوەی یەکجارەکی بۆ هەرێمی کوردستان لەساڵی (٢٠١١) دا ، ماوەی ساڵێك و دەمانگێك دانیشتین لەکوردستان و پاشان بۆ جاری سێیەم بەناچاری و لەبەر زروفێکی تایبەتی کەپەیوەست بوو بەفکرو بیروباوەڕەکەمەوە لە سەرەتای ساڵی (٢٠١٣)دا بڕیارم دا، بۆ جارێکی تر خۆم و خێزانم و خاتو ئەسمائی کچم بەرەو هەندەران بەڕێ بکەوینەوەو ئەم جارەیان سەفەرمان کرد بەرەو وڵاتی(فنلەندا) !.









# (سەفەری یەکەم)

# ڕێگا سەختەکانی هەندەران

## (بەشی یەکەم)

## (کوردستان - ئێران - تورکیا)
## ( ٢٠٠٠ - ٢٠٠٢ )

## ڕەنج شێخانی







## یەکەم: سەفەری ڕێی هەندەران و گیرانمان لە سنوری نێوان وڵاتی (ئێران - تورکیا) لە لایەن پاسداری وڵاتی (ئێران)ەوەو بەندکردنمان لە زیندانی گەورەی( سەڵماس).

پاش نوێژی مەغریب بوو براکەم هات بەدوای من و خاڵی باوکیشم داوای کردبوو کە بێت بۆ هەندەران و ئەویش هات لە گەڵمان و هەموومان پێکەوە چووینە ماڵێکی ناسراوی قاچاخچیەکە لە گەڕەکی شەهیدانی زەرگەتەبوو، بەیانی نەفەرێکی زۆر لە چەند ماڵێك کۆکرابووینەوەو بەچەند پیکابێکی سەر داپۆشراو بەڕێ کەوتین بەرەو (چۆمانی) ناوچەی شاربازێڕی لای شاری (سلێمانی) و سنوری شاری (بانە)ی کوردستانی ڕۆژ هەڵات، ئەو ڕۆژە دەمەو پاش نیوەڕۆ گەشتینە (چۆمان) و لەسەر ئاوێك کە دەکەوتە نێوان سنوری کوردستانی باشورو کوردستانی ڕۆژ هەڵات هەموو نەفەرەکان کۆبووینەوە کە ژمارەمان چل کەسێك دەبوو، هەر لەویادا سەیارەی سایپا ئێرانیەکان چاوەڕوانیان دەکردین و، خێرا دە نەفەر دە نەفەر سواری سایپاکان بووین و لەبەر ئەوەی سەر دانە پۆشراو بوون دەبوایە خۆمان پاڵ بخستایە و سەرمان بەرز نەکردایەتەوە، پاش شاخەو شاخێکی زۆرو هەڵبەزو دابەزێکی زۆری ناو سایپاکە بە سەر جادەی خاکی دا، گەشتینە سەر جادەی قیری ڕێی شاری (بانە)و، ئەو شەوە گەشتینە ناو شارو بە پشتی شاری (بانە)دا بردینیانە نزیکی شاخی (کەلی خان) کە دەکەوێتە پشتی ئەوشارەوە!.

وابزانم زۆربەمان ڕێواسی شاخی(کەلی خان)مان بیستوە، بەڵام ئەوکاتە کاتی ڕێواس نەبوو، تا بەدەستی خۆمان لێی بکەینەوەو تامی بکەین، هۆکاری گرتنە بەری ئەو ڕێگەیەش لەبەر ئەوە بوو یەکێك لە قاچاخچی یەکانی تەرەفی (ئێران)، وتی: خاڵی پشکنینی نێوان شاری (بانە)و(سەقز) کەس ناناسین و ناتوانین بەپارە قەناعەتیان پێ بکەین، دەبێت لە شاخی (کەلی خان)ەوە بچینەوە پشتی خاڵی پشکنینەکەو لەوێ







سایپاکان چاوەڕوانیتان دەکەن و پاش یەك دوو کاتژمێر ڕێگە کردن سەرتان دەخەن و هەر ئەم شەو دەتان بەین بەرەو شاری (ڕەزایە)!.
هەر لەویادا سەرو سەمون و هێلکەو تەماتەیان بۆ هێناین و نانێکی بخۆو مەمرە لەبرسامان خواردوو گەشتینە سەر بەرزاییەك و لە دوورەوە گوێمان لە دەنگی سەیارەی ستاوت بوو ڕێبەرە ئێرانیەکە هەموومانی دانیشاندو، وتی: کاکە بەخوا وا بزانم نیروی ئینتیزامی یە!، کەبەکوردی دەکاتە ئاسایش و پۆلیسی لای خۆمان و وتی: دیارە پێیان زانیوین!.
هەموومان بەپەلە ڕامان کردە سەر شاخەکەو بەرەو دیوی ئەو دیو شۆڕ بینەوە و من و خاڵی باوکیشم دەستی یەکمان گرتبوو، بۆیە لەیەك دانەبڕێین و برا گەورەکەشم لە پێشەوەمان بوو ، بەڕاستی زۆر ماندوو بووین و نەفەری زۆر بەجێمابوون لە دوامانەوە، ڕێبەرەکە وتی: با دانیشین و چاوەڕوانی ئەو نەفەرانەش بکەین کە دواکەوتوون چونکە دەنگی سەیارەکە نەماو گڵۆپەکانیشیان کوژاندبۆیەوە، ئەمە تومەزە دەستی قاچاخچییە ئێرانیەکان خۆیانەو دەیانەوێت ڕووتمان بکەنەوەو سەرجەم ئەو پارەو دۆلارانەی کە پێمانە بۆ ڕێگا لێمانی بسەنن!.
بەهەرحاڵ ئەمەمان دواتر زانی ، لەگەڵ هەموو نەفەرەکان کۆبووینەوە و بە نارەحەتیەکی زۆر هەمووی گەشتنە سەر شاخەکە ئێمە دانیشتبووین کاتێکمان زانی میلی تفەنگ ڕاکێشراو چەند فیشەکێك تەقێنرا بە ئاسمانداو هاوار کرا ،ئیست!!!، کە بە زمانی کوردی واتە بوەستە!، ئێمەش وەمان زانی پاسدارەو خێرا لەگەڵ خاڵم هەستاینە سەرپێ و هەر خەڵك بوو ڕای دەکرد بەرەو ناو دۆڵەکە بە شێوەیەك کەس ئاگای لەکەس نەما بوو ، بەس خوا ڕەحمی کرد کە مانگە شەو بوو ، دۆڵەکەش هێندە سەخت بوو هەر نەفەر بوو لە پێش و پاشەوە دەکەوت و بە جێ دەما، لەوێدا من و خاڵم لە براکەم دابڕاین و نەمانزانی چی بەسەر هات و نەفەرێکی نەزانیش خۆی کردە





دەم سپی و دەم ڕاستمان و وتی: کاکە من شارەزام نابێت بەناو دۆڵەکەدا بڕۆین چونکە ئێستا لە بەشی خوارەوەش دا کەمینمان بۆ دانراوە، بەهەرحاڵ نزیکەی پانزە نەفەر دوای ئەم کابرایە کەوتین بەرەو لوتکەی (کەلی خان)،نزیکەی سێ کاتژمێر ڕێگەمان کرد ئیتر تەواو شەکەت بووین و وتمان: کاکە بەسە بۆ کوێمان دەبەیت بەخوا فرۆکەش نامانگرێت تازە ، ئیتر دانیشتین و دوو دوو پشتمان نا بەیەکەوەو ووردە ووردە خەومان لێ کەوت و کەسمان نەماندەزانی چیمان بەسەر دێت، پاش دوو کاتژمێرێك خەوی وەنەوز ، خاڵم هەڵی ساندم و وتی: ڕەنجە گیان هەستە بەخوا ئەوە لایتی سەیارەیە لە خوارەوەو لایت لێ دەدات بۆ شاخەکەو چەند نەفەرێکیش هاواریان دەکرد لە ناو دۆڵەکەدا ، کە ئەوەی ماوە لە بەشی سەرەوە بچێتە خوارەوە ،خاڵیشم چونکە بەتەمەنی ناومان بوو وتی: کاکە ئەوە هاتوونەتەوە بەدوامانەدا با بڕۆینە خوارەوە!، ئێمەش چونکە نەشارەزا بووین دووبارە کاکی کوێخا هاتە قسەو وتی: نا مامە گیان ئەوە لەوانەیە تاکتیکی پاسدارەکان بێت و نەفەریان گرتوەو زۆریان بۆ هێناون هاوار بکەن تاوەکو ئێمەش بچینە خوارەوە بمانگرن!.

هەرچۆنێك بوو قەناعەتی پێ کردین و نزیکەی یەك کاتژمێر هەر لایت دەدرا لە شاخەکەو بانگیان دەکردین، ئێمەش هەولێری گۆتەنی خۆمان کڕ کرد هەتا ڕۆشتن و، دواتر وردە وردە دەستمان کرد بە ڕۆشتنە خوارەوە چەندمان بڕبوو هێندەی تر ڕێگەمان بڕیەوە بەرەو خوارەوە، باوەڕ بکەن سەرکەوتن بەشاخدا زۆر خۆشترە لە دابەزینی چونکە ئەژنۆکانت شەکەت دەکات دابەزین و خزان لە شاخەوە بەرەو خوار!.

نزیکی نوێژی بەیانی بۆیەوە گەشتینە ناو دۆڵەکەو دونیا ڕۆشن بۆیەوەو ماشەڵڵا ئەو ناوە هەمووی باخ و باخات بوو، وە ئاو و کانیەکی زۆر خۆشی تێدا بوو، لەویادا بڕیارماندا دوو دوو لەیەك دابڕێین بۆ ئەوەی بەو شێوە زۆرە نەبینرێین و گومانمان بخرێتە سەر،لەگەڵ خاڵمدا جیا بوینەوە لە نەفەرەکانی تر و چوینە سەر کانیەك





دەست نوێژێکی جوانمان گرت و بەردە نوێژی لێ بوو، خێرا نوێژی بەیانیمان کردوو بەسەر جادەیەکی خاکی دا بەرەو ناو ئاوایی یەکی نزیك کەوتینە ڕێ،تاك وتەرا خەڵك دەهات بەرەو باخ و بێستانەکانیان و گەشتینە پیاوێك و دوای سەلام کردن هەواڵی نەفەرەکانمان پرسی، وتی: کاکە ئەم شەو هەواڵمان بیستوە چەتە کۆمەڵێك خەڵکی زۆریان ڕووت کردۆتەوەو، پارەیەکی باشیشیان لە خەڵکی سەندوەو دواتر قاچاخچی و سەیارەکان هاتوون بەدوایانداو لێرەوە بانگی ئێوەیان زۆر کردوە، بەڵام ئیوە نەهاتونەتە خوارەوەو، ئیتر ئەوانیش ڕۆشتوون!، بەڕاستی زۆر بێتاقەت بووین، وتم : تخوا وەرە ئەم کوێخایە چۆن لێمان قیت بۆیەوەو لە ترسا بووە هۆکاری بە جێهێشتنمان! ، بەخوا بەدەم قسە کردنەوە بووین سێ ئافرەتی ئاوایی یەکە خەریکی بەرێ کردنی ئاژەڵ و مەڕوماڵاتبوون بەرەو دەشت، چاویان پێمان کەوت و هاتن بەرەو ڕوومان ئەوەی قسەی خراپ و ناشرینە پێیان داوین، خوا بۆ خۆی دەزانێت چۆن دەمیان لێ کردوینەتەوەو بەخاڵمیان دەوت، ژن و ماڵ و منداڵت جێ دێڵی بۆ کوێ دەڕۆیت بەو تەمەنەوە؟، باش بوو لەوکاتەدا جێبێك گەشتە لامان و تەنها سایەقەکەو نەفەرێکی تیا بوو، وتی: کاکە نەفەری دابڕوان؟ وتمان ئەرێ وەڵا کاکە گیان، وتی: دە خێرا سەرکەون من لە تەرەفەکەوە هاتوم و بەڵکو بتان گەیەنین بە وەجبەکە، ئەم شەو بەهۆی ئەو وەزعەوە نەمانتوانیوە بیانگەیەنینە شاری(ڕەزایە) لە ئاوایی یەکی نێوان شاری(سەقز)و(بانە)دا دامانناون کە دەکەوێتە سەر ڕێگەی شاری (بۆکان)!.

پاش سەرکەوتنمان چەند نەفەرێکی تریشیان دۆزیەوەو بەرێ کەوتین و ڕۆشتین، ئیتر لە ناو جێبەکەدا قسەو باس کرایەوە لەسەر باردۆخەکەی شەوی ڕابردوو ، وتیان: کاکە چەتە بوەو نزیکەی بیست وەرەقەیان لە نەفەرەکان سەندوەو، ئەوەشی پێی نەبووە لێدانێکی باشیان لێداوە، منیش وتم: بەخوا باش بوو ڕام کرد خاڵە گیان بەخوا من فلسم پێ نیە بەس نەبوو نەگیراین، لەویادا تەلەفونێك بۆ نەفەرەکە هات و کەوتە




قسـە لەگەڵ کەسـێك و وتـی: هیچـت پەیـا نەکـرد لە شـوێنەکە؟، بەخـوا هەمـووی شـەریکی یە هـا دوا فلسـت لەگەڵ حسـاب دەکەم!، ئیتـر زانیمـان کە ئەمە دەسـتی خۆیانەو چەتەکان قاچاخچیەکان خۆیـانن ، بەهەر حاڵ ئەو ڕۆژە بردینیـان بۆ ئاوایی یەك کە دەکەوێتە نێوان شاری (بانە)و (سەقز) بە ڕووی شـاری (بۆکان)دا، بردینیـانە ماڵێکەوە کە پیرەژنێکی ڕەزیـل و زۆربڵێ خـاوەنی ماڵەکە بـوو، لە نـان و ماسـتێك زیـاتر هیچی تریان نەدایێ لە ماوەی شەو ڕۆژێکدا!.
بە داخەوە وەجبەکەمـان ڕۆشـتبوون بەرەو شـاری (ڕەزایە)و فریایـان نەکەوتـین ،ئیتـر قاچـاخچیە ئێرانیەکە وتـی: ئێسـتا ئەوان لە شـاری (ڕەزایە)ن و گەر پـارە بـدەن دەتـان گەیەنمە لایـان ئەگەر فریاشـیان نەکەوتـن ئەوە دەتانـدەمە دەسـتی تەرەفەکەی شـاری (سەڵماس) کە بەرەو تورکیاتان بنێرێت و بەڵام خۆتان مامەڵەی لەگەڵ بکەن لەوانەیە لە شـاری (وان)ی وڵاتی(تورکیـا) بە وەجـبەکە بـگەنەوە، ئـێمەش لەبەر ئەوەی هـیچ شارەزا نەبووین و ڕێگەیەکی زۆرمان بڕیبوو، ناچار بووین هەرچی بڵێن جێ بەجێی بکەین ،باش بـوو خـاڵم سێ سـەد دۆلاری پێ بـوو وتـی: کاکە بـابڕۆین إن شـاء الله سـەرکەوتو دەبـین ، بـووین بەشـەش نەفەرو بە جێبەکە بە نـاو جـادەیەکی خـاکی و دێ بەدێ و بە پشـتی شـاری (سـەقز) و( بۆکـان) و سێ راکەی( مهابـاد) دەمەو ئێـوارە گەشـتینە نزیـك شـاری (ڕەزایە)و ئیتـر لەنـاو بـاخێکی سـێودا ، دایبەزانـدین و پـاش نیـو کـاتژمێر سـەیارەیەکی تەکسـی کە پێیانـدەوت پەیکان بە زمـانی ئێرانی هـات بە دوامانـداو سـەری خسـتین، قەدەری خـوا سـەیارەیەکی مـرور دووامـان کەوت و گرتینی و، وتـی: نەفەری زیادت سەرخستوەو هەرچۆنێك بێت بە شەش هەزار تمەن ڕێك کەوتین و ئیزنی داین، باش بوو داوای هیچ وەرەقەیەکی لێ نەکردین و پاش چوونە ناو شاری (ڕەزایە) هەر ئەو شـــەوە نەیوەســـتاندین و خێـــرا بردینـــی بـــۆ لای تەرەفەکە کە لە دەرەوەی شـــاری( سـەڵماس)لە گونـدی(کۆزە ڕەش) بـوو، ناوی(بـاقر) بـوو کەسـێکی تـورك بـوو، کەوتینـە






مامەڵەو پرسیاری وەجبەکەی خۆمانمان لێ کردو ، وتی دوێنێ شەو بەڕێ کەوتوون بەرەو تورکیاو لە شاری (وان) پێکدەگەنەوە، ئیتر ڕێکەوت لەگەڵمان کە نەفەری بە سەد دۆلار تا شاری(وان) مان ببات!.

پاش ئەوە بۆ ناو ئاوایی یەکی ترو تێکەڵی کردین لەگەڵ وەجبەیەکی تردا، داوای پارەکەی کرد ، منیش وتم: خاڵە مەیدەرێ جارێ کێ دەڵێت: ڕاست دەکەن بەخوا من پارەم پێ نیەو با ئەو پارە زۆرەشمان نەفەوتێت؟، وتی: ئاخر کوڕم ئێستا داوای پارەم لێ دەکەن، منیش بۆ یەکەم جار توانیم فێڵ لە قاچاخچی بکەم وتم:تۆ پارەکەت وەك حەپی گولاج لێ کردوە، کە ئەم حاڵەتەش لە نێو نەفەرەکاندا باو بوو، پارەیان دەخستە ناو سەری مەمکی مناڵ یان بەتیپی ئاویی لە ناو زەرفێکدا دەیان پێچاو ، لەکاتی کەوتنە ناو کەمین قوت دەدراو دواتر لەڕێی پیسایی کردنەوە دادەنرایەوە،دواتر دەشۆردراو پارەکەیان دەردەهێنایەوە بە سەلامەتی ، ئەمەش بۆ ئەوەی پاسدار یان جەندرمە پارەکەمان لێ نەستێنێت!، وتم: ئێستا پارەکە قوت بدەو بڵێ کەوتوینەتە ناو کەمین و قوتم داوەو دام نە ناوەتەوە، وەڵا هەر چۆنێك بێت قەناعەتمان بە قاچاخچیەکە کردو وتمان: یان لە کۆتا ئاوایی (ئێران) کە داینایەوە، یان لە شاری(وان) ی (تورکیا) دەیدەینە دەستی تەرەفەکەت.

دەمەو بەرەبەیان بەڕێ کەوتین بەرەو کۆتا ئاوایی وڵاتی (ئێران) کە ناوی(مەرهەم) بوو،بردینیانە ناو چەمێکەوە دایاننایین هەتا ئێوارە،لەوێش هێلکەو نانیان بۆ هێناین و وتیان: خۆتان دەر مەخەن ئێوارە بەڕی دەکەوین بەرەو خاکی (تورکیا) ، بەڵام قەدەری خوا وابوو ، کات گەشتە ئێوارەو خۆمان ئامادە کرد بڕۆین و کاتێکمان زانی کەمین خۆیان دا بەسەرماندا، گیراین بەبێ تەقە، ئەوانیش شەش چەکدار بوون و سەر گروبانیش ، واتە گەورەکەیان لەگەڵدا بوو ، هێنایننیانە سەرجادەیەکی خاکی.







لەوکاتەدا چەند سەیارەیەکی تر نەفەریان تێدا بوو بەرەو سنور دەڕۆشتن بە سەر جادەکەدا، دایان بەلاماندا ویستیان ئەوانیش ڕاگرن، بەڵام بەڕاستی سایەقی ئێرانی حساب بۆ هیچ شتێك ناکات ، تایەکانیشیان پەنچەر کردن، بەڵام هەر ڕزگاریان بوو لەدەستیان و ئەوانیش بەهۆی ئەوەی سەیارەیان پێ نەبوو ، وە کاتیش بەرەو تاریکی دەڕۆشت ئیتر نەیانوێرا لێمان دوور بکەونەوەو لەویا کەوتنە جیهاز کردن بۆ سەیارەی گەورە تا بمان گوازنەوە، چونکە ئێمە زۆر بووین!، ئێمەش خۆمان ئامادەکرد بۆ ئەوەی تەواو تاریك بێت و ڕابکەین، بەڵام چونکە قسمەتمان تا ئەویا بوو کاتێکمان زانی گەلابەیەکی بەتاڵ کە لە سنوری وڵاتی( تورکیا) وە دە گەڕایەوە وەستاندیان و ئێمەیان سەرخست و بردینیانەوە بەرەو شاری ( سەڵماس) لە بەشی دواوەی گەلابەکە چوار پاسدارمان لەگەڵدا بوو!.

چەند نەفەرێك ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی کە گەشتینە ناو شارەکە خۆمان فڕێدەینە خوارەوەو ڕا بکەین ، بەڵام خاڵم ڕازی نەبوو وە وتی: کاکە ئێمە هیچ شوێنێك شارەزا نین بۆ کوێ بڕۆین دانیشە بەقوربان ، بەڵێ لەویادا نزیکەی دە نەفەر ڕایکردو ،نزیکەی سی و سێ نەفەر ماینەوەو، دواتر ئێمە لێدانمان خوارد لەسەر هەڵاتووەکان ، ئیتر بردینیان بۆ زیندانی ئیتلاعات ئەو شەوەو لە حەوشەدا خەواندینیان، پاش ئەوەش دوو ڕۆژ بۆ زیندانی گازەکەی شاری( سەڵماس) ، کەبەڕاستی حاڵێکی زۆر ناخۆشمان هەبوو شوێنمان زۆر تەنگ بوو چونکە دوو ژوور بوو ، تەوالێتیش لەشەو ڕۆژێکدا تەنها دوو جار بوو هەر جارێکیش نەفەری یەك دەقە،پاشان بە قەیتانی پێڵاوەکانمان دەستمانیان بەستەوەو بە ناو شاری (سەڵماس) دا بەپێ هەموومانیان برد بۆ دادگاو لەوێش ئاخونێك یەکی سێ مانگ حوکمی داین بە تۆمەتی بەزاندنی سنوری خاکی (ئێران) بە قاچاخ و تێپەڕین بە قاچاخ بۆ وڵاتێکی تر!.







## حاڵی ناو زیندانی(سەڵماس) و سنورداش کردنەوەمان بۆ حاجی ئۆمەران و گیرانمان لە ئاسایشی (هەولێر)و بەربوونمان بە کەفالەت!.

پاش ئەوەی لە دادگای شاری(سەڵماس) حوکم دراین براینەوە بۆ زیندانە دوو ژووریەکەی گازەکە و ، دوو شەو لەوێ هێشتیانینەوەو کردینیان بە دوو بەشەوەو، هەر بەشێکمان کە لەسەرووی پانزە نەفەرەوە بوو، خستینیانە ژوورێکی تاریکی بچوك کە زۆر بە نارەحەتی جێمان دەبۆیەوە تیایداو، تەنانەت پەنجەرەشی تێدا نەبوو، کە هەوایەکمان بۆ بێت، لە هەمووشی ناخۆشتر ئەوە بوو گەنجێکی هەرزەی تورکی بێ ویژدانمان بەسەرەوە بوو، وەك خۆی دەیوت: باوکی کوژراوە لە جەنگی نێوان (عێراق) و (ئێران) و ، دەیویست تۆڵەی باوکی لە ئێمە بکاتەوە، هەرچەندە دەمانوت: بابە ئێمەش وەك ئێوە کەسوکارمان کوشتەی دەستی سەدام و داروودەستەکەی بووە، بەڵام هیچ سودی نەبوو ، کاتێك لەدەرگامان بدایە بۆ پێویستەیەکی دەست بە ئاو گەیاندن، هەرکات دەرگای بکردایەتەوە بەشەق و زلە دەکەوتە ناومان، ئەو گێلە نەیدەزانی گەر داوی بکەوێتە دەستی کوردەوە پەڕو باڵی دەکەن، تا لە کۆتاییدا دەردێکمان دادا ، خوا حەز بکات مردنی باوکیمان لەبیر بردۆتەوە!.

پاش دوو ڕۆژەکە براین بۆ زیندانی گەورەی( سەڵماس)و دەرگایەکی گەورەمان بۆ خرایە سەرپشت و ، چووینە ژورەوەو لە ڕێڕەوێکدا یەك یەك ناویان دەنووسین و پەنجەمۆری سەر کاغەزیان پێکردین و، سەرو بەتانی و قاپ و کەوچك و پەرداخێکیان پێداین، لە پاشاندا بە ڕیز براینە ناو زیندانەکەوە،لە یەکەم دەرگای زینداکەدا لە بەشی ناوەوە ، کابرایەکی دەلاکیان بۆ دانا بووین کە یەك یەك سەرمان سفر بکات، چەند برادەرێك لە پێشەوە بەرکەوتن و دواتر، وتمان کاکە با گفتوگۆی لەگەڵ بکەین بە پارە قەناعەتی پێبکەین و سەرمان سفر نەکات، چونکە ئەوکەسە بۆ





خۆشی زیندانی بوو کە کاری دەلاکی دەکرد،باش بوو نەفەری بە سێ هەزار تمەن قەناعەتمان پێکردو، ئەویش لەگەڵ پاسەوانی زیندانەکە ڕێککەوتن بە شەریکی پارەکە دابەش بکەن ،

ئیتر هەر بەدرۆوە مەکینەیەکی دەدا لە قژمان و ،دواتر چووینە ژورەوە ، بەڵام خودایە چیمان بینی؟، یەکەم جارم بوو لە ژیانم دا زیندانی گەورە ببینم کە هەر لە حوکمی لە سێدارەوە تیایدا بوو تا هەتا هەتایی و پیاو کوژو تلیاك کێش و شەڕواڵ پیس تا خەڵکێکی بێ تاوان و بێ گوناحیش، دەتوانم بڵێم بە سەدان زیندانی تێدا بوو ، وە هەر لەو زیندانەدا بەشی ئافرەتانیشی تێدا بوو لە بەشی ئەودیوی زیندانەکەوە!.

ناو زیندانەکە دوو قات بوو کە پێك هاتبو لە دوو هۆڵی گەورە دوو دوو قەرەوێڵە لەسەر یەك دانرابوون لەگەڵ هەندێك ژووری تایبەتی کەوا چوار نەفەری تێدا بوو، ئەمەش بۆ کەسانێك بوو کە پارەیان دەدا یان زیندانی هەتا هەتایی بوون،وە دوکانێکیشی تێدا بوو لەگەڵ دووحەمامی بچوك ،حەوشەیەکی گەورەشی تێدا بوو بۆ وەرزش کردنی ڕۆژانە، بەهۆی نەبوونی جێگاوە لە ناو هۆڵەکانی ژوورەوە ئێمەیان بردە ناو حەوشەکەوە ،لە سوچێکەوە دایاننناین و ، وتیان: ئەمە شوێنی ئێوەیە، کە بەڕاستی حاڵێکی زۆر ناخۆش بوو بۆمان ، چونکە لە خواردن پێدانیشمان دا غەدرمان لێ دەکرا و جیاوازی دەکرا لە نێوان ئێمەو زیندانیەکانی تردا ، هەمیشە پاشماوەی خواردنی زیندانیەکانمان پێدەدرا، بۆ خۆ شۆردنیش لەهەفتەیەکدا تەنها ڕۆژی پێنج شەممەیان بۆ دانا بووین کە بەداخەوە زۆربەمان یان ئاوی گەرم نەدەما خۆی بشوات یان فریا نەدەکەوت لەبەر زۆری نەفەرەکان!.

بێ لە ئێمە چەند کوردێکی تریش گیرا بوون کە ئەوانیش لەڕێی هەندەران گیرا بوون و خەڵکی شاری قەڵاو مناره بوون، دواتر یەکێکیانم لە (ئەستەمبوڵ) بینیەوەو پێکەوە سەفەری وڵاتی (یۆنان)مان کرد، بەڵام بەداخەوە ئەو گیرا لەڕێ و دواتر نازانم چی






بەسەر هات،پاش دوو شەو، دوو نەفەر لە هەڵاتوەکان گیرانەوەو ، ئەوانیش حوکم دران، کەچی دوای چەند ڕۆژێك ئەوان پێش ئێمە سنورداش کرانەوە، بەم شێوەیە ئێمەش ماینەوەو حاڵمان زۆر خراپ بوو!.
چونکە هەموو بەیانیەك زوو دەبوایە بۆ وەرزش کردن هەستاینایە بە زۆر و، هەر لەو حەوشەیەدا یاری بالەو تۆپی پێ دەکرا ، سەرجەم تۆپەکان بەر ئێمە دەکەوت، ئەمە بێ لە دەنگە دەنگ و هاواری زیندانیەکان، داوامان کرد لە بەڕێوەبەری زیندانەکە یان ئەوەتا ئەو ماوەی کە ماومانە بمانخاتە ناو هۆڵی زیندانەکەوە یان زوو سنورداشمان بکەنەوە!.
ئەم نامەیەشمان لە پاش تەواو بوونی هەفتەی یەکەم ناردو ، سوپاس بۆ خوای گەورە لە هەفتەی دووەم دا بڕیاری دادگامان بۆ هاتەوە کە سنورداش بکرێینەوە و خێرا پاسێکی گەورەیان بۆ هێناین و بەرەو شاری (پیران شار)یان بردین، هەرچەندە ئێمە زۆربەمان خەڵکی شاری( سلێمانی) بووین و داوامان کرد بمانبەنەوە بۆ شاری (بانە) یان شاری( مەریوان) ،کە سنوریان بە شاری (سلێمانی) یەوەیە!.
لەبەر ئەوەی هێشتا زیندانی پارتیمان لەبەردەم دا مابوو، وە تیاشماندا بوو یەکێتی بوو لە خۆی دەترسا، چونکە پارتی لەڕێی سنورداشەوە زۆرێك لە ئەندامانی یەکێتی دەستگیر دەکرد، تا کەفیلیشت نەبوایە ئازادی نەدەکردیت، ئیتر گەر بێ تاوان بویتایە یان تاوانبار، مناڵ بوایە یان گەورە، ئەوە بێ کەفیل ڕزگارت نەدەبوو ئیتر خوای دەکرد هەموو ژیانت لە ئاسایشی (هەولێر) یان ئاسایشی شارەکەی خۆت بەسەر دەبرد کە بنکەیان هەبوو لە شاری هەولێردا!.
پاش ئەوەی شەو گەشتینە شاری(پیران شار) شەو بردینیان بۆ سنوری (حاجی ئۆمەران) بەڵام ڕێگەیان نەداین لە دیوی ئێران بپەڕینەوە ، ئەوشەوەش لە پاسگایەك هێشتینیانەوە، دووبارە سەر لە بەیانیەکەی بردینیانەوە بۆ سنورو ئاودیو کراینەوە،





زۆر دڵمان خۆش بوو، چونکە وتمان: خاکی خۆمانەو ڕزگارمان بوو لەدەستی بێگانە!، نەمانزانی لەخاکی خۆشماندا ئازاد نین و بێ کەفیل ئازاد ناکرێین و هەر نامۆو غەریبین تیایدا!.

سەرەتا گەشتینە خاڵی پشکنینی(حیزبوڵا)کە ئەدهەم بەرزانی سەرکردەیان بوو، پێش بارەگاو بنکەی پارتی ئەوان مقەڕیان دانابوو،کە دەتوانم بڵێم: زۆر بەڕێزەوە پێشوازیان لیکردین و ڕەوانەی لای پارتییان کردین، لەوێشەوە وەمانزانی ئازاد دەکرێین بەلام لەسەر حسابی خۆمان سواری دوو مێکزەمینیان کردین و بردینیان بۆ (چۆمان)ی لای (حاجی ئۆمەران)، لەوێش براینە ئاسایشی ئەو ناوچەیەو کاتێکمان زانی لێپێچینەوە دەستی پێکرد لەسەرمان ، بەکوردیەکەی بەدوای ئەندامی یەکێتی دا دەگەڕان ، منیش خاڵی باوکم یەکێتی بوو!،وە چەند نەفەرێکمان لەگەڵ بوو یەکێتی بوون و بەشداری شەڕی یەکێتی و پارتیشیان کردبوو، ئەمەش پاش گەڕانەوەمان بۆ شاری سلێمانی خۆیان کەشف کرد، ڕەنگیان وەك کاغەزی سپی لێ هاتبوو!.

بەرپرسی ئاسایشەکەش بیزانیایە کێ شێوەی مناڵە دەیبردە ژوورەوەو داوای لێ دەکرد کە کێ یەکێتی یە ئاشکرای بکات و خۆی لێ توڕە دەکردو دەیترسان ، پاش ئەوەی چەند گەنجێکی بردە ژوورەوە هیچی بۆ حاسڵ نەبوو، دواتر خۆی هاتە دەرەوە و خۆی توڕە کردو وتی: دەزانین کامتان یەکێتی یە باشترە خۆی بێتە دەرەوە، ئەو برادەرانەش سەیری ئەوانەیان دەکرد کەبرابوونە ژوورەوە زۆرترسان کەشف کرابێتن!، پاش ئەوەی کەس خۆی دەرنەخست، ئەوجا وتی: بابزانن لە هەولێریش بێت هەر کەشفتان دەکەین و لەدەستمان دەرناچن دواتر وتی: بەرێیان بکەن بۆشاری(دیانە) سۆران!.

دوای ئەوەی بردینیان بۆ شاری(دیانە)کە پێی دەوترێت قەزای سۆران و بردینیان بۆ بارەگایەکی تری پارتی چونکە جێمان نەدەبۆیەوە لە ئاسایش، شەو لەوێ هێشتینیانەوە، بەلام بەڕاستی ڕێزێکی باشیان لێگرتین !.






هەر لە حەوشەکەدا لەگەڵ خۆیان خەوتین و خواردنیشیان بۆ هێناین، بەیانیەکەی دوو کۆستەریان بۆ هێناین و بردینیان بۆ شاری(هەولێر).

سەرەتا بردنیان بۆ ئاسایشی گشتی و لەوێ خەڵکی گەرمیان و کەرکوکیان لێ جیا کردینەوە و بردنیان بۆ ئاسایشی کەرکوك و ئێمەش لەبەر ئەوەی ئاسایشی سلێمانی شوێنی زیندانی نەبوو لەگەڵ خەڵکی هەولێرو دەوروبەری بردینیانەوە بۆ ئاسایشی هەولێر، ماوەی یەك هەفتە هێشتینیانەوە لەبەر بێ کەفیلی، ئەگەر چی بەشێك لە کەسوکاریشم پارتی یەو بەرپرسیاریەتیشیان هەیە بەڵام بەداخەوە لە ئاسایشی هەولێردا نەیاندەهێشت تەلەفونێکیش بکەیت و تەنها لەڕێی ئەوکەسانەوە، کە کەفیلیان دەهات و ئازاد دەکران نامەمان دەنارده دەرەوە ، ئیتر بەو هۆیەوە منیش و خاڵیشم یەك هەفتە ماینەوە تاوەکو کەسوکارمان لە شاری (سلێمانی) بیستیان وهاتن بەدەم مانەوە، بەهۆی شەڕی ناوخۆشەوە ، پەیوەندی نەبوو لە نێوان شاری(سلێمانی) و( هەولێر)دا و دەبوایە بەناچاری کەسێکی نزیکمان بێت و کەفیلێکی پارتیمان بۆ پەیدا بکات و ئەوکات ئازاد بکرێین!.

سوپاس بۆ خوا پاش ماندوبوون و نارەحەتیەکی زۆر ئەو جارەیان بەسەلامەتی گەڕاینەوە شاری سلێمانی و، لە چێشتخانەی کانی وەتمان لامان داو یەکی نەفەرێك کەبابی خۆشمان خوارد بێ ئێوە ناخۆش و تۆڵەی ئەو چەند ڕۆژە نارەحەتی و برسیەتیەمان کردەوەو، منیش سەرەتا وتم: بەس ئەم جارە ڕزگارم بێت ئیتر باسی هەندەران ناکەمەوە، بەڵام پاش چەند ڕۆژێك هەموو ئازارو نارەحەتیەکانم لە بیر چۆیەوە بە هۆی نارەحەتی خێزانەکەمەوەو، خراپی باری گوزەرانمان ئەگەر چی کەس ڕازی نەبوو لە خێزانەکەم کە سەفەری دەرەوە بکەم بەڵام دووبارە پاش دوو هەفتە بەڕێکەوتمەوە بۆ هەندەران!.





## سەفەری دووەم: گەشتنە شاری (وان) و دەستگیرکرانمان لە شاری (ئاگری) و سنورداش کردنەوەمان بۆ (ئیبراهم خەلیل) گەشتنە ناو شاری (وان) ی وڵاتی (تورکیا)

پاش ئەوەی سەفەری یەکەم گیراین و گەڕاینەوە بۆ شاری سلێمانی ، قەدەری خوای گەورە برا گەورەکەشم لە شاری (وان) گیرابوو، ئەویش سنورداش کرابۆیەوەو، دووبارە پاش دوو هەفتە لەگەڵ قاچاخچیەکەدا کات دیاری کرایەوە ، وەك جاری پێشو لەڕێی چۆمانەوە بەرێ کەوتین و چوینەوە ناو خاکی (ئێران)، بەڵام بەهۆی خراپی باری ئاسایشی شاری (بانە)،کاتێکمان زانی ئەو سەیارەی ڕێبەری وەجبەکەی دەکرد، ئاگاداری کردینەوە کە ڕێگە زۆر خراپەو پڕ بووە لە نیروی نیزامی، بەپەلە دایان بەزاندین و نزیکەی هەشت کاتژمێر لەپێش شاری (بانە) بە ناو شاخ و دۆڵدا ڕێگەمان کردا!.

زۆربەی نەفەرەکان لەلایەن قاچاخچیەوە بەڵێنی ئەوەیان پێدرابوو کە تەنها سێ کاتژمێر ڕێی پێی تێ دەکەوێت و باقیەکەی هەمووی بەسەیارەو ئەسپ دەبێت،ئەوەش تەنها لە ڕێگەی نێوان (ئێران و تورکیا) دەبێت بە حساب، ئێمەش چەند نەفەرێکمان چونکە پێشتر ڕێگەمان کردبوو ، پێکەنینمان دەهات بەو قسانەو، داماوی وای تێدا بوو فریوی خواردبوو بە قسەی قاچاخچی بە قۆندەرەی لەماعەوە هاتبوو، بەهەرحاڵ دوای چەند جارێك سەرکەوتن و دابەزاندوە لە سایپاکانی ئێران، نیوە شەو گەشتینە ناو شاری (بانە)،ئیتر بە هۆی کات درەنگیەوە بریدینیان بۆ ماڵێك تا ئێوارەی داهاتووا!.

پاشان بۆ شەوەکەی بەڕێکەوتینەوە ، وتیان: دووبارە بازگەی نێوان (بانە بۆ سەقز) ، نەتوانراوە بکڕدرێت و دەبێت بەپێ بە پشتیدا بڕۆین، ئێمەش چونکە جاری پێشو، ڕووداوی ڕووت کردنەوەکەمان بەسەردا هاتبوو، هەموو نەفەرە تازەکانمان تێ گەیاندو، وتمان ڕازی نین لە ڕێگەی (کەلی خان)ەوە بمانبەن و پاش گفتوگۆیەکی زۆر




لەگەڵ تەرەفەکانی ئێراندا قەناعەتمان پێکردن ئەمجارەیان لە دیوی ئەم دیوەوە بمان بەن کە هەم ڕێگەکەی ئاسانتر بوو ، وە هەم نزیکەی کاتژمێرو نیوێکی پێ چوو!.
پاش ئەوە گەشتینە ئەودیو خاڵی پشکنین و خێرا چووینە ناو چەمێکەوە لەتەنیشتی جادەیەکی قیردا، ئیتر سایپاکان دەرکەوتنەوەو و بەپەلەو خێرا لەسەر ئەوجادە گشتی یەدا سەرکەوتین و ، دێ بەدێ بە پشتی شارو قەزاو ناحیەکاندا ، لەسەر ڕێگەی جادەی قیرو ناو بەناویش جادەی خاکی،بەڕاستی هێندە تیژ ڕەون سایەقەکانی ئێران کەدەیاندا لە تاسەکان یەك مەتر بەرزیان دەکردینەوە لە دوای سایپاکەوە و، نەش نەدەبوایە هەڵیش بساینایە بۆ ئەوەی دیار نەبین، لە پاش چەند کات ژمێرێکی زۆر ڕێگە کردن گەشتینە ناو باخە سێوەکانی نزیك شاری (ڕەزایە)و، لەویادا تەسلیمی تەرەفی قاچاخچیە تورکەکانیان کردین!.
ئەو شەوە بردینیانە شاری (ڕەزایە)و لەدەرەوەی شارەکە بردینیانە ناو ماڵێك کە لەناو باخێکی گەورەی سێودا بوو ، شەو و ڕۆژێك دایاننایین لەو ماڵەدا و پاشان بۆ ئیوارەی دواتر، سایپاکان هاتنەوە بەدوامان‌دا،ئەو شەوە تا نزیکی بەرەبەیان بەڕێگاوە بووین تاگەشتینە گوندی (جاندار) کە کۆتا گوندی سنوری نێوان (ئێران) و (تورکیایە)و بردینیانە ناو چەم و دۆڵێکەوە تا نزیکی ئێوارە کە ژمارەمان لە سەد نەفەر زیاتر تێ پەڕ دەبوو، کۆمەڵێك وەجبەی زۆری قاچاخچیەکانی کوردستان لەو دۆڵەدا کۆ کرانەوە، دەمەو ئێوارە خۆمان ئامادەکرد بۆ ڕێگە کردن بەڕێی پیادەو ئەسپ، چونکە ئەو سنورە ناوچەی قەدەغەکراوەو، بەهۆی بونی پەکەکە لەو ناوچانە سەیارە ناتوانێت هاتوچۆ بکات، وە بە ناوچەی مان و نەمان ناسراوە،ئەوەی توانای ڕێگە کردنی نەبوایە ئەسپی بەکرێ دەگرت و ئەویشی توانای هەبوایە بەپێ دەڕۆشت، بەڕاستی ڕێگەیەکی سەخت بوو هەمووی شاخ و بەرزایی و دۆڵ بوو،ئەو شەوە نزیکەی نۆ کاتژمێر ڕێگەمان بڕی بەپێ تا گەشتینە سەرەتای گوندە سنوریەکانی وڵاتی (تورکیا) ،کە ناویان






(لەزبین) و (نۆبرین) بوو، ئەوەی کە زۆر سامناك بوو ڕۆشتنمان بوو بە لای پاسگای (ئێران) و قەرەقولی (تورکیا) ، کە بەس بیانبینینایە تەقەی کوشتنمان لێدەکرا، زۆر شەکەت و ماندوو ببووین چونکە خێزان و منداڵیشمان لەگەڵدابوو کە توانای ڕێگە کردنیان نەمابوو،پاش گەشتنمان بە دووەم گوند کە ناوی(نۆبرین) بوو، چەند کەسێکی خەڵکی ئاوایی یەکە بەجوێن دان و قسە پێ وتن کە هەر یەکەیان تێلایەکی بەدەستەوە بوو بەرەو ڕوومان هاتن ، کەوتنە جوێن دان بە سەرکردەکانی پارتی و یەکێتی و ، وتیان: ئێستا دەتانکوژین و تۆڵەی کوژراوانی گەریلای پەکتان لێ دەکەینەوە کە بەدەستی یەکێتی و پارتی کوژراون!.
لەوکاتەدا تازە شەڕی نێوان پارتی و پەکەکە وەستابوو، بەڵام لەولاوە پەکەکە لەگەڵ یەکێتی شەڕی دەست پێکردبوو، ئیتر چەند پیاوێك لەناو نەفەرەکان چوونە پێشەوە، بە پس مام پس مام هێوریان کردنەوە، وتیان: کاکە ئێمەش لەداخی شەڕی کورد کوژی کوردستانمان بەجێهێشتوەو هەڵهاتوین ، باش بوو هاتنەوە سەرخۆیان و کەمێك هێور بوونەوە، ئەگینا هەر لەویادا گەر نەشیانتوانیایە هیچمان لێبکەن دەیانتوانی تەسلیمی جەندرمەمان بکەن،ئەو شەوە کۆمەڵ کۆمەڵ جیا کراینەوەو، هەر وەجبەو چووینە ناو گەوڕ یان تەنوربانی ماڵێکەوە، باش بوو ئێمە ئەوجارە تەنوربانمان بەرکەوت و، خێرا خەومان لێ کەوت تا بەیانی ، کاتێك هەستاین لەخەو یەك یەك دەچووینە دەرەوە، سەیرمان دەکردو دەمان وت: ئەڵێی هەر لە وڵاتی (تورکیا)ش دا نین، بەهۆی بارو گوزەرانی سەختی ژیانی دانیشتوانی ئەو لادێ و گوند نشینانە کە وەك باس دەکرا بە سێ ئاوایی یەك تراکتۆریان هەبوو،
شەوانیش کارەبایان دەبڕین و لە ڕووی خزمەتگوزاریەوە لەلایەن دەوڵەتی عەلمانی تورکیاوە کە عەلمانیەکان لەسەر حوکم بوون ئەوکاتە، گەمارۆی ئابوریان خستبۆیە سەریان بەهۆی کوردبوونیان و، هاوکاری کردنیان بۆ گەریلاکانی پەکەکەو، بەو







هۆیەشەوە هەم گفتوگۆ بە زمانی کرمانجی وە هەم خوێندنیشیان بە زوبانی کوردی لێ قەدەغە کرابوو!.
ئەوانیش بۆ بژێوی ژیانیان پشتیان بە ئیشی قاچاخ و نەفەرات و مەڕو ماڵات بەخێو کردن بەستبوو، ئەوەی کە زۆر جێگای خەفەت و داخ بوو ، نەبوونی مزگەوتێك بوو لەم گوندانەدا، سەرەڕای ئەوەش دانیشتوانی ئەو ناوچەیە زۆر دووربوون لە دینداری و، بەداخەوە ئەمە باس دەکەم چونکە مێژووەو نابێت بەسەریدا تێپەڕین و باز بدەین، ناشرینترین کردەوە کە بینیبێتم بەئاشکرا هەندێك پیاویان مامەڵەیان دەکرد بەسەر کچ و خێزان و کەسوکاریانەوە، بۆ لایەنی ڕابواردن لەبەر خاتری پارەیەکی کەمی پیس، خوا پەنامان بدات کە بەڕاستی زۆر جێگای شەرمەزاری بوو، ئەگەر ئەو حاڵەتانەشم نەبینیایە ئەوە هەرگیز باوەڕم نەدەکرد مێرد یان باوك یان برا کاری وا قێزەون ئەنجام بدات و مامەڵەی لەشفرۆشی بکات بەسەر کەسەکانی خۆیەوە، دیارە ئەم دیاردەیە لە گوندە تورك نشینەکانی ناو خاکی ئێرانیشدا هەبوو، بابای بێ ئابڕوی لای خۆشمان لەوکاتە ناڕەحەتیەدا ئاگای لەشەرەف و ناموسی خۆی نەدەماو، بۆ چەند دەقەیەکی کەم تاوانی زینای ئەنجام دەدا!.
سەر لە بەیانی هەستاین لە خەو بۆ چوون بۆ ناو گوندی(چاچان) بەڕێگەی پیادە و ئەسپ کە نزیکەی یانزە کاتژمێری ترمان بڕی بەو شاخ و دۆڵ و ڕێگە سەختانەداو، ئەوەی کە لەو ڕێگەیەدا بینیم ، شەڕکردنی نێوخۆی نەفەرەکان و جوێندان وپەلاماردان تا ئاستی کوفرکردن خوا پەنامان بدات ، نەفسی نەفسیەك بوو تەنها خوا دەزانێت لەچی ناڕەحەتیەکدا بووین، لەویادا قاچاخچیەکی کورد کوفری کرد،منیش سەرەتای گەنجیەتیم بوو خۆم پێ نەگیراو دەستم کرد بەقسەوتن پێی، ئیتر چەورەکانی دەوری هاتن بۆم ، خوای گەورە پشتیوانی خۆی بۆ ناردم بە کۆمەڵێك گەنجی بەغیرەتی شاری کەلار کە قاچاخچیەکەیان کەسێکی دیندار بوو سوپاس بۆ خوا، خەریك بوو







ببێتە شەڕێکی گەورە، ئەو برا بەڕێزە چاوی سوور ببوو ماشەڵا زۆر بەغیرەتیشە وتی: قەسەم بەخوا هەرکەس کوفر بکات شەق شەقێنی پێ دەکەم،ئیتر سوپاس بۆ خوا دەم کوتمان کردن و ، کەس نەیدەوێرا کوفر بکات!.

گەشتینە دەمەو ئێوارە چووینە سەر شاخێکی زۆر بەرز بەهۆی پارەنەدانی چەند کەسێك و خۆشاردنەوەیان لە خاوەنی ئەسپەکان شەومان بەسەر هات و ئیتر کاتی گەڕانەوەی ئەسپ سوارەکان بوو، ڕێبەرێکی تر هات بەدووامانداا ، بەڵام وتی: کرێی ئەو خاوەن ئەسپە نەدەن نایەڵم بڕۆن و منیش ناتان بەم، برادەرێکیش کە خۆی سەرکەوتبوو، چونکە دەم و چاوی داپۆشیبوو ، کابرای خاوەن ئەسپەکە کەسەکەی لێ ونببوو ، وە نەیدەناسیەوە، نەیدەزانی کێیە، کەچی ئەو برادەرە دیار بوو کەسێکی زۆر فێڵباز بوو،لە هەمان کاتدا گاڵتەچیش بوو، هاتبوە لای کابراو دەستی خستبۆیە سەر شانی کابراو بەدەنگی بەرز دەیوت کاکە کێ پارەی ئەم وڵاخەی نەداوە ، با پارەکەی بدات و چیتر ئەو خەڵکە با نەوەستێت و بڕۆین، کابراش تێنەدەگەشت و دەیوت بەخودێ ڕاست دەبێژیت،نەیدەزانی ئەوەی پارەی نەداوە خۆیەتی و پێشی دەڵێت وڵاخ!.

بەهەرحاڵ هەرچۆنێك بوو لەویاشدا ڕزگارمان بوو ، تا ئەوەی پاش ناڕەحەتی و ماندویەتیەکی زۆر گەشتینە ناو گوندی (چاچان) و ، لەوێش دابەشکراین و چووینە ناو ماڵێکەوە بۆ ئیسراحەت کردن!.

سەر لە بەیانی دوو شاحینەی پشت بەتاڵ هاتن و سواریان کردین، مەودایەکی زۆر بە شاخ و دۆڵدا ڕێگەیان پێ کردین و پاشان ئێوارەمان بەسەرداهات و، لە شوێنێك دایانناین و وتیان: لەبەر بازگەی بەردەم شاری(وان) دەبێت بە پشتیدا بڕۆن و ئێمە لەودیو چاوەڕوانتان دەکەین، بەو شێوەیە نزیکەی سێ کاتژمێرێکی تر ڕێگەمان کرد، تا چووینە پشتی قەرەقولی بازگەکەوە ، شاحینەکان هاتن بەدووامانداو سەریان





خستینەوە، پاش چەند کاتژمێرێك،لە هەندێك شوێنی تردا دایاندەبەزاندین و ماوەیەك ڕێگەمان دەکردەوەو پاشان سەریان دەخستینەوە، چونکە دەیانوت: کۆنترۆڵی پۆلیس هەیە، ئیتر سوپاس بۆ خوا بەو شێوەیە تا نزیکی بەرەبەیان گەشتینە ناو شاری(وان)و بردینیان بۆ ناو گەوڕێکی زۆر گەورە لەدەرەوەی شارەکە، بەڵام بەداخەوە شاحینەکەی تر لە دوای ئێمەوە لە شوێنێك وەرگەڕابوو، وەك باسیان کرد نەفەرێك وەفاتی کردبوو ، وە زۆرێکیش دەست و قاچیان شکابوو ، دواتر جەندرمە دابووی بەسەریاندا هەموویان گیرابوون و بەو نارەحەتی و ئازاراوە سنورداشی خاکی ئێران کرابوونەوە، چونکە ئەگەر پێش شاری(وان) بگیرایتایە نەیاندەدایتەوە بە سنوری(ئیبراهیم خەلیل)ی کوردستان بەڵکو دەیاندایتەوە بە سنوری (ئێران) و لەویاش لەسەر سنور بەجێیان دەهێشتیت و مەجبور خۆت بڕۆشتیتایەتەوە بۆ هەرێمی کوردستان، یان گەر پاسگای ئێران بیگرتیتایە ئەوە حوکم دەدرایت!.

## ناو شاری (وان) و ، گیرانمان لە (ئەرزروم) و سنورداشی بۆ(ئیبراهیم خلیل).

پاش ئەوەی شەوێك ماینەوە لەو جێگەیەدا، ئیتر وەجبەکان لەلایەن قاچاخچیەکانیانەوە پارەیان بۆ دەدراو دواتر دەڕۆشتن بۆ شوقەی تر، شوقەکانیش هەمووی لەناو ماڵدا بوون و خێزانی ماڵەکەش لەگەڵمان دەژیان، ئەوەش بەهۆی نەبوونی ئیش و کارو قورسی باری ئابوری کوردانی باکوربوو، دەمەو ئێوارە دۆڵمشێك هات بەدواماندا و بردینی بۆ ماڵێك کەتەنها دوو ژووریان هەبوو ، ژوورێکیان ئیمەی تیا بووین و ژورێکیشیان خاوەن ماڵەکە، ئیتر تەوالێت و حەمام پێکەوە بوو!.
ئەوەی کە زۆر ناخۆش بوو بوونی دووکچی تازە پێگەشتو بوو لەماڵەکەدا، کە لەلایەن هەندێك نەفەری نەفس نزمەوە چاوبڕکێیان لەگەڵ دەکرا، لەماوەی شەو ڕۆژێکدا






ئاومـــان بــۆ گەرم کــراو خۆمــان شۆرد،ســوپاس بــۆ خــوا کەمێــك مانــدووێتیمان حەسایەوە!.

چەنـد ڕۆژێـك لەو مـاڵە مـاینەوەو لەو ژووره زیـاتر کەسـمان نەمانـدەتوانی بچیـنە دەرەوە، جـار جـارەش تەرەفی قاچـاخچیە کـوردەکە دەهـاتە لامـان و تەلەفـونی دەدایە دەستمان تا قسە لەگەڵ کەسوکاردا بکەین ، قەدەری خوا وابوو ڕۆژێك دائیرەی کارەبا بۆ کۆنترۆڵ کردنی کارەبا خۆیان کرد بەماڵەکەدا، خاوەنی ماڵەکە هاتە ژوورەکەمان و دەستی کردبە گریان، وتی: ئێستا کەشف بم توشی کارەسات دەبم، تکایە دەنگتان نزم بکەن!.

خێرا خۆی چووە دەرەوەو کچێکی هاتە ژوورەکە توند دەرگای ژوورەکەی لەدیوی ناوەوە گرتبو، ئێمەش نوزەمان لەخۆمان بڕیبوو وە خۆمان کردبوو بە ژێر دوو بەتانیدا بۆیە گەر هاتیشنە ژوورەوە زۆر دیار نەبین، بەڵام سوپاس بۆ خوا پاش ئەوەی یەك دووجار دەسکی دەرگاکەیان جوڵاندەوە کە بێنە ژوورەوە ،بەڵام دەرگاکەیان بۆ نەکرایەوە ئیتر گوێمان لێبوو خاوەن ماڵەکە وتی: مناڵی لێیەو خەوتوون، باش بوو ئیتر وازیان هێناو لەگەڵ ڕۆشـتنی لیژنەکە خـاوەن مـاڵەکە هـاتە ژوورەوەو وتـی: خۆتـان کـۆبکەنەوە هەر ئێسـتا دەبێـت بـڕۆن، چـونکە وابـزانم هەسـتیان کـردوە نەفەری قاچـاخ لەماڵمانـدایە، بەپەلە تەلەفـون کـرا بـۆ تەرەفی قاچـاخچی یەکەو، خێرا تەکسـیەك هـات بەدوامانـدا، هەر ئەو شـەوە پێـنج نەفەر پێـنج نەفەر بردینی بـۆ مـاڵێکی تـر، کە لەگەڕەکێکی خـاکی وەك لای خۆمان بوون، ئیتر لەوێ گوزەرانمان باشتر بوو، چونکە هەموو ئەو ناوە خزم و کەسی یەك بوون، ئێمەش چووینە ماڵێکەوە تەنها ژن و مێردێك و دوومناڵی بچوکیان هەبـوو، پیـاوەکەش لە شـارەوانی ئیشـی دەکـرد، تەنـانەت بـۆ کـاتی ئـاهەنگو شـایی کردنیـان کە حەوت ڕۆژی پێ دەچێـت لە کلتوریانـدا، بەزۆر دەهـاتن و دەیـان بـردین ، بەڵام من و چەند برایەك کەنوێژمان دەکرد نەدەچووین، تا ڕۆژێکیان برسێتی زۆری بۆ





هێنـاین و ئیتر قاچاخچی داوای پارەی زیادی لێ دەکـردین و گەمارۆی ئـابوری خسـتە سـەرمان و، خواردنی بۆ نەدەکڕین ئێمەش لەبرساندا بەچاری ناچاری چووین ژەمێك خواردنمان خواردو خێرا هاتینەوە بۆ ماڵەکە!.

پاش دوو هەفتە تەواو خەریك بوو بێزار دەبووین، هەر ئەمڕۆ بەیانیمان پی دەکرا تا بمـانبەن بەرەو شاری(ئەسـتەمبوڵ) ، قاچاخچیەکـان دەیـانوت: ڕێـگە زۆر خـراپەو کۆنترۆڵ بەهێزەو وەجبە زۆر گیراوە، بەوشێوەیە زۆریـان هێشـتینەوە پاش ماوەیەك یەك یەك بردینیان بۆ بازاڕو سەرو وێنەی پاسپۆرتیان پێ گرتین و، دەرنەکی ئێرانیمان بـۆ دروسـت کـرا، ئەم دەرنەکە وەرەقەیەکـی سـپی گەورەبـوو لە بـنکەی نەتەوە یەکگرتوەکان دەکرا بۆ هەڵاتووەکان و سیاسیەکانی ئێران کە لە تورکیا نیشـتە جێ بوون!.

پاش دوو رۆژ چاوەڕوانی دەرنەکەکانمان بۆهاتەوەو وتیـان: خۆتـان ئامادە بکەن ئەم شەو دەردەچین، ئێمە ئەوکاتە ژمارەمان بیست و شەش نەفەر بوو، بۆیە دوو دۆڵمش هات بەدواماندا و کەوتینە ڕێ بەرەو شاری (ئەستەمبوڵ) وەك باسیان دەکرد نزیکەی بیست و چوار کاتژمێر دوورە لەشاری (وان)ەوە، پاش ئەوەی نیو کاتژمێر ڕۆشتین لە پێش بازگەی نێوان (وان) و (ئەستەمبوڵ) بردینیانە سەر شاخێك و دایانبەزاندین و وتیان: دەبێت بەپێ بڕۆن و ئێمەش لەو دیو بازگەکە چاوەڕوانتان دەکەین.

شاخەکە زۆر بەرز بوو بازگەکەش بەرامبەرمان بوو لە دەشتایی یەك و بلاجگتۆرەکەی جوان ئەو شاخەی ڕۆشن کردبۆیەوە، بەس سەیریان بکردینایە جوان دەبینراین، ئیتر ماوەی سێ کاتژمێر، بەو شاخە سەختەدا لابەلا قەدبڕمان کردو ڕزگارمان بوو، پاشان دابەزینەوە بەرەو خوارەوە تا گەشتینەوە سەرجادەی قیرو، لەژێر پردێکدا دانیشتین، تـا دووبـارە دۆڵمشـەکان هـاتنەوەو سەریانخسـتین و دووبـارە کەوتیـنەوە ڕێگەکـردن،




لەپـێش دۆڵمشــەکانەوە ســەیارەیەکی ڕێبەرمــان هەبــوو، لەهەر شــوێنێك کـۆنترۆڵ هەبووایە تەلەفونی بۆ دەکردین تاوەکو لامانبدایە،
ئـێمەش لە پەنایەکـدا یـان لە بەنـزین خانەیەکـدا دەوەسـتاین تـاوەکو کـۆنترۆڵەکە هەڵدەگیراو، دووبارە دەکەوتینەوە ڕێ!.
ئەو شــەوە بەهــۆی هەڵەی ســایەقەکەمانەوە کەوتە پـێش ســەیارەی ڕێـبەرەکەو، بـێ گوێــدانە ڕێنماییەکــانی پێشــکەوت، نــزیکەی یەك کــاتژمێر پێشــکەوتین، کاتێــك تەلەفونمـان بـۆ کـرا، ڕێـبەرەکە شـێتبوو هەزار جـوێنی داوە بە سـایەقەکەو، وتـی: مـن لەگەڵ دۆڵمشـەکەی تـردام و تـایەی پەنجەر بـووە بـۆ پێشـکەوتویت، ئیتر ئەویش وتـی: نەمزانیـوەو وا نزیکیشـم لە شـاری (ئەرزروم) و دەچـمە نـاو شـاری(ئاگری) یەوەو تـازە لەدەرەوەی ئەم شـارە نـاتوانم بوەسـتم و دەچـم بـۆ شـاری (ئەرزروم)و لە وێسـتگەی شەمەندەفەر چاوەڕوانتان دەکەم، چونکە دەبووایە لەو شارەوە ئیتر بە شـەمەندەفەر بڕۆشتینایە چونکە تا ئەوێ ترس هەبوو!.
کاتێك چـووینە نـاو شـارەکەوە، لەنزیکی دەروازەی شـارەکە لـە دوورەوە فەڕاڕەی گڵـۆپی ســەیارەی پۆلیســمان بینـی و، ســایەقەکەمان ئاگــادار کــردەوە کە ئەوە کـۆنترۆڵەو نەڕوات، بەڵام چونکە لەقەدەرمان نوسرابوو کە لەو شارە زیاتر نابێت بڕۆین بەقسـەی نەکردین و خـۆی کـرد بەنـاو کۆنترۆڵەکەداو، پۆلیسێك بە لایتەکەی دەسـتی ئیشـارەی کرد کە بوەستین بەڵام ئەم خێراییەکەی زیاد کردو نەوەستا!.
ئیتر هەر ئەوەنـدەمان خـۆش بـوو شـار بـوو بە چراخـان و دوو سـەیارەی پۆلیس دوامـان کەوت، نزیکەی نیو کاتژمێر فڕکان فڕکان بەدوامانەوە بوون تا خـۆی کـرد بە کۆڵانێکداو ڕێی دەرچـوونی تێـدا نەبـوو، لەکەلاوەیەکـدا وەسـتاو وتـی: ڕابـکەن، بەڵام تەنها بـراکەم تـوانی ڕابکات چـونکە لەپێشـەوە دانیشـتبوو زۆر هـاواری کـردو بـانگی کـردم کە ڕابـکەم، بەڵام برادەرێــك دەرگــای دواوەی داخســتبوو بە قفــڵ ئــێمەش نەمانــدەزانی چــۆن




دەکرێتەوە ، تا پێش و پاشمان لێگیرا بە سەیارەی پۆلیس و، بوو بە هات و هاواری پۆلیس و، داوایان لێکردین خۆمان تەسلیم بکەین، منیش فلیمی پۆلیسیم بیر هاتەوە لەویادا!.

بەڵام ئەمجارەیان خۆمان ئەکتەر بووین و ڕاستەقینەش بوو، بۆیە هەموومان خۆمان دا بە زەوی دا لەناو دۆڵمشەکەدا، و هاوار هاورێك بوو لەدەرەوە دەتوت دەوری مافیاو پیاوکوژیان داوە، پێش ئێمە سایەقەکەیان دابەزاندو گرتیان، باوەڕتان بێت یەك لێیانی لێدراوە هەتا ئێستا شتی وام بەچاوی خۆم بەدەگمەن بینیوە، هەر لەویا پێش گەشتنە بنکەی پۆلیس سەروچاویان تەقاند، نەیانهێشت ئیمە دابەزین و یەکێکیان هاتە لای پەنجەرەی دۆڵشەکەو وتی: خەڵکی کوێن؟.

هاوڕێ یەکەمان وتی: کاکە هەموو دەرنەکەکان دەربهێنن و بیدەن بە پۆلیس و بڵێن: تەزویرە ئەگینا بەخوا وادەزانن ئێرانین و سنورداشی ئێرانمان دەکەنەوە، لەوێش پاسگا دەمانگرێت سێ مانگ حوکممان دەدات، بەو شێوەیە لەسەر وتەی ئەو دەبەنگە سەرجەم دەرنەکەکانمان تەسلیم کردو بە تەزویرمان لەقەڵەم دا ،پاشان بردینیان بۆ بنکەیەکی پۆلیس زۆر ئازاریانداین و نەیاندەهێشت دابنیشین، یەك یەك براینە ژورێك و ناوی سیانیان لێ وەرگرتین و پەنجە مۆریان پێکردین، هەموو وتمان خەڵکی عێراقین کەس نەیدەوێرا بڵێت: کوردم چونکە ئەوکاتە کاتی حوکمڕانی تورکە نەتەوە پەرستە عەلەمانیەکان  بوو، لەسەر دەرنەکەکان لێدانێکی باشمان خوارد، چونکە هەمووی ئەسڵ بوو، دەیانوت: کێ ئەمەی بۆ تەزویر کردوون؟،

ئێمەش سەیری کابرامان کردو، وتمان: خوا ئەو ماڵەتمان ئاوا کرد تخوا ئەوە ڕێ بوو بۆت دانایین، دواتر زانیمان کە ئەو کۆنترۆڵە پۆلیسی هاتو چۆ بوەو، تەنها بۆ ئیجازەی سایەقی و سەرپێچیش دانراوە،سەر لەبەیانی ئەو ڕۆژە کە ژمارەمان دوانزە نەفەر بوو،




بە دۆڵمشێکی پۆلیس دوو دوو کەلەپچە کراین بەیەکەوە، بردینیان بۆ شاری(ئەرزروم) و تەسلیمی شوعبەی یابان چی کراین،

کە بەکوردی واتە: بەشی پەنابەران، لەوێ داوای پارەیان لێکردین بۆ کرێ سەیارە تاوەکو (ئیبراهیم خەلیل)منیش هەم براکەم لێ دابڕاو هەم خاڵی باوکیشم لە دۆڵمشەکەی تردا بوو سوپاس بۆ خوا دەرچوون ئەوان ،منیش یەك فلسم پێ نەبوو، سەرجەم هاوڕێکانیشم پارەکانیان شاردبۆیەوەو، هەندێکیشیان کردبوویان بە گولاج و قوتیان دابوو، ئیتر ڕووتیان کردینەوەو هەموو جل و بەرگەکانمانیان پشکنی هیچیان دەست نەکەوت، دوایی کەچەڵێکی ملپانی کەلە زل ڕێك دەتوت جەماعەتی کاهینەکانی فیرعەونە، وتی: ئێستا یەك یەك دەتانبەمە ژوورەوە، بەس پارە بەیەکێکتان بێت دەیخەمە ژووری تاکەکەسی و لێدانێکی باشی لێدەدەم، بەخوا یەك دووانێکیان بردوو هاتنەوە وەك مریشکی ئاوە ڕووتکراویان لێ کرابوو فەقیرانە!.

کاتێکم زانی هاتە لامەوەو پشتە ملی گرتم و بردمیە ژوورێکەوە هەمووی فەرمانبەر بوون، وتی: پارە وتم: پێم نیە، گەڕا هیچی نەدۆزیەوە، ئەوجا وتی: کێ پارەی پێ یە؟، منیش وتم: کەسمان، بەخوا یەك زلەی لێدام فڕێی دامە سەر مێزی کارمەندێکی ئافرەت، ئیترئافرەتەکە هەڵی ساندمەوەو، بەزەیی پێدا هاتمەوە، دیاربوو بەزمانی خۆی وتی: گوناحە وازی لێ بێنە، کردمیانە دەرەوەو، وتی: تا پارە پەیدا نەکەن ناتانبەینەوە، ئیتر براین بۆ زیندانی بنکەکە لەژێرزەمینێکدا بوو، یەکی لەتە سەمونێکیان بۆ هێناین، ئەوسەربازەی کە بردینی، وتم: نوێژ دەکەم بە ئیشارەت، دیار بوو کەسێکی باش بوو، خێرا جیای کردمەوەو بردمی دەست نوێژم گرت و پاشان بانگێکم دا لەناو زیندانەکەدا.

پاشان چەند کەسێکمان نوێژەکانمان کردو، زۆر هیلاك بووین چونکە لێیان دابووین وە هەم نانیشمان نەخواردبوو ، وە نەشخەوتبووین، ئیتر بۆ شەوەکەی پۆلیسێك هات






بـۆ لامـان و وتـی: بەیـانی زوو خۆتـان ئامـادە بـکەن سنورداشـی (ئیبـراهیم خەلیـل) دەکرێنەوە، لەخۆشیا نەماندەزانی چی بکەین ، نەمانزانی لای خۆشمان حاڵمان زۆر باش نابێت!.

بەیـانی زوو دووبـارە دوو نەفەر دوو نەفەر پـێکەوە کەلەپـچە کـراینەوەو بە دۆڵمشـێك بردینیان بەناو چەندین شارو قەزای جوانی کوردستانی باکورو دیارترینیان شارەکانی (دیـار بەکـر) و (مـاردین) بـوو تـاوەکو گەشـتینەوە نـاو شاری(سـلۆپی) کە کۆتـا شـاری سـنوری نێـوان کوردسـتانی باشـورو بـاکورەو، لەوێـوە گەشـتینەوە بـنکەی گومرگی(ئیبراهیم خەلیل)،پاش تەسلیم کردنەوەمان بە پارتی ، ئەوانیش بەبەندکراوی بردینیـانە سـەربانی ئاسایشـی (ئیبـراهیم خەلیـل) و، هەتـا ئێـوارە لەبەردەم ئەو خـۆرە گەرمە دایاننـاین بەبێ ئەوەی لەتێـك نانیشـمان بـدەنێ ، بەڵام خـوا ڕەحمی پێکـردین چێشتخانەیەك لەناو بیناکەدا بوو، هەرچی نانی زیادەو قەراغ و کەڕووە کردبوویانە ناو گوێنی و لەوسـەربانە دایاننـابوو، ئێمەش بە ناچاری دوای ئەوەی چەنـد جارێك داوای نامانمـان کـردو بۆیـان نەهێنـاین دەسـتمان کـرد بەخـواردنی ئەو نـانە ڕەق و قەراغ و کەڕووانە !.

تـا دەمەو ئێـوارە هەر وەجـبە بـوو سـنورداش دەکـرایەوەو دەهـاتە لامـان ، تـا ئەوەی سـەربان پڕ بـوو لەنەفەرو، لەسـەر حسـابی خۆمـان بەچەنـد کۆسـتەرێك بردینیـان بـۆ ئاسایشـی(دهۆك) کە ژمارەمـان نەوەد کەس دەبـوو، لە هـاوڕێیەکم دووسـەد دینـارم وەرگـرت بەقەرز، لەوێ بردینیـانە نـاو هـۆڵێکی گەورەوە،بـادینی و عەرەبەکانیـان لێ جیـا کردینەوەو بردنیان بۆ شوێنێکی تر، هەر لەناو زیندانەکەدا شەوەکەی دووکانێکی تێدا بوو، بەچەند قات شتی پێ دەفرۆشتین و دۆلاریشی وردەکردەوە بەپارەیەکی کەم!.

ئـێمەش لەبەر برسـێتی و، نەبـوونی دینـار، دۆلارمـان وردکـردەوە وە هەم شتیشـمان کڕی،هەر ئەو شەوە پارەی کرێ پاسی نێوان (دهۆك) بۆ(هەولێر)یشیان لێ سەندین و





بەیانی زوو بردینیانەوە بۆ شاری هەولێر هەر بەبەندکراوی ، لەڕێگە زۆرمان برسی بوو پاسەکانیان نەدەوەستاند، تا ئەوەی زۆرمان بۆ پاسەوانەکان هێنا کە هەر پاسەو دووانی تێدا بوو، لەپێش شارۆچکەی( شەقلاوە) لە چێشتخانەیەك لاماندا ، لەسەر حسابی خۆمان نانمان خواردو پاشان بەڕێکەوتینەوە بەرەو شاری(هەولێر) لەگەڵ گەشتنە ناو شارەکە لەترافیکێکدا برادەرێکمان دەرگای پاسەکەی کردەوەو ڕایکرد، لەترسی ئاسایشی هەولێر کەداوای کەفیلیان دەکرد، ئەویش کەفیلی نەبوو جاری پێشوتر دەردیان پێدابوو ، وە زۆر هێشتبویانەوە بۆیە ڕای کردا!.
پاش ئەوە چووینە ئاسایشی گشتی دووبارە جیاکراینەوەو خەلکی شاری (سلێمانی) و (هەولێر) برایەوە بۆ ئاسایشی هەولێر کە ئەوکاتە بەرامبەر قەڵا بوو، دووبارە داوای کەفیلیان لێ کردینەوە، منیش چومە لای بەرپرسەکەو وتم: کاکە من دوو هەفتە بۆ سێ هەفتە لەمەو پێش هاتومەتە ئێرەو ئەمە دووەم جارمەو پێشتر کەفیلم داوە، کەچی پێی وتم: باشە با کەفیلەکەت بێتەوە دووبارە کەفیلیت بکات، منیش وتم: کاکە جا ئەوەی بۆچیە من هەر لەڕێگە بووم ئەو چەند هەفتەیە، وتی: نا کاکە کێ دەڵێت: لەوماوە کەمەدا نەبویتەتە یەکێتی؟،کە ئەوکاتە نێوانیان باش نەبوو لەگەڵ پارتی دا و ئەو کەفیل داواکردنەش لەبەر ئەندامانی یەکێتی بوو، هەرچەندە ئاگربەست بوو لەنێوانیاندا، لەولاشەوە یەکێتی شەڕی پەکەکەی دەکرد، بۆیە وتی: باشترە دابنیشن چونکە پەکەکە هەیبەت سوڵتانی گرتوەو ڕێگای شاری(سلێمانی) گیراوە، بۆ ئەوەی هێندەی تر خەفەتمان بداتێ!،بەهەرحاڵ ماوەی هەفتەیەك هێشتینیانەوە، نەشیان دەهێشت تەلەفونێك بکەین، باش بوو برادەرێکمان کەسێکی ناسی و لەڕێی ئەوەوە کەفالەتی هەمووومانی کردو ، ئازاد کراین ، ماڵی ئاوابێت ئەو کەسەش شەو بردینیەوە ماڵی خۆیان و سوپاس بۆ خوا بۆ بەیانیەکەی بەرەو شاری(سلێمانی) بەڕێکەوتین!.






دووبـارە بـێ ئێـوە نـاخۆش لە کانی وەتمـان لامانـداو نـانێکی خۆشـمان خـواردو، دواتـر گەشـتینەوە شـاری سـلێمانی و ئەم جارەشـیان سـوپاس بـۆ خـوا بەخێـرو خۆشـی گەشتینەوە بەکەسوکاری سەربەرزم، بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر هەندەرانم لە مێشکم دا سڕیەوەو چوومەوە سەر ئیش و کاری شاگردی دوکانەکەی بازاڕی(قەیسەری نەقیب)!.

## سـەفەری سـێیەم: گیرانمـان لە پـێش شـاری(وان) و سـنورداش کرانەوەمان بۆ سنوری ئێران و گەشتنەوە کوردستان!.

ماوەی چەند مانگێك دوای سەفەری دووەم دووبارە کەڵکەڵەی ڕێی هەندەران هاتەوە مێشـکم و خـاوەن قەرزەکانیشـمان بەردەوام دەهـاتنە لامـان و داوای قەرزیـان لـێ دەکردین، بەو هـۆیەوە دووبـارە کاتمـان دیـاری کـردەوە لەگەڵ بـرای قاچـاخییەکەداو ئەم جارە ئەو هات لەگەڵمان، سەرلەبەیانی بوو لەماڵی خۆیانەوە بەچەند سەیارەیەکی جـۆری تویێتـا بەڕێکەوتـین بەرەو سـنوری وڵاتی(ئێـران) لەڕێـی نـاوچەی شـاربازێڕو(چۆمان)ەوە ، دەمەو نیـوەڕۆ گەشـتینە سـەر سـنور، لەوێشـەوە سـەیارەی سـایپا ئێرانیەکـان حـازر بـوون و هەر ئەو ڕۆژە نزیکـی ئێـوارە گەشـتینە شـاری (بـانە) سوپاس بۆ خوا بە بێ هیچ کێشەیەك!.

مـاوەی دوو شـەو و دوو ڕۆژ لە شـاری بـانە هێشـتینیانەوە لەبەر خراپـی ڕێـگە، لەوێ تێکەڵ کراین لەگەڵ چەند وەجبەیەکی تردا، دوای دووڕۆژەکە بۆ شەوی سێیەم، خاڵی پشکنینی نێوان (بانە) بۆ (سەقز) بەپارە کڕدراو ، ئەم جارەیان بە ڕێگەی پێ نەڕۆشتین بە پشـتی بـازگەکەدا، دوای دەرچوونمـان لە بـازگەکە کەوتیـنە نـاو کەمینـی نیـروی ئینتیزامییەوە، بەڵام بەهـۆی ئەوەی سایەقەکانی ئێران دەرمان و حەشیشیان دەکێشا، هـیچ حسـابێکیان بـۆ کەمینـەکە نەدەکـردو بەناویـا ڕۆشـتن و ، چەنـدێك هاواریـان کـرد بوەسـتن نەوەسـتاین و ئیتر بە مێـك زەمینـیەك دوامـان کەوتـن ، بەڵام سـایەقەکەمان هێنـدە خێرا دەڕۆشـت و ئەوەنـدە هەڵـبەزو دابەزی پێکـردین دەمـانوت ئێسـتا نـا ئێسـتا







یەکێکمان دەپەڕێت، سوپاس بۆ خوا ڕزگارمان بوو لەدەستیان و ئەو شەوە دووبارە چووینەوە ناو گوندەکەی نێوان شاری (سەقز) و(بۆکان) و ماڵی پیرەژنە ڕەزیلەکە، دووبارە ماوەی دوو ڕۆژ لەوماڵە هێشتینیانەوە، تەنها ماست و نان وچای پێداین،کاتێك داوای نانمان دەکرد دەیوت: قاچاخچی بەس پارەی مانەوەی داوەو پارەی خواردنی نەداوەو، دواتریش دەرکەوت درۆی کردووە!، وە دەیوت: ئیوە ئەو هەموو پارەیە دەدەن بە قاچاخچی بۆ پارە نادەن بە من؟، ئیتر سبحان الله لە ژیانمدا شتی وام نەبینی بوو !.

دوای دووڕۆژەکەی ئەوێش پاش نوێژی عەسر بوو، گەلابەیەکی گەورەیان هێناو سەریانخستین بەرەو شاری(سەڵماس) و شەو درەنگ گەشتینە ناو شارەکەو هەر لەوێشەوە بەگەلابەکە بردینیان بۆ گوندی(کۆزە ڕەش).

کاتێك گەشتینە ئەوێ سەیرمان کرد ئەو نەفەرەی پارەی خستبۆیە ناو پێلاوەکانیەوەو شاردبۆیەوە لەترسی دەستگیرکردن، ماڵی پیرەژنە ڕەزیلەکە هەموو پێلاوەکانیان هەڵکۆڵی بوو لەژێرەوەو ، نزیکەی نۆزدە وەرەقەیان بردبوو،ئیتر لەوێش دووبارە گەشتین بەوەجبەی تر، دەتوت هەموو کوردستان هاتووە بۆ هەندەران ، لەویادا هەر برادەری ڕێگەو سنورداشیەکانی ڕابردوو بوو دەتدۆزیەوە!.

شەوەکەی سەیارە سایپاکان هاتنەوە بەدوامانداو بەڕێکەوتین بەرەو گوندی (مەرهەم) کە گوندی سنوری نێوان(ئێران) و (تورکیا)یە، شەوەکەی بردینیانە ماڵێکەوە و وتیان: تابەیانی لێرە بن ، بەیانی دەتانبەینە دەرەوە بۆ ناو چەم و دۆڵێك نەوەکو جاشەکانی ناو گوند هەواڵمان لێ بدەن و دواتر کەمینی سوپاو پاسدار بدات بەسەرماندا ، خاوەن ماڵەکە ڕۆشت و ڕێگەی پیشاندانی کە بەیانی زوو چۆن بڕۆین بۆ ناو چەم و دۆڵەکە!.

بەیانیەکەی زۆر سارد بوو ئەو برادەرەی کە خاوەنی ماڵەکە ڕێگەی پیشاندابوو ، وتی: کاکە بەخوا ڕەق دەبەینەوە ، بخەون إن شاء الله هیچ نابێت، وەڵا ئێمەش لە خۆشیا خەومان لێکەوت، دەمەو نیوەڕۆ بوو خاوەن ماڵ هاتە سەرمان ، کاتێك بینی کەس





نەڕۆشتۆتە دەرەوە چاوی چووە پشتی سەری و دەستیکرد بە قسەکردن،ئێمەش وتمان: سەرمامان بووەو نەمانتوانیوە بڕۆین ، ئیتر هێورمان کردەوەو، وتی: قەینا دابنیشن بەس هیچ دەنگتان نەیەت و دەرگاش لەکەس مەکەنەوە!.

کات گەشتە ئێوارەو دووبارە سایپاکان هاتنەوە بەدوامانداو کەوتینە ڕێ بەرەو سنور، پاش یەك دوو کاتژمێر لە شوێنێکدا دایانبەزاندین و ، ئیتر ڕێبەری کرمانج کەوتە پێشمان ئێمەش نزیك دەبووینەوە لەسەد نەفەر زیاترو، وەجبەی ئەفغانی و پاکستانیشیان تێکەڵ کردین، بەخوا نزیکەی دوو کاتژمێرێك ڕێگەمان کرد کاتێکمان زانی لایتمان لێدرا لەسەر سنور، ویستمان ڕابکەین ڕێبەرەکە وتی: ڕامەکەن هیچ نیە ئەوە گەریلای پەکەکەیە، هاتن و هەمووومانیان وەستان و تەنها دوو کەس بوون!.

سەرەتا دەستیان کرد بەجوێندان بە یەکێتی و پارتی و، دەیانوت کێتان پێشمەرگەی یەکێتی و پارتی یە! ، دواتر وتی: کێتان پێش مەرگەی پەکەکە بووەو ڕای کردووە،کەس جوابی نەدەدانەوەو ئێمەش نەمانزانی کە هاتوون گومرگمان بکەن!، دوای بێنەو بەردەیەکی زۆر وتیان: دەبێت نەفەری پێنج ملیۆن لیرە بدات بۆ شۆڕش ئەگینا کەس ناتوانێت بڕوات، هەر قاچاخچی بوو نەفەرەکانی کۆ دەکردەوەو پارەی لێ کۆدەکردنەوە.

لەویادا ئامۆزایەکی قاچاخچیەکە وتی وەڵا من پارە نادەم ، منیش وتم: سوێند بەخوا منیش یەك فلسیان نادەمێ ، لەویادا ئەو ئایەتەم بیر کەوتەوە کە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ خوێندی بەسەر قورەیشداو پاشان ڕۆشت بەناویانداو خوای گەورە چاوی کوێر کردن و نەیانبینی کە لەسورەتی یاسین دا دەفەرمووێت: (**وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ**)، پاش ئەوەی کە ئایەتەکەم خوێند و بەرەو ناو ئەوکەسانە هەنگاومنا کەوا پارەیان داوەو چوونەتە ئەودیو دوو چەکدارەکەوە، باوەڕتان بێت نەیانبینیم و برادەرێك کە ناوی نەوزاد بوو دوامکەوت،




خێرا پشتەملیان گرت و وتیان: وەرە کوا پارەکەت؟، ئیتر چاوی چووە پشتی سەری کە من ڕۆشتم بەناویانداو قسەیان نەکردو ئەویش گیراو پارەکەیان لێ سەند،دواتر وتی: ئەوە چۆن بوو تۆیان نەبینی؟، وتم: سوپاس بۆ ئەوخوایەی کە فێری کردین لە دینەکەی و ژیانی پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾، وتم: وەڵا ئەو ئایەتەم خوێند،

کەچی نوێژی نەدەکرد دەیوت: وەڵا زۆر موهیم ڕزگارت بوو،دە ماڵت ئاوا بێت فێرمان بکە با منیش لەمەودوا خۆمی پێ ڕزگار بکەم،دوای ئەوەی لەو شوێنە ڕزگارمان بوو، نزیکەی کاتژمێرێك ڕۆشتین دووبارە لایتمان لێدراو، ئەمجارەیان نزیکەی دە گەریلای پەك دەبوون و ، هاتن وەسڵێکیان لێ سەندین بۆ ئەوەی دڵنیابن پارەمان داوە یان نا؟، ئەو شەوە تابەیانی ڕێگەمان کرد و بردینیانە ناو گەورێکی گەورەی مەڕوماڵاتەوە،کە پڕ بوو لە مەڕو بزن، هەتا ئێوارە لەتاو کێچ و بۆنی گەوڕەکە خەریك بوو مێشکمان دەتەقی.

دەمەو ئێوارە دووبارە کەوتینەوە ڕێگە کردن ، بەم شێوەیە ماوەی چەند شەوو ڕۆژێك ڕێگەیان پێکردین و لەهەندێ لادێ دەیانبردینە ناو ماڵەوەو،لەهەندێ شوێنیش لەناو دۆڵ و شاخێکدا جێیان دەهێشتین تا کاتی ئێوارەو شەوەکەی، تەنها یەك جار بۆ دووجار شاحینەیان هێنا سەریانخستین، ئەویش ماوەی نیو کاتژمێر بووا!.

خێرا دایان بەزاندینەوە ،جاری دووەم وتیان: دەبێت بەپشتی ئەو قەرەقولەدا بڕۆن چونکە لەبەردەمیدا خاڵی پشکنین هەیەو ناتوانین بەو هەموو نەفەرەوە دەرچین،بەس ئەمە ببڕن ئیتر بەشاحینە دەتانبەینە ناو شاری(وان)ەوە، ئێمەش بەهۆی سەرماو سۆڵەو ڕێگە کردنەوە زۆر ماندوو ببوین بەشێوەیەك دەم و چاومان هەمووی سەرما بردبووی،وە تێر بەسکی خۆشمان نانمان نەخواردبوو، ئەو هەموو نەفەرە بەپشتی سەربازگەکەدا ڕۆشتین ، باوەڕتان بێت بلاجگتۆرەکەی نەفەر بەنەفەر دەیبینین!.






هەر ئەوەنـدەمان خـۆش بـوو گەشـتینە پشـتی سـەربازگەکەو بەرەو دۆڵێـك شـۆڕ بووینەوە کاتێکمان زانی دەورمان گیرا لەلایەن جەندرمەی تورکیەوەو تەڵقە تەنورەیان هەڵـدا باوەڕتـان بێـت ئەو تـاریکە شـەوەی وەك ڕۆژی ڕونـاك لێ کرد،بـوو بەتەقەکـردن بەسەرماندا و هەمووان خۆماندا بەزەویدا،بێ لەڕێبەرە تورکەکە هیچ کەس نەیتوانی ڕابکات، پاشـان هەمومانیـان ڕیز کـرد چـوار چـوار پێکەوە لەدوای یەك ، بـاش بـوو من چومە ناوەڕاست، ئەوەی لەسەر پەڕەوە بوایە لەم سەر بۆ ئەو سەر شەقی دەخوارد!.

پـاش نیـو کـاتژمێر شـاحینەیان هێنـاو هەمووانیـان سەرخسـت و، بردینیـانە قەرەقـولەکەی نزیکیـان و لەوێ ناویـان نووسـین و پەنجەمۆریـان پێکـردین، لێـرەدا نـوکتەیەکم بیر کەوتەوە کەوا هەمومـان ناوەکانمـان هەڵە بـوو، هەرچی گۆرانی بێژو هونەرمەنـدی کـورد هەیە تـاوەکو نـاوی قـاپ و قاچـاخ و مەنـجەڵ یـان لەخۆیـان دەنـا نەفەرەکان، بـرادەرێکم لەپـێش مـن بـوو، ئەفسـەرەکە وتی: نـاوت چی یە؟ وتـی کەریـم کابـان، وتـی: دایکـت نـاوی چـیە: وتی:ئایشێ، خـوا ئاگادارە پێکەنینـێکم بـۆ هـات خـوا ڕەحمی پێکـردم زۆر لەسـەرم نەوەسـتا ئەگینـا لێـدانێکی باشـیان لێـدەدام، خێرا هـاتە سەرەی من و وتی: تۆ ناوت چی یە: وتم زەکەریا عبداللە، ئیتر برادەرەکەی دوامەوە دای لە قاقای پێ کەنین، فەقیرە زلەیەکی خوارد!.

سـەر لەبەیانی شـاحینەکانیان هێنایەوە دەسـتیکرد بەڕێگەکـردن هەتا لای ئێـوارە بەبێ نـان و ئـاو، زۆر مـامەڵەیەکی ناشـرینیان دەکـرد لەگەڵمانـدا، دواتـر بردینیـان بـۆ سـەربازگەیەکی گەورە لەسـەر سـنورو، هەمووانیـان بـردە ژوورەوە لەبەر سـەرما، هەر ئەو شەوە نزیکی بەرەبەیان چەند جەندرمەیەك هات لەگەڵماندا و شەوەکەی داوایان لێکـردین کە بێدەنگ بین تـا نزیکمـان دەکەنەوە لە سـنوری خـاکی وڵاتـی (ئێران) و لەویـا ئازادمـان دەکەن ، چـونکە ئەگەر ئێـران پێیـان بزانینـایە وەریـاننەدەگرتینەوە لەبەر ئەوەی ئێمە ، عێراقی بووین و دەیوت: با لەسنوری (ئیبراهیم خەلیل)ەوە سنورداشتان







بکاتەوە، لەو نێوانەدا تۆپ تۆپێنمان پێدەکراو ڕەقمان دەبردەوەو کەسیشیان وەریان نەدەگرتین،لەڕێگە بە برادەرەکانم وت: کەوا سەعات و مستیلەو ئەڵقەکانی دەستیان دابکەنن، چونکە جەندرمەکان لێیان دەسەندین و دەیانبرد بۆ خۆیان، لەبەر ئەوەی سەربازی کردن لە وڵاتی(تورکیا) زۆرسەخت بوو هیچ پارەیەکی ئەوتۆیان بۆ دابین نەدەکرا تا بژێوی خۆیانی پێ دابین بکەن، ئەوانیش بە دزی و فزی و ڕێککەوتن لەگەڵ قاچاخچی و ماددەی هۆشبەردا ئیشیان دەکردا!.

دەمەو بەیان گەشتینە سنوری ئێران و هەر قاچاخچی بوو خێرا هەوڵی ڕزگاری خۆی و نەفەرەکانی دەدا ، چونکە گەر پاسگای وڵاتی(ئێران)یش بیگرتینایە حوکمی دەدایـن، خێرا قاچاخچیەکەمان خۆی شاردەوە لەگەڵ چەند قاچاخچیەکی تردا، ئێمەش وەجبەکە بەپێ نزیکەی نیو کاتژمێرمان بڕی و چووینە ناو یەکەم دێی ئێرانەوە، زۆرمان برسی بوو لەدەرگای چەند ماڵێکماندا ، کەخواردنمان بدەنێ بەپارەش دەمانکڕی!.

لە دەرگای ماڵێکماندا ژن و پیاوێکی بەتەمەنی تێدا دەژیان، یارەبی خوا پاداشتیان بداتەوە دەرگایان بۆ خستینە سەرپشت و خێرا سفرەیان بۆ ڕاخستین و نان و ماست و چایەکی تازەی خۆشیان پێداین و، جێگەی نوستنیشیان بۆ دەرهێناین وتیان دەتوانن بخەون، زۆر بەزەییان پێماندا دەهاتەوە ئێمەش چەند برادەرێك یەکەم جار ویستمان بخەوین، بەڵام دواتر وتمان کاکە بەیانیمان لێ بێتەوە دەگیرێین، باشتر وایە هەستین بڕۆین و دوور بکەوینەوە لەم ئاوایی یە!.

پاش ڕۆشتنمان و دوورکەوتنەوەمان لە ئاوایی یەکە دوو نەفەر دوو نەفەر جیا بووینەوە لەیەك و هاتینە سەرجادەو دەستمان ڕاگرت لەساپیایەك ڕاوەستا بۆمان ، تا ناو شاری (سەڵماس)یان بردینەوە، لەوێشەوە چووینە ترمینالی(ڕەزایە)و بەپاسی نەفەرات لەگەڵ هاوڕێکەم دا چووین بۆ شاری(ڕەزایە) لەوێ چەند هاوڕێیەك،



یەکمانگرتەوە لە ترمینالّی گەورەی(ڕەزایە) بلیتمان بڕی بۆ شاری(سنە)و بە ئوتوبوسێکی گەورە بەڕێکەوتین بۆ شاری(سنە)،
بەڵام قەدەری خوا لە سێ ڕاکەی (مهاباد) ئەفسەرێك هاتە سەرەوە داوای شناسنامەی لێکردین و نزیکەی شەش نەفەرمانی دابەزاندو گیراین و پاسەکەی ئیزن دا، پاش تکاکردنێکی زۆر سەرگروبانەکە زانی کەوا خەڵکی هەژارین و بۆ وڵاتی خۆشمان دەگەڕێینەوە ئیزنی داین، بەڵام وتی: بەومەرجەی بڕۆنەوە بۆ عێراق لەڕێی شاری (مهاباد)ەوە ، لەوکاتەدا پاسێکی بچوك هات بەرەو شاری(مهاباد) دەڕۆشت، وتی بڕۆن لەگەڵ ئەم پاسەداو ئەویش بردینی بۆ شاری(مهاباد) لەوێشەوە پەیکانێکی دەربەستمان گرت بۆ شاری(سەردەشت) ئیتر پارەمان پێ نەما!.
پاش تکاکردنێکی زۆر لە سایەقەکانی سنوری(هەڵشۆ) بردینیانەوە، بۆ ئەوێ و لەوێش سایەقێکی تەرەفی کوردستانمان گرت و پارەی سایەقە ئێرانیەکەمان لێ وەرگرت و لەسەر سیقە لە شاری(قەڵادزێ) وە هێنانینیانەوە بۆ شاری (سلێمانی) ، لەم سەفەرەدا نزیکەی دە ڕۆژێکم پێچوو، بەڵام زۆر ناڕەحەتیم بینی!.

## سەفەری چوارەم: گیرانمان لە شارۆچکەی (باشقەڵە) ی (تورکیا)و سنورداش کرانەوەمان بۆ سنوری (ئێران) و گەشتنەوەی مەرزی (باشماخ)!.

وەك هەموو جارەکانی پێشووتر لەسنوری ناوچەی شارباژێڕەوە چووینەوە ناو خاکی (ئێران)و ، هەر ئەو ڕۆژە ئێوارەکەی گەشتینە شاری(بانە)ی کوردستانی ئێران، ئەوشەوە بازگەی نێوان (بانە)و (سەقز) کڕدراو ، بە سایپا شینەکانی ئێران، کەوتینە ڕێ بەرەو شاری(ڕەزایە) لەدرەنگانێکی شەودا لەباخێکی سێودا لە پێش شارەکە دایان بەزاندین و، چاوەڕوانی تەرەفە تورکەکەمان دەکرد، پاش کاتژمێرێك سایپای تورکەکانیش هاتن و، لەسەر ئەو جادە گشتییەدا سەریانخستین و ئێمە دووەم سایپا




سەرکەوتین ، قەدەری خوا لەوکاتەدا مێکزەمینیەکی نیرو ئینتیزامی گەشتە سەرمان و پێشی لێ گرتین، بەلام سایەقەکانی ئێران هێندە چاو نەترسن هیچ حسابێك ناکەن بۆ نیروی ئینتیزامی، یەکەم جار وەستاو خێرا پازدارەکان دابەزین ویستیان بمانگرن ، لەگەڵ ئەوان دابەزین، سایەقەکەمان پیاوانە پێی نا بە بەنزین داو دای بەلایاندا، بەشێوەیەك دەڕۆشت دەمانوت ئێستا نا ئیستا وەك تۆپ فڕێمان دەدات!.

سوپاس بۆ خوا ڕزگارمان بوو، بەپەلە هەر ئەوە شەوە بردینیە ناو شارەکەوە، تا شاری(سەڵماس) نەوەستا و لەوێشەوە بردینیە دەرەوەی شارەکە، خێرا سایپای تر هاتن و سواری ئەوانیان کردین و ، هەتا گوندی (مەرهەم) نەیانوەستاندین، کاتەکەی دەمەو بەیان بوو، بردینیانە ماڵێکەوەو لەو ئاواییە تاوەکو دوو ڕۆژ هێشتینیانەوە!.

بۆ ئەوەی ڕێگەیەکی زۆر نەبڕین ، تەرەفە ئێرانیەکان لەگەڵ پاسگایەکدا بەپارە ڕێك کەوتن و هەتا کۆتا سنوری وڵاتی(ئێران) بەسایپاکان بردینیانەوە،لەوێشەوە تەسلیمی تەرەفی قاچاخچیە تورکەکان کراین و ژمارەمان لە سەدو بیست نەفەر زیاتر بوو، وەك جاری جاران تێکەڵی کۆمەڵێك وەجبە کراینەوە، ئەوی نەیتوانیبایە ڕێگە ببڕێت ئەسپی بەکرێ دەگرت و، ئەویشی توانای هەبوایە بەپێ دەڕۆشت، سوپاس بۆ خوا لەم هەموو ڕێگەیەدا، من ئەسپم نەگرت و تەنها بەپێ دەڕۆشتم!.

لەبەر نەبوونی و ناڕەحەتی و بێ پارەیی ئەم جارە (٤٠) ملیۆن لیرەی تورکیم گۆڕیەوەو، کردم بە چوار گولاج و بەتیپ پێچامەوە ، بۆ حاڵەتی ئامادە باشی کەوا هەرکات کەوتینە کەمینەوە خێرا قوتی بدەم،بۆ ئەوەی پارەکەم نەفەوتێت و لێمان نەستێنن، وە ئەگەر گیراین لەکاتی سنورداش کردنەوەماندا، تا پارەیەکمان پێ بێت بۆ خەرجی ڕێ!.

پاش ڕێگەکردنێکی زۆر ئەوشەوە گەشتینە ناو گوندو ئاواییەکانی کوردستانی(تورکیا) بەڵام ئەم جارەیان نەمانتوانی بەهۆی کەمینی جەندرمەوە بچینە هیچ ماڵێکەوە،




لەدۆڵێکدا دایاننـاین، منـیش لەترسی ئەوەی نەوەك جەنـدرمە بـدات بەسـەرماندا و لەکاتی خەودا بین ، پارەکانم قوت دا!.

پاش ڕێگەکردنێکی زۆری چەند ڕۆژوو شـەوی و دەستی بە دەستی پێکردنی قاچاخچیە تورکەکـان و بەڵێنێکـی زۆری درۆ، کەوا شـاحینەمان بـۆ دێـنن ، دوو شـاحینەیان بـۆ هێنایـن ئەو هەموو نەفەرەیان سەرخست ، لەڕێگە ئەوی ئێمە خەریك بوو وەرگەڕێت و چەقی لە ناوەڕاسـتی شـاخێکی سـەختدا، ئیتـر دووبـارە دایـان بەزانـدینەوەو بەپـێ کەوتینەوە ڕێگە کردن، بەڕاستی زۆر ماندوو ببوین!.

ئەمجارە یەك شـەو بردینیانە ماڵەوە بۆ ئیسراحەت کردن ، زۆری ڕێگەکەشمان بەپێ بڕی بەو شـاخ و داخ و چیا سـەختانەی کوردسـتانی (تورکیا)دا ، تەواو نـاڕەحەت ببوین و خۆری ڕۆژوو سەرمای شـەو تەواو دەم و چاوی سـوتاندبوین!.

پـاش چەنـد ڕۆژێـك لە دۆڵێکـدا دایاننـاین و وتیـان: ئەم شـەو شـاحینە دێـت سـەرتان دەخات و ، دەگەینە شاری(وان) لەویادا دوور لەڕووی بەڕێزتان ، من پارەکەم دانایەوە ئەو ئێوارەیە و جوان شۆردم و دووبارە بەتیپ پێچامەوە بۆ حاڵەتی ئامادە باشی، بەڵام لیرەی تورکی زۆر گەورە بـو ئەوەی منیش دە ملیـۆنی بـوو زۆر نـاڕەحەت بۆم قـوت دەدرا، بەڵام چارێشمان نەبـو لەبەر ئەوەی ئەگەر جەندرمە یان پاسدار بیان گرتیتایە چیت پـێ بـوایە لێ یـان دەسـەندیت و دواتـر لەبەر بـێ پـارەی توشـی کارەسـاتی زۆر گەورە دەبوویت!.

دەمەو ئێـوارە پاش خـواردنی لەفەی هێلکەو تەماتەکە ، دووبـارە بەپێ کەوتینـەوە ڕێ و وتیـان: دەبێـت بچیـنە سـەرجادەی قیر ئەوکاتە شـاحینەکان چاوەڕوانمـان دەکات و، سـەرمان دەخەن و دەمانبەن بەرەو شـاری(وان)، بەڵام بەڕاسـتی درۆیـان لەگەڵ کـردین و ماوەی چەند کاتژمێرێك ڕێمانکرد گەشتینە ناو ئاوەدانییەك،قاچاخچیە کرمانجەکە ڕۆشت و وتی: ئێستا دەڕۆمە ناو ئەو ئاواییەو تەلەفون دەکەم بۆ تەرەفەکان و دێمەوە






بەدواتاندا، لەسەر بەرزاییەك ئێمەیان داناو، جوان جادە قیرەکەمان لێوە دیار بوو، پاش یەك کاتژمێر تەرەفەکە هاتەوەو، وتی: خێرا با بڕۆین شاحینەکان چاوەڕوانن، خێرا ئێمەش لەخۆشیداو بەهەڵەداوان بەرەو لای جادەکە بەڕێکەوتین بەڵام بەناو ئاوایی یەکەدا!، ئێمەش زۆرمان بەلاوە سەیر بوو، کەبەو شێوەیە بردینی ، نەماندەزانی فرۆشتوینی بە قەرەقولی ئەو ناوچەیە بەنرخی گەریلای پەکەکە ئەو خیانەت کارە، پاش نیو کاتژمێر ڕێکردن گەشتینە نزیکی جادەکەو کاتێکمان زانی تەڵقە تەنورەیەکیان هەڵدا ، ئەو ناوەی کرد بەڕۆژی ڕوناك و بوو بەتەقەکردن بەسەرماندا ، باوەڕتان بێت کەس کەسی خۆی نەدەناسیەوەو، نەشماندەزانی بەرەو کوێوە هەڵبێین وا دەورمان گیرا بوو، وە من تەنها ئەوەم پێکرا جارێکی تر پارەکان قوت بدەمەوە،

بەهۆی زۆری ڕێگە کردنیشمان تەنها یەك تاك پێڵاوم لە پێدا مابوو یەکێکیان تەواو بنەکەی لێبۆیەوەو بەپەڕۆ بەستبوومەوە بەیەکەوە، لەوکاتەشدا ڕامکردو ئەوی تریشیان بنەکەی لێبۆیەوەو،ئیتر بەتەواوەتی پێم پەتی بوو،بەوشێوەیە هەموومان لەناو چاڵێکدا کۆبووینەوە و دەورمان گیرا، لەوکاتەدا هەندێك نەفەری کەم هەڵهاتن و ڕایانکرد، جەندرمەی تورك کەوتنە لێدانمان بە شەق و قۆناغە تفەنگ ،باش بوو لەوکاتەدا جەندرمەیەك هاتە لامان و کەوتە قسە لەگەڵمان دیاربووعەرەب بوو نەم دەزانی خەڵکی کوێیە، بەعەرەبی سەلامی لێکردین و وتی:

برایانی بەڕێزم من مسوڵمانم و ئیمامی مزگەوتێکم و بەناچاری هێنراوم بۆ ئێرە تا سەربازی تەواو بکەم ، دەزانن ئێوە فرۆشراون و قاچاخچیە کرمانجەکەتان پاش ئەوەی ئێوەی بەجێهێشت ، هاتە قەرەقول و ئێوەی بەنرخی پەکەکە فرۆشتوەو وتی: خوا ڕەحمی پێکردون کە منیان لەگەڵدا هاتوم و خوای گەورە کردمیە هۆکار بۆتان ئەگینا ئەمری تەقەی کوشتنیان پێ بوو بۆتان، بەڵام پێش ئەوەی دەست پێبکەین گوێم لەکەسێك بوو بەعەرەبی قسەی کرد، خێرا شانیم گرت و، وتم: ئیوە چین؟،







ئەویش وتی نەفەری قاچاخین و دەڕۆین بۆ شاری(وان)، منیش خێرا جیهازم کردو ، وتم تەقە لەکەس مەکەن ئەمانە هاوڵاتی مەدەنین!.
زیاتر لەسەد جەندرمە بەشداری ئەم پڕۆسەیەی کردووە،بەڵێ بەداخەوە لەهەموو شوێنێك جاشایەتی هەیە، بەچاوی خۆم چەندین مدەرەعەو چەکی قورسم بینی و پاش ئەوە گواستینیانەوە بەشاحینە بۆ ناو قەرەقولەکە،لەوێش ڕیزیان کردین و ، بەرپرسێك هات بەناوماندا گەڕا، کەسەیری قاچی منی کرد هیچم لەپێدا نی یە ، بەزەیی پێم دا هاتەوەو ، جوتێك نەعلیان بۆهێنام ، پاش ئەوەی ناومان نوسرا، بردینیانە حەوشەی قەرەقولەکە کە دەکەوتە شارۆچکەی(باشقەڵەوە) تادەمەو ئێوارە لەویا دایاننایین و پاشان دوو شاحینەی گەورەیان هێنا و،بەرەو سنوری (ئێرانیان) بەڕێ خستینەوە،هەرچەندە داوامان کرد نەمانبەنەوە بەرەو ئێران بەڵام سودی نەبوو، چونکە ئەفغانی و پاکستانیشی تێدابوو، شەو درەنگ گەشتینە سنوری (ئێران) و بردینیانە قەرەقولێکی گەورەی سەر سنورو، هەتا بەیانی لەحەوشەدا دایاننایین، تەنها عایلەکانیان بردە ژوورەوە، بەڕاستی زۆر حاڵێکی خراپمان هەبوو، چونکە زۆر سارد بوو، پاش تکایەکی زۆر ئاگرمان کردەوە کەمێك ڕەوشمان باشتر بوو، سەر لەبەیانی چەند جەندرمەیەك هاتن بەبێ ئەوەی نانێك یان ئاوێکمان بدەنێ ، بەزۆر داوایان لێکردین ئیش بکەین و هەرچی خۆڵ و خاشاکی ئەوناوە هەیە پێیان کۆکردینەوە!
لەبەر سەرماو زوقمدا دەستمان گوێ نەدەکرد، برادەرێك وتی: کاکە ئەرێ ئەوە کەسێك نی یە خۆی ببورێنێتەوە بەڵکو بەهۆی ئەوەوە بمانبەنە ژوورەوە کەمێك خۆمان گەرم بکەینەوە!،منیش وتم: بۆ نیە؟، حەزدەکەیت ئێستا خۆم دەدەم بەزەویداو هەر بەڕاستیش حاڵم باش نەبوو،لەگەڵ خۆم دا بەزەویدا کردیان بەهاوار نەفەرەکانی دەورم، خێرا جەندرمەیەك هاتە سەرم هەندێ زلەی لێدام بۆیە هۆشم بێتەوە، منیش نوزەم لەخۆم بڕی بوو، چونکە سەرماشم بوو هەموو لاشەم سڕ ببوو،







باش بوو خێرا بەدوونەفەر بردمیانە ژورەوەو،بۆ لای زۆپایەکی گەرم وە بێ ئێوە ناخۆش چایان بۆ هێنام لەگەڵ پارچەیەك سەمون دا، لەگەڵ دوو برادەرەکەدا بەشم کرد و، کەمێك هاتینەوە سەر خۆ، تا کاتژمێرێك دانیشتین و دواتر ، وتیان بەڕێتان دەکەین بەو ڕۆژە بەرەو سنوری ئێران!.

لەبەرامبەرماندا پاسگای ئێران دیاربوو، هەرچەندە وتمان: شەو بمانبەن ئێستا ڕۆشنەو دەمانگرن و حوکمان دەدەن گوێیان بۆ نەگرتین، بەزۆر بەڕێیان خستین، منیش لەویا دوو هاوڕێم لەگەڵ بوون نوێژیان دەکرد، وە فەقیرانە قوتابی زانکۆ بوون، تەنها جادەی قیریان بینی بوو، ئاگادارم کردنەوە کەوا لەگەڵ جەندرمەکان جێیان هێشتین دەبێت ڕابکەین بەپەلە تا خۆمان بگەیەنینە ناو خاکی ئێران ئەگینا لەو نێوانەدا یان پاسدار دەمانگرێت یان تۆپ تۆپێنمان پێدەکرێت، دەتوت بۆ پیاسە هاتوون پارەشیان پێ نەبوو فەقیرانە،لەگەڵ گەشتینە سەر سنور ، جەندرمەکان بۆ ئەوەی پاسگای ئیران ئاگادار بکەنەوە، دەستیان کرد بەتەقاندنی چەند فیشەکێك بەسەرماندا تا ڕابکەین ،لەویا هەموو نەفەرەکان هاتینە سەر سنور زۆرینەیان وەستان و دانیشتن نەیاندەوێرا بڕۆن ، خێرا منیش لەگەڵ دووکەسەکەدا خۆمان لەوەجبە زۆرەکە دابڕی و وتم: ڕاکەن لەگەڵم، نزیکەی یەك کاتژمێر بێ وەستان ڕامان کرد تا بەتەواوی چووینە ناو سنوری خاکی ئێران هەتا بەتەواوەتی لەسنورەکە دوور کەوتینەوە!.

هەر ئەوەندەمان زانی لەدوورەوە لەپاسگاکەوە سەیارە بەڕێ دەکەوت بۆ ئەوەی سەر سنور لە نەفەرەکان بگرن و دەستگیریان بکەن، جا ئەو ناوەش هەرکەس بگیرێت حوکمی دەدەن بەچەندین مانگ و ئیش بەنەفەر دەکەن تا تەواو دەڕزێت لەوشوێنەدا!.







سوپاس بۆ خوا ڕزگارمان بوو کەوتینە ڕێکردن و منیش بەجوتێك نەعلەوە، ئەو برادەرانەشم بە کالەوە، پێم نەدەگەشتنەوەو دەیانوت: بەس بزانین تۆ هەورامی نیت؟، منیش وتم: ناوەڵا براکانم بەس هاوڕێیەتی هەورامیم زۆر کردووە بەپێکەنینەوە،گەشتینە شوانێك بەفارسی لەگەڵی دووام و وتم: چی شارێك لێرەوە نزیکە؟، وتی: شاری (سەڵماس) ماڵی ئاوابێت کەمێك نانی یا پێمان و ڕێگەی پیشان داین کەوا دەبێت ئەم شاخە بەرزە ببڕین، لەپاش ئەوە لادێیەك دێتە پێشمان، بازگەی تێدایە دەبێت بەتەنیشتی ئاواییەکەدا بڕۆین بۆ ئەوەی لە بازگەکە ڕزگارمان بێت!.

پاش ئەوەی بەچەند کاتژمێرێك ئەو ڕێگەیەمان بڕی پاشان شاخێکی تری بەرز هاتەوە بەردەممان و ، دووبارە گەشتمەوە شوانێکی ترو ، ئەویش ڕێنمایی کردین کەوا پشت ئەو شاخەش ئاواییەکی تر دێتە ڕێمان و ئەویش بازگەیەکی لێیەو تەنیشتەکەی چەمێك ئاو بوو کەوا بەناو دۆڵێکی دوورو درێژدا دەڕۆشت،وردە وردە گەشتینە نزیك ئاواییەکەو سوپاس بۆ خوا توانیم پارەکان دابنێمەوەو، پاك شۆردمان لە ئاوێك و، بەڕێ کەوتین لەنزیکی ئاوایی یەکەوە، گەشتین بەشوانێك و کۆمەڵێك گەنج کە لەو ناوەدا یاریان دەکرد، ماڵیان ئاوا بێت یارمەتیان داین و ئەوانیش ڕێگەیان پیشان داین و وتیان: ناو ئاواییەکە جاشی تێدایەو بەس بتانبینن دەتاندات بەدەستەوە، بۆیە لە ئاواییەکەوە مەڕۆن،ئیتر بەناچاری بەناو چەم و دۆڵەکەدا بەڕێکەوتین هەتا گەشتینە پشتی جادەکەو دنیا بەرەو تاریك بوون دەڕۆشت ، بە هاوڕێکانم وت: لەم ناوە بخەوین تا بەیانی یان بڕۆینە سەر جادەو دەست لەسەیارە ڕابگرین؟

وتیان: بەخوا تەواو شەکەت بووین و پێمان نەماوە، بەم کاتە درەنگەش تا ڕۆژمان لێ دەبێتەوە ڕەق دەبەینەوە،بۆیە هاتینە سەرجادەی قیرو خوای گەورە پەیکانێکی بە بەتاڵی بۆ ناردین و دەستمان لێ ڕاگرت و وەستاو سەرکەوتین، بە دوو هاوڕێکەم وت: هیچ قسەم لەگەڵدا مەکەن با نەزانێت زمانمان جیاوازە، سەرکەوتین و بەرەو شاری







(سەڵماس) دەڕۆشت، هەندێك دەمەتەقێم كرد لەگەڵ سایە قەكەدا بەفارسی، تا نزیك شارو گەشتینە بازگەی بەردەم شارەكەو، دەستم كرد بەدوعا خوێندن، سوپاس بۆ خوا یەك پاسەوانی لێبوو لە نوقتەكە نەهاتە پێشەوەو، دەستێكی بەرزكردەوەو وتی: بڕۆن!.

ئیتر كەمێك ئاسودە بووین و هیوایەك هاتەوە بەبەرماندا، بەڵام چونكە پارەكەم لیرە بوو، نەم دەزانی چۆن بەكابرا نەڵێم، وتی: بۆ كوێ دەڕۆن؟، وتم بۆ (ترمیناڵ)ی شاری(ڕەزایە)، پێش ئەوەی بگەین ، دەستم كرد بە باسی خۆمان و،بەكورتی تێم گەیاند كە ئێمە كوردی عێراقین و ، حاڵ و مەسەلەیەكی وامان بەسەر هاتووە، ئێستاش كات درەنگەو نازانین لە كوێ پارە بگۆڕینەوەو تەنها ش لیرەمان پێیە!، سوپاس بۆ خوا زۆر پیاوانە هات بەدەممانەوەو، خێرا دەستی كرد بەگیرفانیدا تەلەفونی بۆ برادەرێكی كرد كە ئیشی پارە گۆڕینەوەی دەكرد ، لەماوەی یەك چارەكدا هاتە لامان و لیرە توركیەكەی بۆ گۆڕینەوە!.

ئێمەش زۆر سوپاسمان كرد ڕاستیەكەی سەرەتا سیقەمان نەبوو كاری وامان لەگەڵ بكات، بەڵام زۆر باش بوو لەگەڵمان و ، زۆریشی لێكردین بچینەوەماڵیان ئەوشەوە بەڵام ئێمە وتمان: دەبێت بڕۆین چونكە ماوەیەكی زۆرە كەسوكار هیچ هەواڵێكمان نازانن، بەزۆر كرێكەی خۆیی لێ وەرگرتین و، تەنها یەك پاس مابوو بۆ شاری(ڕەزایە)و دوو نەفەریشی مابوو، ئێمەش هەرچۆن بێت سایەقەكەمان ڕازی كرد یەكێكمان بەپێوە بوەستێت!.

شەو گەشتینە (ترمیناڵ)ی گەورەی شاری(ڕەزایە)و قەدەری خوا پاس نەما بوو بۆ شاری (سنە) ،لەوێ لەفە فرۆشی زۆر لێبوو ، سەرەتا چووین نانێكمان خواردو ، كەمێك برسیەتیمان شكا بەڵام لەترسی كەمی پارەكەش نەماندەوێرا زیادە مەسروفی بكەین، چونكە ئەو برادەرانە هیچیان پێنەبوو،بەهەرحاڵ هەرچۆنێك بێت





پەیکانێکمان پەیا کرد بۆ شاری(میاندو ئاب) و، زۆریش لە بازگە گومرگیەکەی سێ ڕاکەی(مهاباد) دەترسامەوە کە دووبارە بگیرێینەوە بەو بێ پارەییەش! ،
پاش مامەڵە سایەقەکە وتی: لەوێ سەیارەی (بۆکان) زۆرە، چونکە ئێمە خۆمان بە خەڵکی ئەوێ لەقەڵەم دابوو!.
پاش ئەوەی بەڕێکەوتین گەشتینە بازگەی سێ ڕاکەی (مهاباد) کە بازگەیەکی گومرگیە، هەر دوعام دەکرد کە نەگیرێین نەشمدەوێرا بە هاوڕێکانم بڵێم جاری پێشوتر لەم بازگەیە شەش نەفەرمان گیراوە وتم با نەپەشۆکێن، ئەفسەرێك هات و دایانبەزاندین بۆ پشکنینی سەیارەکە، تاوەکو بزانرێت باری قاچاخی پێیە یان نا؟، ئیتر ئێمەشیان بردە ژوورێکەوە پشکنینیان و، لەوکاتەدا من دینارێکی ئاسنم لەگیرفاندا بوو، من خەمی ئەوانم بوو زمان نازانن و کەشفمان بکەن، کەچی بەپێچەوانەوە خۆم بوومە هۆکاری کەشف بوون، وتی: چیتان پێیە دەری بهێنن، برادەرەکانم لەپێشمەوە بوون خێرا منیش خستمە ژێر مێزەکەوە بۆ ئەوەی بیشارمەوە، نەفەرەکەش سەرگروبانێکی بەتەمەن بوو، وتی: خەڵکی کوێن؟ منیش وتم: بۆکان. وتی؟ بۆ کوێ دەڕۆنەوە؟ وتم ، بۆکان دەڕۆینەوە لەباخی سێو کارمان کردووەو کاریگەرین واتە کرێکار،وتی باشە : بڕۆن، لەگەڵ هاتینە دەرەوە لە ناو دەرگاکەدابووین ، سبحان الله قاچی دای لەدینارەکەو، تەقەی هات، لەگەڵ هەڵیگرتەوە بینی دینارە زانی عێراقین و کەشف بووین،خێرا بانگی کردینەوەو وتی: بۆ درۆت لەگەڵ کردم؟، منیش وتم؟ بەخوا ترسام بمانگریت ئەگینا بەرەو کوردستانی عێراق دەڕۆینەوە!
تەماشایەکی کردین و بەزەیی پێماندا هاتەوەو، وتی:ئێستا بتاننێرم بۆ شاری(مهاباد)و زیندانەکەی سێ مانگ حوکمتان دەدەن و سەریشتان سفر دەکەن، بەڵام بەڕاستی پێم بڵێن: بەڵێن دەدەن بڕۆنەوە بۆ عێراق یان درۆم لەگەڵ دەکەن؟، وتم: بەڵێنت پێ دەدەین دەڕۆینەوەو ئیمە کەسی خراپ نین، سەیرێکی کردین و وتی:دەزانم لەکەسانی






خـراپ نـاچن دەبـڕۆن ئیتر نەیەنەوە بـۆ ئێران جـارێکی تـر بە قاچـاخ، منـیش وتـم: بەسەرچاو، خوا دەکات تۆ ئێزنمان دەدەیت ، ئیتر تەواو!.
باش بوو سوپاس بۆ خوا لەویاشدا ڕزگارمان بوو، گەشتینە شاری(میاندو ئاب) خێرا پەیکانی شاری(بۆکان) ئامادە بوو،سەرکەوتین و سایەقەکە کوردی سۆرانی بوو، وتی: بۆ کوێ دەڕۆن وتمان ، بۆ شاری(سنە) وتی : ئەگەر ماشێن دەست نەکەوت من دەتان بەم ، وتمـــان: زۆر مەمنونیشـــین،ئیتر هەتـــا شـــاری (ســـەقز)ی بردین،ئیتـــر لەوێ ئوتوبوسەکانی شاری(تاران) بۆ شاری(سنە) دەگەڕانەوە، وتی: بڕۆن سواری ئەوە بن باشترە، پاش سواربونی ئوتوبوس کە پاسی گەورەی گەشت و گوزارە،لە تاو ماندوێتی خەومان لێکەوت.
برادەرێکم ماوەی چەند ڕۆژێك بوو پێڵاوی دانەکەند بوو، لەویا دایکەند باوەڕتان بێت ، بۆگەنی زێرابی لێدەهات خێرا وتم : لەپێی کە برام با کەشف نەبین، بەخوا کاتێکم زانی شاگردی پاسەکە کوڕێکی منداڵکار بوو هات بەرەو دوواوە زانیم کەوا بۆگەنی گۆرەوی و پێڵاوی چەند ڕۆژە بۆ لای ئەوانیش ڕۆشتوە ، خێرا وتم: چاوتان بنوقێنن و خۆتان بکەن بەخەوتو، ئەویش نەفەر بەنەفەر سەیری قاچمانی دەکرد تا پیاوێکی شاڵ لەبەر لە تەنیشتمان خەوتبوو، کڵاشی لە پێدابوو دایکەندبوو، خێرا دای بەشانیداو وتی: ئاغا کەفشەکانت لەپاکە بۆنی دێت، ئەویش هەستاو وتی: برا وەخوا لەتێهرانەوە دامکەندگە، نەیدەزانی ئەم بەزمەی بەویان گێڕا پەنی ئێمەیە، خەریك بوو دەمردین لە پێکەنینا!.
نزیکی بانگی بەیانی گەشتینە شاری(سنە)و سوپاس بۆ خوا لە بازگەکان توشی هیچ نەبووین، پاش ئەوەی گەشتینە ترمینالی (سنە) پاس نەبوو خێرا سواری پەیکانی دەربەست بووین بۆ شاری(مەریوان) ، پاش ئەوەی گەشتینە نزیك بازگەی(بێ کەڕە) سایەقەکە زانی سەروچاومان لە کوردی عێراقی دەکات، وتی: کاکە ئەگەر عێراقین لێرە







دابەزن بـڕۆن بەپشـتی بـازگەکە بـڕۆنەوە سـەرجادەی (مەریوان)چـونکە لەم بـازگە ڕزگارتـان نابێت بەئاسـانی،ئیتر دابەزیـن و چـوینەوە پشـتی بـازگەکەو، لەوێشـەوە پاسی مینی بوسی (دزڵی) هـات و سـەرکەوتین پێش خـۆرکەوتن گەشـتینە شـاری (مەریـوان) چـووینە چایخـانەی عێراقیەکـان و لەوێـش جێبێکمـان گـرت بـۆ سـەر سـنوری (باشماخ)،ویسـتمان خۆمـان بگەیەنیـنە نـاو خـاکی عێراق و دوو پاسـدار لەچاڵێکـدا کەمینیـان دانـابوو بـۆ پـارە وەرگـرتن و قەدەری خـوا نەیانهێشـت بـڕۆین ، داوای پارەیـان کرد ئێمەش تەنها دینارە ئاسنەکەمان پێ بوو!.
وتـم: سـوێند بەخـوا پارەمـان پێنـیە ، ئیتر یەکیـان زۆر بێ ئەدەب بـوو هەسـتا زلەیەکی لێدام و، وتی: دەتـانبەم بـۆ پاسـگا،پاش تکاکردنێکی زۆر سـەعاتێکی دەسـتیم پێبـوو لە جەنـدرمەکان شـاردبومەوە ، لەویا لەدەسـتم دایکەنـدو لێیـان سـەندم و ئەوجـا ئێزنیـان داین،سـوپاس بـۆ خـوا کـاتی خـۆرکەوتن گەشـتینەوە (باشـماخ) بەڵام تەنهـا یەك دینارەکەمان پێمابوو،باش بـوو سێ چـای بـۆکردین و ، پاشـان بەتوێتایەك گەشـتینەوە شـاری پێنجـوێن و لەوێشـەوە لەسـەر سـیقە بە لانـدگرۆزەرێك هێنایـنیـانەوە بـۆ شاری(سـلێمانی) و لەوێ کـرێ کەیمانـدا،بەو شـێوەیە چـوارەم سـەفەریش پـاش نـاڕەحەتیەکی زۆر سـوپاس بـۆ خـوا گەشـتمەوە شـاری سـلێمانی، ئەم جارەیـان زۆر دانیشتم بەڵام هەرکات حاڵی قەرزاری و ماڵەوەم دەبینی و، هەواڵی هاوڕێکانم دەبیست کە گەشـتونەتە شـوێنی خۆیـان، هێنـدەی تـر ئـارەزوو وە کەڵـکەڵەی هەنـدەران دەکەوتەوە خەیاڵم، تا ئەوەی بۆ جاری پێنجەمیش ئەو ڕێگەیەم گرتەوە بەر!.





## سەفەری پێنجەم: گیرانم لە بازگەی (چوارتا) مانەوەم لەئاسایشی سلێمانی بۆماوەی هەفتەیەك!.

پاش بێزاربوونی زۆرێك لە گەنجانی هەرێمی کوردستان و ، ڕووکردنە دەرەوەی گەنجان بەلێشاو بۆ هەندەران، دەسەڵاتی سلێمانی کەیەکێتی حوکمڕانی دەکرد بڕیارێکیان دەرکرد کەوا هەرکەسێك بەرەوهەندەران بڕوات و لە سنوری ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا بگیرێت ، ئەوە بڕی دوو هەزار دینار غەرامە دەکرێت و پاشان ئازاد دەکرێت، یان دەبێت لەزینداندا بمێنیتەوە!، ئەم بڕیارە وای کرد لەوەی کە گەنجانێکی زۆر لەشاری(هەولێر) گیر بخۆن و نەوێرن بێنەوە بۆ شاری (سلێمانی)، تا ئەوەی دەنگۆ بڵاوبۆیەوەو داوایان کرد لەیەکێتی ئەگەر ئەو بڕیارە لانەبات و هەڵی نەوەشێنێتەوە ئەوە دەبن بە پارتی، ئیتر ئەوکاتە نەوشیروان مستەفا بڕیارەکەی هەڵوەشاندەوە!.

پاش ئەوەی تەلەفونم کرد بۆ قاچاخچیەکەم کە ئەوکاتە لە تورکیا بوو، وەجبەی دەرکردبوو ئاگاداریان کردمەوە کەوا براکەی وەجبەیەکی تری بردووەو لەشاری (بانە)ن، ئەگەر منیش زوو فریای بکەوم ئەوە منیش دەتوانم لەگەڵیان بڕۆم،خێرا ژمارەی تەرەفەکەی ئێرانم لێ وەرگرت و بە پێی وتەی قاچاخچیەکە ڕێگە زۆر خۆش بوو لەوکاتەداو بەئاسانی وەجبەی پێشوی دەرکردووە،خێرا (٥٠) دۆلارم بەقەرز وەرگرت لەکەسێك و، کردم بە گولاجێك و خستمە ناو کونی بەنەخوێنی شەرواڵەکەم و لەوێ شاردمەوە، بۆ ئەوەی هەستم پێ نەکرێت بۆ هەندەران دەڕۆم کۆمەڵێکی زۆر قائیمەی ئەشیا کڕینم خستە گیرفانم، بەناوی ئەشیاوە ڕۆشتم ، چونکە سەرجەم بازگەکانی سنور، ئاگادارکرابونەوە کە نەیەڵن یەك گەنج بەرەو خاکی ئێران بڕوات و ، خێرا دەبێت دەستگیر بکرێت ، وە حوکمی قاچاخچیش بەشێوەیەك دەرکرابوو ، ئەگەر بگیرێن




دەبێت بەفر لە گەرمیان ببارێت ئەوکات بەردەبن!، منیش ناوی خوام لێ هێناو بەنابەدڵی دایك و باوکم ، سەرلەبەیانیەکەی چووومە گەراجی شاربازێڕو، سواری لاندکرۆزەرێك بووم بۆ ناوچەی(چۆمان)ی سەرسنور، هەتا نزیکی شارۆچکەی (چوارتا) چەندین بازگەمان بڕی و ، کاتێك دەیانپرسی بۆ کوێ دەڕۆین، من بەناوی ئەشیا کڕین و قایمەوە خۆم دەربازکرد هەتا گەشتینە بازگەی(چوارتا)!، ویستی خوا وابوو لەگەڵ مندا سێ نەفەر سەرکەوتبوون و ئەوانیش بۆ هەندەران دەڕۆشتن بەناوی چوون بۆ ئیش بۆ (ئێران) لەبازگەکە ڕایانگرتین و پاسەوانێك هاتە پێشەوەو داوای پێناسی کردو پرسی بۆ کوێ دەڕۆن!، پاش پێناس تەسلیم کردن و گفتو گۆ لەگەڵم، کە لەپێشەوە دانیشتبوم پێناسەکەی دایەوە دەستم و چوە بەشی ناوەڕاست و دواوە،لەنەفەرێکی تری پرسی بۆ کوێ دەڕۆی؟ وتی:دەڕۆم بۆ تاران بۆ ئیش!، لەگەڵ وای وت ، وتی ئادەی هەمووتان دابەزن ئەم سەیارە نەفەری هەندەرانی هەڵگرتوە، خەریك بوو سایەقەکەش توشی کێشە ببێت، تا پێناسی خەتی دەرهێنا!.

پاشان بردینیانە ژورێکەوە دەستیان کرد بە پشکنینمان ، تاوەکو بزانن کاممان دۆلارمان پێیە، منیش بەهۆی ئەوەی پێشتر ئیزنی دابوم ، ئامادەکاریم نەکرد دۆلارەکە لەشوێنێکی باشتر بشارمەوە، پاش پشکنین پارەکەی دۆزیەوەو، وتی: بۆ ئەشیاکڕین دەڕۆیت؟، وتم: ناوەڵا بۆ هەندەران دەڕۆم ، وتی: ئەی بۆ وات نەوت سەرەتا؟، منیش وتم؟ جا دەکرێت خۆم بەدەستی خۆم کەلەپچە بکەمە دەستم؟، وتی: باشە مادەم ڕاستت کرد لەگەڵم دانیشە لەویا هەوڵدەدەم ئیزنت بدەم، بەس با ئەو نەفەرانە نەزانن، دواتر بۆم دەرکەوت کاکم بۆنی پارەی کردووەو دەیەوێت دەمی چەور بکەم،پاش ئەوەی سێ نەفەری تریش گیران ، خێرا ئەوانیان برد بۆ(چوارتا) بۆ زیندان، منیش: نزیکەی دوو کاتژمێرێك دانیشتم ، کابراش زوو زوو دەیوت: ئێسا نا ئێستا ئیزنت دەدەم، هەر سەیارە بوو دەهات و دەڕۆشت ،نەمدەزانی بۆ ئیزنم نادات!،






پاشتر زانیم کاکم نیازی بووە پارەی بدەمێ و ، وەك شەرم شێخی وڵاتانی عەرەبیش بەدەستی داوای نەدەکرد، منیش نەمدەزانی دەبێت بیخەمە گیرفانی، لەولاشەوە سێ نەفەرەکە زۆر بێ
ویژدانانە شکاتیان لەمنیش کردبوو، وتبوویان: نەفەرێکیان گل داوەتەوە، بەپارە ئیزنیان داوە کاتێکم زانی خێرا سەیارەیەکی مێکزەمینی ناسراو بەشلە خەجێ لە چوارتاوە هات و ، وتی: کاکە کوا ئەونەفەرەی تر، کە بەپارە ئیزنتان داوە؟، منیش ئەوکات زانیم مەسەلە چی یە، وتی: ناوەڵا کاکە ئەوەتا ویستومە بینێرم بەڵام سەیارە نەبووەو، لەویا درۆیەکی کردو،وتی: فەرموو ئێستا بیبەن،دوای ئەوەی بردیانم بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی(چوارتا) چوومە ژورەوەو، گەشتم بە سێ نەفەرەکەی ترو، کەمێك سەرزەنشتم کردن و قسەم پێ وتن، ئیتر ئیفادەیان لێ وەرگرتم و ، وتیان: بۆ کوێ دەڕۆشتی؟ منیش وتم: لەداخی ئێوە سەری خۆم هەڵدەگرم و بۆ هەندەران دەڕۆم، بەرپرسێکی لێبوو زۆر پێی ناخۆش بوو، وتی: مادەم وایە دەبێت دوو هەزار بدەیت ئەگینا ئازادت ناکەین و دەت نێرین بۆ ئاسایشی سلێمانی!، منیش وتم، ئەگەر خاوەنی دوو هەزار بوومایە ئەوە نەدەچووم بۆ هەندەران، وتی: کەیفی خۆتە ئەوە پێم وتی!.
پاش نیوەڕۆ کاتی دەوام داخستن پۆلیسێکیان لەگەڵدا ناردین و ، بەتەکسیەکی نەفەرات لەسەر حسابی خۆمان بردینیانەوە بۆ ئاسایشی سلێمانی، لەڕێگە بردەرێکمان وتی: کاکی پۆلیس ئێستا من بمەوێت رابکەم تۆ چی دەکەیت؟، وتی: وەڵا کاکە هیچ ناکەم بەس دەبێت لەجیاتی تۆ بچمە شوێنەکەت، ئیتر سایەقەکە وتی: کاکە توشی کێشەی مەکەن ، ئێمەش بەزەییمان پێیدا هاتەوەو، دانەبەزین و ڕامان نەکرد!.







پاش نوێژی عەسر گەشتینەوە سلێمانی و بردینیان بۆ ئاسایشی سلێمانی کەدەکەوێتە لای فولکەی کاوەی ئاسنگەر، تەماشادەکەین نزیکەی بیست و پێنج نەفەر گیراوە، بەرپرسێك هاتە لامان و وتی: کاکە دەبێت یەکی دوو هەزار بدات ئەوکاتە بەردەبیت، بەخوا هەندێك لەترسا خێرا دەستیان کرد بە پارە گۆڕینەوەو، پارەیان داو چوونە دەرەوە!.

هاتە سەرەی من وتی: کوا پارەی تۆ، منیش وتم پێم نییە با قسە لەگەڵ کەسوکار بکەم، ئەوکاتە مۆبایل بەم شێوەی ئێستا بلاو نەببۆیەوە، ئێمەش لەبەر هەژاری لەخانوی کرێدا بووین و تەلەفونمان نەبوو، ژمارەی خەتێکی نۆرماڵی ماڵی خەسوی خوشکێکم لابوو ، پەیوەندیم پێوە کرد تا بزانن کەوا لە ئاسایشم نەك بۆ ئەوەی پارەکەم بۆ بهێنن، چونکە بەو فێڵە نەبووایە نەمدەتوانی ئاگاداریان بکەمەوە، لەگەڵ کابرا گوێی لێ بوو وتم پارە نادەم، خێرا تەلەفونەکەی وەرگرت و وتی: دادە کوڕەکەتان لێرەیەو تا دوو هەزاری بۆ نەدەن بەرنابێت، ئیتر دایخستەوە!.

خۆی تووڕەکردو ووتی: تۆ خۆت بەچی دەزانیت لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیەی (چوارتا)ش دەنگە دەنگت کردووە، بابزانیت هەموویان بەر بدەم مادەم تۆ بەئاشکراو بەچاو نەترسی وتوتە: دەچم بۆ هەندەران هەردەبێت پارەکە بدەیت! منیش وتم: کەنەبوو لەکوێی بهێنم بۆخۆم دادەنیشم و ئێوەش هەر باسی پارەبکەن!.

پاش دوو کاتژمێر دایکم و باوکم هاتنە بەردەمی ئاسایش و ناسراوێکیان هێنابوو کەفالەتی کردم و ئەو شەوە چوومەوە ماڵەوەو بۆ سەر لەبەیانی لەسەر بەڵێنی خۆم هاتمەوە بۆ ئاسایش و کەفیلەکەم وتی: بەخوا کاکە ناتوانم ئازادت بکەم و دەڵێن: دەبێت پارە بدات، منیش دانیشتم لەوێ تا ڕۆژێکیان ملازمێك هاتە ژوورەوە، وتی: خەڵکی کوێیت؟ منیش وتم باپیرەم کەدەکاتە باوکی دایکم خەڵکی گوندی قۆزەڕەقەو دەمرکانە، وتم: قۆزەڕەقەییم هەر بۆ خۆشی ئەوەم وت،نەمزانی ئەویش خەڵکی ئەوێ







بـوو، دوای ئەوەی زانـی کـوڕی کـێم ، چـوو تەکلیفـی لە بەڕێـوەبەری ئاسـایش کـرد کە ئازادم بکات، کەچی هاتەوە وتی: کوڕی باوکم تۆ بۆ وتوتە دەچم بۆ هەندەران؟ منیش وتم: ئەی درۆ بکەم ؟، وتی: ئا کاکە دەبێت بەدرۆ خۆت دەرباز بکەیت!.
پاش مانەوەی چەنـد ڕۆژێك کە بـوو بەهەفـتەیەك ، ئەو ناسـراوەمان بەویا تێپەڕی و، هاتەوە بۆ لام و وتی:ئەوە هەر ماویت لێرە؟ وتم ئەرێ وەڵا دەڵێی پیاوکوژیان گرتوە ئیتر وتی: ئێستا خۆم ڕزگارت دەکەم، پاش ئەوەی ڕۆشـت و وتبـوی: کاکە بەخـوا پارە نادات ئیتر بەریـدە بـا بـڕواتەوە بـۆ ماڵەوە، ئەوانیش کەزانیبویـان مـن سـوورم لەسـەر نەدانی پارە وتبوویان: باشە ئیمزای پێ بکەن نەچێتەوە بۆ هەندەران و بەریدەن!.
سوپاس بۆ خوا ئەم جارەشیان بەساغ و سەلامەتی گەشتمەوە بەکەسوکاری بەڕێزم!.





## سەفەری شەشەم: پەڕینەوەم لە گوندی (شەپاڵ)ی سەر بەقەزای(پێنجوێن) بەرەو خاکی (ئێران) و شاری(بانە)و گەشتنە شاری(وان) ی وڵاتی (تورکیا)و لەوێشەوە بۆ (ئەستەمبوڵ).

هێندە ڕۆشتم بۆ سەفەری ڕێی هەندەران، تەواو کەسوکارو خزمان و دۆستانیش نائومێد ببوون لەدەرچونم ، تا ئەوەی ئەم جارەیان کە کۆتا جارم بوو، ماڵئاواییم تەنها لە دایك و باوکم کرد، وە هێشتا دەنگۆی گرتن و لێسەندنی بڕی دووهەزار دینارەکەش مابوو، بۆ هەرکەسێك لەڕێی سەفەرکردنی هەندەران دەستگیر بکرایە،بەچاری ناچار ئەم جارەشیان لەترسی گیران پاش گفتوگۆکردنم لەگەڵ قاچاخچیەکەدا ، لەڕێگەی قەزای(پێنجوێن)ەوە بەرەو سنوری کوردستانی ڕۆژهەڵات و شاری (بانە) بەڕێکەوتم بەتەنها،وە ژمارەی تەرەفی ئێرانم وەرگرت بۆ چوونە ماڵی قاچاخچیەکە لەشاری(بانە)،وادەزانم لە نیوەی مانگی شەشی ساڵی(٢٠٠٢) بوو ، دەبوایە لەماوەی شەو ڕۆژێکدا بگەشتمایەتە شاری(بانە) چونکە کۆمەڵێك نەفەر لەوێ بوون و چاوەڕوانی قاچاخچیەکەو چەند کەسێکی تریان دەکرد کەبگەنە لایان و پێکەوە سەفەر بکەن، پاش نوێژی عەسر بوو ، بە تەکسیەکی نەفەرات چووم بۆ (پێنجوێن) بۆ ئەوەی شەو لە ئوتێل بخەوم لەوێ و بازگەکانیش گومان نەکەن کە بەرەو هەندەران دەڕۆم!.

ئێوارە گەشتمە قەزاکەو چوومە چایخانەیەك دانیشتم کە بەرامبەر دووڕیانەکەی نێوان، ڕێی (باشماخ) و (سەیران بەن) بوو، پاش کەمێك پشوودان دونیا تاریك بوو، بانگی مەغریبی داو چومە مزگەوتێك نوێژی مەغریب و عیشام کرد بە قەسرو جەمع و، هاتمەوە بۆ چایخانەکەو پرسیاری ئوتێلم کرد، وتیان: وەڵا کاکە گیان یەك ئوتێلی تێدایە ئەویش داخراوە، منیش ئەوکاتە هێشتا خێزانم دیاری نەکردبوو، ئەگینا




دەچومە ماڵی خەزورانم کە ئێستا ماشاء الله هەتا دەگاتە سنوری (بانە) و(مەریوان)، خزمـان و دۆسـتانی لێـیە!، لەچـایخەنەکەدا دانیشـتم بەتەنها مـامەوە خـاوەنی چایخانەکە وتی: بۆ کوێ دەڕۆیت؟، منیش وتم: بۆ (بانە) دەڕۆم، ئیتر وتی: دانیشە من تـا کاتژمێر دوانـزەی شـەو داینـاخەم و زۆرجـار سـەیارەی بـار دێـت بەرەو سـنورەکان دەتوانیت لەگەڵیان بڕۆیت،سوپاس بۆ خوای گەورە پاش یەك دوو کات ژمێر تویتایەك هـات بە بـارەوە بەرەو گونـدی (شـەپاڵ) ی سـەر سـنوری دەڕۆشـت، منـیش لەڕێی(سـەیرانبەن)ەوە شـارەزابووم بـۆ شـاری(بانە)، ویسـتم نەڕۆم، بەڵام دواتـر چایچیەکە وتی: کاکە بڕۆ بۆ(شەپاڵ) باشترە چونکە ڕاستەوخۆ سەیارەی ئێران دێتە ناو دێکەوەو، هەتا (بانە)ت دەبەن و هیچ ترست نەبێت،ئیتر دەستخۆشیم لە خاوەنی چایخـانەکە کـردو ، سـوپاس بـۆ خـوا سـواری تویتـاکەبووم و بەڕێکەوتـم، چەنـد بازگەیەك هاتە پێشمان و بەهۆی بارەکەوە لێیان نەپرسیم بۆ کوێ دەڕۆم تا گەشتمە گوندی (شەپاڵ) ، لەوێ چەند خانویەکی لێبووکرابون بە ئوتێل، چوومە دانەیەکیان و پرسیارم کرد لەخاوەنەکەی کە چۆن بگەمە شاری (بانە)؟، ئەویش وتی: بخەوە دوای نـوێژی بەیـانی سـەیارەی بارەکانی ئێران دێـن بـار دەبەن لەگەڵ یەکێکیـان بڕۆ،بـانگی بەیـانی داو هەسـتام بـۆ نـوێژو ، خـاوەن ئـوتێلەکە بـانگی کـردم کەوا سـەیارەیەکی بـار هـاتووەو،وتی: لەگەڵیـان بڕۆ، ئیتر سـوپاس بـۆ خـوا بەو ڕێگە سـامناکە کاکی بەکاکیەدا نزیکی خـۆر کەوتـن بەسـەلامەتی گەشـتینە شـاری(بانە)و ، سـایەقەکەش مـاڵی ئاوابێـت تەلەفونی کرد بۆ تەرەفەکەم و بردمی بۆ بەردەم ماڵیان و ماڵئاواییمان لەیەك کردا.

پـاش ئەوەی گەشـتم بە وەجـبەکە شـەو ڕۆژێـك مـاینەوە لەشـاری(بانە) تـا هەمـوو نەفەرەکان گەشـتن، پاشـان بەڕێکەوتـین بەرەو شـاری (ڕەزایە) و لەوێشـەوە بەرەو کۆتـا گونـدی(ئێران)کە نـاوی گوندی(جانـدار)بوو،ماوەی دوو شـەو و دوو ڕۆژ هێشـتینیانەوە لەو گونـدە،بۆ ئەوەی چەنـد وەجبەیەکی تـر بێـن و تێکەڵی بـکەن لەگەڵمان،بەشـەو






دەیانبردینە ماڵەوەو بەڕۆژیش بۆ ناو چەم و دۆڵەکانی ئەوناوچەیە لەترسی پاسگاو پاسدار، کۆتا ڕۆژمان بوو کە شەوەکەی بە نیازی دەرچوون بووین ، گەریلایەکی پەکەکە هات و سەرژمێری هەموومانی کردو گومرگی کردین و نەفەری پێنج ملیۆن لیرەیان لە قاچاخچیەکانمان سەندو ، پسوڵەیەکیشی دایە دەستمان بۆ ئەوەی شەو تەسلیمی کەمینەکەیانی بکەین و دووبارە گومرگمان نەکەنەوە،دەمەو ئێوارە کەوتینە ڕێگەو وەك جاری جاران نزیکەی سەد نەفەر دەبووین، بەڵام ئەوشەوە قاچاخچیەکەمان خۆی شاردەوەو نەهات لەگەڵمان و نەفەرێکی ئاگادارکردبۆیەوە کەوا سەرپەرشتیمان بکات لەجیاتی خۆی، پاش ڕێگەکردنێکی زۆرو مانەوەمان لەگوندەکانی (تورکیا) وەك جارەکانی پێشو، کەنامەوێت دووبارە لێرە باسی ناڕەحەتی و ئازارەکانی ئەو ڕێگە سەختە بکەم کە نزیکەی سەد کاتژمێر ڕێگەی پێ کردین،چونکە لەبەشەکانی ڕابردوودا زۆر بەووردی تیشکم خستۆتە سەری و بەدوورو درێژی باسم کردووە،ئیتر سوپاس بۆ خوا بەسەلامەتی گەشتینە شاری(وان) ی تورکیا!.

ئەوەی کەجێی سەرسوڕمان بوو ئەمجارەیان کەسێکمان لەگەڵ بوو ناوی خاڵە شەهاب بوو، مودمینی ماددەی هۆشبەر بوو، بردینیانە ماڵێکەوە دایاننانین ، بەیانی کەهەستاین سەیرمان کرد یەك نەفەرمان گۆرەویمان دیار نیـیە، کاتێك چووینە ژێرزەمینی خانوەکە سەیر دەکەین هەمووی بەسەر دەم و چاوی خاڵە شەهابەوەیە، وتم: ئەوە چۆن نەمردووە بەو بۆگەنە؟ یان بۆ وای کردووە؟، وتیان: ئەوە ئەوکەسانەی کە مودمینی ماددەی هۆشبەرن ، ئەگەر لێیان ببڕێت ، ئەوە پەنا دەبەنە بەر سیکۆتین و گۆرەوی بۆگەنی چەند ڕۆژ لەپێ دانەکەندراو،بەڵێ بەداخەوە پاش بینینەوەی هاوڕێیەکم لە وڵاتی (یۆنان)بۆی باس کردم کەوا ئەم گەنجە پاش ئەوەی دەگاتە وڵاتی(یۆنان) لەبەر کاریگەری ئەوماددەیە لەسەر لاشەی گیان لەدەست دەدات، بۆیە







سوپاسی خوای گەورەم کرد کە هیدایەتی داوین بۆ ئەو ڕێگە پاك و بێگەردەی ئیسلام کەوا تاکەکانی دەپارێزێت لە هەرچی ڕێگەی خراپ و نارەواو هەڵدێر هەیە.

**بەڕێکەوتـــن لەشـــاری (وان) بەشـــاحینەو یەخـــت بەرەو شـــاری (ئەســـتەمبوڵ) و نارەحەتیەکـــانی ئەو ڕێـــگەیەو، پـــاش دووســـاڵ سـەفەرکردن گەشتینەشاری (ئەستەمبوڵ) دابڕانم بـۆ مـاوەی چـوار ساڵ لە کوردستان!.**

پاش ئەوەی بـۆ جـاری دووەم گەشـتمەوە شـاری(وان) لەسـەفەری شەشـەم و کۆتـاییم دا، سـەرلە ئێـوارە بە دۆڵمشـێك هـاتن بەدووامانـداو بردینیـان بـۆ مـاڵێکی تـر بەڵام ئەم جارەیـان زۆر نەماینەوە لەوماڵە و پاش دووشـەو بەڕێیـان کـردین بـۆ بینـایەکی زۆرگەورە کە هـۆڵێکی دوورو درێـژی تێـدا بـوو لەدەرەوەی شـاری(وان) کاتێـك گەشـتینە بینـاکە نـزیکەی دووسـەد نەفەری لێبـوو، هەموومـان لەوێـدا کـۆکراینەوە تـاوەکو بە شـاحینە بمانبەن بۆ شاری(ئەستەمبوڵ) و سـەرەتا زۆرێك لەنەفەرەکان نارازی بوون بەشاحینە بـڕۆن بەڵام پـاش ئەوەی مـاوەی شـەوو ڕۆژێـك لەوشـوێنە مـاینەوە تەواو جێگەمـان نارەحەت بوو وەك زیندان وابوو ، ئیتر ناچار بڕیارمان دا ئێمەش بڕۆین بەشاحینە، بۆ ئێـوارەی دووەم شـاحینەیەکی سـەر بەتـاڵ وەك گەڵابەی لای خۆمـان وابـوو بەڵام کەمێك گەورەتـر بـوو هـات و لەویـادا نـزیکەی سـەدو بیسـت نەفەر سـەرکەوتین و بـاقی خەڵکەکە هەنـدێکیان نەهـاتن و هەندێکیشـیان وتیـان: جێ نـابێتەوە بـۆ شـاحینەیەکی تر!.

هێنـدە جێمـان نـاخۆش بـوو هەمووماـن کەوتبـووین بەسـەریەکدا، دەسـت و قاچمـان تێکەڵ ببـوو بەدانیشـتنیشـەوە، کەس بۆی نەبوو هەسـتێت چـونکە سـەری بەتـاڵ بـوو، لەگەڵ ئەوەشـدا چەنـد خێزانێکی ئەفغانیمان لەگەڵدا بوو بە مناڵەوە،پاش بەڕێکەوتنی شـاحینە ، نزیکەی کاتژمێرو نیوێك ڕێی کـردو لەچۆڵەوانیەك وەستا،کە هەموو ئەوناوە







پڕبوو لەخوێ وە بەئەندازەی گردێك بەرز کرابونەوە ، کاتێکمان زانی لە لاوە دەرگا کرایەوەو، وتیان: خێرا وەرنە خوارەوەو دایانبەزاندین و ئێمەش وەمانزانی کەمین هەیە نەمانزانی دەیانەوێت بەیەخت لەڕێی ئاوەوە بمانبەن لەبەر بازگەکەی شاری(وان) لەوێوە دەبوایە بەیەخت بڕۆین کە نزیکەی چوار کاتژمێر لەناو ئاودابووین،
هەتا گەشتینە شاری(خەڵاتە)،کەپێشتر شتی وایان پێ نەوتبووین لەبەر ئەوەی هەندێك نەفەر بەمەرجی ئەوە هاتبوو بە وشکانیدا بڕوات و بەئاودا نەڕوات، بۆیە باسیان نەکرد بۆمان،هەرچەندە سەرەتا هەندێ نەفەر وتیان سوارنابین و چۆن شتی وادەبێت، بەڵام کاتێك یەختەکان هاتن کە ژمارەیان دووان بوو، بە چاری ناچاری هەمووی سەرکەوت وە نزیکەی دەمەتر بۆ بیست مەترێك لە قەراغ ئاوەکەش نەهاتە پێشەوە، وتیان: خێرا سەرکەون چونکە گڵۆپی کوژاندبۆیەوە، باوەڕتان بێت هێندە ئاوەکەی سوێر بوو برادەری وام لەگەڵ بوو پانتۆڵەکەی نایلۆن بوو هەتا هاتە ناو یەختەکە تەنها شۆرتەکەی لەپێدا مایەوەو پانتۆڵەکەی ڕزابوو دەت وت تێزابە ئاوەکە!.
لەناو یەختەکەدا ژوورێکی دوورو درێژی تێدا بوو هەریەختەو شەست نەفەریان تێکرد، منیش براکەم ئامۆژگاری کردم کە لە نزیکی شۆفێری یەختەکەوە بم ، بۆ ئەوەی خوا نەخواستە گەر حاڵەتی خنکان هاتە پێشەوە، ئەوان بەلەمیان پێ یەو هەوڵی ڕاکردنیان لەگەڵ بدەم ، چونکە ژووری شۆفێرەکە جیاوازبوو ،لەویا من نەچومە ژوورەوەو لەنزیکیەوە دانیشتم ، دوو هاوڕێشم چونە پێشی یەختەکە وەیان زانی بۆ گەشت و گوزار دەچن، کاتێکمان زانی مانگەشەو دەرکەوت شەپۆلی دەریا بەرزبۆیەوە ، یەخت کەوتە ئەملاولا کردن و شەپۆلی وا دەیدا بەسەرماندا ، دەموت ئێستا نا ئێستا قڵب دەینەوەو دەکەوینە ژێر ئاو، ئیر شایەتومانم هێناو دوو هاوڕێکەم بەگریانەو ڕایان کردە ژوورەوە، یەکیان ناوی کاکە زانا بوو، کە ئێستا لە وڵاتی سویسرایە، وتی: برا گیان







تخـوا دوعـابکە ڕزگارمـان بێـت بەڵـێن بێـت بەس ئەم جـارە نەمـرم دەسـت بـکەم بەنوێژکردن!.

منـیش بە زەردەخەنەیەکەوە وتـم: إن شـاءالله هـیچ نابێـت، چـونکە کاتێـك سـەیری شـۆفێرەکەم دەکرد هـیچ خـۆی تێك نەدابـوو وە زۆر بەئاسـایی گوێی لەگۆرانی گرتبـوو، سەری بادەدا بۆی، بەڵام ئێمە چونکە یەکەم جارمان بوو شتی وامان نەبینی بوو، بۆیە ئاوامان بەسەر هاتبوو!.

دەرگای ژوورەکەم کـردەوە چـووم تۆزێك زەیتـون بێـنم بـۆ خـوارن کە زۆربەی کەشتی و یەختەکـان ، زەیتـون هەڵـدەگرن بـۆ حـاڵەتی ڕشـانەوە زۆرباشـە، چـونکە بەهـۆی زۆر ئەمـلاو لا کـردنیەوە بەهـۆی شـەپۆلی ئـاو، زۆربەی خەڵـك دەرشـێتەوە، هەر ئەوەنـدە دەرگام کـردەوە سـەیرم کـرد دوو سـەتڵ زەیتـون خـوراوەو یەك دەنکی تێدا نەماوە، وتم: ئەرێ کاکە ویژدانتـان هەبێـت بـۆ بەشی ئێمەتـان نەهێشـتۆتەوە؟یەکێك وتی: ئەی خـوا نافەرموێت: (وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ) منیش وتم: ماشـاء الله کە ئازان بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو ئـایەتە بەڵام هەر ئەوقورئـانە دەیـان فەرمـانی جـوانی تێـدایە وەك نـوێژکردن مێشـێك میوانتان نییە!

نەفەرێـك خـاوەنی خێزان و منـاڵیش بـوو بەڵام زۆر بـێ دیـن و ڕەوشـت ناشـرین بـوو، پێشتر بەردەوام مناقەشەمان بوو لەسەر دین، سەیرم کرد ئەگریا وتم، ها فلان کەس ئەوە چیە بـۆ دەگـری، سـەری بەرزکـردەوەو، بەگریـانەوە وتی: مەلا گیـان بەقوربـانت بـم ئایەتە لکورسی بخـوێنە تخـوا بـا مناڵەکانم ببینمەوە، وەڵا منیش دەسـتم کـردە پێکەنین و وتم جـا کوڕی بـاش تـۆ بـاوەڕت بە خـاوەنەکەی نەبـوو، ئێسـتا خێرە بـاوەڕ بە ووتەکەی دەکەیـت دوور لەڕووی بەڕێزتـان، وتی: کاکە بەخـوا گوم خـوارد بەس ئەم جـارە ڕزگارم بێـت ئیتر تەواو تەوبەدەکەم و دەگەڕێـمەوە، منـیش وتـم: یـاخوا وابێـت، دەی منـیش بەسەرچاو ئێستا دەست دەکەم بەخوێندنی قورئان،







ئالەوێدا ئەو ئایەتەم هاتەوە بیر کەخوا دەفەرمووێت: (فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ)[1] واتە: لەکاتی خۆشی و ئاسایشدا دەبینی ئەو خەڵکەیە بێ باوەڕن و نکوڵی قیامەت دەکەن، کەچی کاتێ سواری کەشتی ئەبن و ترسی نقوم بوونیان لێ دەنیشێت زۆر بەکوڵ سەر دائەنێن و ملکەچی و یەکلابوونەوەی خۆیان بۆ خوا دەرئەبڕن و تەنها لەو داوا ئەکەن و، باسی بتەکان نامێنێ، بەڵام کاتێ ڕزگاریان دەکاو دەگەنە وشکانیی، دووبارە دەچنەوە سەر بیرە پووچەڵەکەی خۆیان و بەهەمان جۆر شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن.[2]،پاش ئەوە هاتمە دەرەوە دانیشتم، ژوورەوەش دەتوت پرسەیە شین و شەپۆڕێکی گریان بوو، من بۆ خۆم لەلای شۆفێرەکە دانیشتبووم خەریك بوو منیشیان دەترساند بەڕاستی!، پاش چوار کاتژمێر گەشتینە قەراغ ئاوەکەودابەزین لەیەختەکەو جل و بەرگمان هەمووی تەڕ ببوو، شاحینەکە چاوەڕوانی دەکردین و خێرا سەرکەوتینەوەو دەستی کرد بەڕۆشتن بەشێوەیەك لەخوامان دەویست لەشوێنێکی تریشدا یەخت هەبێت و دامان بەزێنێت، چونکە تەواو لاشەمان سڕ ببوو، وە بۆشمان نەبوو هەستین هەتا بەیانی کاتی خۆر کەوتن هەر بەڕێگەوە بوو.

بەیانیش کاتێك خۆرهەڵات خێمەیەکی گەورەیان هێناو، وتیان: لەبەر ئەوەی بەناو شاری گەورەدا دەڕۆین دەبێت سەرتان داپۆشرێت، باوەڕبکەن وەك مریشکی لەئاو هەڵکێشراومان لێ هاتبوو!، من و کاکە زانا لەتەنیشت یەکدا بووین تەواو خەریك بوو تەنگە نەفەس ببم وەزعم زۆر خراپ بوو چونکە هاڵاوی گەرمی نەفەرەکان و خێمەکەش هەناسەمان بۆ نەدەدرا لەبەر ئەوەی خێمەکە هەروا درابوو بەسەرماندا،

[1]- (العنكبوت:٦٥)

[2] - (تەفسیری ڕامان).





لەویا چەقۆیەکی کەتەرم پەیا کردو کونێکم کردە خێمەکە، ئاگام لێبوو هەرکەسەو لای خۆیەوە بەشی هەناسەدانی خێمەکەی کون دەکرد، برادەرێکمان لەگەڵدا بوو وەك خۆی باسی دەکرد بیست و پێنج جار سنورداش کرابۆیەوە، چەقۆیەکی کێردی گەورەی گرت بەدەستیەوە، وتی کێ پیاوە سەری دەربێنێت، هەرچی پێڵاوی دەوروبەرەکەیەتی پێی داکەندبوون هەرکەس سەری دەربهێنایە خێرا تاکێك پێڵاوی پێوەدەناو، لێشی وەردەگرتەوە!.

منیش سەرم دەرهێنابوو کاکە زاناش سەری خستبۆیە سەرقاچم و بەدانیشتنەوە خەوتبوو، بەخوا ئاگام لێبوو میلی بۆ هێنامەوە لەگەڵ سەرم دانەواند لەکونەکەوە پێڵاوەکە هاتە ژوورەوەو دای بەسەری کاکە زانای فەقیردا، فەقیرە هاواری کردو وتی: وەی باوکە ڕۆ ئاسمان ڕوخا، ئیتر منیش لەپێکەنینا نەمدەزانی چی بکەم و وتم: نا کاکەگیان خەمت نەبێت ئاسمان سەلامەتە!.

لەشوێنێك وەستاین و یەك دوو فەردە سەمون و چەند کیسێك ئاویان خستە ناو شاحینەکەوەو نەفەری سەمونێك و دەبەیەك ئاویان پێداین، ئیتر حاڵمان زۆرخراپ بوو لە پەل و پۆ کەوتین نەماندەتوانی لەشوێنی خۆشمان بجوڵێین،تا ئەوەی خەومان لێدەکەوت کاتێك خەبەرمان دەبۆیەوە سەیرمان دەکرد لەشوێنێکی تردواین و بەدەم پاڵنانی نەفەرو خەوەوە، هەر جارەو دەکەوتینە لایەکی شاحینەکە، جاری واش هەبوو دەبوو بەشەڕە مشت و پێ لەقە لەناو نەفەرەکاندا، خەریك بوو ئاشکرایان دەکردین!.

نارەحەترین ساتە وەختمان ئەوە بوو کە دوور لەڕووی بەڕێزتان میزمان دەهات و بۆمان نەدەکراو دەشبوایە بمان کردایەتە ناو دەبەی ئاوەوە، بۆ ئەوەی نەفەرەکان میز نەچێتە ژێریان،بەڵام چەندێك هەوڵمان دەدا بۆمان نەدەکرا، وە بەهۆی کەمینەوە جاری واهەبوو چەند کات ژمێرێك شاحینەکە دەوەستا،خێمەکەمان بەسەرەوە بوو تا نزیکی ناوچەیەکی شاخاوی سەخت،




ماشاء الله لە دەسەڵاتی خوا لەسەختی و جوانی و بەرزی ئەو چیا بەرزانە، كە نزیك بوو لە شاری(ئەنقەرە)ی پایتەختی وڵاتی (توركیا) ، باش بوو لەویا خێمەكەیان لاداو، كەمێك هەناسەمان بەبەردا هاتەوەو چووینە سەر جادەی ئۆتۆبان،پاش ئەوەی دوو شەو و دوو ڕۆژ لەناو شاحینەكەدا بووین و، كە مەزەندە دەكرا بە چل و هەشت بۆ پەنجا كاتژمێر، ئەو هەموو كاتە بەڕێوە بووین تا گەشتینە نزیكی شاری(ئەستەمبوڵ)و لە سەرجادەیەك دایانبەزاندین و،

باوەڕتان بێت كەسمان نەیدەتوانی بەپێ بڕوات خێرا كۆمەڵ كۆمەڵ سواری دۆڵمشیان كردین و بە دوو كاتژمێر گەیانـدینیانە نـاو شـاری (ئەستەمبوڵ) و لەوێشەوە بەرەو شوقەی تەسفیەو، پاش تەسلیمكردنی پارەمان لەلایەن قاچاخچیەوە ، هەروەجبەیەو بەرەو شوقەی تەرەفی خۆی بەڕێكەوت!، بەم شێوەیە پاش دوو ساڵ و شەش سەفەری تولانی و دوورودرێژ گەشتمە شاری(ئەستمەبوڵ) لەساڵی (٢٠٠٢)دا، وە كاتێك پەیوەندیم كرد بە ماڵەوە باوەڕیان نەبوو كەگەشتبێتم!، ئیتر ماوەی سێ مانگ لە ئەستەمبوڵ مامەوە، لە مانگی كۆتاییم دا لە چەند قوتابخانەیەكدا ئیشی كرێكاریم دەكرد لەگەڵ چەند برادەرێكم دا، پاش ئەوە سەفەری دووەمم دەست پێكرد لە(ئەستەمبوڵەوە) بەرەو شاری(ئەثینا)ی پایتەختی وڵاتی یۆنان!.

بەم شێوەیە سوپاس بۆ خوا كۆتایی بە بەشی یەكەم هات و، پاش ئەمە بەشی دووەم دەست پێدەكات كە بریتییە لە: ڕێگا سەختەكانی هەندەران (بەشی دووەم) (توركیا_ یۆنان) ساڵی(٢٠٠٢)




# (سەفەری یەکەم)



# ڕێگا سەختەکانی هەندەران

## (بەشی دووەم)

## (تورکیا _ یۆنان)
## (٢٠٠٢)

## ڕەنج شێخانی

پێشەکی بەشی دووەم:
سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار دەکەم کە ئەم دەرفەتە زێڕینەی بۆ ڕەخساندم تا بتوانم لەبەشێکی تردا باسێك لە ژیانی ڕێگای هەندەران کە چیرۆکێکی راستەقینەی







خـۆمە، لە ڕێـگەی هەردوو وڵاتی(یۆنـان و تورکیـا)دا ڕوویـداوە،بخەمە پـێش چـاوی خوێنەرانی بەڕێزو خۆشەویست، لەبەشی یەکەم دا باسم لە ڕێگەی نێوان(کوردستان - ئێران - تورکیـا) کـرد لەم بەشەشـدا کە بە بەشـی دووەم دێـت لەسـەفەری یەکەمی هەندەرانم ، باس لەڕێگە سەختەکانی نێوان هەردوو وڵاتی(تورکیا - یۆنان) دەکەم!.
کە پێك هـاتووە لە کۆمەڵێك باسی گرنگ سـەبارەت بە ئازارو ناڕەحەتیەکانی ئەو ڕێگە سەختانەی کە زۆرێك لە هاوڵاتیان و پەنابەرانی خەڵکی هەرێمی کوردستان بەسەریان دا هاتووەو بەوشێوەیە تێپەڕبوون و گەشتونەتە وڵاتی (یۆنان).
هەربـۆیە بە پێویسـتم زانـی وەك یـادەوەری و مێـژوویەك کـورتەیەك لەو ڕووداوانەی کەبەسـەرم دا هـاتووە لەم پەڕتـووکەدا بـخەمە پێش چـاوی خـوێنەرانی بەڕێـز، تـاوەکو ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ گەنجانی داهاتووی وڵاتە بێ ناسنامەکەم و هیوادارم جێگای ڕەزامەندی خوای گەورە بێت و پاشان ئێوەی بەڕێزیش سودمەند بن لێی!.

**ڕەنج شێخانی**
**٢٩ / ١ / ٢٠١٤**
**فینلەندا**

## بەڕێکەوتن لە شاری (ئەستەمبوڵ) ەوە بەرەو سنوری وڵاتی (یۆنان).

لەسـەرەتای مانگی ١٠ ی سـاڵی (٢٠٠٢) دا بـوو کەوا (٣٦) گەنجی هەرێمی کوردسـتان لە شـاری (ئەستەمبوڵ)ی وڵاتی (تورکیـا)وە بە دۆڵمشـێك بەڕێکەوتین بەرەو سـنوری نێوان (یۆنـان و تورکیـا) لە دەمەو ئێـوارەیەکی بارانـاویـدا بـوو!، نـزیکەی سێ کاتژمێر لەنـاو ئەو دۆڵمشـە قەپاتەدا مـاینەوەو هـاتبووینە کـوڵ چـونکە مـانگی دە بـوو، پـاش کەوتـنە نـاو







کەمینی پۆلیس سوپاس بۆ خوا بەفڕکان فڕکانی نێو کۆڵانەکانی شاری (ئۆزون کۆپری)کە کۆتا شاری گەورەی نێوان تورکیاو یۆنانە، لە سنوری شاری (دیمەتیکۆ)ی یۆنانەوە کە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی وڵاتی (یۆنان) لەسەر سنوری (تورکیاو بولگاریا)وە نزیکە!.

پاش ئەوەی چەند جارێك لە وەرگەڕان ڕزگارمان بوو، تەنها ئاوێنەی لای سەکنمان شکاو ئەویش بەهۆی پێداکێشانی دۆڵمەشەکەمان بەسەیارەیەکی تەنیشتیداو، سوپاس بۆ خوا یەکەمین هەڵهاتنمان سەرکەوتوبووین و کەسمان نەگیرا!.

پاش دابەزینمان لەناو دۆڵمشەکەدا لە لادێیەکی نزیکی ئاوی گەورەی نێوان هەردوو وڵاتی (یۆنان و تورکیا) هەموومان بەهۆی نارەحەتی جێمانەوە ئەو سێ کاتژمێرە دەقمان گرتبوو، لە هەمووشی ناخۆشتر هەڵگرتنی کۆڵە پشتێکی ٢٥ تا ٣٠ کیلۆی بوو، کە پێك هاتبوو لە کیسە خەو و، نان و خواردنی موعەلەبات بۆ ڕێگە کاکی بەکاکیەکەی نێوان هەرسێ وڵاتی (تورکیاو بولگاریاو یۆنان)، کە بە ناو دارستانێکی چڕو پڕی تەمو مژاویدا بوو،کاتێك نزیك بووینەوە لە ئاوی گەورەی نێوان(یۆنان تورکیا) پێش ئاوی گەورە گواوێکی پیسی گەورە کە وەك باسی لێوە دەکرێت ئەو گواوە لە وڵاتی(بولگاریا)وە دێت بە ئەندازەی لاشەی مرۆڤێك تا سەر ئەژنۆی یان تا سەر شانی دێت دەبوایە بپەڕینایەتەوە لێی، لەبەر ئەوەی زۆربەی جار ئەوپردانەی کەدروست کرابوون لەسەر ئەم چەمە پیسە جەندرمەی لێ دادەنیشت و،

گەر پێیدا تێپەڕبوویتایە ئەوە زۆر بەئاسانی دەکەوتیتە ناو کەمینەکەیانەوە، بەڵام زۆرێك لە قاچاخچیەکان نەفەری بەلاشەیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا تاوەکو خۆیان وتەنی" لەبەر ئەوەی بەگواوەکەدا نەپەڕێنەوە،ئەو کەسەیان دەنارده سەر یەکێك لە پردەکان و ڕێگەکەیان پێ تاقی دەکردەوەو، ئیتر خۆی و قسمەتی خۆی یان بارەیان لێ هەڵدەستاندو دەگیرا یان ویستی خوا وادەبوو، کە ئەو شەوە کەمینیان دانەنایەو







بەخێرایی ئیشارەتی دەكردو دەپەڕینەوە لەسەری،خوای گەورە كردی ڕزگارمان بوو ، نەكەوتینە ناو گواوەكەوە و ، كاكی فیدایی بەلاشەش چوە سەر پردەكەو پەڕیەوە ئەو بەرو فیكەیەكی هێواشی لێداو ئێمەش بەپەلە پەڕینەوەو، بەرەو ئاوی گەورە كە ماوەیەكی كورت لێوەی دووره بەڕاكردن ڕۆشتین، لەترسی ئەوەی نەوەك كەمینیان لەسەر ئاوی گەورە دانابێت.

سوپاس بۆ خوا گەشتینە سەر ئاوی گەورەو، هیچ ڕووینەدا، خێرا بەلەمە چوپەكەمان قاچاخچیەكەو ڕێبەرێكی هەوایان تێ كردوو نەفەرێكیان ناردە ئەوبەر ئاوەكە بەمەلە كردن كە چەند سەد مەترێك دەبوو پانی ئاوەكە تا گوریسێك بباتە ئەو بەر ئاوەكەوەو بیبەستێتەوە بەدارێكەوە و پاشان بێتەوە ئەم بەرو پێنج پێنج بەو بەلەمە نەفەرەكان بپەڕێنێتەوەو، ئەوەش بۆ ئەوە بوو بەلەمەكە نەڕوات بەرەو خوارەوە چونكە ئاوەكە زۆر بەخوڕ بوو،هەر ئەوەندەمان خۆش بوو گوێمان لەدەنگی سەیارەیەك بوو لەبەری (توركیا)،وە ئەو شوێنەی ئێمەشی لێبووین زۆر نزیك بوو لە جادەوەو، تادەهات دەنگەكەی نزیكتر دەبۆیەوەو هەمووممان خۆمان دا بەزەوی داو، ئیتر هەریەكەو خەیاڵێك بە مێشكیدا دەهات، ئەوی مەلەی دەزانی لە ئاوەكە خۆی نزیك كردەوە،بۆ ئەوەی ئەگەر جەندرمە بێت خۆی هەڵداتە ئاوەكەو خۆی بگەیەنێتە خاكی (یۆنان) و ئەوی تریش یان خۆمان دابوو بەزەوی دا، یان بەتەما بووین بەرەو

پردی گواوەكە ڕابكەینەوە بەرەو سنوری خاكی(توركیا)،پاش ئەوەی دەنگەكە نزیك بۆیەوە لێمان ، وامانزانی چەندرمەیە،بەڵام سوپاس بۆ خوا كاتێك دەركەوت تراكتۆرێك بوو، دیار بوو بەرەو ئاواییەك دەگەڕایەوە و، پاشان هەناسەیەك هاتەوە بەبەرمان دا و، ئیتر ئەو شەوە وڵاتی (توركیا)مان بەجێ هێشت و لەڕێی بەلەمەكەوە سەرجەم نەفەرەكان پەڕینەوە بۆ دوورگەیەیەكی بچووك لەنێوان خاكی(توركیاو







یۆنان)دا، چونکە ئەو دوورگەیە، بەزەوی قەدەغەکراو هەژمار دەکرا بۆ هەردوو وڵات و کەسیان بۆیان نیە بچنە ناوی!.
هەرچەندە قاچاخچیەکەمان دەیوت، کۆماندۆی یۆنانی زۆر دەترسن لە چەندرمەی تورکی و تائێستاش زۆرجار جەندرمە سنوری بەزاندوەو کۆماندۆشی کووشتوە!.
زۆرم بەلاوە سەیر بوو ، وتم وەڵا سەیرە، وتی بۆ ؟
وتم: ئەزانی بەینی خۆمان بێت تا بەرەو سەر بڕۆین غیرەت کەم دەبێتەوە؟
دایە قاقای پێکەنین وتی: وەڵا خۆ ڕاست دەکەیت.
بەڵێ ئەو شەوە لەناو دوورگەکەدا شوێنێکی خەومان لەناو دڕك و داڵێکدا دۆزیەوەو بۆ یەکەم جار کیسە خەومان دەرهێناو قاچاخچییەکە وتی: بخەون بەئیسراحەت ترسمان نەما لەنێوان دوو وڵاتداین ،مەگەر ڕاوچیەکانی تورکیا بمانبینن و بێنە ئەم بەرەوە ئەوانیش بەپارە دەمیان چەور دەکرێت!.
وە داواشی لێکردین خواردن زۆر بەکار نەهێنین چونکە ڕێگەمان زۆر لەبەردەمدایە، هەرچۆنێك بێت ئەو شەوە چونکە چووبوینە ناو هاوینەوە جەوەکەی خۆش بوو پڕ لەمێشولە دەرمانی مێشولەمان یا لەخۆمان و ماشەڵا تێر خەوتین تا بەیانی!.
بەیانی زوو هەستام بڕۆم دەست نوێژ بگرم، قاچاخچیەکە وتی، بۆ کوێ؟ وتم دەست نوێژ دەگرم ، وتی یانی نوێژ دەکەیت؟ وتم سوپاس بۆ خوا، وتی دەباشە لەخوا بەزیاد بێت وەڵا منیش کاتی خۆی چاکم کردوە بەس ئێستا لە هێلکە چومەتەوە!.
منیش وتم: لەهەر شوێنێکی سەر ئەم زەویەدا بم، هەر ئەو خوایە خاوەنمە کەوا لە وڵاتی خۆشم دا نوێژم بۆ کردوە،گەر بەپێوە بۆم کرا نوێژ دەکەم وە ئەگەر نەمتوانی بەدانیشتنەوە هەر نەمتوانی بە ڕاکشانەوە تا پێڵوی چاوەکانیشم!.





وتی: ئاخر ئێمە لەسبەی شەوەوە ڕێدەکەین و مەجالی دانیشتنمان نابێت، منیش وتم: ئەوکاتەش توانیم لەهەر شوێنێك پشوومانداا ئەوە نوێژەکان کۆدەکەمەوەو کورتیان دەکەمەوە، هەر مەجالیش نەبوو بەڕۆشتنەوە دەیان کەم إن شاء الله!.
وتی: ئاخر ئاومان دەست ناکەوێت، بەتایبەتی لەم گوندە مەسیحیانە تا ماوەی چەند شەو و ڕۆژێك بەدەگمەن ئاوی خواردنیشمان دەستدەکەوێت!.
منیش وتم: زەوی خوا پاکەو پاك کەرەوەشە، گەر دەستمان نەکەوت تەیەموم دەکەم. پاش خۆرکەوتن و نزیکی نیوەڕۆ، ڕاوچیەکی سمێڵ بابڕی تورکی بالآبەرز گەشتە سەرمان ،ئیتر لەوکاتەدا قاچاخاچیەکە بەتورکی کەوتە قسە کردن لەگەڵیداو ، داوای لێکرد ئاشکرامان نەکات، بەتایبەتی لەدیوی وڵاتی (یۆنان) ، چونکە ئەو شوێنەی ئێمە بۆی دەڕۆشتین بەشە مەسیحیەکەی بوو، ئەگەر بەس شوانیشیان بیبینیتایە، خێرا تەلەفونی دەکرد بۆ پۆلیس، شتێك پارەی خستە دەستیەوەو بەپێکەنینەوە ڕۆشت و بەجێی هێشتین!.

## چوونە ناو خاکی وڵاتی(یۆنان) و گەشتنە پشتی شاری(دیمەتیکۆ)

تا ئێوارە لەو دوورگەیەدا ماینەوەو کەس بۆی نەبوو هەستێت، بۆ ئەوەی نەبینرێین و ئیتر لەم بەرو ئەوبەر گوێمان لەدەنگی سەیارەی هەردوو وڵات بوو کە هاتوچۆیان دەکردا!.
لەگەڵ ئاوابوونی خۆر بەلەمەکەمان هێنایە دەرەوەو دووبارە پەڕینەوە بۆ خاکی (یۆنان) و چووینە ناو یەکەم وڵاتی ئەوروپیەوە، بەڵام قەدەری خوا لەکاتی پەڕینەوەماندا لەسەر یەکەم جادەی وڵاتی یۆنان دا، سەیارەیەك بەخێرایی تێدەپەڕی چەند نەفەرێکمان خۆیان نەدا بەزەوی داو لایتی سەیارەکە بەدیکردین و،قاچاخچیەکە وتی: ڕاکەن بەخوا ئێستا پۆلیس دەگاتە سەرمان، چونکە سەیارەکە لەدورەوە وەستاو نەهاتە پێشەوە، ئێمەش دەستمان کرد بەڕاکردن بەدوای قاچاخچیەکەداو، پاش




مەودایەکی زۆر ڕاکردن لە ناو وەردێکدا دانیشتین بۆ پشوودان و سوپاس بۆ خوا لەویاش ڕزگارمان بوو!.
پاشان هەستاینەوە لەدوورەوە سکەی شەمەندەفەرمان بینی بۆ یەکەم جار لەتەمەنم دا شەمەندەفەرێکم بینی بەسەر سکەدا بڕوات بەڕاستەقینەیی نەك فلیم،ئیتر بەتەنیشتیدا لە دوورەوە مەودایەك دەڕۆشتین و ماوەیەك دەبوو دابنیشتینایە، واتە ئەگەر سەربازیت نەکردبووبێ ئەوە لەویادا فێر دەبوویت چونکە لەگەڵ هاتنی هەموو سەیارەو دەرکەوتنی گلۆپێك یان شەمەندەفەرێك دەبوایە خۆمان بدایە بەزەوی دا ئیتر ئاو بوایە یان قوڕ شاخ بوایە یان ڕێ هیچ جیاوازی نەبوو چونکە گەر دانەنیشتیتایە یان دارێکی ڕەحمەتی قاچاخچی و ڕێبەرەکەیت دەخوارد یان دەرزەنێك جوێنت بۆ دەهات وەك فیشەکی وێڵ بەڵێ جار جارەش دەنگی سەگوەڕی ئەو ڕێگایەش هەناسەشی لێ حەرام دەکردین و دەبوا توند لوتمان بگرتایە تاوەکو بەبۆن نەمان دۆزێتەوە ئەمە بێ لەو هەڵتەك و داتەکەی جانتا بیست وپێنج کیلۆیەکەی پشتمان کە حەزمان دەکرد بەتاڵ بێت هێندە ناخۆش و قورس و گران بوو!.
لە سێیەکی ئەو شەوەدا گەشتینە شاری(دیمەتیکۆ)و بەخێرایی بەسەر جادە قیرەکانی ئەو شارەدا لەگەڵ دەنگ نەدەما ڕامانەدەکرد چونکە دەبوایە ئەو شەوە بگەینە نێو چڕی دارستان ئەگینا ئاشکرا دەبووین پاش ئەوە چووینە سەر جادەیەك سەیارە زۆر دەهات بەسەریدا، دەبوایە پێنج پێنج لەو مەودایەدا ڕامانبکردایە و بپەڕینایەتەوە ئەوبەر جادەکە و خێرا سەرکەوتیشینایە بەسەر گردێکی بەرزدا بۆ ئەوەی لەناو شاردا ڕزگارمان بێت و بەو شوێنەدا بڕۆشتینایەتەوە پشتی شارەکە،
سبحان الله پێش پەڕینەوە سەیارەیەکی کۆماندۆ کەجێبێك بوو دەرکەوت و خۆمان دا بەزەوی داو هاتە تەنیشتمان وەستا، پاش ئەوەی سەیارەی کۆماندۆکە وەستا لەسەر جادەکە، دیار بوو دوو کۆماندۆ دابەزین و هاتنە قەراغی جادەکەوە و لایتێکی

بەقوەتیان داگیرساند بەرەو ناو دەشتایی و وەردەکەو کەمێك وەستان و سەیرێکی ئەوناوەیان کرد بەڵام سوپاس بۆ خوا سەیری بەشی خوارەوەیان نەکرد کە خۆمان دابوو بەزەوی دا پاش چەند دەقەیەك وەستان و پاشان سەرکەوتنەوەو ڕۆشتن خێرا قاچاخچیەکە وتی: بابڕۆین ئەم شەو دەبێت بگەینە ناودارستان چونکە هەست دەکەم پێیان زانیوین ، وە پێشمان لێ دەگرن چونکە عادەتی کۆماندۆی یۆنانی وابوو شەوانە گەر ناو شار و قەرەباڵغی نەبوایە نەیاندەگرتیت بۆ ئەوەی کەس لەدەستیان هەڵنەیەت و بەیانیان کاتێك تۆ لەناو کیسە خەوەکەتدا دەبوویت و خەوتبویت کاتێکت دەزانی بە هێواشی خۆیان دەدا بەسەر وەجبەکە و دەیاندا بەسەرتدا و نەیاندەهێشت کەس بە ئاسانی دەربچێت! بۆ ئەو مەبەستەش گەر هەستت پێبکرێت قاچاخچیەکان شوێن دەگۆڕن و بەڕێگایەکی دوورتر دەتبەن کە ئەوەش ماندووبوونی زۆری دەوێت.

سوپاس بۆ خوا لەجادەکە پەڕینەوەو بە پشتی شاری (دیمەتیکۆ)دا سوڕاینەوە، تاوەکو بگەینە ناو دارستان جادەیەکی ئۆتۆبانی گەورە لەبەردەممماندا مابوو کە هەرسێ وڵاتی (یۆنان و بولگاریاو تورکیا)ی دەبەستەوە بەیەکەوەو نەماندەتوانی بەسەر جادەکەدا بپەڕینەوە لەبەر زۆری سەیارە و قەرەباڵغی جادەکە بۆیە بەناچاری بەدوای پردێکدا گەڕاین و بەهۆی ئاوەوە نەمانتوانی لە یەك دووانێك بپەڕینەوە تا گەشتینە پردێك و ئاوی کەمتر بوو لەژێرییەوە پەڕینەوەو، لەوبەر جادەکەشەوە گردێکی بەرز هەبوو زۆر بەجوانی لایتی سەیارەکان لێیان دەداین تا ئەوەی کەمێك دوور کەوتینەوە و چووینە سەر جادەیەکی خۆڵ ڕێگەمان دەکرد هەر ئەوەندەمان خۆش بوو ماتۆڕ سوارێك بەخێرایی بەرەو ڕوومان هات و فریا نەکەوتین لابچین لەسەر جادەکە خێرا خۆمان دا بەزەوی دا، باوەڕ بکەن بەناو ئەوهەموو نەفەرەدا ڕۆی کەسمانی نەبینی لەقەراغ جادەکەدا.




ئەو شـەوە زۆر مانـدوو بـووین چـونکە ڕۆشـتنمان خێرابـوو لەبەر ئەوەی خەریـك بـوو کاتمـان درەنـگ بێـت تـا بگەیـنە نـاو دارسـتان بە مەجبـوری دابەزیـنە نـاو شـارەکەوەو دەبـوایە بەقەدبڕی خۆمـان بگەیانـدایەتە نـاو دارسـتانەکە! کاتێك دابەزیـنە ناوشـارەوە قـاچـاخچیەکە وتی: دەبێـت زۆر بە هێواشی بـڕۆن تەنـانەت نابێـت تەپەی پێشـتان بێـت چـونکە ئیتر بەنـاو گەڕەکدا دەڕۆیـن و کات درەنگەو خەڵکی خەوتـوە تەنها یەك کەس بمانبینێت خێرا تەلەفـون بۆ پۆلیس دەکرێت و ڕزگار بوونمان ئاسان نیە بۆیە دەت وت چاوشارکێ دەکەین لەگەڵ سـەیارەیەك دەرکەوتایە یان دەنگێك بهاتایە دەبوو خۆمام بـدەین بەزەوی دا تـا دەنـگەکە نەدەمـا قەدەری خـوا بەهـۆی زۆر مانـدووبوونمان لەو شـەوەداو دەسـت نەکەوتنی ئـاوی خـواردنەوە نەفەرێکمـان کە نەخۆشـی گـورچیلەی لەگەڵ دابـوو تەواو پەکی کەوت و پێش گەشـتنە نـاو شـارەکە کەوت بەزەوی داو، وتی تەواو جێم بهێڵن من ناتوانم بێم، لەوکاتەدا چەندێك هاواری ئاومان کرد بۆی بڕواتان هەبێـت تەنها چەنـد دڵۆپێـك لە نـاو سـەری دەبەیەکـدا لای کەسـێك دەسـتکەوت کە تەنها لێوی پێ تەڕکرد، دواتر قاچاخچیەکە وتی: کاکە ڕێمان زۆر لەبەر ماوەو لە سبەی شەویشـەوە دەچینە نـاو دارسـتان و ئیتر بە ئاسـانی ئاوەدانیمـان دەسـت ناکەوێت هیچ نەبێـت با بیگەیەنینە نـاو شـارو لەشـوێنێکدا بەجێی دەهێڵین و بەیـانی خـۆی تەسـلیمی پۆلیس بکات بەهەر حاڵ ئێمەش زۆر ماندوو بووین یەکێك کۆڵە پشتەکەی هەڵگرت و دوو نەفەر دوو نەفەریـش بەسـەرە ئەو کەسـەمان هەڵگـرت تـا گەشـتینە نـاو شـار بەڵام قەدەری خـوا تەنها ڕێگەیەك لەبەردەممانـدا هەبـوو لێی بپەڕینـەوە بـۆ ئەو بەری جادەکە بۆ تەرەفی ناو دارستانەکە بەڵام ماڵێك بەخەبەر بوون و سەگیشیان هەبوو ، هەر لەدوورەوە کەوتــنە وەڕیــن کە ئێمەیــان بینـی و خــاوەنی مــاڵ کە هــاتە دەرەوە لەدوورەوە ئـێمەی بەدیکـرد بەپەلە ڕای کـردە ژوورەو،قاچـاخچیەکە وتی:تـازە بینـراین خێرا بـا ڕاکەیـن و لەجـادەکە بپەڕیـنەوە ئیتر ئەوکەسـەمان بـۆ هەڵنەگیراو لەویـادا







جێمان هێشت و دەستمان کرد بەڕاکردن! بەشێوەیەك هەموو خەڵکی ئەو ناوچەیە بەدەنگی سەگەکان خەبەریان بۆیەوەو هەر ئەوەندەمان دەزانی گڵۆپ هەڵدەکرێت و خەڵکی لەپەنجەرەو دەرگاوە سەر دەردەهێنن بەڵێ تەلەفون کرا بۆ پۆلیس و لەماوەی دە خولەکدا جێب لەسەر جێبی کۆماندۆ دەگەشت کە من بۆ خۆم تا شەش دانەم ژمارد!.

ئیتر لەویادا هەندێکمان لە تینویەتی و ماندوو بوون دا و بینینی ئەو هەموو سەیارەیە کە پێشتر تەنها لەفلیمدا بینیبوومان ئەژنۆیان شکاو هەنگاویان پێ هەڵنەدەهات سوێندتان لەسەرم نیە نەفسی نەفسیەك بوو پیاو ئەو پیاوە بوو ڕابکات بەرەو ئەو بەری جادە بەدوای قاچاخچییەکەدا و کاتێك گەشتینە سەر جادەکە یەکەم سەیارەی کۆماندۆ گەشت و خێرا دابەزین و بەدوامان کەوتن و دەستیان کرد بەهاوارو جوێندان تا ڕاوەستی! هاوڕێیەکم کە خەڵکی شاری (هەولێر) بوو پێکەوە دەژیاین لە (ئەستەمبوڵ) وتی کاکە تۆ ڕاکە گەر دەتوانیت، ئەو کەمێك قەڵەو بوو وتی: من خۆم دەشارمەوەو کەمێك یۆنانی دەزانم و بەیانی بە شەمەندەفەر هەوڵ دەدەم سەفەربکەم گەر نەگیرام تۆ بڕۆ خۆت نەجات بدە بەڵێ لەو قسانەدا بووین ئیتر ئێمە ڕامان دەکردو دەنگی ویقە ویقی سەیارەی پۆلیس و کۆماندۆ شاری (دیمەتیکۆ)ی کردە ڕۆژی ڕووناك و پێش گەشتنە ناو دارستانەکە سەیارەکان دوامان کەوتن و گوێم لە هاواری هەندێك برادەرم بوو لەدوامەوە کەدەگیران و جێبێکیش تا دەهات لێمان نزیك دەبۆیەوە!

پاش ئەوەی جێبەکانی کۆماندۆی یۆنانی لێمان نزیك بۆیەوە لەتەنیشتمانەوە باخێکی گەورەی لێ بوو بەپەلە خۆمان هەڵدایە ناو باخەکەو تەلبەندی باخەکەمان بڕی، ئیتر کۆماندۆکان وازیان لێ هێناین و ڕزگارمان بوو سوپاس بۆ خوا لەویاشداو، خێرا قاچاخچیەکە وتی: وەختی دانیشتن نیەو دەبێت بڕۆین و بگەینە ناو دارستان ، چونکە







ئەوان شارەزای ڕێگەکانن و بەئیسراحەت پێشمان لێدەگرن ، قەدەری خوا لەویادا سێ کەسمان جێمان و دەستگیر کران،بەڵێ بەتینوویەتییەکی زۆرەوە دەستمان کرد بەڕێ کردن بەناو ئەو کارگەو شەریکاتانەی کە دەکەوتنە پشتی شاری(دیمەتیکۆ)! پاش ماندوبوونێکی زۆر گەشتینە ناو چەمێك و لەگەڵ گەشتنماندا هەموومان دەستمان کرد بە ئاو خواردنەوەو، دەبەی ئاوەکانیشمان پڕ کرد لە ئاو لەماوەی چەند دەقەیەکدا، پاشان دەستمان کردەوە بەڕێ کردن، تا ئەوەی تەنها کارگەیەك لەپێشمان مابوو بۆ ئەوەی بگەینە ناو دارستان و کاتی شەویش بەرەو کۆتایی دەچوو قاچاخچیەکە وتی: لێرەدا دەبێت دووبارە بە هێواشی بڕۆین چونکە زۆرجار لەم کارگەیەدا کەمین دانراوە، چونکە دەزانن کۆتا ڕێگەیە بۆ ناو دارستان، بەڵێ بەهەرحاڵ بەڕێکەوتین و ڕێبەرێك چوە ناو کارگەکەوەو ئیشارەی پێداین کەبڕۆین و هیچ نیەبەڵام کاتێك ڕۆشتینە ناو کارگەکەوە شۆفڵ و گەڵابەو سەیارەیەکی زۆری تێدا بوو.
لەوکاتەدا بەهێواشی گوێمان لەدەنگی سەیارەیەك بوو بەڵام هیچ ڕۆشنیەکمان نەبینی!، تومەزە جێبێکی کۆماندۆکانەو بەهێواشی دەڕوات و لایتیشی کوژاندۆتەوە تا ئێمە هەستی پێ نەکەین بڕواتان بێت خێرا خۆمان خستە لای چەند شۆفڵ و گرێدەرێکەوە کەلەناو کارگەکەدا وەستابوون، جێبەکە هاتە ناو کارگەکەوە و وامان زانی کەشف بووین چونکە لەبەردەم ئەو شۆفڵ و گرێدەرەدا وەستا کە ئێمە خۆمان خستبۆیە پاڵیەوە، بەڵام سوپاس بۆ خوا کەمێك وەستاو ڕۆشت!.

## گەشتنە ناو دارستانەکانی نێوان هەردوو وڵاتی(بولگاریا - یۆنان)

پاش نیو کاتژمێرێك کە بەتەواوی زانیمان هیچ نەبوو بەڕێکەوتین بەرەو ناو دارستانێکی چڕو پڕ کە لەژیانمدا بۆ یەکەم جار شوێنی وا ببینم و ووردە ووردە دوونیا ڕۆشن





بــۆیەوەو لەدوورەوە دەمــانبینی شــوانەکان مەڕومالاتەکانیــان بەڕێ دەخەن بەرەو لەوەڕگا!
قاچاخچیەکە وتی دەبێت خێرا بکەین و لێرەش زۆر دوور بکەوینەوە تاوەکو شوێنێکی چڕو پڕ پەیدا بکەین و خۆمانی تێدا حەشار بدەین تاوەکو خۆر ئاوا دەبێت، چونکە ئاشکرا بووین وە بەشەودا گەر مانگە شەو نەبێت ناتوانین لە ناو دارستاندا ڕێ بکەین و ڕۆشتنی ناو دارستان جیاوازتر بوو لە شوێنەکانی تر لەشوێنەکانی تردا بە شەو دەڕۆشتین و بەڕۆژ دەخەوتین بەلام لەناو دارستاندا بەشەو دەخەوتین و بەڕۆژ دەڕۆشتین چونکە کاکی بەکاکی بوو کەس بەکەس نەبوو تەنها ئاسمانمان دەبینی و قاچاخچیش تەنها بە شارەزایی خۆیی و قیبلە نما دەڕۆشت بەڵێ سوپاس بۆ خوا پاش ماندووبونێکی زۆر گەشتینە ناو شوێنێکی چڕو پڕ کە دەبوایە لەسەر دەم خۆمان بخشاندایە تاوەکو هەمووومان لە شوێنێکی بچوکدا کۆ ببینەوەو کیسە خەوەکانمان دەرهێنین و بخەوین بۆ ئەوەی لەیەکتری دانەبڕێین، قاچاخچیەکەش وتی: پێلاو دامەکەنن نەوەك لەگەرمەی خەودا بدەن بەسەرمانداو دەبێت خێرا ڕابکەین و جار جارەش یەکێك هەستێت و چاوێك بگێڕێت!.
باوەڕ بکەن هێندە هیلاك بووم خێرا بەتەیەموم نوێژم کردو خەوم لێکەوت پاش ماوەیەك لەدەنگی وەڕینی سەگ بەخەبەر هاتم و خێرا کیسە خەوەکانمان کۆکردەوەو قاچاخچیەکەمان وتی خۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕاکردن،تادەهات دەنگی سەگوەڕەکە نزیك دەبۆیەوەو،بەشێوەیەك گوێمان لە زەنگۆڵەی ملی مەڕومالاتەکان بوو کەبەرەو لامان دەهاتن تومەز ئەمە شوانێکەو مەڕەکانی بۆ لەوەڕ هێناوەتە ئەو شوێنە خێرا لوتمان گرت و وورده وورده بەسنگە خشکێش بەرەو ناو دارستانەکە دەڕۆشتین تا بەتەواوی لەدەنگەکە دوور کەوتینەوە ئیتر لەویاش دا ڕزگارمان بوو سوپاس بۆ خوا!.




لەوڵاتی(یۆنان)دا شوانەکانیشی مۆبایلیان پێیە و لەلایەن حوکمەتەوە هاوکاری دەکرێن غەیری ناوچە مسوڵمانە تورك نشینەکان نەبێت باقی ناوچەکانی تر لەگەڵ کەسێك یان شوانێك بتبینێت خێرا تەلەفون دەکات بۆ پۆلیس و ئاشکرات دەکات و دەدرێت بەسەرتا ئیتر ڕێکردن بەڕۆژ دەستی پێکرد بەرەو سنورەکانی وڵاتی(بولگاریا) بە وتەی قاچاخچیەکە ئیتر جارێ دوور دەبین لە مەترسی تاوەکو دەگەینە ناوچەی(سەبزی) کە دەکەوێتە نێوان شاری (دیمەتیکۆ)و شاری(کۆمەتین)و کۆماندۆی ئەوناوە بەناوبانگن لە ئازایەتی و دەستگیر کردنی وەجبەی قاچاخچییەکان ئەو ڕۆژە تا ئێوارەو تاریکایی شەو ڕێمان کرد تەنها ئاسمان نەبێت هیچ شوێنێکی ترمان لێ دیار نەبوو ئیتر شەومان بەسەر هات و قاچاخچیەکەمان بردینیە ناو شوێنێکەوە لەناو دارستانەکەو وتی کاتی ئەوە هاتووە کە بخەوین و سبەینێش ڕێگایەکی دوورو درێژو زۆرمان لەبەردەمدایە بەڵام سوپاس بۆ خوا کە ئەو فەزڵەی بە برا بچوکتان بەخشی بوو قاچاخچیەکە لەناو نەفەرەکاندا منی بانگ کردە لای خۆی و وتی: کاکە گیان تۆ کەمێك وت و وریایت وەك سەیرم کردوویت ئەم چەند ڕۆژە لەلای خۆم دابنیشەو من دەخەوم تۆش هەرشتێکت بینی ئاگادارم بکەوە خێرا تاوەکو شوێنمان بگۆڕین خۆمان ڕزگار بکەین!.

ڕاستیەکەی من خەوم نەدەهات و هەر ئەوەندەم خۆش بوو پرخە پرخی خەو دەستی پێکرد لەناو نەفەرەکانداو سبحان الله لەوکاتەدا کەروێشکێك بەخێرایی بەرەو ناومان هات و پیاو ڕاست بڕوات یەکەم جار وەمزانی کۆماندۆکانن خۆیاندا بەسەرماندا هێندە دەنگی پێی تەپەی دەهات! لەوکاتەدا گوێم لەدەنگی سەیارەیەك بوو وە تەنها من بەخەبەر بووم ، لەگەڵ نزیك بۆیەوە سەیرم کرد جێبی کۆماندۆیەو زۆر بەهێواشی بەسەر جادەکەی تەنیشتماندا دەڕوات لەنزیك ئێمەوەو لایتیشی کوژاندۆتەوە ،

منیش لەوکاتەدا هیچم نەکرد چونکە وتم ئێستا دەبێتە هات و هاوارو هەمووومان لێك دادەبڕێین بۆیە بەناچاری بێدەنگ بووم تاوەکو ڕۆشت لەپاش ڕۆشتنی قاچاخچیەکەم







هەستاندو وتم کاکە حاڵ و مەسەلەیەکی ئاوا ڕوویدا بەپەلە هەستاو وتی خوا ماڵتم ئاواکرد نەموت خێرا هەڵم سێنە؟.
وتم: جا کاکە چۆن شتی وادەبێت ئێمە ڕابکەین و ئەو خەڵکەش پەرتەوازە بێت ؟ چۆن شتی وادەکەم ، دواتر ئەو لەسەر جادەکە دەڕۆشت و دوور بوو لێمان و دڵنیاش بە هێندە ئازا نین بێنە ناو ئەم دارستانە چڕو پڕەوە ئیتر خێرا نەفەرەکانی خەبەر کردەوەو وتی دەبێت بڕۆین شوێنمان باش نیە پاش ئەوەی لەو شوێنە هەستاین لەناو دارستانەکەدا قاچاخچیەکە وتی دەبێت نەخەوین و ڕێبکەین چونکە هێشتا بەدوامانەوەن و ئیتر بەسەر جادەیەکی خاکی دوورو درێژی بێ کۆتایی کەوتینەڕێ و تەنها بەردەم خۆمان و ئاسمان دیار بوو هێندە دارستانێکی چڕو پڕ بوو چەند کاتژمێرێك ڕێمان کرد چونکە بەڕۆژەکەشیدا ڕێمان زۆر بڕی بوو تەواو شەکەت و ماندوو ببووین و لە شوێنێکدا لامان دا بۆ خەوتن تا ڕۆژی دواتر.
کاتێك خەبەرمان بۆیەوەو زنجیری کیسە خەوەکەم کردەوە، سبحان الله سەیرم کرد چاو چاو نابینێت تەم و مژێك دەوری گرتبوین باوەڕ بکەن هەتاوەکو نزیکی ئێوارە لەو دارستانە چڕەدا هەر بەدەوری خۆماندا دەیسوڕاندینەوە،
ئیتر شەوانمان بوو بە کاتی خەو ڕۆژیش بووە ڕێکردن دەنگی باڵندەو خشەی گیاندارە کێویەکان نەبێت هیچمان نەدەبینی و نەدەبیست ئەوەی کە بەدیم دەکرد لەو دارستانەدا ئەو ناوچەیەی کە ئێمەی پێدا دەڕۆشتین بەشی مەسیحیەکەی بوو کەدەکەوتە نێوان هەردوو وڵاتی (بولگاریا و یۆنان)ەوە، سوێند بەخوا ناوچەیەکی زۆر وشك بوو، ئاومان دەست نەدەکەوت هیچ خۆراکێکیشی لێنەبوو بەشێوەیەك ڕۆژ هەبووە تا ئێوارە یەك جار زەلکاوێکمان بینیوەو لەگەڵ پیسی ئاوەکەش وەك قوڕاو وابوو بەڵام شەربەتی تۆزی کیسەمان لەگەڵ خۆمان بردبوو تێکەڵمان دەکردو





چاومان دەنوقاندو دەمانخواردەوە، ئەمەش فکرەی برایەك بوو پێی وتم (١٠ بۆ ١٥) کیسەی شەربەتی تۆز با بکڕین بۆ ئاوی پیس خواردنەوە پێویستمان دەبێت!.
بەڕاستی باس کردنی ناو ئەو دارستانە چڕوپڕو دوور و درێژو کاکی بەکاکیە هەرگیز کۆتایی پێ نایەت و ئەگەر ببم بە خاوەنی سەروەت و سامانی هەموو دوونیا هەرگیز لەخۆم ناگۆڕێم بەپشتیوانی خوا وەك کەسانێك گۆڕان بەسەر بیرو بۆچونیان هات ، کاتێك گەشتنە شوێنی خۆش و پشویان دا خوایان لەبیر کرد دڵنیابن خوای گەورەش ئەوانی لەیاد کردووە چونکە تەنها فەزڵ و بەرەکەتی خوای گەورە ڕزگاری کردین لەو شوێنە سامناك و بێ ئاویەدا و ئیتر وردە وردە خواردنیشمان بەرەو کۆتایی ڕۆشت!.
سەرەتا پاش چەند ڕۆژێك نانی کۆڵەپشتەکانمان هەندێك کەڕوی کردبوو، هەندێك نەفەر فڕێیان دا، بەڵام دواتر ئەو کەڕووەشمان دەست نەدەکەوت کە تۆزێك کەفی مەعیدەمانی پێ دامرکێنینەوە جگەرە کێشەکانیشمان گەڵای دارەکانیان لای خۆیان وورد دەکردوو وشکیان دەکردەوەو لە پەڕەی دەفتەری تەلەفوندا دەیان پێچایەوەو جگەرەیان دەکێشا بەشێوەیەك گەنجێکمان چونکە برسی بوو تەواو پەکی کەوت و جگەرەیەکیشی کێشا لەو شێوەیە ئیتر حاڵی تەندروستی تەواو تێك چوو وە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو زوو زوو دەیوت خۆم تەسلیم دەکەم قاچاخچیەکەش وتی: لەو شوێنەدا هیچ ئاوەدانی لێ نیەو با نزیك بینەوە لە لادێیەك بڕۆ خۆت تەسلیم بکە، بەس لێرە کەس نایەت بەدەمتەوەو تیا دەچیت ئیتر لەو شوێنە کاکی بەکاکیەدا لێمان دابڕوا نازانین چی بەسەر هات هەرچەند هاوارمان دەکرد هیچ دەنگ نەبوو ئەویش کاتێك پێمان زانی لەشوێنێك لاماندا و پشومان دا سەیر دەکەین لەگەڵمان نەماوە!. دوای ئەوەی خواردنیشمان پێ نەما ووردە ووردە حاڵمان بەرەو پەرێشان دەچوو، قاچاخچیەکەش پێی وتین بەس ئەمشەو ڕزگارمان بێت بەیانی ڕێدەکەین و






دوو بەیانی سواری شاحینە دەبین لە ناوچەی (سەبزی). وامان لێ هاتبوو هەردارێك شتێکی پێوە بوایە دەمان خوارد شتێکی سوورمان خوارد کە لەژیانمدا شتی وام نەبینیوەو نەخواردووە شێوەی وەك زەیتون وابوو بەڵام زۆر تفت و ترش بوو هەموو ناو دەم و قورگی برین و ئازاری سك ئێشەشی بۆ هەندێکمان دروست کرد لەگەڵ چەند دارێکی هەرمێ بەڵام هەمووی تاڵ بوون، هێندەمان خواردو جانتاکانمان پڕ کرد لێی تەواو ناو دەممان و مەعیدەمانی وێران کردا. بەڵێ بەوشێوەیە تەواو شەکەت بووین و هەموومان هاوارمان لێ هەستابوو قاچاخچیەکەش خۆی جگەرەی لێ بڕابوو حاڵی برسیەتی پەرێشانی کردبوو گەشتینە دەمەو ئێوارەو ئیتر ڕێگەمان بۆ نەکرا لە چۆڵەوانیەکدا ئاگرێکمان کردەوەو وتی: کاکە با بخەوین باشترە بەخوا ناتوانن ئاوا ڕێبکەن بەڵکو بەیانی بگەینە نزیکی گوندە ئیسلامیەکان و لەوێ شتێك پەیدا بکەین چونکە لێرە بەس بمانبینن ئاشکرامان دەکەن، لە گوندە مەسیحیەکان.
لەتاو برسیەتی و بێ نان و ئاویماندا خەومان لێکەوت تا بەرەبەیانا. پاش ئەوەی بەیانیەکەی بەسکی برسیەتی خەبەرمان بۆیەوە قاچاخچیەکە وتی: دەبێت دابەزینە ناو ئاوەدانییەك تاوەکو خواردنێکمان دەست بکەوێت، ئەگەرچی ئەم ناوەش هێشتا ناوچەی مەسیحیەکانەو بەس بمانبینن ئاشکرامان دەکەن بەڵام هیچ چارەیەکی ترمان نییە بەڵێ بەڕێکەوتین پاش چەند کاتژمێرێك ڕێبڕین
لەدوورەوە تەنها ماڵێکمان بەدی کردو هێندە برسی بووین گوێمان نەدا بە گیران، زۆربەمان ئاواتە خواز بووین بگیرێین بەهەرحاڵ هەموومان بەرەو ماڵەکە ڕۆشتین کاتێك نزیك بووینەوە سەیرمان کرد ماڵێکە خەریکی بەخێو کردنی هەنگ و مەڕوماڵاتن لەو ناوچەیەدا ئیتر قاچاخچیەکە زمانی تورکی دەزانی لەگەڵ نەفەرێکدا ڕۆشتن بۆ ماڵەکەو ئێمەش لە نزیك سەد مەترێکەوە لەدووری ماڵەکەوە لەسەر ڕێی ماڵەکە دانیشتین،







دوای ئەوەی ئافرەتێك و پیاوێك هاتنە دەرەوە لەماڵەکە سەرەتا ترسان کاتێك ئەو هەموو نەفەرەیان بینی بەڵام دوای سەلام کردن سوپاس بۆ خوا ماڵێکی مسوڵمانی تورك بوون کاریان بۆ خێزانێکی یۆنانی دەکرد لەویادا داوای نانمان لێکردن وتمان بەهەر نرخێك بێت دەیکڕین لێتان ئەوانیش وتیان بەڕاستی ئاردمان هەیەو کەمیشە لەوەیە بتوانین تەنها دوو سەمونی گەورەی یۆنانیتان بۆبکەین کە ئەوبرایانەی یۆنانیان بینیبێت دەزانن کە کام سەمونەیە و بەسەمونی خێزانی ناسراوەو گەورەیە.
نزیکەی دوو کاتژمێرێك چاوەڕوانمان کرد تاوەکو دوو سەمونەکەی بۆ دروست کردین و یەکی پارچەیەکمان بەرکەوت لەگەڵ هەندێك کەرەداو کەمێك ئافاقەی دایەوە بە بەرمان سوپاس بۆخوا هەرچۆنێك بوو بەزۆر هەندێك پارەمان بۆ جێهێشتن و سوپاسمان کردن و داوامان لێکردن کەوا ئاشکرامان نەکەن بەڵام چونکە مسوڵمان بوون وتیان دڵنیابن لەوە کەوا ئێمە هەرگیز فێڵ لە برای مسوڵمانی خۆمان ناکەین لەپاشان دا دووبارە بەڕێکەوتینەوە بەناو ڕێگا چڕوپڕەکەی ناو دارستاندا تا نزیك بووینەوە لە سنوری نێوان هەردوو وڵاتی(بولگاریا و یۆنان) و ئیتر ئەمجارە لەبەر نەمانی خۆراك ناچاربووین شەویش ڕێبکەین بەسەر جادەی قیرداو هەرکات لایتی سەیارە دەربکەوتایە لەدوورەوە خێرا خۆمان فڕێ دەدایە قەراغ جادەکان و خۆمان دەدا بەزەویدا تا سەیارەکە لەچاو دیار نەدەما کاتێك بەسەر جادەکاندا دەڕۆشتین گڵۆپی لادێ و شارەکانی (بولگاریا)مان دەبینی
تاوەکو نزیکی بەرەبەیان لەسەر ئەوجادە کاکی بەکاکیەدا ڕێگامان بڕی لەهەندێ شوێن سندوقێکی سێ گۆشەمان دەبینی لەسەر جادەکە مۆمێکی تێدا داگیرسابوو وە وێنەی خاچێکی بەسەرەوە بووا پرسیارم کرد لەقاچاخچیەکە سەبارەت بەو سندوقە پێی ڕاگەیاندم ئەوە لەم شوێنەدا کەسێك مردووەو بۆ لێخۆشبوون و لەیاد نەچونی ئەوکەسە ئەم سندوقەیان دروست کردووە!







سبحان الله کاتێك ئەوەم بیست سوێند بەخوا ئەوجا هەستم بەغەریبی کرد کە ئیتر من لەوڵاتی مسوڵمانانداا نەماوم و لەجیاتی منارەی مزگەوت خاچم دەبینی لەجیاتی دەنگی الله اکبر زەنگی کەنیسەم دەبیست زۆر دڵم پڕ بوو بەڕاستی هەر داوای لێخۆشبوونم لەخوای گەورەدەکرد چەند جارێك یەك دوو نەفەر ویستیان دەست بەرن بۆ ئەو سندوقانەو بیان شکێنن و چونکە هەندێکیان پارەی وردەیان تێدابوو دەیان ویست دەریبهێنن! منیش ڕێم لێگرتن و وتم، بۆ وادەکەن کاکە وتیان وازبێنە بایشکێنین ئەوە هی مەسیحیە! منیش بەسەر سوڕمانێکەوە پێم وتن سەیرم لێتان دێت ئەگەر ئێوە هێندە دڵسۆزی دینی خوان و یەکخوا پەرستن ئەوە سوجدە بۆ خوا دەبەن و نوێژ دەکەن نەك دەست درێژی بکەنە سەر ئاینێك کە لەژێر سایەی ئیسلامیشدا مافیان پێ دراوەو کەسیش بۆی نەبووە دەست درێژی بکاتە سەر پەرستگاو کەنیسەکانیان وتم: ئەمەی ئێوە هەم نەشارەزاییتانە لەشەرع وە هەم بۆ دزینی ماڵی خەڵکیە نەك لەبەر خوا لەناوی بەرن داماوینە!.

## گەیشتنە نێوان سێ ڕیانی وڵاتی(بولگار) و گوندی(مەسیحی) و گوندی(ئیسلامی).

بەهەرحاڵ بەیانیمان لێ نزیك بۆیەوەو دەبوایە پێش خۆرکەوتن بگەشتینایەتە گوندە ئیسلامیەکان و لە سێ ڕیانی بولگاریاو یۆنان و گوندی مەسیحی و ئیسلامی ڕزگارمان بوایە چونکە گەر ڕۆژت لێبێتەوە شوانەکانی گوندە مەسیحیەکان دەتبینن و خەبەرت لێ دەدەن ئێمەش تەواو شەکەت ببووین و زۆریش برسی بووین بۆیە قاچاخچیەکە وتی: لەم لادێیە کە کۆتا لادێی مەسیحیەکانە کاتی خۆی لەگەورەکانیدا نەفەری قاچاخ، مەڕو بزنی دزیون بۆیە زۆر ڕقیان لە نەفەری قاچاخەو دەبێت خۆمان ڕزگار بکەین یان لەناو دڕك و داڵێکدا خۆمان حەشار بدەین گەر نەتوانین ئەم شەو بپەڕینەوە!.





قەدەری خواش وابوو کەوا گوندەکە لە شاخێکی بەرزدا بوو سنوری هەبوو بە وڵاتی (بولگاریا)وە و ئەووڵاتەش کەوتبۆیە دەستە ڕاستەوە و تەنها ئاوێك لە نێوانیاندا هەبوو لە بەشی خوارەوەی گوندەکەو ئێمەش لەو نێوانەدا گیرمان خواردبوو ، چونکە گەر لەو نێوانە بتەوێت دەربازت بێت دەبێت بەشەودا پێیدا تێپەڕ ببیت بۆ گەشتن بەیەکەم گوندی ئیسلامی کەدەکەوتە پشتی ئەو شاخەوە، لەبەر ئەوەی بەڕۆژ دەبینراین نەماتتوانی بڕۆین و ناچار ڕێمان گۆڕی و قاچاخچیەکە لە چەمەکە پەڕاندینیەوەو بردینیە ناو خاکی بولگاریاوەو لەناو دڕك و داڵێکدا داینداین و وتی: نامەوێت تا ئێوارە کەس دەنگی بێت، برسی بین یان تینوو ئاو پڕکەن لەچەمەکە ئێستا چونکە بەخوا لەپۆلیسی (بولگاریا) بێ شەرەفتر نیە لەسەر زەوی دا گەر پێمان بزانن سەگمان تێ بەردەدەن و سنورداشیشمان دەکەنەوە بۆ وڵاتی (تورکیا)و ئەم گوندەش خەڵکەکەی پێمان بزانێت تەسلیمی کۆماندۆی یۆنانیمان دەکەن و ئێرەش سەر بە کۆماندۆی ناوچەی(سەبزی)یە زۆر خراپن و ئازارێکی باشمان دەدەن،وتی: بەس ئەمشەو ئارام بگرن سبەی شەو دەگەینە ناو گوندە ئیسلامیەکان و لەوێ بەئاسانی خواردنمان دەست دەکەوێ بەڵێ بە برسیەتی خەومان لێکەوت دووبارە و تا دەمەو ئێوارە لەویادا خەوتین و جار جارەش هەورێك دەهات و بارانی ڕەحمەتی بەسەردا دەڕشتین لەملاو لاشەوە وەڕەی سەگی شوانەکان و دەنگی خەڵکی هەردوو وڵاتی (یۆنان و بولگاریا)مان دەبیست بەشێوەیەك لێمان نزیك دەبۆیەوە دەمانوت ئێستا نا ئێستا ئاشکرا دەبین سوپاس بۆ خوا کەس نەیبینین و دووبارە ئێوارە نزیك بۆیەوەو خۆریش بەرەو ئاوابوون دەڕۆشت و دووبارە هەستاینە سەرپێ و خۆمان ئامادەکرد تا بگەینە خواردن نەك (ئەسینا)ی پایتەختی (یۆنان)!.

پاش ئەوەی کەوتینە ڕێ سوپاس بۆ خوای گەورە ئەو سێ گۆشە ترسناکەمان بڕی و لە ترس و دڵە ڕاوکێی ئەو ناوچەیە ڕزگارمان بوو وە قاچاخچیەکە کەمێك دڵخۆشی







کردین و وتی ئەگەر ئیتر لێرەدا بگیرێین ترسی سنورداشیمان لەسەر نیەو بەڵکو دەمانخەنە کەمپ و دواتر وەرەقەمان بۆدەکرێت و دەمانێرن بۆ (ئەسینا)ی پایتەختی یۆنان ئەوشەوە لەبەر تاریکایی شەو وە بارینی باران بەسەرماندا نەمانتوانی زۆر ڕێگە بکەین و لەشوێنێکدا لامانداو خەوتین تا بەیانی!.

## گەیشتنە ناو گوندە (ئیسلامیەکان)ی وڵاتی یۆنان.

بەیانی کاتێك هەستاین دەستمان کردەوە بەڕێگە کردن تاوەکو خواردنمان دەست کەوێت لە شوێنێکدا ئیتر ترسمان نەما لە خۆشاردنەوە باوەڕتان بێت وردە وردە هەستمان بەخۆشیەك دەکرد و لەگەڵ داغڵ بوونمان بە ناوچەی گوندە ئیسلامیەکان هەناسەیەکمان بەبەردا هاتەوە و ڕزگارمان بوو لەو چاوشارکێیەی گوندە مەسیحیەکان و ئەوجا بە ئاشکرا شەو بووایە یان ڕۆژ ڕێگەمان دەبڕی چونکە گوندە ئیسلامیەکان شکاتیان لێ نەدەکردین وە سبحان الله ئەو موعجیزەیەی کە من بەچاوی سەری خۆم بینیم ئەوە بوو کەوا ناوچەی مەسیحیەکان وشك و بێ ئاو بوو تەنانەت بەدەگمەن دەنگی باڵندەشت دەبیست!، بەڵام خوا بۆ خۆی شاهێدە کەوا ناوچەی گوندە ئیسلامیەکان ناوچەیەکی بەپیت و بەرەکەت و ئاودار بوو بەشێوەیەك کاتێك ڕێمان دەبڕی بەناو دارستانەکانیاندا هەمووی ئاو و ئاوەدانی و درەختەکانی وەك سێبەر وابوون بەسەرمانەوەو یەك پارچە سەوزایی جوان بووا!. ئەمە بێ لە جریوە جریوەی ئەو هەموو باڵدارە دەنگ خۆشە!.

لەڕێگە ڕۆشتنەکەماندا دامان بەلای شوانێکی تورکی مسوڵماندا هەموومان لەدوورەوە هاوارمان کرد سەلام و عەلەیکوم مسوڵمان مسوڵمان ئیتر ئەویش بەدەست سەلامی وەڵامدایەوە و جێمانهێشت نزیکەی تا نیوەڕۆ ڕێگەمان کرد و دووبارە گوێمان زرنگایەوە بە بانگی محمد ﴿ﷺ﴾ کە ماوەی چەند ڕۆژێك بوو گوێمان لێ نەببوو ئیتر چووینە ناو چەمێکەوە پڕ بوو لە توتڕك و توو لەبرساندا دەستمان کرد







بە لێکردنەوەو خواردنی و ماشەڵا هێندە زۆربوو سوپاس بۆ خوا کەمێك ڤیتامینمان وەرگرتەوەو بێ ئێوە ناخۆش قڕیشمان خستە ناو دارەکان و تاقمان لێ بڕی دەتوت لە سۆماڵەوە هاتووین بەس بەخوا پێشنیان ڕاستیان فەرموو کە فەرموویانە برسێتی ڕەگی هاری پێوەیە!،چەمەکە هیچ ئاوی تێدا نەبوو ئێمەش لەناوەڕاستیدا دانیشتبوین کاتێکمان زانی قەدەری خوا لەسەرروومانەوە دەنگی شکاندنی دار دەهات زۆر بەگەورەیی ئێمەش هیچ هەستمان نەدەکرد ئەوە ئاوە و بەهۆی بارانەوە لەو چەند ڕۆژەدا و لێدانی هەورە بروسکە ئاو تەقیوە سبحان الله لەو ڕووداوەی کەبینیم کاتێکمان زانی ئاو دای بەسەرمانداو کوڕ ئەو کوڕە بوو خۆی ڕزگار بکات زۆربەمان ڕامان کردە لای دەستە ڕاستی چەمەکە و شەش نەفەرمان کەوتنە دەستە چەپ ئاوەکە هێندە زیادی کردو زۆر بوو، ئیتر لەیەکی دابڕاین و قاچاخچیەکە لای ئێمە بوو شەش نەفەرەکەش لەوبەر ئاوەکەوە دەگریان و هاواریان دەکرد تخوا جێمان مەهێڵن، ئێمەش وردە وردە لەم بەر ئاوەکەوە دەڕۆشتین و ئەوانیش لەوبەر سبحان الله دەستی کردە باران و ئاویش تا دەبوو بەرزتر دەبۆیەوەو ئاوێکی قوڕاوی بەخوڕ و سامناك کە لەژیانمدا شتی وام نەبینی بوو ئێمەش ناچار پەنامان بردەوە ناو دارستانەکە و لەبەر نەفەرەکانی ئەوبەر ئاوەکەش نەماندەتوانی جێیان بهێڵین!.

ئالەویادا کەڕزگارم بوو سەیرێکی ئاسمانم کرد و وتم خوایە دوو مەڕ نەزر بێت لەسەرم کەوا ڕزگارم بکەیت و بەسەلامەتی بمگەیەنیتە(ئەسینا)ی پایتەختی (یۆنان) و لەم ڕێگەیەدا هیچم بەسەر نەیەت کە تا ماوە ببمە مایەی خەفەت بۆ دایك و باوکم و دەستگیران و براو خوشکەکانم و کەسوکارم،بەڵێ کاتمان بەرەو تاریکی دەڕۆشت و ئیتر گوێمان بەوە نەدا بگیرێین یان نا چونکە ژیانی ئەو شەش نەفەرە لە خەتەردا بوو بۆیە هەر هاوارمان دەکرد بۆ یەکتری و بەڵێنمان پێ دەدان کەوا جێیان ناهێڵین تا ئەوەی خوای گەورە دەرووی خێری لێکردینەوەو پردێکی گەورە هاتە بەردەممان و







بەپەلە نەفەرەکان هاتنەوە ئەمبەر و باوەشمان کرد بەیەکدا وەك ئەوەی بڵێی لەخانەوادەیەك بوویێتین و دابڕابێتین لەیەك لەوکاتەدا ماتۆڕسوارێك پەیدا بوو لەسەر پردەکەو هاتە لامان وەستا سەیرمان کرد پیاوێکی بەتەمەنی مسوڵمانە و تورکە کڵاوێکی سپی جوانی لەسەردا بوو ئیتر لامان وەستاو کەوتینە قسەکردن لەگەڵی و داوای نانمان لێکرد کە بۆمان پەیدا بکات و وتی بەڕاستی ئەم ناوە زۆر خەتەرە کە ئێوەی لێن چونکە، سەر بە کۆماندۆی ناوچەی(سەبزی)یە و یەك دوو ڕۆژە زۆر هاتووچۆ دەکەن لەم ناوەدا وەك ئەوەی بزانن وەجبە هاتووە بۆیە هیچم پێ ناکرێت بۆتان چونکە بگیرێم حوکم دەدرێم ئیتر بینیم زۆر بێتاقەت بوو بۆمان و فرمێسك بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە وەك ئەوەی بگری بۆ حاڵی مسوڵمانان کەوا چۆن ماڵوێران و دەربەدەر بوون!.

دوای ئەوە خێرا سەرکەوتینەوە بۆ ناودارستانەکە تاوەکو دوورکەوینەوە لەئاوەدانی و، دوای ڕۆشتنمان چەند سەعاتیك لە شوێنێکدا لاماندا و پشووماندا و بەکیسە خەوی تەڕەوە خەوتین چونکە هەموو گیانمان تەڕ ببوو وە هەم کیسە خەوەکانیشمان و هەم برسیش بووین.

بەیانی دووبارە هەستاین و دەستمان کردەوە بە ڕێکردن و هاتینەوە نزیکی چەمەکەو سەیرمان کرد ئاو کەمی کردوە و بارینی ئەوبارانەش و هاتنی ئەو ئاوەش خێری تێدا بوو بۆ ئێمە، بەڵام ئێمە پێمان نەزانی تاوەکو بەچاوی خۆمان بینیمان ماشەڵا ئاو چەند گوێزی لەگەڵ خۆی هێنابو وەك ڕۆزیەك بۆ ئێمە باوەڕتان بێت هێندەمان کۆکردەوە و هێندەمان خوارد ئیتر سوپاس بۆ خوا تەواو برسیەتی شکاندین و لێشمان کۆکردەوەو هەڵمانگرت بۆ ڕێگاشمان!.





## گەیشتنە ناو ناوچەی(سەبزی) لەناو دارستاندا.

گەشتینە دەمەو پاش نیوەڕۆ و لاماندا لەشوێنێك و قاچاخچیەکە وتی: ئیتر داغڵی ناوچەی (سەبزی) دەبین بۆیە دەبێت بەشەو بڕۆین لەدوورەوە شوانێکمان بینی وەڕە وەڕی سەگەکانی لێمان نزیك بۆیەوە و خۆشی هاتە سەرمان سوپاس بۆ خوا ئەویش تورکێکی مسوڵمان بوو داوای خواردنمان لێکرد هەندێك توێشە بەرەی خۆی پێبوو دای پێمان بەڵام زۆربەمان هیچمان بەرنەکەوت چونکە زۆر کەم بوو وە وتمان مەڕێکمان پێ بفرۆشە وتی ڕێگە نەدراوم و ماڵی خەڵکەو ئەمانەتە لام!.
تا دوونیا تاریك بوو لاماندا و دواتر شوانەکەمان بەجێ هێشت و کەوتینە ڕێ تا ئەوەی کۆمەڵێك لۆفەی جادەی زۆر هاتە بەردەممان کەشێوەی وەك لۆفەکانی هاوینە هەواری سەڵاحەدینی خۆمان وابوو، بەڵام دەوری جادەکان هەمووی دارستان بوو، دەبوایە سەرکەوتینایەتە سەرەوە چونکە شاری(کۆمەتین) دەکەوتە پشتی ئەو چیایەوە، وەك چۆن لە لۆفەکانی مەسیفەوە دەشتی(هەولێر) دیارە، شاری(کۆمەتین)یش ناوچەیەکی تەختەو هەمووی دەشتە دەوروبەری وەك دەشتی شارەزوریش بەپیتە و هەمووی کاڵەك و شوتی و کشتوکاڵە!.
کاتێکمان زانی لەدوورەوە کۆمەڵە سەیارەیەکی جێب دەرکەوتن و ئێمەش بەناچاری لاماندا لەسەر جادەکەو چووینە ناو دارستانەکەوە، هەر ئەوەندەمان خۆش بوو نزیك بوونەوە بەتەنیشتماندا کەسەیر دەکەین ئەوە چەند جێبێکی کۆماندۆیە و بەدوای ئێمەدا دەگەڕێن! لەگەڵ قاچاخچیەکەمان جێبەکانی بینی دوونیای لە پێش چاو ڕەش بوو چونکە زۆر دەترسا لەکۆماندۆی ناوچەی(سەبزی) و دەیوت بتگرن هەر دەتکوژن ئەوەندە بێناموسن!.خێرا بەپەلە لەجیاتی ئەوەی بە جادەدا بڕۆین کەوتینە ڕێ بەرەو سەر بەناو دارستاندا و لەلۆفەکاندا دەگەشتینەوە سەرجادەکە و کەمێك دەوەستاین تا سەیارە نەدەماو ڕامان دەکردە سەرەوە،




بەشێوەیەك لەشوێنێکدا جادەی لۆفەکە بۆ ناو دارستانەکە زۆر بەرز بوو سەیارەش هەبوو لە لۆفەکەی خوار ئێمەوە کەوا هەستمان کرد کەکۆماندۆکان بوون چونکە لە لۆفەکاندا دەوەستان تاوەکو بمان دۆزنەوە لەویادا دەبوایە دەستی یەکمان بگرتایە تاسەرکەوتینایە!.

ئیتر لەویادا قەدەری خوا پیلی شەحنی مۆبایلەکەمان لێ کەوت کە لای نەفەرێك بووکە توشی نارەحەتی زۆری کردین بێ شەحنی چونکە تەنها ئەوەمان بەدەستەوە بوو تا تەلەفون بکرێت و شاحینە بێت بەدووامان‌دا کاتێك بگەینە نوقتەی شاحینە، بەڵام باش بوو ڕۆژێك پێشتر مۆبایلەکەی پێ شەحن کرابوو بەهەرحاڵ تا گەشتینە کۆتا لۆفەو بەرزایی گیانمان دەرچوو هێندە ماندوو بووین ئاومان لێبڕا و پێش کۆتا لۆفەی ناوچەی (سەبزی)ئاخوڕی ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتمان بینی کە پڕکرابوون لە ئاو بۆ ئاژەڵەکان تێر ئاومان لێ خواردەوەو دەبەکانیشمان پڕ کرد لە ئاو پاشان چووینە سەر بەرزاییەك دانیشتین لەناو دارستانەکەدا و بەئاسانی دەمانڕوانیە ناو بەشی خوارەوە ئیتر کۆماندۆکان دەتوت هەستیان کردوە و تا درەنگانێکی شەو هەر بەو لۆفانەدا دەهاتن و دەسوڕانەوە و هەر هاتوچۆیان دەکرد بەو ناوەداو لایتیان دەدا لەناو دارستانەکە ئێمەش خۆمان دابوو بە زەویداو دەستمان بەسەر چاوماندا گرتبوو لەبەر ئەوەی تیشکی لایتەکان نەدا لەچاومان و بمانبینن!.

دوای ئەوەی کە دەنگ نەما و جێبەکان ڕۆشتن، قاچاخچیەکە وتی تازە شەحنم کردۆتە مۆبایلەکە باسەرف نەبێت شەحنەکەی و وە خەتەکەشمان خەتی(کۆسمۆتی) یۆنانی بوو شەبەکەی باش نەبوو لەو ناوەدا و وتی: دەچم لەو لادێ یە کە گوندێکی ئیسلامی بوو لەتەنیشتمان تەلەفونێك دەکەم و بەتەرەفەکەم دەڵێم نزیك بووینەتەوە بەڵکو بێت بەدوامان‌دا یان خواردنمان بۆ بنێرێت هیچ نەبێت ئیتر کاتێك ڕۆی دوو کاتژمێری پێچوو هاتەوە و وتی کاکە خێرا با بڕۆین بەخوا کۆماندۆ بەدوامان‌دا دەگەڕێت




ئێستا پیاوێك پێی وتووم لەو ئاواییەدا و تەلەفونیشم کرد بۆ تەرەفەکەم و پێم وت نزیك بوینەتەوە لە نوقتە بەڵکو دوو سبەی سەرمان بخات!.
بەپەلە بەرەو دیوی ئەو دیو شۆڕ بووینەوە بەناو دۆڵێکدا کە تاریکە شەوە چاو چاوی نەدەبینی هەر نەفەرمان بوو دەیدا بەزەویدا تاوەکو دوور کەوتینەوە و لە لاچەپێکدا لەناو دارستانەکە شوێنمان چاك کرد بۆ خەوتن.
بەیانی کاتێك کە هەستاین لەخەو ڕۆژێکی زۆر خۆش بوو ، خۆر هەتاوێکی گەرم بوو وە ئەو شوێنەش لەناو دۆڵێك بوو ئاوێکی سازگاری پێدا دەهاتە خوارەوە و شوێنێکی خۆش بوو بۆ مەلە کردن، ئێمەش ماوەی چەندین ڕۆژ بوو خۆمان نەشۆردبوو بۆیە قاچاخچیەکەمان پێی وتین: خوا ویستی لەسەربێت  ئێمە زۆرمان نەماوە بۆ نوقتەی شاحینەو سەربکەوین با لێرە خۆمان بشۆین و مەلەیەکی باشیش بکەین.
هەموومان دەستمان کرد بە خۆشۆردن و مەلە کردن و هەندێکمان جلەکانیشمان بەو سابونەی کە لە کۆڵە پشتەکەماندا بوو دەشۆرد، تا نزیك ئێوارە لەو دۆڵەدا ماینەوە و گوێزەکانیشمان کۆتایی پێ هات و برسێتی تەنگی پێ هەڵچنینەوە ئێوارە دووبارە بە ڕێکەوتینەوە و تا درەنگانێکی شەو لەناو دۆڵەکاندا دەڕۆشتین و دواتر لەبەر سەختی ڕێگاکە هاتینەوە سەر جادەی قیر و جار جارە کە سەیارە دەردەکەوت خۆمان دەدایەوە بەتەنیشت جادەکەدا چونکە لۆفەو بەرز بوو جاری واهەبوو شوێنەکان بەرز بوو بەشێوەیەك  لە لۆفەیەکدا بووین لۆفەی ئەو دیومان لێوە دیار نەبوو کاتێکمان زانی گڵۆپی سەیارەیەك  بەپەلە گەشتە سەرمان هەمومان بەپڕتاو خۆمان فڕێدایە قەراغ جادەکەوە بەرەو ناو دارساتانەکە و شوێنەکە هێندە بەرز بوو چەند کەسێکمان لە تەنشیتی شاخەکە خزاینە خوارەوە چەند مەترێك بەرەو خوارەوە خوا ڕەحمی پێ کردین نەکەوتینە ناو دۆڵەکەی تەنیشتمانەوە و بەداری قەد پاڵی شاخەکە وە خۆمان گرتەوە!.




ئەوشەوە دووبارە زۆر ماندوو بووین شتێکی خۆش کە ڕویدا لەو شەوەدا یاخوا کەس توشی کارەساتی وا نەبێت کە هەم پێکەنیناویە و هەم نارەحەتیش کاتێك ڕێگەمان دەکرد بەسەر جادەکەدا لەدوورەوە نەفەرێکمان بەدی کرد بەجگەرەکەی دەمی دا بینیمان دیار بوو ڕێبوارێك بوو بەرەو لادێیەکی نزیکمان دەڕۆشت ئێمەش هیچمان پێ نەکراو هەموومان لەتەنیشتی جادە قیرەکەوە دانیشتین و کابراش گۆرانی دەوت لەبەر خۆیەوە و بڕواتان بێت بەناوماندا هات کەسمانی نەبینی، ئیتر کە زانیمان ڕێبوارە و گۆرانی تورکیشی دەوت لەبەر خۆیەوە و زانیمان مسوڵمانە تورکەکانی دانیشتووی ئەو وڵاتەیە ئیتر قاچاخچیەکەمان هەستایە سەرپێ و هەموومان بەدوایدا هەستاین و باوەڕتان بێت کابرا هاوارێکی کردوە و بەرەو دواوە ویستی ڕابکات وتم ئێستا گیانی دەردەچێت فەقیرە کەوتە حاڵەتێکەوە گیانی وەك شەق شەقە دەلەرزی کە ئەو هەموو نەفەرەی بینی لە زەوق و ڕەوقمان خست و وایزانی فریشتەی گیانکێشان یان خێوی بۆ هاتووە جا بێنە پێش چاوی خۆت لە تاریکە شەوێکدا یەکێ بڵێ پخ دەبێت حاڵت چۆن بێت؟، ئیتر بە تورکی قسەیان لەگەڵ کرد و داوای لێکرا کە ئاشکرامان نەکات و پاکەتێك جگەرەشیان لێ وەرگرت و کابراش وتی خوا دەکات من بەسەلامەتی دەڕۆمەوە ماڵەوە شکاتی چی و حاڵی چی!.

## گەیشتنە ناو دەشتایی و زەوی زارەکانی شاری (کۆمەتین).

بەهەرحاڵ دەستمان کردەوە بەڕێگەکردن ئەوجا چووینە سەر کۆتا لۆفە و تاوەکو بەرەو دیوی شاری (کۆمەتین) شۆڕ ببینەوە لەویادا قاچاخچیەکە لە تەنیشت جادەکەدا ئێمەی دانیشاند و چووە سەر بەرزیەك و تەلەفونی دەرهێنا وتی: بەڵکو شەبەکە هەبێت و قسە لەگەڵ تەرەفەکەی (ئەسینا)دا بکەم یان نانمان بۆ بێنیت یان شاحینەمان بۆ بنێرێت! دوای ئەوەی کە هاتەوە سوپاس بۆ خوا شەبەکە هەبوو مـوژدەیەکی خۆشی پێدان و وتی ئەم شەو دەچینە دیوی ئەودیو لەشوێنێکدا






لادەدەین و بەیانی خواردنمان بۆ دێت و سبەی شەو سەرمان دەخات  ئیتر بەڕاستی لە خۆشیدا برسێتیمان لە بیر چویەوە و دەستمان کرد بەڕێگە کردن و چووینە دیوی ئەودیوی لۆفەکان و لە بەشی خوارەوەماندا گڵۆپی شارەکان دەرکەوتن و تا نزیکی بەرەبەیان ڕێگەمان کرد چونکە نزیك بووینەوە لە شار و ئاوەدانی ئیتر شوێنی خۆشاردنەوە زەحمەت بوو بۆمان و نەمانتوانی بە ئاسانی ئەو هەموو نەفەرە خۆمان لە جێیەکدا بشارینەوە تا ئەوەی خەریك بوو تەواو دوونیامان لێ ڕۆشن بێتەوە!.

سەیری جادەکەمان کرد کەوا لە شوێنێکدا پردێکی خڕی تێدا بوو وەك مەنۆڵە خڕەکانی لای خۆمان بۆ ئاوەڕۆ لەم بەر بۆ ئەو بەری جادەکە و قاچاخچیەکە وتی دەبێت بچینە ناو ئەو کونەوە بخەوین تا ئێوارە و تکا دەکەم کە هەم دەبێت تەحەمول بکەن وە هەم  نابێت گوێشم لە دەنگی کەس بێت!

ئیتر بە سنگە خشکێیەك خۆمان کردە ناوی و خوا ڕەحمی کرد ئاوی تێدا نەبوو، بەس ئەگەر باران ببارایە ئاو دەهاتە ناویەوەوە و خوا ڕەحمی کرد ئەو ڕۆژە باران نەباری

بەڕاستی هێندە هیلاك بووم چونکە ماوەیەکی زۆر بوو نەخەوتبووم لەناو ماڵدا ڕێك وەك خانو هاتە پێش چاوم و خەوێك بۆی خەوتین هەتا نزیکەی دوا نیوەڕۆ خەبەرمان نەبۆیەوە کاتێك خەبەرم بۆیەوە وتیان کاکە هەستە سەمونەکە و ئاوەکەت وەرگرە! دەتوت لەبەرزاییەك فڕێم دەدەیتە خوارەوە کەوایان وت تومەزە تەرەفەکەی (ئەسینا) سەمون و ئاوی ناردوە و بەتەلەفون شوێنەکەیان دۆزیوەتەوە ئیتر بێ ئێوە ناخۆش لەو شوێنەدا نان و ئاومان خواردو تا نزیکی ئێوارەماینەوە.

بەڵام هەموومان سڕ ببووین لەو شوێنەدا چونکە جێگاکەی تەرازوو نەبوو خڕ بوو زۆر بەناڕەحەتی تیایدا پاڵ کەوتبووین و نەشماندەتوانی دابنیشین تیایدا، بەهەرحاڵ هەرچۆن بێت تا ئێوارە خۆمان تێدا گرت و دواتر هاتینە دەرەوە و دەستمان بە ئاو گەیاند و قاچاخچیەکەمان وتی:







لەبەر ئەوەی پێمان زانراوە تەرەفەکە ناوێرێ لێرە سەرمان بخات و دەڵێت: دەبێت بێنە نزیکی پاسە سوتاوەکە و إن شاء الله ئەمشەویش لەوانەیە سەر بکەوین !.
پاسە سوتاوەکە نوقتەیەکی قاچاخچیەکانە لەپێش شاری(کۆمەتین) و کاتی خۆی پاسێك سوتاوە لەویادا و حوکمەتی یۆنانیش هەیکەلی پاسەکەی لەشوێنی خۆیدا لانەبردووە وەك کلتورێك لەتەنیشت جادەکەدا دایناوە هەرچەندە قاچاخچیەکە وتی: ئەمە تەڵەیە بۆ ئێمە و زۆرجار لەویادا نەفەر گیراوە و کەمین هەبووە چونکە کۆماندۆکان دەزانن کراوەتە نوقتەی شاحینە!.
بەڵێ ڕێگەیەکی زۆرمان بڕی و دووبارە باران دەستی بە بارین کردەوە و تەواو شەکەت و ماندوی کردین و توانای ڕێگە کردنمان نەما ئیتر پێش ئەوەی بگەینە پاسە سوتاوەکە ڕێگامان گۆڕی بەرەو ناو دارستانەکە و قاچاخچیەکە وتی: ئەمشەو درەنگ دەگەینە لای پاسە سوتاوەکە و دەترسم نەیەن بەدوامانـدا لەوێ و ڕۆژمان لێ بێتەوە ڕەنج بەخەسار ببین و بگیرێین با بڕۆین شوێنێك ئامادە بکەین بۆ خەوتن و سبەی شەو دێینە ئێرە و ئیستا تەلەفون دەکەین بۆتەرەفەکە تا سبەی شەو بێن بەدواماندا!.
پاش تەلەفون کردنەکە ئیتر ڕۆشتینە ناو دارستانەکەوە خوای گەورە کردی خانویەکی کۆنمان دۆزیەوە کە بەتەختە دروست کرابوو چوینە ناوی دیاربوو پێشتر ڕاوچیەکان بەکاریان هێنابوو بەڵام هیچ شتێکی تێدا نەبوو پەنجەرە و دەرگاکانیشی شکابوون زۆریش سەرمامان بوو چونکە باران زۆر تەڕی کردبووین سەیرمان کرد داری وشکیشی لێیە بۆ سوتاندان هەر لەناو خانوەکەدا ئاگرێکی گەورەمان کردەوە و هەم خۆمان گەرم کردەوە وە هەم برادەرێکمان قوتویەکی پەنیری سەفەری هەڵگرتبوو بۆ چا لێنان وە چاو شەکریشی پێبوو بۆنی چام کرد بەو قوتوە زۆرێك لەنەفەرەکان هەر ئاویان دەکردەوە ناو چاکە و دەیان خوارد بەڕاستی منیش زۆرم حەز لێی بوو بەڵام لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا بەشی منی نەدا چونکە من لەڕووم نەهات داوای لێبکەم





خۆشی عەقڵی پێ نەشکا ئیتر دوای ئەوەی چاکە تلّپی تەڕی تێدا نەما و کابراش بێزار بوو فڕێیدا منیش هەستام پڕم کرد لە ئاو، هەر بۆ حەزەکەم خستمە سەر ئاگرەکە و وتم با بە تاڵییش بێت تۆزێکی لێ بخۆم!.

کەچی بەداخەوە کاتێک چاکە ئاوەکەی هاتە کوڵ ویستم دەستی بۆ بەرم کابرای خاوەنی کێشای بەدەستمدا و وتی بۆ کوێی دەبەیت؟، منیش وتم تۆ بۆ کوێی دەبەیت ئەی فڕێت نەدابوو؟ من بۆ خۆم ئاوم تێکردەوە !، وتی: نەخێر فڕێم نەدابوو منیش وتم دەی یاخوا عافێتتان بێت فەرموو کاکی من ئەمەم بۆیە باس لێوە کرد تا مرۆڤ هەر هەنگاوێک دەنێت دووربین بێت و تەنها بیری لای ئەو دەقەیە نەبێت کە خوا پێی دەبەخشێت و وابزانێت ئیتر ڕۆژێك نایەتە پێشی کە موحتاجی دەستی کەسانێکی تر بێت کە پێویستیان بەهاوکاری ئەم بووە و بەدەمیانەوە نەچووە! بەهەرحاڵ بەیانیش هەر لەوێدا بوین تا نزیکی نیوەڕۆ و کاتێکمان زانی دوو راوچی گەشتنە شوێنەکە و ، کە ئەو هەموو نەفەرەیان بینی چاویان چووە پشتی سەریان ، ئیتر دوای ئەوەی بە ئیشارەت هەندێك قسەمان لەگەڵ کردن وتیان دەبێت ئێرە چۆڵ بکەن بەقسەی خۆیان وتیان شکاتتان لێ ناکەین بەڵام باوەڕمان نەبوو بۆیە لەگەڵ ڕۆشتنیان ئێمەش شوێنەکەمان بەجێ هێشت و دوای دوو سەعات ڕێگە کردن چووینە ژێر پردێکی گەورەوە دانیشتین تاوەکو ئێوارە وردە وردە لە ئاوەدانی نزیك ببووینەوە و نەماندەتوانی بەئاسانی ڕێگە ببڕین دووبارە ئێوارەمان بەسەر هاتەوە و ئەو پارچە سەمونەی کەبۆمان هاتبوو کۆتاییەکەی ئەویشمان خوارد و تەواو بوو! پاشان دەستمان کردەوە بەڕۆشتن بەرەو نوقتەی شاحینە و لای پاسە سوتاوەکە نزیکەی کاتژمێر دەی شەو دەبوو گەشتینە ئەوێ و لەدوورەوە وەستاین چونکە کۆماندۆکان دەیانزانی ئەوە نوقتەیە دوای ئەوەی تەلەفون کرا بۆ تەرەفەکەی(ئەسینا) تا شاحینە بنێرێت بەدواماندا دوای بێنە و بەردەیەکی زۆرو ئەملاولاو ئێستا نا ئێستا دێت پەیوەندیان







پێوەکردین کەوا کەمین هەیە و وتیان دەبێت بێنە لای شاری کۆمەتین تازە لەوێ سەرتان دەخەین شەحنی مۆبایلیشمان وا بەرەو کۆتایی دەڕوات ئێمەش زۆر ماندوو بووین قاچاخچیەکە وتی: کاکە هیچ چارەیەکمان نەماوە نابێت دابنیشین دەبێت بڕۆین لەرێگە لادێی لێیە و دووان دەنێرم بۆ خواردن کڕین و لەڕێگەش پاش چەند کاتژمێرێك دەگەینە دەشتی کۆمەتین و کاڵەك و شوتی لێیە و دەیانخۆین!

ئێمەش کەوتینە ڕێگە کردن دووبارە و پاش چەند کاتژمێرێك رێگە کردن لادێیەك هاتە سەر ڕێگەکەمان و دوو نەفەرمان نارد بۆ ئەشیا کڕین ترس و لەرزیشمان زۆر بوو بەڵام دوای کاتژمێرێك هاتنەوە بەدەستی بەتاڵ و وتیان دوکانێکی لێبووە داخراوە!.

کەچی ڕاستیشیان نەکرد و ئەشیایان کڕیبوو، بەڵام بۆ خۆیان هەڵگرتبوو، ئیتر تا نزیکی کۆتایی شەو و بەرەبەیان ڕێگەمان کردەوە و ئەمجارە گەشتینە ناو دەشتایی و ناوچە کشتوکاڵیەکانی دەشتی کۆمەتین بۆ هەمیشە لەدارستان و شاخ و دۆڵ ڕزگارمان بوو ڕێگامان زۆر خۆش بوو لەمەودوا بەڵام هەڵوەستە و ترسمان زیادی کرد، چونکە شوێنی خۆ شاردنەوەی کەم بوو وە نەشماندەوێرا بە سەرجادەی قیردا بڕۆین لەکاتی ڕێگە کردنماندا گەشتینە ناو بێستانی کاڵەك و شوتی و وەك کوردی دۆ نەدیو خوا لێمان خۆشبێت لە برسا کەوتینە لێ کردنەوەی کاڵەك و شوتی، پێگەشتوو بێت یان نا گرنگ نەبوو باوەڕتان بێت من هەر لەویادا دوو کاڵەکی بچوکم بە توێکڵەوە خوارد ئەوەندە برسی بووم هەرچەندە هاوارم کرد کەوا کاکە بەپێی نەفس و برسێتیتان لێی بکەنەوە بەڵام کەس گوێی بۆ نەگرتم و هەر نەفەر بوو جانتای پڕ دەکرد، بەشێوەیەکی وا هێندەیان خواردبوو وە خواردنی شوتیش بۆ خۆی خەواڵوت دەکات جا وەرە بەو هیلاکیەش بیخۆیت باوەڕتان هەبێت ڕێمان دەکرد کەدونیا ڕۆشن دەبۆیەوە ئیتر ئێمە بۆ پەنایەك دەگەڕاین کە بخەوین تا شەو نەفەرەکانمان لەپێش چاو ببووە هێسترو ئەسپ دوور لەڕووی بەڕێزتان برادەرێك وتی:



ئەرێ کاکە ئێمە وڵاخمان لەگەڵ بوو؟، منیش وتم : بۆ کاکە ناوەڵا کەی شتی وامان لەگەڵ بووە؟،وتی ئەی ئەوە وڵاخ و ئەسپ نیە لەپێشمانەوە دەڕۆن؟ منیش زانیم کەوا خەوی دێت و هەستم کرد هی شوتیەکەیە و گێژی کردووە! ئیتر لەو دەشتاییەدا جۆگەلەیەك ئاوی تێدا بوو کەمێك قوڵ بوو چووینە ناوی و لە لایەکیەوە دوو داری لێبوو لەو شوێنە باشترمان دەست نەکەوت و، قاچاخچیەکە وتی: ئەگەر ئەمڕۆ لەم شوێنەدا خەڵك نەمانبینێت و نەگیرێین ئەوە ئیتر سبەی شەو سواری شاحینە دەبین بۆ (ئەسینا) بەڵێ لەویادا خەوتین و بەیانی کەسمان نەمان دەوێرا سەر دەربێنین چونکە بەئاسانی گوێمان لەدەنگی خەڵك بوو لەم لاو لاماندا و بەتەمای خۆمان نەماین کەنەگیرێین و تا ئێوارە لەویادا ماینەوە و ئەو ڕۆژەش سوپاس بۆ خوا ڕزگارمان بوو سەرلەنوێ خۆمان حازر کرد و کەوتینە ڕێگە کردن و ئەمجارە وورەم بەرز بوو چونکە وا بڕیار بوو کە ئەم شەو ئیتر بگەینە ناو شاری(کۆمەتین) و سواری شاحینەمان بکەن بەڵێ پاش خواردنی کاڵەك بەتەنها ئەمجارەیان کەوتینە ڕێ و ئەم جارە ڕێگەمان تەخت بوو وە دەبوایە بەناو بێستان و، زەویە کشتوکاڵیەکاندا بڕۆشتینایە و دەنگیشمان نەهاتایە، چونکە لەناو ئاوەدانی دا بووین لەڕێگەکردنماندا بووین هەر ئەوەندەمان زانی کەوتینە ناو زەویەکی کشتوکاڵییەوە هەمووی توتن بوو لەکاتی پێگەشتن و وشك بونەوەیدا بوو کە بەشێکی زۆریان درەو کردبوو ، هەڵیان خستبوو بۆ ووشك بوونەوە وەڵا کاکە سەرتان نەئێشێنم شەو بوو بەشەوی جگەرە کێشان و بێ ویژدانی وای تێدا بوو خەریك بوو جانتاکەی شانی پڕ دەکرد لە توتنی ووشکراوەکەش دەتوت نامێنیت؟!

خوا تاقی جگەرە و توتنی سەر زەوی ببڕێت لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیم بۆ برا جگەرەکێشەکان هیوادارم تەرکی بکەن و خۆیان بپارێزن لەو حەرامە! پێشتر گەڵا داریان دەکێشا لەجیاتی توتن ئێستا توتنیان دەست کەوتوە و ئەزمەی پەڕەی کاغەزی






تەلەفونە و بەپارە دەفرۆشرێت و کڕین و مامەڵەی گەرمە بەڵێ بەڕێکەوتینەوە دووبارە و ئەمجارە قاچاخچیەکە وتی: کاکە ڕازی نیم هیچ کەسێك نە لەبێستاندا وە نەلە هیچ شــوێنێك شــت لێبکــاتەوە، چــونکە شــوێن پێکانمــان کەشــف دەبێــت و دواتــر دەمانــدۆزنەوە و شــکاتمان لــێ دەکەن خــاوەنی زەوی و زارەکــان!، ڕەتڵێــك جــوێنی قاچاخچیانەشی دا بەوەی بچێتە نـاو بێستانەوە و وتیشی ئـاواو ئـاوای لێدەکەم دوای چەنـد کاتژمێرێـك ڕێگەمـان کـرد و برسـێتی زۆری بـۆ هێنـاینەوە و ئەمجـارە زەختمـان خستە سـەر قاچـاخچیەکە خواردنمـان بـۆ پەیـدا بکـات و وتمـان تەحەمـوڵی ڕێکـردن نـاکەین ئەویـش دوو نەفەری نـارد بـۆ ئـاواییەکی نزیکمـان و لە نـاو باخێکـدا ئـێمەی شـاردەوە و وتی بـڕۆن سی وسێ سـەمون بکـڕن ئەم ئـاواییە مـارکێتێکی گەورەی تێـدایە بەڵام باوەڕتان بێت دوای ئەوە دەبێت بڕۆین و نەوەستین چونکە شکاتمان لێدەکەن و دەزانــن ئەو هەمــوو ســەمونە بــۆ وەجــبەی نەفەراتە لەبەر ئەوەش وەســتا چــونکە ڕێگەمـان زۆر مـابوو تـا بگەیـنە نـوقتەی شـاحینە و هێزمـان تێـدا نەمـابوو شـوێنی خۆشاردنەوەشـمان نەبـوو تەواو دەبوایە ئەو شـەوە بگەشـتینایەتە نـوقتە سـوپاس بـۆ خـوا دوای یەك سـەعات دوو نەفەرەکە بەفەردەیەکەوە هـاتنەوە و پـڕ بـوو لەسـەمون یەکی سـەمونێکی گەورەی خێزانیمـان دەسـتکەوت لەگەڵ سـەرو دەبە ئـاودا باوەڕتـان بێـت هەر لەویـا بەڕێـوە نیـوەیم خـوارد هێنـدە برسـیم بـوو، خێرا بەپەلەو بێ وەسـتان کەوتینەوە ڕێگەکردن، پاش ماوەیەك ڕۆشـتن هەستمان کـرد سـەیارە بەدوامانەوەیە و لە دوورەوە گڵـۆپ کـوژێنرایەوە یەکسـەر زانیمـان کۆمانـدۆ بـۆرە و شـکاتمان لێکـراوە و کەشـف بـووین و لەدوورەوە بلاجگتۆرمان بـۆ داگیرسـا پیـاو ئەو پیـاوە بـوو خـۆی بـدات بەزەوی دا، ماشـەڵا ئەو دەشــتەش شــوێنێکی تێـدا نەبــوو خــۆتی تێــدا بشـاریتەوە و بلاجگتۆریش دەتوت ڕۆژی ڕوناکە!





نزیکەی پێنج دەقەیەك ئەو ناوە دەگەڕان بەڵام دوور بوون و، بەینی خۆشمان بێت کۆماندۆکانیان پیاوی شەو نین! مەگەر بەڕۆژ و لە ئاوەدانیدا و لەکاتی خەوتن لە ناو کیسە خەودا بدەن بەسەرتا هەستاینەوە سەر پێ و بەپەلە کەوتینە ڕێ قاچاخچیەکە وتی تازە تەواو کەشف بووین دەبێت هەرچۆنێك بێت ئەمشەو بگەینە پشتی شاری(کۆمەتین) و شاحینە ناوێرێ لە پێش شارەکە سەرمان بخات بۆ ئەو مەبەستەش دەبێت بە ناو جۆگەیەکی ئاودا کە بە ناو شارەکەدا دەڕوات بپەڕینەوە و سێ پردی بەسەرەوە کراوە و زۆربەی کەمینەکان لە لای ئەو پردانە دادەنرێت لەکاتی ڕێگە کردنمان بوو ئەم جارەیان بەسەر جادەشدا دەیبردین و گوێمان نەدەدا بەوەی سەیارە دێت یان نا؟ هەرچەندە کە گڵۆپی سەیارەمان دەبینی خۆمان فڕێدەدایە قەراغ جادەکەو خۆمان دەدا بە زەویدا لە ڕۆشتندا بووین بەسەر جادەیەکی قیردا بەڵام چۆڵ بوو گەشتینە قەراغێك کاتێکمان زانی گڵۆپی جێبی کۆماندۆ داگیرسا و کەوتینە کەمینەوە و دەست کرا بەجوێندان بە زمانی یۆنانی پێمان و هەرچەند هاواریان دەکرد بوەستن حسابمان بۆ نەکردن، ئێمەش سکمان تێر بوو وەك ئاسك بۆی دەرچووین و ئەگەرچی زۆرمان بەهۆی لاوازیەوە یان قەڵەویەوە دواکەوت بەڵام لەو کەمینەدا کەسمان نەگیراین و ڕزگارمان بوو ئا لەویادا چووینە شوێنێك دانیشتین و وتیان نەفەرێك زۆر ماندووە و هیلاکە کێ دەچێت یارمەتی بدات و بیهێنێت دیار بوو برادەرێك هەوڵی خۆی دابوو لەگەڵی بەڵام ئەویش توانای نەمابوو خوا نەکات کەس بڵێ من دەچم چونکە نزیکەی سەعاتێك ڕامان کردبوو منیش وتم: خوایە لەبەرخاتری تۆ دەڕۆم خۆ ناشزانم کێیە بەس گوناحە ئەم شەو دەگەینە نوقتە با جێ نەمێنێت ئیتر بە قاچاخچیەکەم وت کاکە من دەڕۆم بەدوایدا بەڵام جێمان نەهێڵن وتی باشە خەمت نەبێت !.




کە گەڕامەوە نزیکەی دوو سەد مەترێك ڕۆشتم بینیم بەهێواشی لەسەر خۆ دەرکەوت وتم کاکە ماویت؟ وتی: مانی نەمان، وتم خوایە ئەم دەنگە غەریب نیە کاتێك گەشتمە لای سەیر دەکەم ئەوە خۆ خاوەن چاکەی پێرێ شەوە و ئەو کەسەیە کەوا چایەکەی لێ سەندم و نەیهێشت بیخۆم ئیتر هەستم کرد زۆر ماندووە و تاریکیش بوو سەرەتا ئەو منی نەناسیەوە و منیش قۆڵم کرد بە قۆڵیدا و وردە وردە کەوتینە ڕێ و هەر دوعای بۆ دەکردم و نەشیدەزانی من کێم! کاتێکم زانی وتی: کاکە تۆ کێیت؟ وتم من ڕەنجدەرم جا ناوی یەك فێر ببووین ، یەکسەر وەستاو سەیرێکی دەم و چاوی کردم و هەڵوەستەیەکی کرد و وتی: زۆر خەجاڵەتم بەڕاستی داوای لێبوردن دەکەم منیش وتم: کاکە بوراویت گوێشی مەدەیە و ئەو شتانەش دەبێت ئیتر بەزۆر دەستی کرد بەجانتاکەیدا وتی: دەبێت تۆڵەت بۆ بکەمەوە و بەزۆر خواردنێکی پێدام و وتی: بەخوا دەبێت بیخۆیت ماشەڵا زۆر قایم هەڵگر بوو سەیرم کرد ئەو هەموو ڕێگەیەمان کردووە هێشتا خواردنی وڵاتی(تورکیا)ی پێمابوو بەڵام کە لاماندەدا بەدزیەوە دەچووە لاچەپێك و دوور لە ئێمە دادەنیشت جا ئەمە ئەوەیە کە پێشینان دەڵێن: ڕۆژان ڕۆژی لەدوا دێت بەڵێ دوای ئەوەی کەمێك ئیسراحەتمان کرد و گەشتینەوە وەجبەکە دووبارە دەستمان کردەوە بەڕێگە کردن تا گەشتینە قەراغی شاری (کۆمەتین) (ئەم شارە شارێکی مسوڵمان نشینە و ئەگەرچی گاوریشی تێدایە بەڵام مسوڵمانیشی زۆرە و بەئەسڵیش ڕەچەڵەکیان تورکە و بانگیش بەئاشکرا دەدرێت لەم شارەو شاری (ئەگزەنتی)یش کە نزیکەی پەنجا کیلۆمەتر بەڕووی (ئەسینا)دا لێوەی دوورە لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیسلام کە عوسمانیەکان سەرکردایەتیان دەکرد و لەو کاتەی چوونەتە ناو خاکی وڵاتی (یۆنان)ەوە و نزیکەی چوار سەدە مسوڵمانان لەو وڵاتە بوون بەبێ ئەوەی کلتورێکی ئەو وڵاتە بگۆڕن یان دەستکاری بکەن یان ڕێگریان لێ بکرێت لەسەر ئاینەکەیان پێکەوە ژیاون و هیچ کێشەیەك لەنێوانیاندا نەبووە و



مافی خۆشیان دراوەتێ! ئێستاش پاش نەمانی دەسەڵاتی ئیسلامی و عوسمانیەکان لەو ناوچانەدا ئەم دوو شارە مزگەوتیان تێدایە و بانگیشی تیدا بە ئاشکرا دەدرێت و گۆڕستانی مسوڵمانانیش لەم وڵاتەدا تەنها لەم دووشارەو دەوروبەریدا هەیە).

## گەیشتنە ناو شاری(کۆمەتین) و کەوتنە ناو کەمینەوە و دابڕانمان لەیەك.

لەدەرەوەی شارەکەوە لە شوێنێك لاماندا و دانیشتین تاوەکو شەو درەنگ بە ناو ئەو جۆگەیەدا بڕۆین و ئەو سێ پردە ببڕین تا بچینە ئەودیو شارەکە چونکە تەنها ڕێ ئەو جۆگەیە بوو لەبەر ئەوەی وەجبەکە زۆر بووین و ئەو هەموو نەفەرەش بە ئاسانی ناتوانن بەناو شاردا بڕۆن دوای ئەوەی کات گەشتە نزیك دوانزە ی شەو شار کش و مات و بێدەنگ بوو دەستمان کردەوە بەڕێگە کردن بە بێدەنگی و دەبوایە زۆر بەئاگاییەوە بڕۆشتینایە چونکە کەشف ببووین ئێمەش نزیك بووینەوە لەناو جۆگە ئاوەکە و دەستمان کرد بەڕۆشتن تا نزیکی پردی یەکەم بووینەوە کەمێك چاوەڕوانمان کردو ژێر پردەکە هەمووی ئاو بوو قەراغی نەبوو نەشمان دەزانی قوڵیەکەی چەندە بۆیە بەچاری ناچاری پێنج پێنج چووینە سەر پردەکە و بەڕاکردن کەسەیارە نەدەما دەپەڕینەوە بۆ ئەوبەر ئەگەرچی سەر پردەکان بلاجکتۆری لێبوو بەڵام شار کش و مات بوو واماندەزانی کەس نامانبینێت نەماندەزانی ئەوەتاین لە ناو کەمیندا!.

بەهەرحاڵ پردی یەکەممان بڕی و دووبارە چووینەوە ناو جۆگەکە و دەستمان کردەوە بەڕێگە کردن هەتا گەشتینە پردی دووەمیش دووبارە وەك جاری پێشوو چووینەوە سەر پردەکە و دەستمان کرد بەپەڕینەوە پێنج پێنج یەکەم جار پێنج کەس پەڕینەوە و هیچ ڕووی نەدا دووەم جار من لە پێنج کەسی دووەم دا بووم، پەڕیمەوە لە دوورەوە سەیارەیەك دەرکەوت لەتەنیشت جۆگەکەوە کە جادەیەکی خاکی لێ بوو گڵۆپێکم بینی لە گڵۆپی پۆلیس دەچوو خێرا بە قاچاخچیەکەم وت: کاکە وەڵا ئەوە سەیارەی





پۆلیسەو نەفەری تریش دەپەڕیەوە بۆ لامان لەو کاتەدا و ویستی بڵێ با بوەستن و نەیەن جارێ و لەو قسانەدا بووین کاتێکمان زانی تەڵقە تەنورە هەڵدراو هەر سەیارە بوو گلۆپی دادەگیرسان و بوو بە هات و هاوار، ئەمجارە بەتەواوەتی کەوتینە کەمینەوە و سەرەتا وەستام و توشی شۆك بووم وەك کابرای کوردە دەڵێت: وا پەشۆکابووم شتی وام بەس لەفلیمدا بینیبوو سەرم خواردبوو ماستم سوڕ دەما ئیتر بینیم نەفەرمان هەبوو وتی: بەخوا برام ئەم کابرایە کوشتینی هێندە ڕێگەی پێ کردین بەخوا برا من دادەنیشم و با بگیرێم، لەوکاتەدا منیش خەریك بوو بێمە سەر قسەی ئەو برادەرەم و دابنیشم یاخوا کەس هاوڕێی بێغیرەت و جەبانی لەگەڵ نەبێت لەو شوێنانەدا لەوکاتەدا قاچاخچیەکەم بینی خێرا خۆی کرد بە ژێر پردەکەدا و ڕای کردە ناو ئاوەکە و بۆ دەستی ئەوبەری پردەکە کەسەیرم کرد ئاوەکە تا ئەژنۆ دێت و ڕای کردو وتی: ڕاکەن منیش هەر لەگەڵ چاوم پێی کەوت و گوێم لەدەنگی بوو خێرا ڕام کردە ناو ئاوەکەی ژێر پردەکە و بووم بەدووەم کەس و کاتێکم زانی چوار نەفەری تریش دوای من کەوت لەوکاتەدا کۆماندۆیەك هاتە پشتمەوە و ، ویستی بمگرێت بەڵام سوپاس بۆ خوا لەدەستی خۆم قوتار کرد و هەڵهاتم لەوبەر ئاوەکەوە گەراجێکی سەیارە بوو بەتەلبەند دەوری گیرا بوو ، خێرا بەسەر تەلەکەدا خۆمان هەڵدایە ئەودیوە و لە دیوی جۆگەکە ڕزگارمان بووا!.

ئیتر شاری کۆمەتین یەك پارچە بوو بە فەڕاڕەی پۆلیس و دەنگی ویقە ویقی پۆلیس ئێمەش لەوێدا بەقاچاخچیەکەمانەوە تەنها شەش نەفەر ڕزگارمان بوو، بەڵام جارێ ئێمەش چارەنووسمان دیار نیە و خۆشمان نازانین بۆ کوێ ڕادەکەین باوەڕتان بێت هەر لەگەڵ لەگەراجەکە هاتینە دەرەوە جێبێکی کۆماندۆ هاتە بەردەممان و ئێمەش بەپەلە خۆمان هەڵدایە ناو حەوشەی ماڵێکەوە و ڕامانکردە سەربانی ماڵەکە و دەستمان کرد بەڕاکردن سەربانە و سەربان و هەرچی ماڵی ئەو ناوەیە هەڵمانساندن




لەخەو هەتا گەشتینە چۆڵەوانیەك و لەویاشدا ڕزگارمان بوو سوپاس بۆ خوا ئەمجارەیان چونکە شەش کەس بووین ئاسانتر بوو ڕێگە کردنمان و خۆ شاردنەوەمان دەتوت لە سەنگەردانین و دانە دانە گەڕەکە و گەڕەك ڕامانـدەکردە سوچێك و خۆمان مەڵاس دەدا تاوەکو بزانین کەمینمان بۆ دانراوە یان نا لەشوێنێکدا خۆمان حەشاردابوو سەیارەی پۆلیسمان بەدی کرد بەڵام ئەو ئێمەی نەبینی ئەمجارە و تەنها ڕێگەیەکیشمان لەبەردەمدا بوو کە دەبووایە بەرەو دواوە بگەڕێینەوە و بچینە چۆڵەوانیەك لە پشتی شارەکەداو قاچاخچیەکە زۆر وت و وریا و زیرەك بوو وتی دەبێت بۆ دەرەوەی شارو بۆ بەشی دواوە بگەڕێینەوەو بچینە پشتی شارەکەوە چونکە بەیانی ئەوان پێشمان لێ دەگرن و بۆمان دەگەڕێن ئیتر لەوکاتەدا کەسەیارەکە ڕۆشت و گەڕایەوە ئێمەش بەخێرایی بەناو ئەوجادە گەورەیەدا دەستمان کرد بەڕاکردن تاوەکو خۆمان بگەیەنیە تاریکایی و لە ڕۆشنایی و چراخانی شار ڕزگارمان بێت سبحان الله سەرمان لێ تێك چوو خۆمان کرد بەگەڕەکێکدا و بەڕاکردن ڕۆشتین بەرەو سەرەوە کەچی کاتێکمان زانی لەسەر سوچی کۆڵانەکە کافتریایەکی شەوانەی لێیە و خەڵکی تێدایە ئێمەش خۆمان تێك نەدا و ڕاکردنەکەمان هێواش کردەوە و وەك بڵێی ڕێبوار و موسافیر بین بەو کۆڵەپشت و جل و بەرگە چڵکن و قژ ئاڵۆسکاویمانەوە سەیرێکی ناو کافتریاکەمان کرد خەڵکەکەی بەسەر سوڕمانێکەوە سەیریان کردین و وەك ئەوەی بڵێن: باشە ئەم نەفەرانە چی دەکەن بەم نیوە شەوە و بەهێواشی خۆمان تێك نەداو بەلایاندا ڕۆشتین و چووینە کۆتایی کۆڵانەکە کەچی سەیرمان کرد دەرناچێت!.

قاچاخچەکە وتی: بەخوا کاکە نابێت بگەڕێینەوە و بۆ دواوە هەستمان پێدەکەن و تەلەفون دەکەن و دەگیرێین بشمانگرن دەمانکوژن هێندەمان لێدەدەن چونکە زۆرمان ماندوو کردن دەتوت فلیمیان لەگەڵ دەردەکەین لەبەر ئەوەی نزیکەی دوو کاتژمێر بوو ناوشار هەر سەیارەی پۆلیس و کۆماندۆ بوو دەشیانزانی نەفەر






ڕای کردووە خێرا خۆمان هەڵدایە ناو باخی ماڵێکەوە و دیوی ئەو دیوی ماڵەکە بەرەو چۆڵەوانی و دەشتاییەك دەیڕوانی و دەیبردیتەوە دەرەوەی شارەکە لەبەشی دوواوە هەرچۆنێك بوو سوپاس بۆ خوا گەشتینە دەرەوەی شار و ئەوجا کەمێك دانیشتین و سەیری ناوشارمان دەکرد شەوقی فەراڕەی سەیارەی پۆلیس دەیدا لە ئاسمان و هەر دەنگی ویقە ویق دەهات! پاش پشوودانێکی باش و قسەی دەردەدڵی خۆمان و باس کردن لەو هەڵەیەی کە چووینە ئاواییەکە بۆ نان کڕین ئەوجا قاچاخچیەکە مۆبایلەکەی دەرهێنا کەبەحاڵ شەحنی تێدا مابوو تەلەفونی کرد بۆ تەرەفەکە و هەواڵی گیرانی نەفەرەکانی دایە و ئەویش هێندەی تر خەفەتباری کردین و وتی کاکە وەڵا سەیارە نایەت بۆ شەش کەس ، دەبێت بێنە شاری (ئەگزەنتی) ئێ ئەو شارەش پەنجا کیلۆ مەتر دوورە!.

ئیتر دەسەڵاتمان نەما و بەناچاری هەستاین دەستمان کردەوە بەڕێگە کردن هەتا گەشتینە سەرجادەی ئۆتۆبانی شاری(کۆمەتین- ئەسینا) کە جادەیەکی پانی کاکی بە کاکیەو تەختە خوا ایناوە بۆ پێشبڕکێی سەیارە چونکە بەڕۆژیشدا زۆر چۆڵە و سەیارەی بەکەمی پێدا دەڕوات تا ئێستاش بەڵام ئەوکاتەی من پێیدا هاتم کەساڵی (٢٠٠٢) بوو هێشتا لە دروستکردندا بوو هیچ سەیارەی بەسەردا نەدەڕۆشت غەیری سەیارەی چاك کردنی جادەکە و جار جارەش سەیارەی پۆلیس بەسەریدا دەڕۆشت بۆ پاراستنی ئەمنیەتی ناوچەکە دەبوایە لەجادەکە بپەڕینایەتەوە بۆ ئەوبەر بەڵام دەوری جادەکە تەلبەندڕێژکراو بوو دەبوایە بەسەر تەلەکەدا خۆمان هەڵدایەتە سەر جادەکەوە ئەوجا بپەڕینایەتەوە ماشەڵا هەر سایدێکیش وەك لای خۆمان بەسایدی پۆلیسەوە چەندین خەتی سەیارەی بۆ کرابوو هەردوو سایدەکە بێ لەوەی ناوەڕاستی جادەکەش شیشی لێ دانرابوو بۆ جیاکردنەوەی هەردوو ساید و نێوانی جادەکەش بەچیمەنتۆ جۆگەیان دروست کردبوو دەبوایە بچوویتایەتە ناوی ئەوجا بپەڕیتەوە





سـەرەتا نەمـانوێرا بـڕۆین چـونکە وتمـان لەوانەیە پـۆلیس چـاودێری بکـات بـۆیە لەبێستانێکی کـاڵەك و شـوتیدا لە تەنیشـت جـادەکە کاتژمێرێـك دانیشـتین و چەنـد کاڵەکێکمان لێ کردەوە و خواردمان و نەمانوێرا ئەمجارە شوتی بخۆین! ئیتر کاتێکمان زانی سـەیارەیەکی پـۆلیس بە خێرایی بەسـەر جـادەکەدا ڕۆشـت لەگەڵ ئەو ڕۆی خێرا ئـێمەش بەسـەر تەلەکەدا بازمانـدا و خۆمـان گەیانـدە دەسـتی ئەوبەری جـادەکە و بەسـەر تەلی ئەوبەر جادەکەش بازمانـدا و پەڕینەوە لەویا قاچاخچیەکە وتی: سـوپاس بـۆ خـوا زاهیـرەن لەخەتەریـات دەرچـووین و دڵنیـام ئەوان بەشـی پێشـەوەمان بـۆ دەگەڕێن، ئیتر ئێمەش دەستمان کرد بە ڕێگەکردن بەڵام ئەمجارە زۆر ترسمان نەبوو لەبەر ئەوەی کەم بووین و زووتر فریای ڕاکردن و خۆشاردنەوە دەکەوتین هەتا نزیکی بەرەبەیـان چـووینەوە دەرەوەی شـارەکە و چـووینە سـەر بەرزایـیەك کە هەمـوو شـارەکەمان لێـوە دیاربوو کۆمەڵێـك داری چڕوپڕمـان دۆزیەوە و چووینە نـاوی جێمـان چاك کرد بۆ خەوتن تا بەیانی!

بەیـانیش کاتێـك خەبەرمـان بـۆیەوە سـەگێك گەشـتە سـەرمان و کابرایەکی سـوورکاری یۆنانی کەخاوەنی سەگەکە بوو چوار شانەیەك بوو بەهۆی سەگەکەیەوە دۆزینیەوە و هـاتە لامـان و سـەلامێکی لێکـردین!. لێمـان نزیـك بـۆیەوە و سـەیرێکی کـردین بەو سـەرو چـاو و جـل و بەرگەوە هەسـتمان کـرد بەزەیـی پێمانـدا هـاتەوە و کەوتە قسـە کـردن لەگەڵمـان بەیۆنـانی قاچاخچیەکەمان نەیـوێرا وەڵامی بـداتەوە وتـی: نەك پۆلیس بێـت بیەوێت بزانێـت کێ قاچـاخچیە و ئیتر بە ئیشـارەت وەڵاممـان دەدایەوە و کەم کەمەش ئینگلیزی قسـەمان دەکـرد، نـزیکەی کاتژمێرێـك لامـان دانیشـت و جگەرەیەکیـان بـۆ داگیرسـاند و وتـی: بـۆ کـوێ دەڕۆن ؟ وتمـان بـۆ (ئەسـینا) وتـی: دوورە بەپـێ بەئاسـانی نـاگەنە ئەوێ!، ئێمەش وتمان: تـۆ شکاتمان لێ مەکە قەینا چەنـدی مابێـت، وتـی: نـا نـا خەمتان نەبێت ئێوە کەسی خراپ دیار نین.



ئیتر کابرا هەستا ڕۆشت و ئێمەش خۆرمان لێ ئاوابوو هەر شەش نەفەرەکە کەدووانمان خەڵکی شاری سلێمانی بووین و دووانیشمان خەڵکی چەمچەماڵ و دووانیشمان خەڵکی دەربەندیخان بوون.

## بەڕێ کەوتن بەرەو شاری(ئەگزەنتی).

دوای ئەوەی بە دەستە چەپی (کۆمەتین) لەدەشتاییەکی کاکی بەکاکیدا لەناو پەموو و گەنمە شامی و بێستانە شوتی و کاڵەکدا کەوتینە ڕێ بەرەو شاری (ئەگزەنتی) ماشەڵا ڕێگەمان لێ نەدەبڕایەوە و بەهۆی زەوی و زارەکانیشەوە قاچمان تەواو شل و کوت ببوو بەناچاری پاش دەرچوونمان لە شارەکە و پاش چەند کاتژمێرێك ئیتر لاماندایە سەر سکەی شەمەندەفەر و بەسەر سکەکەدا دەڕۆشتین ئەگەر چی ڕێیەکی باش نەبوو چونکە زۆرجار وەجبەکان لەسەر سکە گیراون و هەرجارێك شەمەندەفەر بهاتایە خۆمان فڕێ دەدایە تەنیش سکەکەیەوە تاوەکو دەڕۆشت بەم شێوەیە هەستمان کرد باش نیە ڕۆشتنمان بەسەر سکەکەدا چونکە ژێر سکەکە هەمووی خڕە بەرد بوو، ماشەڵا دەنگی پێمان هێندە گەورە بوو دەمان وت ئێستا نا ئێستا ئاشکرا دەبین بەناچاری هاتینەوە ناو زەوی زارەکان و تا بەیانی ڕێگەمان کرد تابەتەواوی گوندێکی مەسیحیمان بڕی و گەشتینە نزیك گوندێکی ئیسلامی لەوناوچەیەدا وتی: ئێرە باشە بۆ پشودان چونکە ئیتر گوندی ئیسلامی کۆتایی پێ دێت لەم ناوەدا و گەر لەنزیك گوندە مەسیحیەکان پێمان بزانن ئاشکرامان دەکەن وە بەڵکو بۆ بەیانیش خواردنێکمان دەست بکەوێت لێرەدا لەناو کێڵگەیەکی توتندا شوێنمان بۆ خۆمان چاك کرد و پاڵ کەوتین ، چونکە ئیتر شوێنی خۆحەشاردان بە ئاسانی دەست نەدەکەوت پاڵ کەوتین و کەسمان بۆمان نەبوو هەستین و داشبنیشین وە قاچاخچیەکەمان لە شوێنێکدا مۆبایل و شتومەکە یۆنانیەکانی شاردەوە و وتی: با بخەوین لێرەدا نەوەك بەیانی لەکاتی خەودا بدەن بەسەرماندا ئەم شاتنەم پێ بگیرێت دەڵێن: تۆ قاچاخچیت!.





بەیانی کاتێك خۆرمان لەسەر هەڵهات خەوتبووین دەنگی کرێکار و تراکتۆر و خەڵك دەهاتە گوێمان لەو نزیکانە باوەڕتان بێت هەر خوا ئاشکرای نەدەکردین ئەگینا لەدەورماندا درەوی توتن دەکرا، کات گەشتە نزیکی نیوەڕۆ بۆ عەسر
لەناو ئەو زەویەی کە خۆمان حەشاردابوو سەیرمان کرد وا لەبەشی خوارەوەماندا دروێنەدەکرێت لەلایەن چەند پیاو ئافرەتێکەوە و خەریکە لێمان نزیك دەبنەوە.
حاڵیشمان بەرەو نارەحەتی زیاتر دەڕۆشت و ڕۆژیش بوو شاخیشی لێنەبوو تا بڕۆینەوە ناو دارستان خۆمان بشارینەوە بۆهەرشوێنێك بڕۆشتیتایە دەگیرایت چونکە ئەو ناوچەیە دەڵێی دەشتی شارەزوورە!.
ئیتر من بەحاڵ سەرم بەرز کردەوە سەیرم کرد، ئەوە خۆ چەند ئافرەتێکی سەرپۆش بەسەریان لەگەڵە و ئیش دەکەن و بەتورکیش قسە دەکەن وتم کاکە وەڵا لەخوا بەزیاد بێت لەزەوی مسوڵمانێکی تورکداین پێشنیارم بۆ قاچاخچیەکە کرد کەوا کارێك بکات و وتم: هەستە بڕۆ بۆ لایان پێش ئەوەی خۆیان بگەنە لامان و توشی شۆك بن قورئانێکی وەرگێڕاوی زمانی تورکیم پێ بوو کە پێش ئەوەی سەفەر بکەم لە شاری (ئەستەمبوڵ) ی وڵاتی (تورکیا) لە کۆمپانیەیەك ئیشم دەکرد کە ئیشی قۆنتەراتی نوێکردنەوەی قوتابخانەی دەکرد پیاوێك سەرپەرشتی دەکرد ناوی (عبداللە ئابی بوو)پیاوێکی ئیندداری ڕیش ماش و برنجی تەنك بوو
نزیکەی مانگێك پێش سەفەرکردنم ئیشم کرد لەلای ڕۆژێکیان بینیمی نوێژ دەکەم زۆری خۆشویستم و قورئانێکی وەرگێڕاوی زمانی تورکی و بەرماڵێکی بە دیاری بۆ هێنام منیش قورئانەکەم لەگەڵ خۆم بردبوو بۆ ڕێگە وتم بڕۆ بیاندەرێ بەدیاری و بڵێ: ئەمەش قورئانێکی وەرگێڕاوی تورکی یە بەدیاری بۆ ئێوە و چونکە دیارە کە مسوڵمانیشن و سەلامیان لێ بکە و بڵێ : ئێمە مسوڵمانین و لێمان قەوماوە و بۆ (ئەسینا) دەڕۆین و کەسی خراپ نین ، خواردنیشمان پێ نیە و پارەی بدەرێ بەڵکو




خواردنیشمان بۆ بێنێ لە لادێکەدا قاچاخچیەکە زۆر پێشنیارەکەمی بەلاوە جوان بوو وە کە قورئانەکەی بینی وەریگرت و ماچێکی کرد و وتی: وەڵا عافیە برام ئەمە ڕزگارمان دەکات بەقوربانی بم.

سەیرێکی دەوری خۆی کرد و هەستا و چوو بۆلایان ئێمەش لەدوورەوە لەبەینی لق و گەڵای توتنەکانەوە سەیرمان دەکرد، باوەڕتان بێت بینیم کابرایەکی ڕێك و پێك هات بەرەو پیری و لەگەڵ قورئانەکەی دایە دەستی خستیە سەر سەری و ئاگام لێ بوو پارەکەی دایە و هەر ئەوەندەم زانی قاچاخچیەکەمان هاتەوە بۆ لامان دەم بەپێکەنینەوە و ئەویش سواری سەیارەیەکەی بوو کەسەیارەیەکی سووری جوان بوو ڕۆشت و ئەویش هاتەوە وتی: ألله اکبر، بەخوا لەگەڵ قورئانەکەم دایە دەستی حەماسەت گرتی و خێرا ڕۆی خواردنیشمان بۆ بهێنیت و وتیشی لەشوێنی خۆتان هەڵ مەستن هیچ ترسێکتان نەبێت و ئێمە نیازمان هەبوو ئەولایەی ئێوە بدورینەوە، بەڵام دەیخەینە بەیانی.

پاش کاتمێرێك هاتەوە و خواردنێکی باشی موعەلەباتی ماسی و تاعین و سەمونی بۆ هێنابووین و سەلامێکی لێکردین و باقیشی بۆ هێنابوینەوە و ئەوجا لەبەر ئێمەش دەستیان لە ئیش و کار هەڵگرت و ڕۆشتن پاش نان خواردنمان و پشودانێکی باش ئێوارەمان بەسەردا هاتەوە و دووبارە کەوتینەوە ڕێ و ئەمجارەیان ڕێگەکەمان سەختتر بوو چونکە ناو ئاوەدانی بوو تەنها دەمانتوانی بە ناو گەنمەشامی دا بڕۆین کەماشەڵا لەباڵای خۆمان گەورەتر بووون دەبوو بەهەردوو دەستت لەپێش چاوی خۆت لات بدایە و زۆر شەکەتی کردین ئەمە بێ لەوەی جار جارە دەبوایە بچوینایەتەوە سەر جادەی قیرو خاکی و گەڕەك و کۆڵانی ئەو شارۆچکە و لادێیانەی کەدێنە ڕێگەمان بەهەرحاڵ لەشوێنێکدا گەراجێکی سەیارەمان بەدی کرد بە تەلبەند دەوری گیرا بوو، نەفەرێکمان کلیلی جۆکەری پێ بوو وتی: کاکە بەخوا من زۆر هیلاکم




و دەچمە ژوورەوە بەڵکو سەیارەیەك بخەمە ئیش و بڕۆین تا ماوەیەك نزیکمان بکاتەوە و دواتر فڕێی دەدەین!.
منیش وتم کاکە ئەم کارە بەکەڵك نایەت و دواتر توشی کارەسات دەبین با نەکەوینە هەڵەوە ، بەخوا گوێی نەگرت قاچاخچیەکە وتی: بەخوا بگیرێیت لەسەر سوکانەکەی یەکسەر حوکمی قاچاخچێتی دەدرێتە پاڵت و سیانزە ساڵ حوکم دەدرێیت، بەڵام هەر گوێی بۆ نەگرتین دەرگای سەیارەیەکی کردەوە و چووە ناوی بەڵام سوپاس بۆ خوا نەیتوانی بیخاتە ئیش و مەجبور بوو دوامان بکەوێت دووبارە لەپاش ئەوە نەماندەتوانی ڕێگا ببڕین لەدەستی ڕاستی جادەی نێوان(کۆمەتین و ئەگزەنتی) لەبەر ئاوەدانی.
لەژێر پردێکەوە پەڕینەوە ئەوبەر جادەی ئۆتۆبانەکە و کەوتینە ڕێ لەتەنیشت جادە ئۆتۆبانەکەدا و جادەیەکی خاکی کاکی بەکاکی تەختمان هاتە بەردەم زۆر دوور و درێژ بوو قاچاخچیەکە وتی: وەڵاهی زۆر چاکە تا ئێستا من بەم ڕێگەیە نەهاتوم و نەشم زانیوە هێندە چۆڵ و باشە بۆ وەجبە نەمانزانی ئەم ڕێگەیە بەرەو ئاومان دەبات ، ڕێگامان زۆر بڕی جار جارە کوخێکی کەنیسەمان دەبینی و دەچووینە ناوی وشك و برین لەمۆم زیاتر هیچی تیدا نەبوو!.
لەڕێگە ڕۆشتنمان بووین هەستمان بەدەنگی بۆق کرد و هەوایەکی فێنك بەرەو ڕوومان هات هێندە تاریك بوو چاو چاوی نەدەبینی قەدەری خوا کەوتینە ناو زۆنگاوێکەوە قاچمان چوو بەناو ئاودا و خەریك بوو یەکێکمان بکەوێتە ناو ئاوەوە و بەپەلە دەستمان گرت ، هەر دەڕۆشتین و وردە وردە جێ پێمان نەرم دەبوو پێڵاوەکانمان هەمووی پڕ بوو لە ئاو تا گەشتینە شوێنێك کە کۆتا ڕێگە بوو سەیر دەکەین ئەوە خۆ ئاوێکی گەورەیە و بەهەڵە هاتووینەتە ناوی ، جا وەرە بەچی نارەحەتیەك ڕێگەمان دۆزیەوە تاوەکو بەشوێن پێیەکانی خۆماندا گەڕاینەوە دواوە و زۆر هیلاك بووین و



ئیتر چوینە ناو بەشێکی وشکی زۆنگاوەکە لەناو قامیش و زەلدا شوێنێکمان چاك كرد و وتی: با بخەوین بەخوا تاریکە و ڕێگە دەرناکەین با یەکێکیشمان نەخنکێت وبەهەڵەش هاتووین هەردەبوایە لەوبەر جادەکەوە بڕۆشتینایە و پاشان وتی: تازە خێری تێدا بێت و بەیانی دەبێت هەستم بەڕۆشنی سەیرێك بکەین مادەم خواردنی بەیانیشمان پێماوە زۆر باشە و ئیتر خەومان لێکەوت بەیانی دووبارە بەدەنگی تراکتۆر و شوان خەبەرمان بۆیەوە و شوێنەکەمان زۆر باش بوو کەس نەهاتە سەرمان و تا ئێوارە لەو زۆنگاوەدا ماینەوە!.

دووبارە وەك ڕۆژانی ڕابردوو کە ئێوارەمان بەسەر هات و ، دوونیا کش و مات بوو دەستمان کردەوە بەڕێگە کردن بەڵام ئەمجارەیان بەتەنیشتی جادەی قیری ئۆتۆبان کەبەرەو (ئەسینا)ی پایتەخت دەڕۆشت و ئێمە لە جادەکەیەکی خاکی تەنیشتیەوە دەڕۆشتین و ئەو هەموو سەیارەیەش هاتووچۆیان دەکرد بەڵام ئەوان ئێمەیان نەدەبینی چونکە جادە ئۆتۆبانەکە وادروست کرابوو بەرزتر بوو لەجادە خاکیەکە و سیاجیشی بۆکرابوو لەهەرشوێنێك ڕێگەی جادەی خاکی کۆتایی پێ بهاتایە پردێکی دەداینێ و لێوەی دەپەڕینەوە بۆ بەشی ئەوبەر یان ئەمبەری جادەکە و دەستمان دەکردەوە بەڕۆشتن بەڵام لەکاتی پەڕینەوەکانماندا زۆر بەحەزەر بووین چونکە ژێر ئەوپردانەش هەمووی جادە بوون و لادێ و گوندەکانی دەوروبەری پێکەوە دەبەستەوە چونکە لەسەر جادەی ئۆتۆبان کە لای خۆمان بەخەتی خێرا ناسراوە لادانی زۆرکەمە و تەنها لەنزیکی شار و ئاوەدانیەك لادانت دەداتێ لەو ڕێگە کردنەدا ئیسراحەتر بووین لە ڕۆشتنەکانی ڕابردوو چونکە هەم ڕێگەکە تەخت بوو وە هەم ترسمان لەسەر لاچووبوو، لەبەر ئەوەی سنوری خاکی وڵاتی(یۆنان)مان زۆر بڕیبوو وە ئیتر چووبووینە قوڵایی ئەو وڵاتەوە ترس و لەرزیش زیاتر لەسنورەکانی دا هەیە و لەجیاتی کۆماندۆش پۆلیس سەرپەرشتی دەکات ئەوەی کەزۆر ناخۆش بوو ئەو شەوە هاتنە ڕێی چەند







جۆگەلە و ئاوێکی وەك ڕووبار هەندێکیان وشك ببوون یان ئاوەکەیان کەم بوو بۆیە بەئاسانی دەپەڕاینەوە لێی بەڵام دانەیەکیان لەبەر زۆری ئاوەکەی نە دەمانتوانی بپەڕێینەوە وە نەشماندەتوانی بەمەلەش بڕۆین لەبەر ساردی ئاوەکە، چونکە مەسافەکەی زۆر بوو

نەشماندەوێرا بەسەر ئەو پردە دوور و درێژەدا بڕۆین کەلەسەری دروست کرابوو لەبەر هاتووچۆی سەیارە ئەم پرد و ئاوەش دەکەوێتە نزیکی چیای سپی لە نێوان شاری(کۆمەتین و ئەگزەنتی)یە و (چیای سپی) شاخێکی سپیە کاتی خۆی نوقتەی کۆنی قاچاخچیەکان بووە و شاحینە لەویادا نەفەری هەڵگرتوە بەڵام پێم وایە ئەوکاتەی ئێمە کەساڵی (٢٠٠٢) بوو ڕێگە ئاسانتر بوو وەجبە نەدەگەشتە ئەوشوێنە و ئێمە تاکە وەجبە بووین کە ئەوڕێگە زۆرە ببڕین چونکە شاحینەکان زیاتر دەهاتنە خوارەوە بۆ سەر سنور بەهەرحاڵ نەمانزانی چۆن ڕزگارمان بێت لێی!.

چووینە ژێر پردەکەوە سەیرمان کرد پردێکی ئیملاقی گەورەیە و لەسەر پایەکانی پردەکە تاوەکو ئەوبەر ڕێڕەوێك هەیە و بەئەندازەی ڕۆشتنی پێیەك جێ قاچی هەیە و پایە بۆ پایەی بەستۆتەوە بەیەکەوە و پایەکانیش وەك پیتی وای ئینگلیزی دروست کرابوون و لەخوارەوە تا ئەو ڕێڕەوەی پیایدا دەڕۆشتین ستونێکی درێژبوو بۆ خوارەوەو لەویادا بۆ ڕاگرتنی پردەکە وەك ژمارە حەوتی لێ هاتبوو بۆ ئەوەی هەردوولای پردەکە ڕابگرێت و ئێمەش بەناوەڕاستیدا دەڕۆشتین تابچینەوە سەر هەمان ڕێڕەو خوارەوەشمان ئاو بوو لەگەڵ ئەوەی نەماندەوێرا سەیری خوارەوە بکەین بەڵام دەنگی خوڕەی ئاوەکەی زراوی بردبووین و بۆ خۆی گیانکێشانێك بوو سوپاس بۆ خوا لەوێشدا ڕزگارمان بوو.

پاشان نزیك بووینەوە لەشاری (ئەگزەنتی) و ئیتر بەدەستە ڕاستماندا لە جادەی قیرو ئۆتۆبان ڕێڕەومان گۆڕی بەرەو بەرزایی و شاخ چونکە ئەو شارە بە بەرزاییەوەیە و ناو شارەکەش شاخ لەیەکی جیا کردونەتەوە بەشێوەیەکی هێندە دڵڕفێنە کەوا هەرگیز







وێنەیم نەبینی بوو لەڕابردوودا! لەبەر ئەوەی شەوێکی تاریك بوو ئەوەی کە کردمانە نیشانە بۆ ڕێگەکردنمان سەڵبێکی گەورەی سپی بوو لەسەر شاخی پشتەوەی شارەکە کەشەوانە دیار بوو بە بلاجگتۆر دەوری ڕازابۆیەوە و دایاندەگیرساند دەتوانم بڵێم لەدووری بیست وپێنج کیلۆ مەترەوە دیاربوو دووبارە کەوتینەوە ناو ئازار و ناڕەحەتی و بەرزی و نزمی ڕێگە و جار جارەش ڕێمان دەکەوتە ناو گوندێکەوە بەهێواشی و لەسەر خۆیی گەڕەکا و گەڕەك دەرۆشتین بەڵام سەگوەڕی ئاواییەکان هەراسانیان دەکردین و دەبوایە خۆمان زوو ڕزگار بکردایە بۆ ئەوەی ئاشکرامان نەکەن!.

پاش ئەوەی گەشتینە ئاواییەك ماڵەکان لەبەردەمی خۆیاندا باخ یان بێستانی بچوکیان دروست کردبوو، سبحان الله لەویادا بێستانێکی بچوکمان بینی وادەزانم تەنها پانزە شوتی تێدا کرابوو بەڵام ماشەڵا شوتیەکانی چەند گەورە و جوان بوون لەژیانمدا تامی شوتی وا خۆشم نەکردوە ئیتر بێ ئێوە ناخۆش هەرچەندە دەشمانزانی خەومان لێ دەخات بەڵام شوتیەکی باشمان خوارد کە تامەکەی لەقەد گەورەییەکەیدا بوو بەڕاستی!.

لەنزیك بوونەوەماندا لە شارەکە ڕێمان لێ تێکچوو چونکە چیایەك هاتە بەردەممان و سەڵبەکەمان ون کرد تا کەوتینە ناو کۆمەڵێك تەلبەندی گەورەوە کە نەماندەزانی بەرەو کوێمان دەبات ، ئێمەش دانە بەدانە دەمانبڕی و نەماندەزانی ئەمە ناوچەیەکە هەمووی ئاژەڵە کێوی و ئاژەڵە ماڵی تێدا بەخێو دەکرێت لە هەموو جۆرەکانی ئاژەڵان ماشەڵا تەلبەند نەدەبڕایەوە هەر خۆمان هەڵدەواسی و خۆمان فڕێ دەدایە دیوێکی تر بەشێوەیەك هەندێکیان بەشی سەرەوەی تەلبەندەکە تەلی دڕکاوی پێوە بوو بەخوا لەوە ناخۆشتر نییە لەکاتی خۆ هەڵدانەدا پانتۆڵت لێی گیر بێت و بدڕێت جاری واش هەیە هەڵتەواسێت بەسیاجەکەوە و دەبێت نەفەرێك هاوکاریت بکات تا لێی بکاتەوە!.





باوەڕتان بێت هەر ئەوەندەمان خۆش بوو تەواو دەنگی سەگوەڕ هەراسانی کردین و وتمان ئێستا کەشفمان دەکەن و کەوتینە ناو سیاجێکەوە نەمانزانی هەمووی ئاژەڵی کێویە و پەلاماریش دەدەن و هەندێکیان شاخیشیان هەبوو یەکەم کەس سورەی بەر لەشکر کە خۆم بووم خۆم هەڵدایە ناوی پاش من قاچاخچیەکە دواتر دانەیەکی ترمان کەوا توانای کەمتر بوو بە دوو نەفەر بەرزیان کردەوە .
بەخوا لەگەڵ ئەو خۆی هەڵدایە ئەم دیو بۆ لای ئێمە لەدوورەوە شتێکم بینی بەرەو رووومان هات بەخێرایی جا خوا ڕەحمی کرد ئەوکات چاویشم وەك ئێستا لاواز نەبوو عەینەکم لەچاودا بێت لەگەڵ بینیم سەیرم کرد ئەوە خۆ ئاژەڵێکە و شاخی هەیە و لەدوورەوە گوژمی بۆ ئێمە خواردۆتەوە وتم کاکە خۆتان فڕێدەنەوە ئەو دیو بەخوا فەوتاین هەر ئەوەندەم خۆش بوو خۆمان فڕێدا بەبێ یەك و دوو، باوەڕتان بێت ئەو برادەرەی بەدوو نەفەر هەڵیان دایە لامان نەمزانی چۆن خۆی فڕێدایەوە ئەودیو دەرقاچی پانتۆڵەکەی لەتەلە دڕکاویەکە گیرا لەدیوی ئەم دیو وەك گۆشتی قەساب هەڵی واسی بەسیاجەکەوە ، ئاژەڵە کێویەکەش کەتا ئێستاش نازانم چی بوو بەس شاخەکانیم بینی لەگەڵ خۆی دا بەسیاجەکەدا ئەوفەقیرەی فڕێ دایە خوارەوە ئیتر پێکەنین و ترس تێکەڵ بوو بەسەر یەکدا و بە شێوەیەك ڕزگارمان بووە لەو سیاجانە نزیکەی نیو کاتژمێرێك بەدەووری خۆماندا سوڕاوینەتەوە تاوەکو ڕێگەی ڕزگار بوونمان دۆزیەوە و نەجاتمان بوو سوپاس بۆ خوا!.
پێش ئەوەی بگەینە ناو شاری(ئەگزەنتی) گەشتینە ناو گوندێك سەرقەبرانێکی لێ بوو چووینە ناوی ئیسراحەتێکمان کرد و پاشان لەتەنیشتی سەرقەبرانەکە جۆگەلە ئاوێکی سازگار و پاکی لێبوو قاچاخچیەکە وتی پێم باشە لەم ئاوە سەر و ملمان بشۆین بەسابون بۆ ئەوەی تۆزێك ڕەنگ و ڕومان بێتەوە چونکە سبەینێ ئیتر دادەبەزینە ناو ئاوەدانی و خەڵك و ئیتر لەژیانی کێوی ڕزگارمان دەبێت پاش ئەوەی لەو جۆگەیەدا کە




ئاوێکی سازگار و پاکی پێدا دەڕۆشت و لە شاخەوە دەهاتە خوارێ سەروملمان شۆرد و دەست نوێژێکی جوانم لێ گرت لە ئاوەکە بۆ ئەوەی کاتێك بانگی بەیانی دا نوێژەکەمی پێ بکەم چونکە ماوەیەکی زۆر بوو بەس بەتەیەموم نوێژەکانم دەکرد لەبەر نەبوونی ئاو یان ترس کە نەمدەتوانی لەشوێنی خۆم بجوڵێم دووبارە کەوتینەوە ڕێگە کردن و تا نزیکەی بەری بەیان ڕێگەمان کرد و بەرەو بەشی دواوەی شارەکە ڕۆشتین تا خۆمان بگەیەنینە ناو دارستانی پشتی شارەکە و لەشوێنکدا خۆمان بشارینەوە و جێی ئیسراحەت پەیدا بکەین زۆر هیلاك و شەکەت بووین چونکە وەك باسم کرد ناوچەیەکی شاخاویە کاتێك گەشتینە لای نەخۆشخانەی شارەکەوە کە لەبەشی سەرەوەی شارە و لەدەرەوەی شار دروست کراوە تەواو خەریك بوو دونیامان لێ ڕووناك ببێتەوە بۆیە بەپەلە چووینە پشتی نەخۆشخانەکە و لەوێدا کۆمەڵە دارێکی چڕوپڕمان دۆزیەوە و شوێنمان چاك کرد بۆ خۆمان و وتمان لێرە دەخەوین تابەیانی دواتر هەرشتێك بوو خوانەخواستە ڕادەکەین بەرەو ناوشار ئیتر لەویادا نوێژی بەیانیم کرد و چووینەوە ناو کیسە خەو و خەوتین.
ئالەویادا باوکم هاتە خەوم و لەخەونم دا من لە وێستگەی شەمەندەفەرێکدا وەستابووم چاوەڕێی شەمەندەفەرم دەکرد و کاتێك هات ویستم سەرکەوم ئاوێك لەبەردەمم دا ڕێگر بوو وە من چاوەڕێی نەفەرێکم دەکرد هاوکاریم بکات خێرا باوکم هاواری کرد و وتی: کوڕم خۆت بڕۆ چاوەڕوانی کەس مەکە سوپاس بۆ خوا خێرا بەپەلە خۆم کرد بە ناو ئاوەکەدا و ئاوەکەم بڕی وسەرکەوتم و ڕزگارم بوو لەوکاتەدا بەخەبەر هاتم تەماشام کرد خۆر وا لە ناوەڕاستی ئاسمانە و دەنگی جریوە جریوەی چۆلەکە و باڵندە دێت قاچاخچیەکەش هەستاوە و دانیشتوە جگەرە دەکێشێت!.
وتی: هەستن کاکە دەبێت ئێستا من بڕۆم بۆ ناو شار، شەحنم پێ نەماوە و دەبێت هەم تەلەفون بکەم بۆ تەرەفەکە وە هەم خواردنێکی خۆشیش بێنم وتی:




مریشکی برژاو چۆنە بەلاتانەوە ئێمەش وا مەعیدەمان کەف دەکات بۆی لەڕێگە کەبرسیمان بوو باس باسی خواردنی خۆش و چێشتخانەی عبداللە ی(ئەسینا) بوو کەبگەین و تۆڵەی برسێتی بکەینەوە بەهەرحاڵ قاچاخچیەکە برادەرێکی دەست نیشان کرد بیبات لەگەڵ خۆی منیش وتم: وەڵا کاکە من دێم وتی ئاخر نابێت کاکە ئەو باشترە و تۆ لێرە بمێنەوە وتم: بەخوا خەوم بینیوە بە باوکمەوە و پێی وتوم: کوڕم چاوەڕوانی کەس مەکە وتی: بابە ئەوە خەوە و کەی پەیوەندی هەیە بەم باسەوە خۆ هەر من ئەبێت سەیارەتان بۆ پەیا بکەم وتم: دەزانم بەس بەخوا من دێم خێرا جلی تازەم دەرهێنا لەناو جانتادا کە لە دوو سێ عەلاگەم پێچابوو باش بوو پیس نەببوو لەگەڵ پێڵاوی تازەدا و بەرگی کۆن و چڵکن و دڕاوی چەندین ڕۆژم لەبەرکردەوە و فڕێم دا کە بەتەواوی دەقم گرتبوو تیایدا ئیتر ئەوبرادەرەش دیار بوو حەزی نەدەکرد بڕوات لەگەڵ قاچاخچیەکەدا چونکە دەترسا لەڕێگەی ناوشار بگیرێت وتی: کاکە ئەو بەرەو بەپێکەنینێکەوە وەك گاڵتەکردن وتی: خەوی بینیوە و باوکی بلیتی بۆدەبڕێت بەڵام نەیزانی خەوەکە ڕاستە و دواتر بە ڕاستەقینەیی بۆی دەرکەوت و پەنجەی پەشیمانیان گەست !.

## گەشتنە ناو شاری (ئەگزەنتی) و دابڕانم لە قاچاخچی و نەفەرەکان.

دوای خۆئامادەکردنمان و خۆگۆڕینمان من و قاچاخچیەکە دابەزینە ناو شاری(ئەگزەنتی) و یەکەم جارم بوو کە بەڕۆژ بچمە ناو ئاوەدانی لە وڵاتێکی ئەوروپی دا گەشتینە کۆشکێك بۆ کڕینی کارتی کابینەی سەرشەقامەکان کە وڵاتی (یۆنان) بەوە ناسراوە زۆربەی دووکانەکانی وردەواڵەی لەسەرجادە و شەقامەکانە و لەناو کۆشکدایە لەویا منیش کارتێکی وەحدەی تەلەفونم کڕی تاوەکو تەلەفون بکەم بۆ کەسێکی نزیکی خۆم کە لە(ئەسینا) چاوەڕوانی هەواڵم بوو وە هاوڕێی قاچاخچیەکەش بوو بەهۆی ئەوەوە من قاچاخچیەکەم ناسی و




سەفەرم کرد لەگەڵیدا کاتێك زەنگی تەلەفونم بۆ لێدا باوەڕی نەکرد و وایزانی منیش گیراوم لەگەڵ نەفەرەکانی شاری(کۆمەتین)ئیتر خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و وتی: ئاگات لەخۆت بێت دوای ئەوەی تەلەفون کرا بۆ تەرەفەکە وتی: ئەم شەو یان سبەینێ سەیارەتان دەنێرم بەدوادا و با قسە بکەم لەگەڵ تەرەفەکەمدا کە لای ئێوەوە نزیکە دواتر دەتانبەم بۆ(ئەسینا)، ئیتر ئێمەش زۆرمان برسی بوو دوای دوو کاتژمێر ڕێگەکردن گەشتینە ناو سەنتەری شار.

لەوێش چووینە دوکانێکی لەفە فرۆشی مسوڵمان و بێ ئێوە ناخۆش یەکی دوو لەفەی دەبڵی مریشکمان خوارد باوەڕتان بێت کابرای خاوەن دووکان سەری سوڕمابوو هەر سەیری دەکردین چونکە لەفەکان دەبڵ بوون خۆیان یەك لەفەی بچوکیان پێ تەواو نەدەکرا بەڵام ئەوان ئاگایان لە حاڵی گەدەی ئێمە نەبوو دوای ئەوەی نانمان خوارد بردمی مزگەوتێکی پیشان دام و خۆی لەدەرەوە دانیشت و منیش چوومە ژوورەوە بەئیسراحەت نوێژی نیوەڕۆ و عەسرم کرد و سوپاسی خوای گەورەم کرد کە لەپاش نارەحەتی دەروی خێری لێکردینەوە دواتر هەستاین ڕۆشتین لەسەر شەقامێکەوە تەلەفونی کردەوە بۆ تەرەفەکە و ژمارەی تەرەفەکەی خۆیی پێدااین لەشارەکەو وتی: تەلەفونی بۆ بکەن و (٥٠) یۆرۆی بدەنێ پێشەکی ئەمرۆ نانتان بۆ دێنێت بەڵام دەڵێت: سبەی شەو سەریان دەخەم ئیتر تەلەفونی بۆ کرا و ناونیشانێکی پێدااین و وتی: خواردنتان بۆ دێنم.

پاشان قاچاخچییەکە وتی: من دەبێت بڕۆمەوە بەدوای ئەو نەفەرانەدا و خواردنیان بۆبەرم منی بردە ناو پارکێکەوە و شوێنێکی پیشاندام کە لەژێر ژوورێکدا بوو بەتەختەو دار دروست کرابوو لە دەستە چەپێکی پارکەکەدا و ژوورەکەش لەسەر چوارپایە دروست کرابوو دەبوایە بەسنگە خشکێ بچویتایەتە ژێری وتی: ئەمە شوێنمانە و لێرە یەکتری دەبینینەوە و دواتر بردمی بۆ ناونیشانی تەرەفەکە و وتی:






یەك دوو کاتژمێرێکی تر دێت و ئەم پارەیەی بدەرێ و خواردنەکەی لێ وەرگرە دواتر ئەو ڕۆشت و منیش چاوەڕێی کابرام کرد دوای دوو کاتژمێر بە سەیارەیەکی توێتای شینی وەك سایپا ئێرانیەکان هات و کەچەڵێکی ورگ زل و مل پان بوو لەدوورەوە زانیم خۆیەتی بەدەست ئیشارەتی بۆکردم و چوومە ناو سەیارەکە و کەسمان لەیەك تێنەدەگەشتین و پارەکەم دایە دەستی و خواردنەکانم لێ وەرگرت ئیتر بۆ هەمیشە ئەم تەرەفە قۆڵ بڕەمان نەبینیەوە!.

منیش خواردنەکانم بردە ژێر ژوورە کەوە و دەستم کرد بەگەڕان بە نێو شارەکەدا تا نزیکی ئێوارە هەر خەریکی مزگەوت دۆزینەوە بووم و هەرکاتێك مزگەوتێکیشم بدۆزیایەتەوە ئیتر دەچوومە ناوی یەك دوو کاتژمێرێك دادەنیشتم تیایدا بەداخەوە ئەوەی جێی سەرنج بوو تەنها پیاوە بەتەمەنەکانیان لەمزگەتدا دەبینرێت ئەوانیش تەنها کاتی نوێژەکان دەردەکەون!.

هەرچۆنێك بێت کاتم بردە سەر تا خۆرئاوابوون و وردە وردە بەڕێ کەوتمەوە بەرەو ناو پارکەکە و لەم لاو لای پارکەکەدا تاکەتاکە نەفەری موعتاد و حەشیش کێشم دەبینی و جار جارەش پۆلیس دەهاتە ناوی بەڵام من خێرا چووم خۆم کرد بەژێر ژوورەکەدا بەشی خۆم نانم خوارد لەوکاتەدا نەفەرەکانیش گەشتن و تومەز پێیان زانرابوو بۆیە وادرەنگ کەوتبوون خوا ڕەحمی کردبوو نەگیرابوون ئیتر ئەوانیش نانیان خوارد و ئەو شەوەش لەویادا خەوتین تاوەکو بەیانی بەڵام زۆر ساردبوو شوێنەکەمان چونکە ناو دار و درەخت بوو بەیانی هەستاین لەخەو قاچاخچیەکە وتی: لەبەر ئەوەی ئێرە پارکە و خەڵك سەردانی دەکات دەبێت لێرە هەستین و هەر دووکەس و پێکەوە بن و بۆ خۆتان بگەڕێن تا کاتی سەرکەوتنمان کە دوانیوەڕۆیە  ئیتر منیش بەهەمان سیفەتی ڕۆژی یەکەم دەچوومەوە بۆ مزگەوتەکان و بەهۆی ئەوەی کەمێك شارەزایم پەیدا کردبوو نەفەرەکان حەزیان دەکرد لەگەڵ مندا هاتووچۆ بکەن منیش هەرجارە و





یەکێکیانم دەبرد دەمگەڕاند و دواتر دەمبردنە مزگەوتێکیان حەمامی تێدا بوو بەس ئاوەکەی سارد بوو خۆیان دەشۆرد گەشتینە دوانیوەڕۆ پەیوەندی کرایەوە بە تەرەفەکەوە و وتی: ڕۆشنە و بۆ ئێوارە گەشتینە ئێوارە و دووبارە وتی بۆ شەو بەم شێوەیە هەردەستی دەستیمان پێ دەکرا و درۆمان لەگەڵ دەکرا!.

ئێمە لەچاوەڕوانیدا بووین وردە وردە ئاسمان هەورێکی ڕەشی سامناکی تاریك دایپۆشی و بارانێك دەستی پێکرد لەژیانمدا بارانی وا بەخوڕم نەبینیوە بە هەورە بروسکەشەوە بوو لەبەر ئەوەی شارەکەش لە ناو شاخدا بوو دەنگێکی دەدایەوە دەت وت ناپاڵمە ماشەڵا بەپەلە خۆمان کردەو بەژێر ژوورەکەدا بەڵام کاتێکمان زانی ئاو هاتە ژێرمان و هەموو گیانمان تەڕ بوو، لەویادا قاچاخچیەکە لەبێ دەسەڵاتی و چاوەڕوانیدا دەستی کرد بە کوفر کردن خوا پەنامان بدات منیش هاتمە دەرەوە دەستم کرد بە قسە وتن پێی ئیتر خوا بۆ خۆی شاهێدە لەوکاتەدا یەك بروسکە دای لەزەوی هێندە دەنگی گەورە بوو خەریك بوو مێشکمان بتەقێت خێرا وتم: خوا شەرمەزارت بکات بەهۆی تۆوە خوا توشی غەزەبمان دەکات باش بوو خێرا پەشیمان بۆیەوە وتی: خوایە فڵان کەس بەتەنەکە گوی خوارد کە ناوی خۆی هێنا هاواری دەکرد و دەیوت: تکایە فریشتەکانی خۆت مەنێرە تا ڕسوام بکەن و ئیعلانی حەربم لەگەڵ مەکە!.

ئیتر هاتینە دەرەوە و چووینە سەرجادە و هەموو گیانمان و کۆڵەپشتمان ئاو بوو چووە ناو کابینەیەك و تەلەفونی کردەوە بۆ تەرەف کە کەی دێت بەدوامانندا هەر دەیانوت ئێستا نا ئێستا دەیانوت:ئەو ئێوە دەبینێت و لەکافتریای بەرامبەرتان دانیشتوە بەس دەڵێ پۆلیس هەیە جارێ بۆیە ناوێرم سەریان بخەم باوەڕتان بێت چوومە ناو کافتریاکە چەند پیاوێکی پیر نەبێت کەسم نەبینی هاتمەوە وتم کاکە وەڵا درۆ دەکات ئەم ساختەچیە ئیتر ئەویش تەلەفونی کردەوە و یەك هەزار جوێنی داوە






بە تەرەفەکە و تا وای لێهات تورە بوو دەسکی تەلەفونەکەی شکاند،دووبارە دەستی کردەوە بەکوفر کردن، بەخوا ئەمجارەیان خۆم پێ نەگیراو چوومە پێشەوە بۆی پەلامارم دا و وتم: مرۆڤێکی ناکەس بەچە درۆت لەگەڵ دەکات بۆ کوفر دەکەیت نەفەرەکان کەوتنە بەینەوە و خێرا ئەویش چەقۆیەکی دەرهێناو وتی: ئێستا خۆم دەکوژم وەرە بمکوژە منیش وتم: من ناتکوژم بەڵام هەتا ئێستا ڕێگەم نەداوە کەس جوێن بدات بەخوا یان سوکایەتی بکات بەدینەکەم لەپێش چاوم دا هەزار وڵاتی جیهان و سەفەرەکەم دەکەمە قوربانی خوا بەتۆشەوە ئیتر لێرەوە نێوانی من و تۆ کۆتایی پێ هات و من دەڕۆم وتی: بۆ کوێ دەڕۆیت سەیارە دێت! وتم: قەسەم بەوخوایەی کەخاوەنی زەوی و ئاسمانە گەر بلیتی تەیارەشم بۆبڕیت تازە هەنگاوم لەگەڵ کافرێکی وەك تۆدا ناڕوات وتی: کاکە تۆ ئەمانەتی لای من و دراویتە دەستی من منیش وتم : خۆم بەرپرسم لەوەی هەرشتێکم بەسەر بێت وە سوێند بەخوا گەشبینم بەوەی کە خوا بم گەیەنێتە(ئەسینا).

بە ئاشکرا کیسەخەوە تەڕەکەم دا بەسەر شانم دا و کەوتمە ڕێ لەویادا نەفەرێکی تریشم لەگەڵ بوو کە نوێژی دەکرد وتی: وەڵاهی منیش دێم لەگەڵت و بەخوا لەگەڵ ئەو هات یەکی تریش کەدڵی بۆ لامان لێی دەدا بەڵام نوێژی نەدەکرد هات لەگەڵمان و بووین بە سێ بەسێ و لەیەك دابڕاین و جیا بووینەوە!.

دوو نەفەرەکە وتیان: بۆ کوێ دەڕۆین ئێستا؟ منیش لەوکاتەدا سەرم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و باران دەباری وتم: خوایە ئێستا ئێرە تاریکترین شوێنە بۆ ئەم بەندەیەت و تەنهاش لەبەر تۆ ئەم دابڕانەم هەڵبژاردووە خوایە کۆمەك و یارمەتیت لێ داوا دەکەم و سەرکەوتومان بکە و ئێمە خۆمان داوەتە دەستی تۆ بەتەنها و لەوکاتەشدا فرمێسك بەچاوەکانمدا دەهاتە خوارەوە لەتاو بێ کەسی دا ئیتر ڕووم کردەوە بەلای نەفەرەکاندا و وتم: براینە ئێستا خۆمان تەسلیمی پۆلیس دەکەین ئێوە دەڵێن: چی ؟





وتـم: مـن هـیچ ڕێـگە شـارەزا نـیم و ناشـمەوێت توشـی کارەسـات بـین و بـارانیش تەواو شـەکەتی کـردووین ئیتر ماڵیان ئاوا بێت وتیان: تۆ بـرا گەورەبە کاکە بەخـوا سنورداشی تورکیـا و کوردستانیشـمان بـکەنەوە لەگەڵتـاین سـبحان الله لەوکـاتەدا سـەیارەیەکی پۆلیس دای بەلاماندا و جـوان سـەیری دەکـردین منیش کەوتمە هـاوار کـردن بەدوایدا خـوا بۆ خـۆی شاهێدە نەوەسـتان و ڕۆشتن!،

لەکاتێکدا ئێمە پێشتر لە پۆلیس ڕاماندەکرد و خۆمان دەشاردەوە زۆرمان بەلاوە سـەیر بـوو خێرا شـتێك هـاتە دڵـم و وتی بـۆ نـاڕۆن بـۆ مـزگەوت و مـاڵی خـوا لەوێ دەروتـان لێ دەکـرێتەوە ڕووم کـردە دوو هـاوڕێکەم و وتـم: دڵنیـابن سـەرکەوتنی خـوا بەڕێـوەیە بۆمـان خـۆ بینیتـان سـەیارەی پۆلیسـەکە نەوەسـتا وتـم بـابڕۆین بـۆ مـزگەوت مـن شـارەزای مـزگەوتێکم لەم نـاوەدا لەویـا کیسـەخەوەکانیشـمان فڕێـدایە نـاو تەنەکەیەکی خـۆڵ و بەپەلە ڕۆشـتین و چـووینە بەردەرگـای مـزگەوتەکە دەرگـاکە داخرابـوو چـونکە کـات درەنـگ بـوو نەفەرێکـم لەسـەر دیـواری مزگەوتەکەوە خسـتە دیـوی ئەودیـو وتـم بـزانە جامخانەی مزگەوتەکە دانەخراوە؟ وتی: ناوەڵا دانەخراوە سوپاس بۆ خـوا خێرا خۆتان هەڵـدەنە ئەم دیـو ئێـوەش تـا خەڵـك نەیبینیـون وە دەرگـای جامخـانەکە کـراوەیە و دانەخـراوە ئیتر ئـێمەش خۆمـان هەڵـدایە ئەودیـو پـێش هەمـوو شـتێك سـوجدەیەکی شـوکرم بۆ خـوا بـرد و خێرا برادەرەکانیشـم سـوجدەی شـوکریان بۆ خـوا بـرد دواتـر وتـم: جلەکانتـان لێرە دابکەنـن بـا نـاو مـزگەوتەکە تەڕ نەکـات و لە دەرەوە و شـوێنی دەسـت نـوێژەکەی هەڵمـان خسـت یەکی شـۆرتێکمان لەپێـدا مـابوو چـونکە هەمـووی ئـاو بـوو جلەکانمـان و نەخـۆش دەکەوتین وتـم تـاریکە و کەسـیش سـەیری یەك نەکـات تـا بەیـانی چـووینە ژوورەوە بەس هـۆڵی مزگەوتەکە دەرگـای کـراوە بـووە خێرا فەرشـێکی گەورەمـان هەڵگـرت و چـووینە سـەر فەرشـێك خەوتین و ئەوفەرشەشـمان دا بەخۆمانـدا چـونکە زۆرمان سەرمابووا!.






ئەو برادەرەی کە نوێژی نەدەکرد وتی: باشە بەیانی گەر خەڵك هاتە مزگەوت چی بکەین بەخوا شکاتمان لێ دەکەن منیش لەژێر فەرشەکەوە بەپێکەنینەوە وتم: بخەوە کاکی بەڕێز ئەو خوایەی کە ئەم شەو ڕزگاری کردووین و ڕێی نیشاندایین ومیوانداری کردین و بانگی کردین بۆ ماڵەکەی خۆی دڵنیابە هەر خۆشی بەیانی سەرمان دەخات وتم: هەرکەسیش هات دەڵێین: مسوڵمانین و لێمان قەوماوە وە وتم: ئێمە شەو ویستمان خۆمان تەسلیم بکەین و نەگیراین ئەگەر بەیانیش لێرە گیراین ئەوە خێری تیدا بێت.

بەو شیوەیە خەومان لێکەوت خێرا بەخوا ئەمەندە خۆش بوو خەوەکەی ئەگەر لە ئوتێلێکی پێنج ئەستێرەش بخەوتینایە هێندە خۆش نەدەبوو!،ئێمە خەوتبووین کاتی نوێژی بەیانی نزیك بۆیەوە و بانگ بێژی مزگەوت خۆی کرد بەمزگەوتا و لەگەڵ هاتە ژوورەوە بەسەر سوڕمانێکەوە سەیری ناو هۆڵی مزگەوتی کرد خێرا هات هەڵیساندین و بە تورکی کەوتە قسە کردن و وتی: خەڵکی کوێن ، ئێمەش هەر ئەوەندەمان زانی بڵێین: بەن مسوڵمان عێراقلەر بانگبێژەکە پیاوێکی بەتەمەنی بەساڵاچوو بوو بەسەر و چاویدا دیار بوو زۆر بەزەیی پێماندا هاتەوە بە ئیشارەت داوای لێکردین کەوا دابنیشین لە مزگەوتەکە و داوای لێکردین کەوا هەستین بۆ نوێژی بەیانی ئەو هاوڕێیەم کە نوێژی نەدەکرد ، وتی: چی بکەم لەشم تەواو نییە؟،وتم: ئاواش هاتوویتە ناو مزگەوت عەمر کۆتا خێرا ناردم بۆ حەمامی مزگەوتەکە و وتم: بڕۆ خۆت بشۆ خێرا غوسڵ دەربکە و ئیتر بەتەمای کەی بگەڕێیتەوە بۆ لای خوا کە ئەو هەموو دەرگا داخراوەی لێ کردوینەتەوە لەم بێ کەسییەدا؟ خێرا ڕۆشت و تا ئەو هاتەوە ئێمەش دەستنوێژمان گرت و نوێژی سوننەتەمان کرد و ئەو بەیانیە بە ئیمامەکەوە تەنها پێنج پیاوی بەتەمەن هاتبوون بۆ مزگەوت و لەناو خۆیاندا گفتوگۆیان کرد و قامەت کرا بۆ نوێژ!.







لەگەڵ ئیمام دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی فاتیحە دەستی کردە گریان و هەستمان کرد ئەوگریانەی بۆ ئێمەیە کە بەو شێوەیە بانگبێژەکە باسی بۆ کردووە پاش سەلام دانەوەی لە نوێژ قورئانێکم هێنا دەستم کرد بەخوێندنی بەدەنگەوە بەڕاستی ئەمەندە شەرمەزاری لای خوام لەخۆشیدا دەگریام ئیتر لەوکاتەدا خەڵکەکە کەوتنە گفتوگۆ لەناو یەکدا و دەستیان کرد بە پارە کۆکردنەوە بۆمان ئیمامەکەش هاتە لام و دەستی کردە ملم و دڵخۆشی داینەوە و کلیلی حوجرەی مزگەوتەکەی دایە دەستم کە لە نهۆمی دووەمدا بوو وتی: دەزانم ماندوون بڕۆن بخەون لەوێدا و بەتانیشی لێیە ئیتر هێندەی تر خۆشحاڵ بووین بەڕاستی.

پاشان هەرسێکمان لەخۆشیدا باوەشمان کرد بەیەکدا و دەگریاین نزیکەی (١٢٠) یۆرۆشیان بۆ کۆکردینەوە و هەر لەویادا دابەشمان کرد لەناو خۆماندا پاش نیو کاتژمێر خەڵکەکە یەك یەك دەهاتنەوە و هەریەکێکیان سەرو عەلاگە جل و بەرگ و پێڵاو خواردنیان بۆ هێناین و بێ ئێوە ناخۆش هەم سکمان تێر کرد وە هەم خۆمان بەجوانترین جل و بەرگ پۆشتە کردەوە ئیتر ڕۆژ بۆیەوە و بە دوو هاوڕێکەم وت دابنیشن لێرە من دەڕۆم قسە لەگەڵ ئەو کەسە نزیکەم دا دەکەم بزانم ڕێگەیەکمان پێ ناڵێت تا بگەینە (ئەسینا).

کاتێك چوومە دەرەوە دوو کۆڵانم بڕی و کاتێکم زانی قاچاخچیەکەم بینی لەگەڵ دوو نەفەرەکەی تردا هەموو سەر و چاو و کونە لوتیان دووکەڵی ڕەش بوو خوا بۆ خۆی شاهێدە کە بینیمیان بەو جل و بەرگە نوێیە و بە ڕەنگ و ڕوویەکی جوانەوە هەر بەنج بوون! وتی: ئەوە لە کوێ بوون وە ئەم جلانەتان لە کوێ بووە؟ منیش وتم: ئەوە خوای گەورەم بەدەممانەوە هات و ڕزگاری کردین!، وتی: وەڵاهی من وتم: ئێستا گیراون ئەشەهەدو خواکەت منی ڕسوا کرد و ڕوڕەشی کردین و تۆشی سەرخست ئەم شەو دوای ئێوە چووینە شوێنێك ئاگرمان کردەوە پێیان زانین تابەیانی پۆلیس ڕاو راوێنی







پێکردوین ، کاکە وەرە با بەیەکەوە بڕۆین ئەم شتانەت لەکوێ دەست کەوتووە؟ وتم: لەهەر شوێنێك دەستم کەوتبێت موشکیلەی تۆ نیە دواتر من بەڵێنم داوە بەخوا کە لەگەڵتا سەفەر نەکەم ئیتر بوو بە مشتومڕمان و وتی : ئەو نەفەرانەت لەسەر حساب دەکەم کە لەگەڵ تۆدان منیش وتم: جا من حەقم چی یە بەسەریانەوە ، وتی: خۆی نەفەری بە (١٤٠٠) دۆلار مامەڵەمان بووە بەس ئەوەی دابڕێت و خۆشی بگات لەمبەر ئاوی تورکیاوە من(٥٠٠) دۆلارم لێی دەوێت منیش وتم بۆ خۆم باشە بەس خۆت لەگەڵ ئەو دوو نەفەرەی تردا قسە بکە و هیچ پەیوەندیان بەمنەوە نییە و من تەنہا بەرپرسم لەخۆم.

لەپاش ئەوە چووینەوە بۆ ناو مزگەوتەکە و کاتێك ئەو هەموو خواردن و جل و بەرگەیان بینی چاویان چووە پشتی سەریان ، دوای گفتو گۆ نەفەرە تازەکەی کەدەستی کردبوو بە نوێژ کردن وتی: من ڕازیم و ئەوی تریان هەر لەوێ مزگەوتی بەجێہێشت و وتی: من دەڕۆم و لەگەڵ ئێوەدا نایەم منیش وتم: برام ئەوە معامەلەیە و ئێمە نابێت خۆمان تاوانبار بکەین بەڵام ئەو گوێی بەقسەم نەدا و ویستی هیچ پارە نەدات و ڕۆشت دواتر من لە وڵاتی ئەڵمانیا بووم بیستم کە سێ مانگ گیراوە و دواتر هاتۆتە (ئەسینا) بەڕێی کەمپ!.

## بەڕێکەوتن بەرەو شاری(سالۆنیك).

لەپاش ئەوە چووم تەلەفونم کرد بۆ کەسە نزیکەکەی خۆم و وتم: حاڵ و مەسەلەیەکی ئاوا بووە ئەمشەو دیار بوو سەرەتا پێداگری کرد و وتی: کاکە تۆ بۆ وات کردوە و ئەوپیاوە دەڵێ: نەفەری لێ هەڵگەڕاندومەتەوە و لەبەر منیش هیچی لێ نەکردویت ئێستاش دەڵێت : ئەمڕۆ سەیارە دێت و دەڕۆین تۆ بۆ خۆت ناتوانیت بگەیتە( ئەسینا) چونکە کۆنترۆڵ هەیە لەڕێگە و نزیکەی نۆ کاتژمێرت پێدەچێت تا بگەیتە ئێرە منیش: بابەتەکەم بۆ ڕوون کردەوە و دووبارە پێم وت سوێند بەخوا







بەتەیارەش بمهێنێت نایەم گەر تۆش یارمەتیم نادەیت ئەوە دەگەڕێمەوە ، زانی کەوتمە ئینکاریی وتی: باشە براکەم ئێستا ڕێت بۆ دادەنێم بە یۆنانی فێری کردم کەوا تەکسی چۆن بگرم بۆ وێستگەی شەمەندەفەر و لەوێش چۆن بلیت ببڕم بۆ شاری (سالۆنیك) کە نزیکەی شەش کاتژمێر دوورە لە(ئەسینا)وە و وتی:ئاوا باشە بێیت و ڕاستەوخۆ بلیت مەبڕە بۆ ئێرە و ئەو سێ کاتژمێرە نەگیرێیت لەو بەینەدا تا شاری(سالۆنیك) ئەوە ڕزگارت دەبێت إن شاء الله،منیش خێرا گەڕامەوە بۆ مزگەوتەکە و کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو چوومە لای ئیمامی مزگەوتەکە و کلیکەکانم دایەوە دەستی و زۆر دوعای خێرم بۆکردن و دەست خۆشیم لێ کردن وتم:

ئێمە دەڕۆین هەرچەندە وتی:بمێننەوە بەئارەزوی خۆتان پشوو بدەن منیش بە ئیشارەت وتم: دەبێت بڕۆین بۆ(ئەسینا) وە لەو کاتەدا قاچاخچیەکەش مابوونەوە لە مزگەوت و وتم: ئیتر ئێمە دەڕۆین و زەمانی ئەو کەسانە ناکەین ئیتر چووینە سەنتەری شار لەگەڵ ئەو هاوڕێیەم دا و ماینەوە دوو نەفەر تەکسیەکمان گرت بۆ وێستگەی شەمەندەفەر ماڵی ئاوا بێت زۆر قسەی دەکرد خەریك بوو ئاشکرامان بکات بە خاوەن تەکسیەکەی دەوت بەئینگلیزیەکی شەق و شڕ پاسپۆرتمان نیە پارەت دەدەینێ بمان بە بۆ (ئەسینا) کابرا زیرەی کرد نەیوێرا بمانباتە ناو وێستگەکەش لە دووری کیلۆ مەترێکەوە فڕێی داین و بەدەست ئیشارەتی کەلەپچەی کرد و وتی: دەگیرێن! کەدابەزین کەمێك لێی تورە بووم وتم خوا ماڵتم ئاوا کرد خەریکە بەهیچ و خۆڕایی توشی کارەساتمان دەکەیت بابە زمانت بگرە سەر سەلامەتە هەرچۆنێك بێت گەشتینە وێستگەکە و تەماشا دەکەم چوار کۆماندۆی بەرگ سەوز لەبەردەم دەرگای شوێنی بلیت بڕین دانیشتون بەرامبەر وێستگەکەش کافتریایەك بوو چوینە ئەوێ سەرو قتویەکی فانتامان کڕی و لەسەر مێزێك دانیشتین و چاوەڕوانمان دەکرد کەوا کۆماندۆکان بەلایەکدا بڕۆن و بچینە ژوورەوە و بلیت ببڕین لەوکاتەدا شەمەندەفەرێك





هات و هەستان چوون بۆ ئەوێ منیش وتم: کاکە دەبێت هەرکەسەمان بۆ خۆی بلیت ببڕێت وتی: باش یەکەم کەس من چوومە ژوورەوە و چیم پێ وترابوو وەك توتی وتم: بۆ بلیت بڕین تاوەکو (سالۆنیك)بەخوا هەندێ قسەی کرد و منیش هەر سەرم بۆ دەلەقاند پیاوێك لەبەردەمم دا بوو وتی: زە سالۆنیکی منیش بەسەر وتم بەڵێ ئیتر بەئیشارەت وتی: منیش بۆ ئەوێ دەڕۆم وتم ئەی خوای گەورە بەقوربانت بم بەڕاستی ڕێ نیشاندەرت بۆ ناردم خێرا هاتمە دەرەوە و ئەوم نارد لەدووای ئەو کابرایە نەدەبوومەوە بۆ هەر شوێنێك بڕۆشتایە بەدووایەوە بووم!

کاتێکم زانی هاورێکەم هاتە دەرەوە و سەرەتا ویستی فێڵم لێبکات وتی: وەڵا من نازانم بلیت ببڕم بڕۆ بەقوربانت بم بۆ منیشی ببڕە و ئەوی خۆت بدە بە من ئێ وتم: کاکە منیش هەروەك تۆم وتوە خۆ زمانی ئێرە نازانم وتی ڕاستیەکەی بلیت نەماوە منیش وتم دەستەکانت خۆش بێت خەریکە کڵاو دەکەیتە سەرم وەڵاهی شەرت بێت حەقم نەبێت بەسەرتەوە ئیتر جێم هێشت لەویادا کاتێکم زانی پاسێکی گەورە هات و نەفەرەکان سەردەکەوتن و کابراشم بینی سەرکەوت ئەوەی بەدوایەوە بووم خێرا منیش ڕۆشتم وتم باشە خۆ ئێمە بلیتی شەمەندەفەرمان بڕیوە بۆ پاس هات ئیتر لەو نهێنیە تێنەگەشتم تا ئێستاش بێتاقەتی ئەو هاوڕێیەشم بووم بەڵام کەبیرم لە فێڵەکەی دەکردەوە هێندەی تر بێتاقەت دەبووم لەو داڵغانەدا بووم کاتێکم زانی ئەویش سەرکەوت خوا کردی نەفەرێك نەهاتبوو ئەو چووە شوێنەکەی!.

سوپاس بۆ خوا پاس کەوتە ڕێ و بۆ یەکەم جار پاش دەیان ڕۆژ ڕێی پیادەیی سواری پاس بوم ماشەڵا چی دیمەنێکی جوان و سەرنج ڕاکێشی هەبوو ئەو سروشتە جوانە ئیتر خەوم دەهات و نەشمدەوێرا بخەوم زوو زوو تابلۆی سەرجادەکانم دەخوێندەوە تاوەکو بزانم بەرەو کوێ دەڕوات پاسەکە کاتێك بینیم ڕێی کۆمەتینی نەگرت دڵم خۆش بوو وتم تەواو ناگەڕێتەوە بۆ دواوە خەوم لێکەوت کاتێك خەبەرم بۆیەوە چووە




شـارێك نـاوی (دراما) بـوو لەوێ وەسـتا و هەنـدێك نەفەر دابەزیـن و هەنـدێکی تـریش سـەرکەوتن ، بەلامەوە زۆر سـەیر بـوو چـونکە نەمدەزانی پاسی نۆرماڵ و ئێکس پرێس هەیە و نۆرماڵەکان چەندین شار دەکات یەك دووجار ویستم دابەزم بەڵام دواتر وتم: باشترە دانەبەزم چونکە زۆربەی وێستگەکان پۆلیسیان لێیە و وتم: با نەگیرێم، دووبارە کەوتەوە ڕێ و ئەمجارەشـیان چـووە شـارێکی تـر کە ناوی(کەڤاڵە) بـوو دووبـارە لەوێـش هەندێك دابەزین و هەندێك سەرکەوتن ئیتر جابی هات و هەندێك قسەی کرد منیش بلیـتەکەم دایە دەسـتی و کـونێکی کـرد بە دەزگایەکی دەسـتی و دووبـارە کەوتەوە ڕێـگە کردن.

ئەم جارەیان سوپاس بۆ خوا پاش چەند کاتژمێرێك گەشتینە شاری(ساڵۆنیك) و لەوێ دابەزین و کابرایەکمان لێ پەیا بـوو جیهازێکی پێ بـوو بە هاوڕێکەم وت: ئەبێت ئەوە چی لێمـان بوێـت؟ وتـی: ڕاکە بەخـوا پێی زانیـوین چـونکە لەنـاو پاسـەکەدا نـوێژم کـردووە منـیش وتـم: مـاڵم ئـاوا کردیـت وتـم خـوا هیـدایەتت بـدات بەس نەك ئـاوا کەشـفمان بکەیت!.

ئیتر مەودایەك ڕامان کرد و لەلایەن کەسـە نـزیکەکەمەوە نەفەری ناردبوو بەدوامانـدا و بە ناونیشـــانی ئوتێلێـــك یەکمـــان دۆزیەوە لەڕێـــی تەلەفـــونەوە دواتـــر بـــردینیە چێشـتخانەیەك نانی بۆکڕین و هەر ئەو ڕۆژە بلیتی پاسی بۆبڕین بۆ(ئەسینا) و سـواری پـاس بـووین و سـوپاس بـۆ خـوا شـەو درەنـگ گەشـتینە شـاری (ئەسـینا) و لە وێسـتگەی گەورەی پـاس کەسـە نـزیکەکەم کەچەنـد سـاڵێکی زۆر بـوو نەم بینیبـوو چـاوەڕوانی دەکـردین و باوەشـمان کـرد بەیەکـدا و لەوکاتەدا قاچاخچیەکە تەلەفـونی کـرد و وتـی: چیان بەسـەر هـات وتی: وەڵا ئەوەتـان لەتەنیشـتم دا ئیتر تەلەفونەکەی دایە دەستم و دووبارە وتی: من پەشیمانم و داوای لێبوردن لەخوا دەکەم!.






وتی: بەڕاستی ڕاست بوویت لەگەڵ خوادا و ئەوە ئەو برادەرشی کەدەیوت: باوکی بلیتی بۆ بڕیوە دەڵێت: ئافەرین بەخوا ئەو ڕاستی کرد و ئێمەش دۆڕاو بەڕاستی خەوەکەت ڕاست دەرچوو وتی: بەخوا دوای ئێوە لەمزگەوتەکەشدا دەریان کردین زانیان ئێمە درۆزنین و نوێژ ناکەین!.

بەڵێ بۆ شەوی داهاتووش سوپاس بۆ خوا ئەوانیش گەشتنە شاری (ئەسینا) و بەیەك گەشتین و ئەملاو لای یەکمان ماچ کرد و قاچاخچیەکەشمان تەوبەی کرد و ئێستاش خاوەنی خێزان و مندالە و کەسێکی مولتەزیمە بە نوێژ و ڕۆژووەوە و برایەکی زۆر بەڕێزیشە زۆرجاریش بۆ یادگاری باسی ئەو ڕێگەیەمان کردۆتەوە و سوپاسی هاوکاریەکانیشی دەکەم!.

لێرەدا چیرۆکی راستەقینەی نیوان (تورکیا)و (یۆنان) کۆتایی پێ هات ،هیوادارم جێگای ڕەزامەندی خوای گەورە بووبێت و بەڕێزیشتان سودتان لێ بینیبێت.

لەکۆتایی دا : دەمەوێت ئەوە بڵێم: کەوا لەپاش سوپاسی خوای گەورە دوعای خێر بۆ برا گەورەکانم دەکەم ، بەڕاستی گەورەترین پشت و پەناو قەڵا بوون بۆ من و سەرجەم هاوکاریکردنم لەڕێی ئەوانەوە بووە، لەزۆربەی نارەحەتیەکانی ژیانم دا،داواکارم لەخوای گەورە پشت و پەنایان بێت لەگەڵ باقی خوشك و براکانم دا!.

بەم شێوەیە سوپاس بۆ خوا کۆتایی بە بەشی دووەمی سەفەری یەکەمم بۆ هەندەران هات و ، پاش ئەمە دەچینە سەر بەشی سێیەم پشتیوان بەخوا

کە بریتی یە لە : ڕێگا سەختەکانی هەندەران(بەشی سێ یەم) (یۆنان _ ئیتاڵیا) (٢٠٠٣)





# (سەفەری یەکەم)



# ڕێگا سەختەکانی هەندەران

## (بەشی سێیەم)

## (یۆنان _ ئیتاڵیا_ ئەڵمانیا_ نەمسا_بەریتانیا_ئیرلەندای سەربەخۆ)

## (٢٠٠٣_ ٢٠٠٦)

## ڕەنج شێخانی

### پێشەکی بەشی سێیەم:

پاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان،وە سەڵات و سەلامی خوا بڕژێت بەسەر، پێغەمبەری کۆتا زەمان محمد(ﷺ).







پاش باسکردنی بەشی دووەم لەسەفەری یەکەمی هەندەرانم دا کە بریتی بوو لە ڕێگای نێوان وڵاتی(تورکیا) و(یۆنان) لەساڵی (٢٠٠٢) دا، لێرە بەدواوە دەچینە سەر باسی سەفەرەکانی نێوان وڵاتانی ڕۆژئاوا، هەر لەوڵاتی (یۆنان) بۆ وڵاتی(ئیتاڵیا) بە شاحینە لە ڕێی کەشتی و ئاوەوە، وە پاشان چۆنیەتی دەربازبوونم لە وڵاتی (ئیتاڵیا) بەرەو وڵاتی(ئەڵمانیا)و خۆتەسلیمکردنم لەو وڵاتە و داواکردنی مافی پەنابەری تیایدا!.

لە وڵاتی(ئەڵمانیا)ش بەهەڵە لەجیاتی کەسێکی تر، پاش نۆ مانگ سنورداشی وڵاتی (نەمسا)کرامەوە، لەوێشەوە بەڕێکەوتم بەرەو وڵاتی(بەریتانیا)و، پاش سێ مانگ لەو وڵاتەش پەنجەمۆرم ئاشکرابوو، بۆ ماوەی مانگێك خرامە کەمپی داخراوەوە و سنورداشی وڵاتی(ئەڵمانیا) کرامەوە.

لەوێش لەجیاتی قەرەبووکردنەوە زیندانی کرام و بەیەکجاریی دۆسیەم داخرا لە وڵاتی(ئەڵمانیا) بۆ شاردنەوەی ئەو هەڵەیەی بەسەریاندا تێپەڕیوە! پاشان بەڕێ کەوتمەوە بۆ وڵاتی(بەریتانیا) و مانەوەم بە قاچاخ بۆ ماوەی دوو ساڵ لە کارگەیەکی زەڵاتە دروستکردندا کارم دەکرد!. دوای ئەوەی حاڵی ئەو وڵاتەش بەرەو خراپی دەڕۆشت و دەستیان کرد بە گرتن و سنورداشکردنەوەی کوردانی بێ ئیقامە، لەوێشەوە بەڕێکەوتم بەرەو وڵاتی(ئیرلەندا)ی سەربەخۆ، مانگ و نیوێك لەو وڵاتە بووم و پەنجە مۆری وڵاتی (ئەڵمانیا) و ( بەریتانیا)م ئاشکرا بوو،ئەم جارەیان بەناچاری خۆم دەربازکرد چونکە دەیانویست سنورداشی ولاتی(ئەڵمانیا)م بکەنەوە، دووبارە بە ڕێی قاچاخ گەشتمەوە وڵاتی(بەریتانیا) و چوومەوە سەر ئیشی کارگەی زەڵاتەکە تا سێ مانگ.

پاش ئەو سێ مانگە بڕیاری گەشتکردنم دا و گەڕامەوە بۆ هەرێمی کوردستان بەدوای خێزانی بەڕێزم دا، چونکە ماوەیەکی زۆربوو چاوەڕوانی دەکرد و منیش بەئاسانی نەمدەتوانی بیبەم بۆ ئەوروپا بەڕێگەی فەرمی و یاسایی، بۆیە پاش گەڕانەوەم بۆلای،







لەڕێی قاچاخەوە پێکەوە گەڕاینەوە بۆ هەندەران و ماوەی پێنج ساڵ لەوڵاتی(یۆنان) پێکەوە نیشتەجێ بووین، درێژەی ئەم باسەیان لەسەفەری دووەم دا باس لێوە دەکەم إن شاء الله کە لەساڵی (٢٠٠٦) ەوە دەست پێ دەکات!.

**ڕەنج شێخانی**
**٢٠١٤ / ٩ /١١**
**وڵاتی فنلەندا**

## سەفەری نێوان وڵاتی(یۆنان) بۆ وڵاتی(ئیتاڵیا).

سەفەرکردنم لە وڵاتی(یۆنان) بۆ وڵاتی(ئیتاڵیا) لەسەر سندوق و ئەکسلی شاحینە بەڕێگای کەشتی و ئاودا!.





لەمانگی دەی ساڵی (٢٠٠٢) ی زاینی دا بوو پەنابەرێکی زۆری کورد ڕووی کردبۆیە وڵاتی (یۆنان)، هێندە زۆر هاوڵاتی کورد لەشەقامەکانی(ئەسینا) ی پایتەخی ئەو وڵاتە بەدی دەکرا بەشێوەیەك کەدەگەشتیتە لای چێشتخانە کوردیەکان واتەدەزانی هەموو کوردستان هاتووە بۆ هەندەران!.

لەبەر زۆری ژمارەی پەنابەر و نەبوونی پێناس و ئیقامەی ئەو وڵاتە بە چاری ناچاری زۆربەی پەنابەران یان لەشوقەی شکاودا دەخەوتن بەهۆی سەفەرکردنی هاوڵاتیانی یۆنان بۆ وڵاتانی تری ڕۆژئاوا و ئەمریکا لەڕابردوودا شوقەیەکی زۆری بێ خاوەن دەرگاکانیان داخراون و پەندێکی کوردیش دەڵێت: ماڵی خۆنەخۆر بۆ چەکمە بۆر، زۆربەی پەنابەرانیش لەبەر بێ جێگە و ڕێگەیی دەیانشکاندن و دەچونە ناوی،

ئیتر هەبوو خاوەنی پەیدا دەبوو بەزەیی دەهاتەوە بە نەفەرەکانی ناو خانوەکە و داوای دەکرد پاك و خاوێنی خانوەکە بپارێزن و کرێی ئاو و کارەبا بدەن، هەیان بوو کرێی وەردەگرت و هەشبوو تائێستاش خاوەنی هەر نیە و، هەشیان بوو شکاتیان دەکرد و دەیدان بەگرت و دەریاندەکردن، خەڵکێکی زۆریش لەسەر شەقام و پارکەکان ژیانیان بەسەر دەبردا!.

ئەگەر کەسێك ناسراوێکی نەبوایە بەئاسانی شوێنی نیشتەجێبوونی دەستنەدەکەوت منیش بەهۆی کەسێکی نزیکی خۆمەوە سەرەتا چوومە لای خێزانێکی کورد پاشان چوومە لای کۆمەڵێك برای بەڕێز و خۆشەویست کە خەڵکی شارۆچکەی چەمچەماڵ بوون شوقەیەکی بێخاوەنیان شکاندبوو بە قاچاخ کارەبایان ڕاکێشا بووا!.

ماوەی چەند مانگێك مامەوە لە وڵاتی یۆنان سەرەتا هەموو ڕۆژێك دەچووم بۆ مەیدانی کرێکاران ئیشم دەست نەدەکەوت تا برایەکی بەڕێز سەفەری کرد و خستمیە سەر ئیشەکەی خۆی کە لای وەستایەکی دارتاش شاگردبوو وە بەردەستی دەکرد،

بەردەوام بووم لەو ئیشە تا مانگی یەکی ساڵی (٢٠٠٣) و لەگەڵ ناسراوێکی نزیکی خۆم دا بڕیارمان دا سەفەر بکەین بۆ وڵاتی (ئیتاڵیا)لەڕێی شاری(کۆمۆنیزیا)وە.
دەمەو ئێوارەیەکی ساردبوو بەڕێ کەوتین بەرەو شاری (کۆمۆنیزیا)ی سنوری وڵاتی(ئیتاڵیا) لە ڕووی دەریاوە کۆڵە پشتێکی باشمان کڕی وخواردنی ئامادە و سەرو کیسە خەویشمان کڕیبوو چونکە شوێنی خەو بە ئاسانی دەست نەدەکەوت دەبوایە سەربازیانە ژیانت بەسەر ببردایە لەناو دارستان و شاخەکانی ئەو شارە وە لەبەر ئەوەی کۆماندۆی یۆنانی کەمینیان دەردەکرد و گەر بیانگرتیتایە بەپاس دووریان دەخستیتەوە بۆ ناوچەیەکی دوور زۆرجاریش خەڵکیان سنورداش دەکردەوە بۆ وڵاتی تورکیا!.
لەو دوورگەیەدا کەشتی گەورە لە ئیتاڵیاوە دەهات و شەوانە قاچاخچیەکان دادەبەزینە ناو ساحەی کەشتییەکان و نەفەریان سواری شاحینەکان دەکرد ئیتر هەبوو دەچووە پشتی شاحینەکە و دەرگایان بۆ دەکردەوە و دەبوایە بە هێواشی و بێ ئاگاداری شۆفێری شاحینەکە خێرا لەناو ئەوبارەی هەڵیگرتوە خۆت بشاردایەتەوە یان دەیانخستیتە ناو سندوقی شاحینەکە یان کڵاوەکەی کەدەکەوێتە بەشی پێشەوە لەسەرو شاحینەکە، یان سەر ئەکسلی تایەی ناوڕاستی بەشی دوواوەی شاحینەکە کە ئەم ڕێگەیان زۆر سامناکە و ناسراوە بە هێڵی مردن، یان سەر سندوقی شاحینەکە!.
جاری واهەبوو شۆفێرەکان پێیاندەزانی تەلەفونیان بۆ پۆلیس دەکرد یان بە تالیبەرێکەوە لەبەردەم دەرگای شاحینەکە دەوەستا و دەکەوتە لێدانی نەفەرەکان و ئیتر خۆت و بەختت یا ئەوە بوو خەڵتانی خوێن دەبوویت یا بەچەند تالیبەرێك ڕزگارت دەبوو! ئەگەر پێشتنەزانرایە شاحینەکە خۆی دەکرد بەناو کۆنترۆڵدا
گەر لە کۆنترۆڵی بەردەم کەشتییەکەدا ڕزگارت بوایە ئەوە دەچووە ناو کەشتیەکە و پلەی یەکەمت دەبڕی بەسەلامەتی پاش ئەوەی سەفەرمان کرد بە پاس نیوە شەو






گەشتینە شارەکە و قاچاخچیەکانیش تەنها بەشەودا نەفەریان سەردەخست و بەڕۆژ دەبـــووایە نەفەر خـــۆی بشـــاردایەتەوە لەبەر گیـــران و لەترســـی کۆمانـــدۆ لەگەڵ گەشتنمان خێرا پەیوەندیمان کرد بەو تەرەفەی دەچووینە لای ناونیشانێکی پێداین و دۆزیمانەوە وتی: خێرا هەردووکتان بڕۆن بۆ ناو سندوقی شاحینەیەك ئامادەیە بۆ ڕۆشتن و ڕێبەرەکەی وتی دوامکەون بردینی لەگەڵ خۆی و چووینە ناو ساحەکە بەهێواشی دەرگای سندوقەکەی بۆ کردینەوە و سەریخستین و دەرگاکەی بە هێواشی داخستەوە لەسەرمان و وتی: هیچ دەنگتان نەیەت إن شاء الله بەسەلامەتی لە ئیتاڵیا دادەبەزن ئێمەش لەخۆشیدا دەتوت بلیتمان بۆ بڕاوە و،وتمان دەی خوا بکات وابێت و ببێتە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بۆمان بەیەکەم سەرکەوتن بڕۆین چونکە بەهۆی سەرما و  پشوی سەری ساڵەوە شاحینەی بار هەڵگر کەم دەبێتەوە تا ماوەیەك،ئەو شەوە تا بەیانی لەناو شاحینەکەدا ماینەوە لەتاو سەرما پشتمان نابوو بەیەکەوە و دوور لەڕووتان زۆر تەنگاوبوین و هێندە بە خێرایش سەرکەوتین دەبەیەکمان نەبردبوو لەگەڵ خۆماندا وتمان دەی قەینا جارێ خۆمان ڕادەگرین تا دەگەینە ناو کەشتییەکە لەوێ چارەسەرێکی بۆ دەدەۆزینەوە!.

لەپاش سەرمایەکی زۆر و ماندووبونیشمان خەومان لێکەوت لەناو سندوقەکەدا قەدەری خوا شاحینەکە هەر لە شوێنی خۆیدا وەستا و نەڕۆشت سەر لەبەیانی لەگەرمەی خەودا بـــووین کاتێکمـــان زانـــی دەرگـــای ســـندوق کـــرایەوە لەلایەن شۆفێرەکەیەوە لەگەڵ ئێمەی بینی دەستی کرد بە پێکەنین و وتی دابەزن بەنیاز نیم بڕۆم بۆ (ئیتاڵیا) ماڵی ئاوابێت کە دەرگای لێکردینەوە و نەیداینە دەستی پۆلیس!

ئەگینا زۆرجار شاحینە بەرەو وڵاتی (تورکیا) یان وڵاتی(ئەلبانیا) ڕۆشتوە و نەفەرەکەی لەگەڵ خۆیدا بردووە بۆ ئەوێ! ئێمەش خێرا دابەزین و خۆمان تێك نەدا و بەرەو گردۆڵکەیەکی بەرز ڕۆشتین لە ناو دوورگەکەدا خانویەکمان دۆزیەوە لەسەر گردەکە





کیسە خەوەکانمان دەرهێنا و خەوتین تا نیوەڕۆ پاش ئەوە تەلەفونمان کرد بۆ قاچاخچیەکەمان و وتی خۆتان بشارنەوە تا شەو ئەوکاتە  دووبارە دابەزنە خوارەوە بۆ ناو ساحەکە.
بەو شێوەیە تا ئێوارە ماینەوە لەو شوێنەدا بۆ شەوەکەی دابەزینە خوارەوە بۆ ناو ساحەکە بەڵام ئەو شەوە بەهۆی زۆری نەفەرەکانەوە نەمانتوانی سەرکەوین، ئیتر نزیکی بەرەبەیان برادەرێکمان دۆزیەوە خەڵکی شاری (هەولێر) بوو ماڵی ئاوابێت وتی: کاکە من  شوێنم هەیە هەر لەناو شاردا بەڵام زۆر دڵنیا نییە و پارێزراو نییە کۆمەڵێك خانوی کۆماندۆ بوون بۆ کاتی مەشق کردن دەهاتنە ناوی و دواتر چۆڵیان دەکرد بۆ ماوەیەکی زۆر باش بوو چووینە ئەو شوێنە ئەگینا دەبوایە  نزیکەی دوو کاتژمێر بڕۆشتینایە تا دەگەشتینە ناو دارستان و لەوێدا خۆمان بشاردایەتەوە لەترسی گیران و دوورخستنەوە پاش ئەوەی ئەو ڕۆژەش ئیسراحەتمان کرد بۆ شەوی دواتر چووینەوە ناو ساحەکە!.
قاچاخچیەکەمان منی نارد بۆ ناو بارێك لەگەڵ چەند نەفەرێکی تردا هەمووی بارە کارتۆن بوو نەماندەزانی چی تێدایە!  خێرا دەرگای داخست و وتی: بەپەلە خۆتان بشارنەوە تیایدا نزیکەی نیو کاتژمێرێك تیایدا بووین و بەهۆی جوڵەجوڵی نەفەرەکان پێمان زانرا کاتێکمان زانی دەرگای بارەکە کرایەوە، خاوەن شاحینەکە بە لایتێکەوە دەستی کرد بە جوێندان و هاوارکردن ئێمەش لەترسی ئەوەی نەگیرێین خێرا
هەر نەفەرەمان لەشوێنی خۆی هەڵدەستا و ڕاماندەکردە خوارەوەنو هەتا سەیارەی کۆماندۆکان گەشتن ئێمە دەرچووین،قەدەری خوا ئەوشەوەش دەرنەچووم!.
شەوی سێیەممان بوو لەبەر ئەوەی کە قاچاخچیەکان شەو نا شەوێك بەسەرە نەفەریان سەردەخست و نەفەریش زۆر بوو ئەو شەوە نەڕۆشتم ولەماڵەکەدا مامەوە، بۆ شەوی چوارەم چوومەوە ناوساحەکە ئەمجارەیان دووبارە لەگەڵ چەند






نەفەرێکدا سواری شاحینەیەکی تریان کردین و بەرێکەوت بەرەو کۆنترۆڵ لەگەڵ گەشتینە کۆنترۆڵەکە کەژمارەیان سێ دانەبوولەیەکەم دانەیان دەرچووین تا گەشتینە بەردەم ئەوەیان کە جیهازێکیان پێبوو بەهۆی هەناسەدانەوە ژمارەی نەفەرەکانی دەست نیشان دەکردا!.

دەرگای شاحینەکە کرایەوە دوو کۆماندۆ بە لایتەوە سەرکەوتن و کەوتنە هاوارکردن و بەزمانی یۆنانی و ئینگلیزی دەیانوت: دەزانین حەوت نەفەرن و وەرنە دەرەوە، ڕاستیەکەی ئێمەش قاچاخچیەکان ئاگاداریان کردبووینەوە کەوا تا نەیەنە سەرتان نەیەینە دەرەوە، ئیتر لەوکاتەدا من لەگەڵ برادەرێکدا لەنێوان دوو بالێتدا خۆمان شاردبۆیەوە هاتە سەرمان و لایتی لێداین و کەشف بووین وتی وەرنە دەرەوە و لەویاشدا گیراین بردیانین بۆ ژوورێك لە تەنیشت کۆنترۆڵەکەدا کاتێ چووینە ژوورەوە سەیرمان کرد نزیکەی بیست کەس گیراوە لەو ژوورەدا دەتهێڵنەوە تا کەشتیەکان دەڕوات و دواتر ئازادت دەکەن زۆرجار گەر بزانن نەفەرەکان زۆرن پاسی گەورە دێنن و چەند کاتژمێرێك دووردەخەنەوە بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێمە ئەو شەوەش ئازاد کراین!.

پاش ئەوەی گەڕاینەوە بۆ خانوی کۆماندۆکان، بەیانی لەشیرینی خەودا بووین کاتێکمان زانی دەرگا کرایەوە، چەند کۆماندۆیەك هاتنە ژوورەوە کاتێك ئێمەیان بینی چاویان چووە پشتی سەریان بەڵام کەزانیان هیچ شتێکی خراپمان لە ماڵەکە نەکردووە یەکێکیان زۆر ڕێك و پێك بوو، وتی: ئێستا بڕۆن با گەورەکەمان نەزانێت تا پاش نیوەڕۆ لێرەین و دواتر وەرنەوە ماڵەکە ئێمەش بەپەلە کەلوپەلەکانمان کۆکردەوە و چووینە ناو باخێك لەوناوەدا خەوتین تا ئێوارەودووبارە گەڕاینەوە ناو خانوەکە!.

بۆ شەوی پێنجەم لەگەڵ ئەو برادەرە هەولێریەم دا کە چووبووینە لای بڕیارمان دا لەو شەوەی کە سەرەی خۆمان نەبێت بۆ بارکردن، خۆمان بە نهێنی قاچاخچیەکان بچینە







ناو ساحەکە لەوکاتەی کە شاحینەکان دەچنە پێش کۆنترۆڵ سواری ئەکسلی شاحینە بـین یـان لە تەنیشـتی کـۆنترۆڵەکەوە بۆشـاییەك هەبـوو کە دەمـانتوانی بـڕۆینە ناوساحەی کەشتیەکان ئەوە بوو ڕۆشتین بەڵام پاش چەند جار هەوڵدانێك کاتێکمان زانی گەشـتی سـەیارەی کۆمانـدۆکان دەسـتیان کـرد بە گەڕان بەنـاو شـاردا بـۆ گرتنی نەفەر،ئەو شەوە هێندە ڕاوڕاوێنیان پێ کردین و دوامان کەوتن هەتا نزیکی بەرە بەیان بەدەیان نەفەر گیرا سوپاس بۆ خوا لەویاشدا ڕزگارمان بوو بەڵام ئەو شەوە نەمانوێرا بڕۆینەوە ناو خانوی کۆماندۆکان و چووینە دەرەوەی دوورگەکە لەناو دارستانێکی چڕدا بینایەکی گەورەی تێدابوو چۆڵ بوو قاچاخچیەکان کردبوویان بەشوێنی نەفەرات! کە گەشـتینە ئەویّ کۆمەڵێـك خەڵکی زۆری لێبـوو سـوپاس بـۆ خـوا کـوردێکی زۆری لێبـوو دەرفەتێکی بـاش بـوو بـۆ گفتوگـۆ و ئامۆژگـاری.وە زۆریـان پـێ خـۆش بـوو یەك دوو قاچاخچیشی لێ بوو پێشتر یەکێکیان مسوڵمانێکی دامەزراو بوو وازی لە نوێژ هێنا بوو هـاتە لامەوە بەخێرهـاتنی کـردم و وتی: ئەگەر لەمەودوا شـەوانە بێیـتە ئێرە زۆر باشـە و وابڕوات إن شاء الله دەبیتە هۆکاری تەوبە کردنەوە و گەڕانەوەم!.

بەڵام قەدەری خوا بۆ شەوی دواتر کۆتا جار بینیمەوە لەناو ساحەکەدا ڕێنمای کردم و چوومە سەر سندوقی شاحینەیەك و جارێکی تر بەخزمەتی نەگەشتمەوە، ئەوشەوە لە دورگەی(کۆمۆنیزیـا)دا هەر قاچـاخچیە و نەفەرێکی بـردە نـاو سـاحەکە و سـەرەتا بردینیانە ناو بینایەکی چۆڵ بەرامبەر کەشتیەکان بۆ ئەوەی هەمووومان پێکەوە نەبەنە ناو شاحینەکان ئەوەبوو دوو نەفەریان برد لەلای بەنزینخانەی پێش ساحەکە لەکاتی گاز تێکردنی شـۆفێری شـاحینەکاندا کە سـەرقاڵ بـوون سەریانخسـتن بەڵام قەدەری خوا نەفەرێکیان لە نێوان خێمەی لاتەنیشتی شاحینەکە دا گیری خوارد

هەرچەندە هەوڵیدا نەیتوانی بچێتە ناو بارەکەوە تا شۆفێرەکە گەڕایەوە و پێی زانی،ئیتر بەدارێك کەوتە لێدانی نەفەرەکە دامـاوە هـاواری ڕۆژەڕێیەك دەڕۆشـت لەویـادا چەنـد





قاچاخچیەك بەرەو شۆفێرەکە ڕۆشتن و بەبەرد کەوتنە لێدانی و نەفەرەکەشیان ڕزگار کرد،بەڵام هەر ئەوەندەمان خۆش بوو شۆفێر تەلەفونی بۆ پۆلیس کرد لەماوەیەکی کەم دا ناو ساحەکە پڕ بوو لە سەیارەی پۆلیس و کۆماندۆ و کەوتنە گرتنی نەفەر بەدوای ئەوکەسانەدا دەگەڕان کە لە شۆفێرەکەیان داوە ئیتر هەرچی نەفەر و قاچاخچی هەیە ڕایانکرد بەرەو ناو جەنگەڵ و دارستانەکە منیش زۆر بێزار ببووم هەر لەشوێنی خۆم مامەوە تاماوەی کاتژمێرێك و بەدوای فرسەتێکدا دەگەڕام کە کاتی نزیك بوونەوەی ڕۆشتنی کەشتیەکە بۆ ئەوەی بچمە سەر ئەکسلی یەکێك لەو شاحینانەی کە لەبەردەم کۆنترۆڵەکەدا وەستاون،چونکە لەوکاتانەدا بەهۆی زۆری شاحینەکان و نزیکبوونەوەی ڕۆشتنی کەشتییەکە کۆنترۆڵ لاواز دەبێت و نەفەری باش دەردەچێت بەڵام نابێت بە بێ پرسی قاچاخچی بچیتە سەر ئەکسل چونکە ئەکسلی شاحینە مەترسی دارە و ترسی مردنی زۆرە!.

لەڕابردوودا پەنابەرێکی زۆر مردوون بەهۆی کەوتنە خوارەوەیان لەسەر ئەکسەلەکە یان بەرز کردنەوەی لەلایەن شۆفێرەوە ! قاچاخچیەکانیش بە داواکاری و ڕەزامەندی کەسەکە یان شایەتی نزیکەکانی سەری دەخەن و بەردێکی گەورەشی دەدەنێ تا لەکاتی دابەزیندا لێی بدات و شۆفێری شاحینەکەی پێ بوەستێنێت چونکە چەندێك هاوار بکەیت دەنگت ناگاتە شۆفێر و تەنها چەند سانتیمەترێك لە جادەکەش بەرزتریت و نابێت سەیری خوارەوە بکەیت دەبێت توند دەست بەم لاو لای شاحینەکە بگریت ئەگینا سەرت دە سوڕێت و دەکەویتە خوارەوە هەرچۆنێك بێت چوومە ناو ساحەکە لەوکاتەدا ویستم سواری شاحینەیەك بم کاتێکم زانی قاچاخچیەك لەدوورەوە هاواری لێکردم و وتی: ئادەی وەرە بزانم نەفەری کێیت؟

سەرەتا ویستی پەلامارم بدات کە نزیکبۆیەوە سەیرم کرد ئەو قاچاخچیەیە کە شەوی ڕابردوو بوو! کە منی بینی خێرا داوای لێبوردنی کرد چونکە زۆری خۆشئەویستم و وتی:





کاکە مەلا گیان ئەوە تۆیت؟ وتم: بەڵێ برا گیان ئەرێ وەڵا زۆر بێزاربووم دەمەوێت بڕۆم بە ئەکسل! وتی: تۆ نەبوویتایە هەرکەسی تر بوایە خەڵتانی خوێنم دەکرد بەبێ پرس بێتە ناو ساحە بەڵام مادەم تۆیت ئێستا دەتنێرم لەگەڵ نەفەرێکی تردا ئەو پێشتر ڕۆشتووە بە ئەکسل و شارەزایە بۆ ئەوەی ئاگاتان لەیەك بێت بەڵام ئەکسل خەتەرەو دواتر با من تاوانبار نەبم! وتم: گەردنت خۆش و ئازا بێت براکەم! بەڕاستی ئەوکاتە هۆشم وەك ئێستا نەبوو بۆیە ئەو ڕێگەیەم گرتە بەر!.

ماڵئاواییمان کرد لەیەك و لەوکاتەدا چووینە ژێر یەك دوو ئەکسل لە دەرەوە دیار بووین و بێ سوود بوو پاشان ئەو نەفەرە کەمێك دەترسا و وتی: تۆ لەژێر ئەو شاحینەیەوە بڕۆ کە هەندێك شاحینە هەیە سەر سندوقەکەی بۆشایی تێدایە لەنێوان سندوق و پشتی شاحینەکەدا و لەسەر سك جێی نەفەرێك یان دووانی تێدا دەبێتەوە خێرا خۆم گەیاندە ژێر شاحینەکە و سوپاس بۆ خوا ئەو شاحینەیە بۆشاییەکەی تێدابوو بەپەلە و سنگەخشکێ چوومە سەری و ئەویش لەدوامەوە هات بەڵام جێی هەردووکمان نەبۆیەوە بۆیە بەپەلە ئەو چووە سەر ئەکسلەکەی لەگەڵ نەفەرێکی تردا شاحینە کەوتەڕێ بۆ بەردەم کۆنترۆڵ سوپاس بۆ خوا یەکەممان بڕی و کەس نەگیرا گەشتینە بەردەمی دووەم و لایتیان دا لەژێر شاحینەکە و هەردوو نەفەرەکەی سەر ئەکسەلەکە گیران و بەمنیان نەزانی بەو شێوەیەلە کۆنترۆڵی سێیەمیش دەرچووم و شاحینەکە چووە ناو کەشتی دورگەی(کۆمۆنیزیا)ی وڵاتی(یۆنان) بۆ دورگەی(ئەنگۆنا)ی وڵاتی(ئیتاڵیا) کە نزیکەی دووانزە کاتژمێر بە کەشتی دوورە پاش سەرکەوتنی شاحینەکە و جێگیر بوون کرێکارەکانی ناو کەشتیەکە دەستیان کرد بە بەستنەوەی شاحینەکان!.

لەپاشان دەنگی بڵندگۆ بەچەند زمانێك کەوتە قسەکردن و ڕێنمایی نەفەرەکانی دەکرد و پاش ماوەیەکی کورت کەشتیەکە کەوتە ڕێ نزیکەی دوو کاتژمێر دەبوو کەشتیەکە



کەوتبۆیە ڕێگەکردن ئیتر دەنگی کەست نەدەبیست لەناو شوێنی وەستانی بارهەڵگر و سەیارەکاندا ئەوکاتە مانگی یەك بوو کاتەکەش زستان بوو زۆر سارد بوو منیش دوور لەرووی خوێنەرانی بەرێز زۆر میزم دەهات و نەمدەزانی چی بکەم هەرچۆنێك بێت تا نزیکەی دوو کاتژمێر خۆم ڕاگرت بەڵام تەواو ساردی کرد و پەرێشانی کردم تا ئەوەی بەلامەوە ئاسایی بوو کەشف بوومایە و بگیرامایە!.
بەخوا ئیدی تەواو نەمتوانی خۆم ڕاگرم بەهەر شێوەیەك بێت لەسەر لا میزم کرد بەڵام چونکە سارد بوو،لەژێر شاحینەکەوە ڕۆشتە خوارەوە بەشێوەیەك هەرکەس بهاتایە ئەویا وایدەزانی تەنکی گازەکەی تەقیوە هەرچەندە بە بەشێك لەپۆشاکەکانی بەریشم سڕیم بەڵام بێ سوود بوو هەر ئاشکرا دەبوم، بۆیە بەناچاری هاتمە دەرەوە لە ژێر شاحینەکەدا دانیشتم بەڵام لەبەر کامێرای چاودێری ناو شوێنەکە وە هەندێ شۆفێریش کە بۆ ئەوەی پارەی ژوور نەدەن لەناو شاحینەکانیان دەخەون و تەنها بۆ کافتریا و خواردن دەچنە بەشی ناوەوەی کەشتییەکە!.
وردە وردە بە سنگە خشکێ بەژێر شاحینەکاندا دەڕۆشتم تا چەند شاحینەیەکم بڕی و دوور کەوتمەوە لەشاحینەکەی خۆم و بەدوای شوێنێکی تردا دەگەڕام پاش بڕینی چەند ڕیزێك شاحینە سندوقێکی باشترم دۆزیەوە و چوومە سەری بە ئیسراحەت لەسەر لا جێمبۆیەوە و خەوم لێکەوت کاتێك خەبەرم بۆیەوە گوێم لەدەنگی بڵند گۆکەی ناو کەشتیەکە بوو زۆرم برسی بوو چونکە هیچم پێ نەبوو وە کاتێکی زۆریش بوو خواردنم نەخواردبوو دووبارە بەچەند زمانێك گفتوگۆی کرد.
منیش دەتوت گوێزم بۆ دەبژێرن چونکە زمانم نەدەزانی و پاش کەمێك وەستا و هۆڕینێکی گەورەی لێدا زانیم گەشتین دووبارە کرێکارەکان کەوتنە کردنەوەی شاحینەکان و منیش چرکەم لەخۆ بڕیبوو لە کونێکەوە ئەوانم دەبینی و دەستم کرد بەنزا و پاڕانەوە بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبم!.







لەکاتی نزاو پاڕانەوەدابووم کاتێکم زانی لایتێکم لێدرا شۆفێرێك بەزمانی یۆنانی کەوتە جوێنـدان و هـاواری لێکـردم کە بـێمە خـوارەوە و قەدەری خـوا ئاشـکرا بـووم و خێرا منیش دابەزیم و لەدیوی ئەودیوی شاحینەکەوە ڕامکرد بەئاشکرا بە ناو کەشتیەکەدا بەپەلە بەژێر سێ ڕیزی شاحینەدا ڕۆشتم و کەمێك دوور کەوتمەوە ئەویش هاواری کرد بۆ پۆلیس و کرێکارەکان و هەر ئەوەندە خۆش بوو دەنگەکەیان بیست بەدەیان نەفەر بەرەو لای شۆفێرەکە ڕۆشتن!.

پـاش ئەوەی کە هەڵهـاتم ژمـارەیەك شـاحینە ڕووەو دەرگـای دەرەوەی کەشـتییەکە وەستابوون و شۆفێرەکانیانی تێدا بوو خۆیان ئامادە کردبوو بۆ چوونەدەرەوە، بەنهێنی و بە چـاری ناچـاری چـوومە ژێـر شـاحینەیەکیان و چـوومە سـەر ئەکسـلی تـایەی ناوەڕاستی بەشی دواوەی شاحینەکە باش بوو کەس نەیبینیم، هەرچەندە لەژیانم دا سـواری ئەکسـل نەببـوم تەنهـا ئەوەنـدەم دەزانـی کە تـایەی ناوەڕاسـت کەمتر بەرز دەکـرێتەوە لەلایەن شـۆفێرەکانەوە!.لەگەڵ سـەرکەوتم هێشـتا دەسـتم نەگرتبـوو شـاحینەکە کەوتەڕێ و بەپەلە هەردوو دەسـتم گـرت بەم لاولای شـاحینەکەوە کە چەند وایەرێك بوو نەمدەزانی وایەری چین! لەتەنیشتیشمەوە کونێکی بچوکی تێدا بوو دەرەوەم تێدا دەبینی سەیرم کرد خەڵکێکی زۆر لای شاحینەکەی تر کۆبوونەتەوە کە پێشتر چووبـوومە سـەر سـندوقەکەی! بەڵام سـوپاس بـۆ خـوا تـا شـۆفێرەکە شـوێنی هەڵهـاتنی منی پیشـانداون شـاحینەکەمان دەرچـوو بەوهـۆیەوە پێیـاننەزانیم و پـاش نزیکەی پێنج خولەکێك شاحینەکە چووە دەرەوە و لەهیچ شوێنێك نەیانوەستاند!.

سـەرەتا شاحینەکە هێواش دەڕۆشـت و زۆر ترسـم نەبوو لەسـەر ئەکسلەکە وە واشـم هەسـت دەکرد کە باری قـورس بێـت بـۆیە دڵی خـۆمم دەدایەوە و دەمـوت بـاوەڕ نـاکەم ئەکسـلەکەی بەرز بکاتەوە،پـاش ئەوەی گەشـتینە شـاری(ئەنگۆنا) نـزیکەی پـانزە خولەکێك ڕۆشـت جاروبـار بەهـۆی تـرافیکەوە دەوەسـتا یەك دووجـار ویسـتم فرسـەت





بێـنم و دابەزم بەڵام لەبەر ئەوەی سـەر جـادە بـوو سـەیارەش زۆر بـوو لەم لاو لاوە و ماوەی وەسـتانەکانیش کەم بـوون، دەترسـام دابەزم و ببم بەژێـر تـایەی شـاحینەکەوە یان سەیارەیەك لێی بداملیە!.
بەهەرحاڵ دانەبەزیم و مامەوە، ئایەتەلکورسیەکم خوێند و شایەتومانم هێنا و پشتم بەخـوای گەورە بەسـت تەیەمـومێکم بە لاشـەم کـرد و نـوێژی نیـوەڕۆو عەسـرم هەر لەویادا و بەڕۆشـتنەوە کـرد،هەر ئەوەنـدەم خـۆش بـوو لەشـارەکە دەرچـووین و چـووە سـەرجادەی دەرەوەی شـار باوەڕتـان بێـت لەگەڵ خێراییەیەکەی زیـاد کـرد جـادەکەی بەردەمـم دەتـوت پەڕەی کتێـبە هەڵـدەدرێتەوە لەپـێش چـاوم دا بـۆیە ئیتـر سـەیری جادەکەم نەکرد وادەزانم نزیکەی نیو کاتژمێر بۆ سێ چارەك ڕۆشت وردە وردە سەرما دەسـتی پێکـرد و خەریـك بـوو کـارم تێبکـات و هەوایەکی سـاردم بـۆ دەهـات لەژێـر شاحینەکەوە!.
لەگەڵ ئەوەشـدا ئاگام لەخـۆم نیە ئەو وایەرانەی دەستم پێـوە گرتـون ڕۆنی ڕەشی لێ دەتکا و و هەموو گیانم ی ڕەش کردبوو وردە وردە دونیا بەرەو ساردی دەڕۆشت بڕیارم دا لە شـوێنێکدا گەر شـاحینەکە وەسـتا دابەزم لەوکاتەدا بەدەسـتێك دەسـتم کـرد بە گیرفـانم دا وەرەقەیەکی یۆنـانیم پێبـوو خێرا بەدان دڕیـم و فـڕێم دا بـۆ ئەوەی ئەگەر دەسـت گیر بکـرێم لەلایەن پۆلیسـەوە، ئاشـکرا نەبـم کە لەوڵاتـی (یۆنـان)ەوە هـاتوم چـونکە گەر شـتێکی ئەو وڵاتەت پێ بگیرێت سـنورداش دەکـرایتەوە! سێ یـۆرۆی ئاسـن لەگیرفانم دا بوو دەرمهێنا و کەوتمە لێدانی ئەکسلی شاحینەکە بۆ ئەوەی دەنگەکەی بگـاتە لای شـۆفێرەکە و وابزانێـت کێشـەیەك هەیە تـا بەڵکـو بەو هـۆیەوە بوەسـتێت و منیش بتوانم لەو فرستەدا دابەزم و ڕابکەم بەڵام قەدەری خوا زۆرم لێدا بێ سـود بـوو نەوەسـتا کەمێـك بـێ هیـوا بـووم بەڵام چـاوەڕوانی ڕەحمی خـوای گەورەشـم دەکـرد و دەمزانی نائومێدم ناکات و لەتاریکترین شـوێندا نزیکترینە لەبەندەکانییەوە هەستم کـرد



ورده ورده شاحینەکە هێواش دەبێتەوە و کەمێك دەوەستا و دەڕۆشت بۆیە منیش لەیەك دوو وەستاندا کاتەکەم دیاری کرد و خۆم ئامادەکرد بۆ دابەزین جاری یەکەم هەوڵم دا بەڵام فریا نەکەوتم و ڕۆشت خەریك بوو ببم بەژێر تایەکەیەوە! بەپەلە خۆم هەڵواسی بە ئەکسلەکەی پێش ناوەڕاستەوە چونکە لە ئەکسلی ناوەڕاستەوە فریا نەدەکەوتم بێمە دەرەوە لەژێر شاحینەکەدا

لەگەڵ جاری دووەم وەستا خێرا خۆم کرد بەژێر تایەی یەکەم دا و هاتمە دەرەوە و دەرچووم و شاحینەکە ڕۆشت و شۆفێرەکەشی پێی نەزانیم بەڵام سوپاس بۆ خوا ڕزگاری کردم وەك موعجیزە! کاتێك هاتمە دەرەوە تەماشا دەکەم ئەو شوێنە شوێنی پارەدانە بۆ سەر جادەی ئۆتۆبان و خوا نەکردە دانەبەزیمایە ئیتر خوای گەورە باشتر دەیزانی بەڵام لە ڕووکەشدا بەئاسانی نەمدەتوانی دابەزم و پێدەچو ڕەقم ببردایەتەوە لەسەر ئەکسلەکە یان بکەوتمایەتە خوارەوە چونکە کات بەرەو ئێوارە دەڕۆشت و بەفریش باری بوو کەش و هەوای(ئیتاڵیا) زۆر ساردتر بوو لە(یۆنان) خەڵکی ناو سەیارەکانی دوامانەوە هەموویان سەیریان دەکردم و توشی سەرسوڕمان ببوون کاتێك بەو شێوەیە منیان بینی لەژێر ئەو شاحینەیە هاتمە دەرەوە! منیش نەمدەزانی هەموو ڕوخسار و گیانم ڕەش بووە لەژێر شاحینەکە خێرا سەیری خۆمم کرد پۆشاکەکانم ڕەش ببوو بەپەلە هەڵم گێڕانەوە تا ڕەشیەکەی دیار نەبێت بەڵام ئاوم دەست نەکەوت بۆ دەم و چاوم!

هەوڵم دا خۆم بگەیەنمە ئاوەدانیەك تا لەڕێی وێستگەی شەمەندەفەرەوە خۆم بگەیەنمە (ڕۆما) ی پایتەختی ئەو وڵاتە چونکە نیازم هەبوو لە وڵاتی(ئەڵمانیا) خۆم تەسلیم بکەم پارەشم پێبوو لەبەر ئەوەی زۆر دوور کەوتبوومەوە لە ئاوەدانی و لەسەر جادەی ئۆتۆبان نزیك بووم بەناچاری بەسەر ئەو جادەیەدا کەوتمە ڕێگە کردن دوو تابلۆم بەدی کرد یەکیان نوسرابوو (ڕۆما) و یەکێکیشیان نوسرابو(میلانۆ) منیش





لەسەر ئەوەی(ڕۆما) کەوتمە ڕێگا بڕین نزیکەی یەك بۆ دوو کیلۆمەترم بڕی هەرچەندە دەستم لەسەیارە ڕادەگرت بێ سود بوو چونکە ئەوە جادەی ئۆتۆبانە و بەهیچ شێوەیەك سەیارە بۆی نیە بوەستێت لەسەری گەر سەیارەیەکیش بوەستێت خێرا پۆلیس دەگاتە سەری ڕێگەی پیادەش نی ەو منیش بەو شێوە و ڕوخسارەوە ئەوە کەس هەر غیرەتی نەبوو بۆم بوەستێت! نزیك بوومەوە لە بەنزینخانەیەك ویستم بڕۆم تەلەفون بکەم بەڵام دواتر پەشیمان بوومەوە و وتم من هیچ زمان نازانم بڕۆم چیان پێ بڵێم؟ بۆیە بڕیارم دا بەردەوام بووم لەسەر ڕۆشتن و جار جارەش بۆ دڵخۆشی خۆم دەستێکم ڕادەگرتەوە لەسەیارە بەڵام هەر بێ سوود بوو!.

خۆر بەرەو ئاوابون دەڕۆشت و سەرماش زیادی کرد بەهۆی ئەوەی ماوەیەکی زۆریش بوو نە نان نە ئاوم نەخواردبوو تەواو ماندوو و شەکەت ببووم و خەریك بوو دەکەوتم و لەدوورەوە کۆمەڵێك گڵۆپی زۆرم بەدی کرد دەموت هەرچۆنێك بێت دەبێت خۆم بگەیەنمە ئەو شوێنە کاتێکم زانی سەیارەیەکی شینی پۆلیس دەرکەوت و بەرەو لای من دەهات و فەڕارەی داگیرساندبوو لەتەنیشتم دا وەستا! سەرەتا وایان زانی من ڕادەکەم لەگەڵ وەستا منیش بەکوردی وتم:

ئەی خوایە سوپاس بۆ تۆ بەخوا بشمبەن بۆ زیندان دێم خۆ لانی کەم کەمێك گەرمم دەبێتەوە و خواردن و خواردنەوەیەکیشم دەدەنێ!.

دوو پۆلیسی تێدا بوو پێش ئەوەی ئەوان دابەزن دەستم دایە دەرگای دواوە و ویستم سەرکەوم بە ئیتاڵی دایان بەسەر یەکدا ئەوەندە تێگەشتم کە وتیان سەرنەکەویت باوەڕتان بێت ئیتر تەواو پێم نەما و کەوتم بە زەوی دا یەکێك لە پۆلیسەکان هاتە سەرم و ئەوی تریشیان خێرا ئیشارەتێکی دانا و جادەیەکی ئۆتۆبانی گرت دەبەیەك ئاویان بۆ هێنام و کەمێك ئاوم خواردەوە و هەندێکیشیان کرد بە دەم و چاومدا بەڵام نەمتوانی هەستمەوە لەهۆش خۆم چووم!.






کاتێك بەهۆش هاتمەوە سەیارەیەکی فریاکەوتنی تەندروستی لەسەر سەرم ڕاوەستابوو دوو کەسم بەسەرەوە بوو بە زلە بەهۆش خۆمیان دەهێنامەوە و هەموو پەنجەکانم کانوێلا و جلگرە بوو سەر لاشەشم پڕ کرابوو لە کیسەی ئاوی گەرم و کە چاوم کردەوە ئافرەتێك هاتە سەرم و وتی تۆ باشی؟ منیش سەرم بۆ لەقاند و خەوم لێکەوتەوە! بەپەلە سواری سەیارەکەیان کردم هێندە ماندوو بووم زوو زوو خەوم لێدەکەوت بەڵام هەرجارێك بخەوتمایە بەزلە خەبەریان دەکردمەوە و دەیانوت نابێت بخەویت نەمدەزانی هۆکار چییە! پاش ئەوە وادەزانم نزیکەی پانزە خولەکێك ڕۆشت و گەشتە نەخۆشخانەیەك و بە نەقالەیەك هێنامیانە خوارەوە و بردمیانە ژوورەوە بۆ نەخۆشخانەیەك لەدواشمانەوە سەیارەی پۆلیسەکەشمان لەگەڵدا بوو!.

کاتێك بردمیانە ناو نەخۆشخانەکە بەپەلە چەند دکتۆر و کارمەندێك لەسەرم کۆبوونەوە دکتۆرێکی پیاو هاتە سەرم پاش هەندێك پشکنین چەند کارمەندێکی ئافرەتی بانگکرد کە لاشەم بۆ پاك بکەنەوە لەو چەوری و ڕەشیەی کە بە پۆشاك و لاشەمەوە بوو منیش کە ئەوان هاتن و لەشەرم دا چاوم نوقاند سەرەتا تەنها دەم و چاویان بۆ پاك کردمەوە لەگەڵ دەستەکانم و سنگ و پشتم دا بەخوا کاتێکم زانی وەزعەکە خەتەر بوو خەریك بوو پانتۆڵەکەم داکەنن!

بەخوا ئیتر غیرەت هاتەوە بەبەرم داو توند دەستم پێوە گرت و هەرچەند ویستیان ڕایکێشن نەمهێشت بەکوردی دەموت: نابێت بابە وازم لێبێنن ئەی هاوار!.

ئیتر لەو بێنە و بەردەیەدا ئەوان لە من تێنەدەگەشتن و نەیاندەزانی ئێمەی مسوڵمان لامان تاوان و عەیبەیە تا دکتۆرەکە پیاوێکی بەتەمەن بوو بەدەنگەدەنگمان خۆی کرد بەژووردا و دیار بوو ئەو شارەزا تر بوو وە جوان لەمەبەستم تێگەشت ئافرەتەکانی کردە دەرەوە و خۆی بەتەنها پشکنینی گیانمی کرد بەبێ ئەوەی پۆشاکی ژێرەوەم لابدات و دواتر وتی:خۆت لەبەر بکە و ئەوجا ئەوان بانگ دەکەمە ژوورەوە!.







بردمیانە ژوورێکی تر و هەندێك کێك و بسکیت و شەربەتیان بۆ هێنام ، بەزمانی ئیتاڵی و ئینگلیزی زۆریان قسە کرد لەگەڵم منیش لەهیچ تێنەدەگەشتم بەس هێندە وشەی ڕی بەکاردێنن منیش هەر سەرم بۆ بادەدان،دکتۆرەکە داوای ناوی لێکردم باش بوو تێگەشتم و ناوی خۆمم پێ وتن بەڵام لەهەمووی سەیر تر بە مەزەنەی ئەقڵیان تەمەنیان بە حەڤدە ساڵ بۆ نووسیم چونکە ئەوکاتە هێشتا ڕیش و سمێڵم نەهاتبوو! بەو شێوەیە نزیکەی سێ ساڵ کەمتریان نووسی لە تەمەنی ڕاستەقینەی خۆم لەوکاتەدا!

کاتێکم زانی بەسەیارەیەکی جێب کە دوو ئافرەت و پیاوێکی تێدا بوو هاتن بەدوامدا و وەریانگرتم و بەتانیەکیان تێوە پێچام بۆ ئەوەی سەرمام نەبێت و پۆلیسەکان تا ئەوساتەش بەسەرمەوە بوون خوا هیدایەتیان بدات بەڕاستی زۆر باش بوون لەگەڵم دا ئیتر بە(چاو چاو) ماڵئاواییان لێکردم و منیشیان فێری (چاو) کرد و زانیم واتە ماڵئاوایی وتم بەخوا ئەمەیان مادەم لەچاوی خۆمانەوە نزیکە باش لێی تێگەشتم ئیتر منیان خستە دوای جێبەکەوە دەستی کرد بە ڕۆشتن منیش هەر دوعام دەکرد و دەموت خوایە نەیانزانیبێت لە یۆنانەوە هاتوم دەترسام سنورداشم بکەنەوە بۆیە سەیری تابلۆی سەرجادەکەشم دەکرد کە ناوی شارەکانی لێ نوسرابوو سەیرم کرد بەرەو ڕێگەی(ئەنگۆنا) دەگەڕێنەوە،

لەوکاتەدا ئافرەتێکیان هەر زیرەی پێکردم بەحساب خۆیم پێ دەناسێنیت و پاش ناوی خۆی وشەی(کۆمۆنیتی ، کۆمۆنیتا) ی لەدەم دەرچوو وتم : ئەی باوکە گیان بەخوا وابزانم زانیان کە لە(کۆمۆنیزیا)ی وڵاتی یۆنانەوە هاتووم بۆیە خێرا وتم نۆ نۆ کۆمۆنیزیا خەریك بوو خۆشم ئاشکرا بکەم لەترسا ئەویش بەپێکەنینەوە هەر دەیوتەوە ماڵیم ئاواکرد منیش ڕەنگم پێ نەما بوو! وتم: دە تخوا وەرە ئەو هەموو ڕێگە نارەحەتە ببڕە و ئێستاش بتنێرنەوە،هەتا گەشتینە بەردەم ماڵێك کە کەمپی منالانی خوار تەمەن







هەژدەساڵ بوو دایانبەزاندم و ئەوکاتە ئافرەتەکە دەستی ڕاکێشا بۆ بیناکە و وتی: (کۆمۆنیتی ، کۆمۆنیتا) سەیر دەکەم بەگەورەیی لەسەر دیواری بیناکە ئەوە نوسراوە باش بوو هەناسەیەکم هاتەوە بە بەردا و لەدڵی خۆمدا وتم: ئۆخەی خۆ ئەمە کەمپی منالانە ئەو ناوەی هەیە خۆ من ڕەنگم سپی ببوو ماڵیم ئاوا کرد باشە بۆ لەوکاتەدا ئەو قسەیەی کرد؟ بەس نەبوو نەموت لە یۆنانەوە هاتووم!. بردمیانە ژوورەوە سەیر دەکەم پڕە لە گەنجی هەرزەکار و تازە پێگەشتوو خێرا ناردیانمە حەمام و خۆم پاك شۆرد وابزانم نزیکەی دوو کاتژمێر نەهاتمە دەرەوە و تۆڵەی هەموو ناڕەحەتیەکانی ڕێگەم کردەوە و باوەڕتان بێت وابزانم چڵکی کوردستانیشم لەوێ فڕێدا ئیتر کە هاتمە دەرەوە بێ ئێوە ناخۆش خواردنیان بۆ حازر کردبووم هەمووی ماکەرۆنی بوو بەناوبانگن (ئیتاڵیا) بۆ ئەو خواردنە ئەو شەوە لەو بینایە خەوتم سەتەلایتی تێدا بوو کەس زمانی نەدەزانی چووم کەناڵ بەکەناڵ گەڕام هەتا کەناڵی کوردستان تیڤیم دۆزیەوە ئیتر کە گوێم لە کورد بوو کەمێك هاتمەوە سەر خۆم و وتم: ئۆخەی خۆ من وەك کەڕو لاڵم لێهاتوە نە تێدەگەم لەوان نە ئەوانیش لێم تێدەگەن ماوەی دوو ڕۆژ مامەوە لەو شوێنە نەمدەهێشت یەك منال دەستکاری کۆنترۆڵ بکات ئەوانیش بە ناچاری هاتبوونە لام سەیریان دەکرد و یەك بەخۆ پێدەکەنین کە ژیانی ئێمەیان دەبینی،دوای دوو ڕۆژ بردمیان بۆ کەمپێکی تر لە لادێیەك پێی دەوترا(مۆنتێلا ئابیاتی) لەبەردەم بینایەکی دوو قاتی گەورە دایانبەزاندم و ماڵئاواییان لێکردم، قاتی ژێرەوە هۆڵێکی گەورەی وەرزش بوو لەوێدا پیاوێکی قژ درێژی ڕەنگ سپی و سمێڵ بابڕ هات بەدەممەوە ناوی(ڕیناڵد) بوو ئەو سەرپەرشتی مناڵەکانی ئەو کەمپەی دەکرد، بەخێر هاتنی کردم و لەبەر ئەوەی کات درەنگی شەو بوو بەدەست ئیشارەی کرد کە نابێت دەنگم بێت بردمی بۆ ژوورێك لە قاتی دووەمی بیناکە دوو قەرەوێڵەی دوو نەفەری لەسەر یەکی لێبوو دانەیەکیان گەنجێکی لەسەر خەوتبوو لەوی تریان جێگەی بۆ من





ئامادە کردبوو بە دەست ئیشارەی کرد کە بخەوم تا بەیانی ئیتر منیش نوێژی مەغریب و عیشام بە کۆکردنەوە و نیەتی سەفەرکرد، دواتر هێندە ماندوو بووم خێرا خەوم لێکەوت!

بەیانی کەهەستام لەخەو سەیر دەکەم پڕە لە منداڵی گەنجی ئەلبانی و کۆسۆڤۆیی و ڕوسی و ئەفریقی یەك مێزی گەورە ڕازێنراوەتەوە بە خواردن و هەریەکە قاپ و کەوچکی خۆی هەڵدەگرێت و خواردن تێدەکات و دەیخوات منیش دەستم کرد بە خواردن تێکردن و زۆر دەترسام توشم بێت بە بەرازە بۆرەوە و نەشمدەزانی چۆنیان تێبگەیەنم هەتا قەدەری خوا بە ئەقڵی خۆم گۆشتی مانگام هەڵگرتوە باش بوو نەفەرێك زانی مسوڵمانم بە دەم وەك بەرازی بۆکردم تا بزانم ئەوە بەرازە خێرا منیش لامدا و بەس ماکەرۆنی و پەتاتە و زەڵاتەم دەخوارد لەترسا پاش ئەوە(ڕیناڵد) هاتەوە و داماوە گیری خوارد بەدەستمەوە هەتا ئیش و کاری کەمپی تێگەیاندم کە بەرنامەی کەمپەکە چۆنە دەبوایە ڕۆژانە هەر یەکێك لە منداڵەکان ئیشێکیماڵەی بکردایە بەپێی ئەو خشتەیەی بۆی دیاری کراوە منیش کە ئەوانم بینی هەر یەکێك ئیشێك دەکات لەخۆمەوە دەستم کرد بە قاپ شۆردن و ماڵ پاك کردنەوە هەرچی منداڵ بوو هاتبۆیە سەرم بەلایانەوە سەیر بوو دەیانوت بە ئیشارەت ئەوە چی دەکەیت ؟ کەس ئیشی کەسی نەدەکرد و یارمەتی یەکیشیان نەدەدا بەڕاستی لەویا زانیم کە گیانی یارمەتی و بەدەمەوەچوون زیاتر لەوڵاتی مسوڵمانانندا دەبینرێت منیش بە کوردی دەموت دەزانم سەرەی من نیە بەڵام لای ئێمە یارمەتی و هاوکاری هەیە لەوکاتەدا(ڕیناڵد) هاتە ژوورەوە کە منی بینی ئاگام لێبوو لێیان تورە بوو وای زانی ئەوان ئیشیان پێکردوم منیش دەستم دا لە سنگم وتم من خۆم حەزم لێیەتی ئیتر دەستی خستە سەرشانم و وتی: تۆ لەبەیانییەوە ئیشت بۆ دیاری دەکەین وردە وردە لەگەڵ نەفەرەکان ڕاهاتم و بە ئیشارەت و دەست یەکمان حاڵی دەکرد ئیتر بەیانیان بەتەنها دەمامەوە لەگەڵ خزمەتکار و چێشتلێنەرەکان




چونکە هەموویان دەچوون بۆ خوێندن بەس من دەمامەوە چونکە تازە و  بە کاتیش بووم لەو شوێنەدا کاتێك نوێژم دەکرد هەموویان دەهاتنە سەیرکردنم قەدەری خوا لەو هەموو نەفەرەدا تەنها یەك ئەلبانی تێدابوو مسوڵمان ئەویش بەناوا! پاش چەند ڕۆژێك مانەوەم شەوێکیان(ڕینالْد) هات بۆ لام و وتی: بەیانی دەچین بۆ شاری(فانۆ) بۆ چاوپێکەوتن!.

بەیانی کاتژمێر هەشت بەڕێکەوتین بۆ شاری(فانۆ) کە وابزانم بیست و چوار کیلۆمەتر دوور بوو لە گوندی(مۆنتێلا ئابیاتی) و بەناو شارۆچکەی (پیسارۆ)دا تێپەڕین کە ئەویش حەوت کیلۆمەتر لە گوندەکەوە دوور بوو لەم ڕێگەیەدا بەجوانی سەیری ڕێگە و تابلۆکانم دەکرد بۆ ئەوەی گەر نیازی ڕۆشتن و هەڵهاتنم هەبێت کەمێك ڕێگەکە ئاشنا بم پاش ئەوەی گەشتینە شاری(فانۆ) بردیانم بۆ بینایەك کە شوێنی چاوپێکەوتن بوو ئافرەتێك پێشوازی لێکردین و وەرگێڕێکی کوردستانی باکور کەخەڵکی شاری(ئەرزروم) بوو بە زمانی کرمانجی بەخێرهاتنی کردم وتی: من ئەمڕۆ بانگیانکردوم کە وەرگێڕیتان بۆ بکەم و تۆش چاوپێکەوتنت هەیە!، منیش وتم پسمام گیان بەخوا ئەز قسەی تە زۆر فەحم ناکەم! واتە: من زۆر لەقسەکانی تۆ تێناگەم ئەم وشانە لەڕێی شاری(وان) ی کوردستانی باکور فێر ببوم ئەویش دەستی کردە پێکەنین و وتی: چەند ڕۆژێکە بەدوای وەرگێڕێکی کوردی سۆرانی دا دەگەڕێن دەستیان ناکەوێت لەم شارە بۆیە منیان بانگ کردووە و یەکەم جاریشە کوردێکی سۆرانی لەم شارە خۆی تەسلیم بکات ئەویش تۆیت!.

ئیتر بردیانمە ژوورێکەوە ژنێکی تەمەن چل ساڵ لەگەڵ کچێکی هەژدە ساڵ دانیشتبوون لەبەرامبەر ئەو ئافرەتەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دەکردم پاش ئەوەی چاوپێکەوتنم لەگەڵ ئەنجام درا من سەرەتا پێم وتن کە نیازم نییە لە وڵاتی (ئیتاڵیا)دا بمێنمەوە و دەڕۆم بۆ وڵاتی(ئەڵمانیا) دیارە قەدەری خوا وابوو کەبچم بۆ ئەویَ تا




بمخاتە ژێر تاقی كردنەوەوە لە ڕووداوەكانی وڵاتی(ئەڵمانیا)دا تیشكی زیاتری دەخەمە سەر إن شاء الله چونكە ئێستا دەزانم ئەو تاقیكردنەوانە خێری تێدابووە و زۆر سوپاسی خوای گەورە لەسەر دەكەم ئەگەرچی لەزۆر خۆشیەكانی ڕۆژئاوا بێبەش بووم تا ئێستاش باجی قورس دەدەم و پاش دەیان ساڵە ئەوكاتەی خۆشم بەتەنهابووم و خێزان و مناڵەكانیشم لەگەڵ بووە هەر بێ ئیقامەین و نیشتەجێی كەمپین!، بەڵام سوپاس بۆ خوا كە ئیمان و بیرو باوەڕەكەمانی پاراستووە و دەزانم بەپێی ئیمانەكەشمان تاقی كردوینەتەوە.

با بڕۆینەوە نێو باسەكە و ئەوان وتیان: تۆ تەمەنت حەڤدە ساڵە و بەهیچ شێوەیەك نابێت بۆ هیچ لایەك بڕۆیت و پۆلیسی وڵاتی (ئیتاڵیا) لە ترسی مافیای وڵاتەكەی، پارێزگاری لە منداڵانی خوار تەمەن هەژدە ساڵ دەكات و تەمەنی تۆش حەڤدە ساڵە، تا تەمەنت نەگاتە هەژدە ساڵ ناتوانیت بەهیچ لایەكدا بڕۆیت و ئەو ئافرەتەش كە بەرامبەرت دانیشتوە ئەوە لەمەودوا دایكی تۆیە و سەرپەرشتیت دەكات، ئەوەی تەنیشتیشی خوشكی تۆیە و دوو خوشكی تریشت هەیە لە قوتابخانەن بۆیە نەهاتوون ماوەی چەند ڕۆژێكە كە باسی تۆمان كردووە بەئاواتەوەن زوو بچیتە لایان.

بەڕاستی لەویادا توشی شۆك بووم و تا چەند دەقەیەك نەمتوانی هیچ بڵێم! كوردەواری دەڵێن: كوندە لەكوێ دڕاوە و لەكوێش پینە دەكرێت! من لەچی خەیاڵێكدام و ئەوانیش نیازی چیان هەیە! دایكی چی و خوشكی چی؟ نەفس و شەیتانیش دەڵێت: دەبڕۆ دەی چیت دەوێت لەوە باشترت لەهیچ شوێنێكی تر دەست ناكەوێت!، سوێند بەخوا باوەڕم وابوو گەر ترسی خوای گەورە و پاشان بەهێزی ئیمانەكەم نەبوایە هەرگیز باوەڕم نەبووە یەك شەو لە لای چوار ئافرەتی جوان و چاوشین و قژ زەرد بمێنمەوە توشی تاوانی زینا نەبم!، ئەو برایانەی لە ڕۆژئاوا ژیان بەسەردەبەن ئەو ڕاستیە باش دەزانن كەوا چەندین گەنج كەدایك و خوشكی بۆ دانراوە توشی تاوانی زینا بووە و دەستی



لەگەڵ بەناو دایك و خوشکەکانی خۆیدا تێکەڵ کردووە سەرەنجام کەوتۆتە داوی شەیتان و نەفسی سەرکەش و ژیانی دونیا و ئاخیرەتی خۆشی فەوتاندووە و بۆ هەمیشە لە کەسوکاری ڕاستەقینەشیان دابڕیوە بەهەرحاڵ وتم: من ناتوانم لێرە ژیان بەسەربەرم کەسوکاری من لە کوردستانە و ئەمانە هیچی من نین نە من لەوان تێدەگەم نە ئەوانیش لە من تێدەگەن! لەگەڵ ئەوەشدا من سوپاسی دڵسۆزی و هاوکاریان دەکەم بەڵام  چۆن دەتوانم بە ئافرەتێك بڵێم: دایکە لەکاتێکدا دایکم کەسێکی ترە؟ئیتر وەرگێڕەکە ڕووی تێکردم و وتی: کاکە خۆت بێتاقەت مەکە، تۆ ژووری تایبەتی خۆتت هەیە بۆ دانانیشیت و نانی خۆت دەبڕیت تۆ تەنها ساڵێك لای ئەوانیت!.

ئەوە دەڵێت: ئێستاش ئیقامەی یەك ساڵی ئینسانیت پێ دەدەن و پاش ئەوەی بوویتە هەژدە ساڵ دەتوانیت داوا بکەیت لە پۆلیس بۆت بکاتە سیاسی یان بۆ چوار ساڵ بۆت تازە دەکرێتەوە پاشان بە پێکەنینێکەوە وتی: لەناو چوار ئافرەتی ناسك و نازداردایت ئیتر چیت دەوێت؟!، وە هەرکات بێتاقەتیش بوویت پەیوەندی بە منەوە بکە کاکە منیش دوو کچی تازە پێگەشتوم هەیە پێکەوە دەچن بۆ قوتابخانە لەکاتی ئەم وتانەدا لەناخی خۆم دا دەموت: ئەی هاوار کەوتومەتە ناو چی گێژاوێکەوە، لەبەردەم کەسێکدا دانیشتوم کە باوکی دوو کچی تازە پێگەشتوە چۆن ڕێگای خراپم بۆ ئاسان دەکات وتم:بێزەحمەت پێی بڵێ ئێستا من ناتوانم لە(ئیتاڵیا) بڕۆم؟ دوای وەرگێران وتی: نا بەهیچ شێوەیەك تانەبیتە هەژدە ساڵ لای ئەم ماڵەیت تازە!، منیش وتم: باشە منیش سێ داواکاریم هەیە بۆمی جێبەجێ بکەن ئەوە دەمێنمەوە! وتیان: فەرموو بیڵێ!.

١. من مسوڵمانم قورئانێکم دەوێت!،وتیان: ببورە لێرە مزگەوتی تێدا نییە و بە ئاسانی دەستمان ناکەوێت بەڵام کەنیسەمان هەیە و هەفتانە دەتوانیت سەردانی بکەیت!.







٢. مـن دایـك و بـاوکم هەیە لە کوردسـتان و دەبێـت پەیوەنـدی تەلەفـونیم هەبێـت لەگەڵیان، وتیان باشە مانگی یەك جار تەنها پانزە خولەك دەتوانیت قسەیان لەگەڵدا بکەیت ئەویش تەنها دایك و باوکت!

٣. وتـم: کۆتـا خاڵیشـم ئەوەیە کاتێك مـن هـاتومەتە دەرەوە لەبەر خراپی بـاری ئـابوری کەسـوکارم بـووە و لەئێسـتادا لەسـەر مـن پـارەیەکی زۆر قەرزار بـوون و بـۆیە پێویسـتم بەوەیە بمـخەنە سـەر ئیشـێك کە بتـوانم قەرزەکـانم بـدەمەوە وتیـان: داوای لێبـوردن دەکەیـن ئیشـکردن بـۆ تەمەنی تـۆ نـیە لە ئێسـتادا چـونکە تـۆ تەمەنی یاسـاییت تەواو نەکـردووە بـۆ کارکردن، وتـم: ئەی خۆتـان هاوکاریم بـکەن، وتیـان: لە ئێسـتادا تـۆ هـیچ موچەیەکت نیە و هەرچی پێداویستی ژیانت هەیە بۆت دابین دەکرێت و ژووری خۆتت هەیە و خـواردن و خـورادنەوە و پۆشاکیشـت بـۆ ئامـادەیە،ئیتر تەواو بـێ هیـوا بـووم لەوەی ناتوانم بڕۆم، بۆ ئەوەی هەسـت نەکەن بە نیـازی هەڵهاتنم وتم باشـە ڕازیم ئیتر ئافرەتەکە کە بەحسـاب دەبێتە دایکم باوەشی پێدا کـردم و منیش زۆر داوای لێخـۆش بـوونم لەخـوای گەورەکـرد بە سـەرزارەکی پێـدەکەنیم بەڵام لەنـاخەوە تەواو بێتـاقەت بـووم داوای پێناسـێکی عێراقییـان لێکـردم کە بۆیـان پەیدا بکەم بەڵام مـن وتـم نـاتوانم بەڵێنتـان پێ بـدەم چـونکە دەسـتم ناگاتە کەسـوکارم وتیـان: باشـە ئێسـتا(ڕیناڵد) دێتەوە بەدواتـدا و دەتباتەوە بۆ کەمپەکە تا ماوەی هەفتەیەك لەوێ دەمێنیتەوە و هەوڵدە تـا ئەوکـاتە پێناسـەکەت پێبگـات ئیتـر لەوکـاتەدا لەگەڵ ناسـراوێکم دا کە زۆر هاوکـاری کردم خوا پاداشتی خێری بداتەوە بە پەیوەندی تەلەفونی قسـەمان لەگەڵدا کـرد کە لە وڵاتی(ئەڵمانیـا) دەژیـا وتـی مـن دەتـوانم هەوڵی ئەوە بـدەم پێناسـەکەتیان بەدەسـت بگەیەنم!،منیش بە کوردی وتم: من بە نیـازی هەڵهاتنم و نامەوێت لێرە بمێنمەوە!،وتی ئاخر خۆ ئەوان دەڵێن: ئیقـامەی دەدەینێ! منیش وتم: ڕاسـتە ئیقـامەی دوونیـام دەدەنێ بەڵام ئیقـامەی قیـامەتم دەفەوتێت لەپـاش ئەم وتـانە وتیـان: کە هێنامـانیتەوە پەنـجە







مۆرت پێدەکەین و هەر هاوکاریەکیشت ویست ئەوە ئێمە خۆمان کار ئاسانیت بۆ دەکەین تا پێت بگات، ئافرەتەکەی بەناو دایکم وتی: نان باش بخۆیت و بەخۆشحاڵیەوە چاوەڕوانیت دەکەین و خوشکەکانیشت چاوەڕوانتن منیش: لەدڵی خۆم دا وتم بە ئیزنی خوا ئەمە کۆتا بینینت دەبێت و ئیتر نامبینیتەوە پسمامیش دەیوت: بڕۆ لێتدا وەك ئەوەی بڵێت: نانت کەوتە ڕۆنەوە داماوە وای دەزانی منیش وەك خۆی وام بۆ خۆشیەکی کاتی خۆشیەکی هەمیشەیی لەدەست بدەم!.

کاتێك گەڕاینەوە ئەم جارە زیاتر دیقەتی ڕێگا و بانەکەم دەدا و بەڵام نەمدەزانی وێستگەی شەمەندەفەر لە کام شارەدایە پاش گەشتنەماڵەوە چەند ڕۆژێك ماینەوە و ڕۆژانە دایکەکە چەند جارێك تەلەفونی دەکرد بۆم و منیش هەندێك وشەی ئیتاڵی لەمنداڵەکانی ترەوە فێر ببووم ئیتر یاریم لەگەڵ هاوڕێکانم دەکرد زۆریان خۆش دەویستم تەنانەت یەك دوانێکیان بەبێ ئەوەی بوبێتنە مسوڵمان و بزانن ئیسلام چی یە!، دەچوون وەك من نوێژیان دەکرد، پاش چەند ڕۆژێك(ڕیناڵد) هات بۆ لام وتی: چیت کرد بۆ پێناسەکەت؟،

منیش وتم: بەداخەوە ناتوانرێت بە ئاسانی بەدەستم بگات، وتی: ئەوە پەیوەندیم پێوە کراوە بتبەم وێنەی ئیقامەت بۆ بگرم و خۆت جوان بکە، بە سەیارەکەی بردمی تەجیلی خستبۆیە سەر گۆرانی ڕاپ و سەری بادەدا منیش هەر بە کوردی قسەم لەگەڵ دەکرد و وتم هاوڕێی تۆ لای ئێمە بە مامە حاجی و باپیرە بانگی دەکەن و سوڵحی دوو تیرەی ناکۆك دەکات! تۆش تازە بەتازە سەر بادەدەیت بۆ گۆرانی؟!، ئەویش هەر پێدەکەنی و نەیدەزانی من چی دەڵێم دوای گرتنی وێنەکان هاتینەوە ماڵەوە و لەڕێگەدا وتی: ئەم ماوەیە زۆر خۆشحاڵ بووم کە گەنجێکی وەك تۆم ناسی هەست دەکەم لەو ڕۆژەوە منداڵەکانیش زۆر گوێمان بۆ دەگرن چونکە تۆ وەك ئەوان سەرپێچی ناکەیت و لەتۆوە فێری ڕێز گرتن بوون! منیش بە کوردی و ئیشارەت وتم: ئەوە ئیسلام وای







فێرکردوم بەڕاستی تا نەچیتە ناو کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا هەست بەو بۆشاییە گەورەیەی پەروەردەی خێزانی ناکەیت کەوا نە بچوك ڕێز لەگەورە دەگرێت، نەگەورەش پەروەردەکارێکی باشە!.

دواتر وتی: بەڵام بەداخەوەم بەیانی دەبێت بتبەم بۆ ماڵەکە و وتویانە پێناس کێشە نابێت و دەبێت ئیتر ئیشەکانی بۆ ڕاپەڕێنین بهێنیتەوە بۆ لامان!،منیش وتم: ناتوانم ئیتر چاوەڕێ بکەم؟، من حەزدەکەم لای تۆ بم! وتی: نەخێر بەداخەوەم لای من شوێنی کاتییە و بەدەستی من نیە!، ئیتر بە پێکەنینەوە بە کوردی وتم: دەی بەخوا ئەم شەو ڕادەکەم فەقیرە ئەویش پێدەکەنی و تەقەی سەری دەهات ئەگینا بەخوا هەر ئەو ڕۆژە دەیدامەوە دەستیان کاتێك هاتمە ماڵەوە چوومە لای هاوڕێکانم و بە ئیشارەت وتم: لەکوێ شەمەندەفەر هەیە؟ یەکێکیان دەستی گرتم و بردمیە ژوورێکەوە و نەخشەیەکی گەورەی پیشاندام و وتی: لەشاری(پیسارۆ) هەیە و حەوت کیلۆمەتر لێمانەوە دوورە، ئیتر بڕیارم دا ئەو شەوە سەفەر بکەم و سەرەتا دوو ڕکات نوێژی(ئیستیخارە)م کرد و پاش ئەوەی شەو داهات دەبوایە کاتژمێر دەی شەو هەموو نەفەرەکان لەناو جێگەی نوستندا بوونایە ژوورەکەی منیش ئەو کوڕەی لام بوو باش بوو دوو شەو لەوەوپێش چووە ژوورێکی تر و بەتەنها مامەوە بەڵام نەمدەتوانی لەدەرگای سەرەکی شوقەکەوە بڕۆم چونکە بەکلیل دادەخرا! دەبوایە تەنها لە پەنجەرە و بەلەکۆنی ژوورەکەوە کە قاتی دووەمیش بوو هەڵبێم و خۆم بخەمە خوارەوە!.

پاش ئەوەی چوومە ناو جێگەی نوستن و شەوانە هەندێ جار ئەوکەسەی کە سەرپەرشتیمان دەکات دەهات سەری لێدەداین بۆ ئەوەی بزانێت نوستوین یان پێویستیمان بە هیچ نابێت!، یەك دوو جار(ڕیناڵد) هاتە ژوورەکەم و گەڕایەوە،منیش لە ناو جێگەکەم دا هەڵنەستام تا بەتەواوی هەموویان خەویان لێکەوت و ماڵ بێدەنگ بوو، کاتژمێر بوو بە یەکی شەو هەستام بۆ خۆ ئامادەکردن،بەپەلە و هەڵە





پـروزە قەڵەمـێکم گـرت بەدەسـتەوە و لەسـەر وەرەقەیەك بە ئینگلزیەکی شـەق و شـڕ نووسیم( ثانکیو مستەر ڕیناڵد، یو ڤێری گود مان ، ئایام سۆری ، ئای وەنت گۆو فۆر جێرمەنی)
واتە: زۆر سـوپاس بەڕێز(ڕیناڵـد ، زۆر داوای لێبـوردن دەکەم مـن دەبێـت بـڕۆم بـۆ ئەڵمانیـا، ئەمەشـم بـۆیە کـرد بـۆ ئەوەی پـاش مـن توشـی کێشـەی یاسـایی نەبێـت و لێپێچینەوەی لەگەڵدا نەکرێت لەلایەن یاساوە چونکە ئەو سەرپەرشتی دەکردین ئیتر دەرگای سـەر بەلەکۆنەکەم کـردەوە و یەکەم جارکەشـفێکم کـرد و سـەیری خـوارەوەم کـرد خەریکبـوو پەشـیمان ببمەوە چـونکە کەمێك بەرز بـوو! بەڵام کە بیریشـم کەوتەوە ئەمشـەو کۆتـا شـەومە و بەیانی پەنجە مۆر دەکرێم ، خێرا هـاتمەوە ژوورەوە و بەتانی و سـەرینەکانی سـەر جێگەکـانی تـرم هێنـا و خسـتمە شـوێنەکەی خـۆم و دامپۆشـی بـۆ ئەوەی گەر کەسێك هاتە ژوورەکە بزانێت خەوتوم پاشان خێرا دەرگاکەم کردەوە و بە بەلەکۆنی قاتی دووەمی بیناکە دا خۆم شۆڕ کردەوە تا دوو مەترێك قاچم لە زەویەکەوە دوور بـوو خێرا غیرەتم دایە بەر خـۆم و چـاوم نوقانـد و خـۆم هەڵـدایە خـوارەوە یەك زرمەی زۆر گەورەی کرد کە کەوتمە سەر زەوی و وتم ئێستا ئاشکرا دەبم!
بەڵام بـاش بـوو سـوپاس بـۆ خـوا ئاشـکرا نەبـووم و دەسـتم کـرد بەڕۆشـتن و لەترسـی سـەیارەی پۆلیسـیش نەمـدەوێرا بەسـەر جـادەی قیرەکەدا یـان شـەقامی تەنیشـت جـادەکەدا بـڕۆم بەناچـاری بەنـاو چەم و دەشـتاییەکاندا دەڕۆشـتم هەتـا بەچەنـد کاتژمێرێـک گەشـتمە نـاو شارۆچکەی(پیسـارۆ) و تـاك و تەرا خەڵکـم دەبینی و لەڕێـی پرسیارکردنەوە وێستگەی شەمەندەفەرم دۆزیەوە!
بەم شێوەیە سوپاس بۆ خوا کۆتایی بە سەفەری نێوان وڵاتی(یۆنان) و (ئیتاڵیا)ش هات و لەمەوپـاش دەچینـە سـەر کۆمەڵێـك ڕووداوی تـر ئەویـش بـریتییە لە : چیـرۆك و ڕووادوەکانی ڕێگای نێوان وڵاتی (ئیتاڵیا)و وڵاتی (ئەڵمانیا).






**ســەفەرکردنم لە وڵاتــی (ئیتاڵیــا) بــۆ وڵاتی(ئەڵمانیــا) بەڕێگــای شەمەندەفەرو پاس.**

پاش ئەوەی لەکەمپی مناڵانی گوندی(مۆنتێلا ئابیاتی) لە وڵاتی(ئیتاڵیا) هەڵهاتم و خۆم گەیانــدە شارۆچکەی(پیســارۆ) کە نــزیکەی حەوت کیلــۆمەتر دوورە لەو کەمــپەوە کــاتژمێر چــوار بــۆ پێنجی شــەو بــوو تــاك و تەرا نەفەرت دەبینی لەســەر کــوچە و شەقامەکانی ئەو شارۆچکەیە دا کەش و هەواش زۆر ساردی کردبوو چونکە لەکۆتایی







مانگی یەکی ساڵی(٢٠٠٣) دا بوو! سەرجەم دووکان و بازاڕیش داخرابوو منیش بگەشتمایەتە هەر نەفەرێك بە ئینگلزییەکی شەق و شڕ پێم دەوت(ئێکسکویزمی وێرزە ترێن ستەیشن) واتە: بێزەحمەت وێستگەی شەمەندەفەر لە کوێ یە!،تا بەو شێوەیە سوپاس بۆ خوا وێستگەکەم دۆزیەوە و چوومە ژوورەوە شوێنی دانیشتنی لێبوو کەمێك گەرمم بۆیەوە بەڵام هێشتا نوسینگەی بلیت فرۆشتن نەکرابۆیەوە، بەڵام دەتتوانی بە جیهاز بلیت ببڕیت!.
پێویستم بەکارتی تەلەفون بوو تا لەڕێی کابینەوە پەیوەندی بکەم بە ناسراوێکمانەوە بۆ ئەوەی ڕێنمایم بکات پاش ماوەیەك چاوەڕوانی مارکێتێك کرایەوە لەناو وێستگەکەدا وردەواڵە و خواردەمەنی دەفرۆشت چوومە لای و هەرچۆنێك بێت تێم گەیاند و کارتێکی کابینەم کڕی سەرتا ویستم بۆ شاری (میلانۆ) بلیت ببڕم بەڵام پاش پەیوەندی کردنم بە ناسراوەکەمەوە،ژمارەی هاوڕێیەکی پێدام لەشاری(بۆلزانۆ)کەدەکەوێتە سەرسنوری نێوان(ئیتاڵیا) و (نەمسا)و شاری (میوشن)ی(ئەڵمانیاش)سێ کاتژمێر و نیو لەوشارەوە دوورە پاش کردنەوەی شوێنی بلیت بلیتێکم بڕی بۆ شاری(بۆلزانۆ) بەڵام هەندێك قسەی کرد من لەهیچی تێنەگەشتم چونکە یەکەم جارم بوو سواری شەمەندەفەربم نەمدەزانی گۆڕینی شەمەندەفەر دێتە ڕێگام لەشارێکی تر!، ئەویش ئەوە بوو کە پێی ڕاگەیاندم لە شاری(بۆلۆنیا) دابەزم و شەمەندەفەرەکەم بگۆڕم بۆ شاری(بۆلزانۆ).
ئەوماوەیەی کەمامەوە لەوێستگەکەدا زۆر لە دوودڵی و ترسدا بووم و دەموت ئێستا نا ئێستا چوونەتە ژوورەکەم و پێیان زانیوم و بەو هۆیەوە پۆلیس دەگاتە سەرم کاتژمێر شەش و نیوی بەیانی بوو سوپاس بۆ خوا هیچ ڕووی نەدا و سواری شەمەندەفەربووم و کەوتەڕێ تا گەشتە شاری(بۆلۆنیا)،لەوێ شەمەندەفەرەکە وەستا و سەرجەم سەرنشینەکان دابەزین، منیش کۆتا کەس دابەزیم و چووم بۆ لای جابیەکە بە





ئیشارەت وتم(بۆلزانۆ) ئیتر دەستی ڕاکێشا بۆ لاینێك و پێی وتم: کە شەمەندەفەری ئەو شارە لەوێوە دەردەچێت منیش نەمزانی دەڵێت کاتژمێر یەك و چل و پێنج دەقەی نیوەڕۆ هەر لەگەڵ چوومە ئەو لاینە شەمەندەفەرێك هات و سەرکەوتم و ڕۆشت نەمزانی بۆ شاری(میلانۆ) دەڕوات!
نزیکەی کاتژمێرێك ڕۆشت و جابیە بۆر هات داوای بلیتی کرد هەر ئەوەندەم خۆش بوو دامە دەستی دای بەسەر یەکدا بە ئیتاڵی و بەس لە وشەی(میلانۆ) تێگەشتم و زانیم بەهەڵە سواربووم ئیتر زانی شارەزا نیم و بەهەڵە سەرکەوتوم زۆر باش بوو لەگەڵم لە وێستگەیەکی تردا وەستا و پێی وتم: خێرا دابەزە و ئێستا شەمەندەفەرێکی تر لەو بەرەوە دێت و بڕۆرەوە بۆ شاری(بۆلۆنیا) و لەوێوە دەڕۆیت بۆ(بۆلزانۆ)،بەوشێوەیە دووبارە گەڕامەوە بۆ شاری(بۆلۆنیا) لەگەڵ دابەزیم دستم کرد بە پرسیار کردن و دەگەشتمە هەر کارمەند و جابیەك بلیتەکەم دەدایە دەستی ئەویش بە ئیتاڵی یان ئینگلیزی گفتوگۆی دەکرد منیش سەرم تەقەی دەهات باوەڕ بکەن وابزانم دەجار بەهەڵە سواری شەمەندەفەربووم بەڵام تا جابیەکەیم نەبینیایە نەدەڕۆشتم لەگەڵیان و ئەوانیش دایاندەبەزاندم و دەیانوت: ئەمە بۆ شاری(بۆلزانۆ) ناڕوات تا جابیەکیان ئەوەندەم لێ پرسی زانی بە قسە تێناگەم دەستی گرتم و بردمیە ئەو لاینەی کە شەمەندەفەرەکەی(بۆلزانۆ) دەڕوات ودەستی درێژ کرد بۆ کات ژمێرەکە و بەدەست چەند جارێك ئاماژەی پێدام کە تا دەبێتە کاتژمێر یەك و چل و پێنج دەقە لەوشوێنە دابنیشم و سواری هیچ شەمەندەفەرێکی تر نەبم کە دێتە ئێرە تا ئەوکاتە و کەسەریش کەوتی دامەبەزە تا کۆتا وێستگە باوەڕ بکەن ئەوکاتە بەتەواوی تێگەشتم و ئیتر زۆرم برسی بوو چووم شتێکم خوارد و پاشان پەیوەندیم کرد بەو هاوڕێی ناسراوەمان و پێم وت کە کاتژمێر حەوت بۆ هەشتی ئێوارە دەگەمە شاری(بۆلزانۆ) پاش تەلەفونەکە






لەكابینەكە هاتمە دەرەوە نەفەرێك بەكوردی هاواری دەكرد ڕەنجە منیش وتم: یارەبی خوایە ئەوە گوێم دەزرنگێتەوە یان بانگم دەكەن؟

كاتێك ئاوڕم دایەوە سەیرم كرد بەرپرسی شوقەی تەسفیەی (ئەستەمبوڵ)م بوو خەڵكی شاری(هەولێر)بوو ئەملاولای یەكمان ماچ كرد و وتم ها ئەوە كەی گەشتی؟ وتی: بە كەشتی هاتووم لە توركیاوە و دوێنێشەو گەشتووم ئێستاش دەڕۆم بۆ(ڕۆما)و ئیتر شەمەندەفەرەكەی ئەو دەڕۆشت و ماڵئاواییمان لەیەك كرد و ڕۆشت،پاش ئەوەی نوێژی نیوەڕۆ و عەسرم كرد بە شێوەی نوێژی كۆكردنەوە و سەفەر شەمەندەفەرەكەم هات و سەركەوتم هێندە ماندووبووم لەگەڵ سەركەوتم خەوم لێكەوت هەتا جابی خەبەری كردمەوە و داوای بلیتی لێكردم بەو شێوەیە لەچەندین شارو شارۆچكە وەستا تاگەشتە شاری(بۆلزانۆ) و دابەزیم تەلەفونم كرد بۆ ئەو برادەرەو، ئەویش وتی: لەوناوە بسوڕێوە پاش یەك كاتژمێری تر دێم لەو ماوەیەدا هاتمەوە دەرەوە لەناو وێستگەی شەمەندەفەرەكە و دەستم كرد بەگەڕان بەناو شارەكەدا لەبەر ئەوەی شارێكی سەرسنوری بوو كەوتبۆیە شوێنێكی زۆرساردەوە كە ناوچەیەكی شاخاوی سەخت دەوری شارەكەی دابوو بەشێوەیەك تیشكی خۆر تا درەنگانێك دەرنەدەكەوت لەگەڵ ئەوەشدا بەفر باریبوو تیایدا منیش چونكە زۆر شارەزا نەبووم پۆشاك و جل و بەرگی گەرمم كەم لەبەردابوو چەندجارێك هاتوچۆم كرد بەناو بازاڕی شارەكەدا كات زۆر تێپەڕی كرد ئەو برایە هەر دیار نەبوو بۆیە بەناچاری پەیوەندیم پێوەكردەوە و وتم براكەم باوەڕ بكە كەمێكی تر نەگەیتە لام ڕەق دەبەمەوە، وتی: وەڵاهی بمبورە تازە جوابم وەرگرتوە و خانوم نەگرتوە و هێشتا لەناو كەمپدام وە كەمپەكەشمان لەژێر چاودێریدایە و ناتوانم بە ئاسانی بتبەمە لای خۆم تەنها كونێكی تێدایە كە بتوانین نەفەری لێ بەرینە ژوورەوە لەوكاتەوە هەوڵ دەدەم مەجالێكت بۆ دروست بكەم بەڵام هیچم پێناكرێت چاوەڕێ بە ئێستا دێمە لات







بەناچاری کەمێکی تر دەستم کردەوە بە پیاسە کردن لەتاو سەرمادا باش بوو سوپاس بۆ خوا گەشتە لام و وتی برا گیان زۆر داوای لێبوردن دەکەم کە ناتوانم بتبەمە لای خۆم چونکە خەڵکی تریشم لەگەڵە و ئێستاش بەهۆی نەفەری زۆرەوە کەپێشتر دەبرایە ناو کەمپەکە ئاشکرابووە! دواتر کەشف ببم توشی لێپێچینەوە دەبم!.
بەهەرحاڵ باش بوو لەبەرامبەر کەمپەکەدا سەیارەیەکی شکاوی لێ بوو کە وەك باسی دەکرد پێشتر شێتێکی تێدا خەوتبوو بەڵام ژێر سەیارەکە یەك پارچە بەفری بەستو بوو وەك سەهۆڵ کە بەڕاستی سەرمای ئەوکاتە وا کاری لێکردووم تائێستاش بەرگەی کەمترین سەرما ناتوانم بگرم و وەك بڵێی کاری لە ئێسقانم کردووە!، ئیتر بردمی بۆ ئەوێ و پاشان گەڕایەوە بۆ کەمپەکە پاڵتۆیەك و هەندێك خواردنی بۆ هێنام و وتی: بۆ خۆت دەتوانیت لێرە ئیسراحەت بکەیت و منیش بەیانی دەچم بۆ ئیش و تائێوارە من نابینیتەوە وە هەوڵدەدەم لەڕۆژی هەینی دا پاسێك هەیە لێرەوە دەڕوات بۆ شاری(میوشن) ی ئەڵمانیا بلیتت بۆ ببڕم و بڕۆیت ئەوەی کەناخۆش بوو نزیکەی چوار ڕۆژی مابوو بۆ کاتەکە وتی: دەبێت ئەم چەند ڕۆژە لێرە بخەویت و بەڕۆژیشدا من لە ئیشم بۆ خۆت بڕۆ بگەڕێ تا ئێوارەت بەسەردا دێت!
بەڕاستی لێتان ناشارمەوە تا ئەو شوێنەش هەستی غەریبیم کەم بوو بەڵام کەچوومە ناو سەیارە شکاوەکەوە و ماڵ ئاوایی لێکردم دەستم کرد بەگریان و زۆر بێتاقەت بووم لەگەڵ ئەوەشدا کەش و هەوا زۆر سارد بوو لەتاو سەرماش خەوم لێ نەدەکەوت!، پاش کاتژمێرێك زۆرم هەوڵدا بخەوم بەڵام خەوم لێ نەکەوت،
شەیتانی نەگریسیش دەیان ختورە و بیری خراپی دەهێنایە نێو دڵمەوە و لەلایەك دەیوت بڕۆ خۆت تەسلیمی پۆلیس بکە لەلایەکی تریش دەیوت بگەڕێوە بۆ کەمپەکەی خۆت و ژیانی خۆتت بۆ والێکرد؟ منیش لەبەر خۆمەوە سوپاسی خوای گەورەم کرد لەسەر ئەو تاقی کردنەوەیە و پەنام گرت بەخوای گەورە لە فرتوفێڵی شەیتان و غیرەتم





هێنایەوە بەرخۆم و هاتمە دەرەوە لەناو سەیارەکەدا وتم با بڕۆم بزانم شوێنێکی باشترم دەست ناکەوێت؟ کەوتمە ڕێگە کردن و زۆر هەوڵم دا شوێنێکم دەست بکەوێت بەڵام بێ سود بوو تا ئەوەی بەناچاری خۆم کردەوە بە وێستگەی شەمەندەفەرەکەدا کە شوێنی چاوەڕوانی لە ژوورەوەدا بوو گەرم بوو کەچوومە ژوورەوە سەیرم کرد چەند مودمینێکی دەرمان و چەند نەفەرێك خەوتوون لەسەر کورسیەکان، لەبەر خۆمەوە وتم: بەخوا باشە ئەم شوێنە هەیە من چیم داوە لەناو سەیارەی شکاودا بخەوم بەم سەرمایە! ئیتر چوومە سەر دوو سێ کورسی خەوم لێکەوت!

پاش ماوەیەکی کەم کاتێکم زانی کەسێك دەیکێشێت بەسەر شانم دا بەدارێکی کارەباییەوە کەچاوم کردەوە سەیر دەکەم دوو پۆلیسن بەخوا هەر ئەوەندەم زانی دایان بەسەر یەکدا بەزمانی(ئیتاڵی) ئەوەندە تێگەشتم کە وتیان: خەوتن لێرە قەدەغەیە و نابێت کەس لێرە بمێنێتەوە،منیش: بە کوردیە حەیاتەکەی خۆمان کەوتمە گفتوگۆکردن و وتم: بابە شوێنم نییە و بچم بۆ کوێ بخەوم؟، سەرەتا هەڵنەستام ، بەڵام کاتێکم زانی هەردوو دەستیان گرتم و لەگەڵ نەفەرەکانی تردا کردنیانە دەرەوە،دووبارە دەستم کردەوە بەگەڕان بۆ پەیدا کردنی شوێنێك چاوەکانم هێندە قورس ببوون و خەوم دەهات باوەڕتان بێت نەفەرم دەبینی لە پێشمەوە دەڕۆشت لە پێش چاوم دەبۆیە هێستر و جانتاکەی شانیشی بە بارەکەی دەچووا! پاش کەمێك گەڕان لەناو بازاڕەکەدا ژێرزەمینێکم دۆزیەوە کە دوو شوێنی بەیەکەوە دەبەستەوە و چوومە خوارەوە هەمووی دوکان بوون بەڵام داخرابوون

منیش چوومە لاتەنیشتێك و لە لاچەپێکەوە کە خەڵك هاتوچۆی تێدا نەدەکرد کارتۆنێکم پەیا کرد و لەسەری ڕاکشام و خەوم لێکەوت هەتا نزیکی بەرەبەیان لەو شوێنەدا مامەوە پاشان وردە وردە گوێم لەدەنگی خەڵك و هاتوچۆ و تەپەی پێ بوو




هەستام و خۆم کۆکردەوە ڕاستیەکەی ترسام وتم: نەوەك بە تۆمەتێك دەستیگر بکرێم لەو شوێنەدا لەبەر ئەوەی شوێنی گومان بوو!
هاتمە دەرەوە دونیا ڕۆشن ببۆیەوە و شەقامەکان جموجۆڵی تێکەوت و ئەوجا بەباشم زانی بچم دەست نوێژێك بگرم و نوێژەکەی بەیانیم بکەم دوبارە گەڕامەوە ناو وێستگەی شەمەندەفەرەکە و لە شوێنی دەست بە ئاوگەیاندنەکەیدا دەست نوێژم گرت و بەناچاری گەڕامەوە بۆ ناو سەیارە شکاوەکە و دووبارە مەمنونی بوومەوە،هەر لەویا نوێژەکەم کرد و چوومە ناو سەیارەکە و خەوم لێکەوت هەتا نزیکەی نیوەڕۆ کاتێك هەستام لەخەو هەموو گیانم تێك شکابوو وە تەشەنوجێکی باشم کردبوو هاتمە دەرەوە و دەستم کرد بەگەڕان بەناو شارەکەدا هێندە ئەمسەر و ئەوسەرم کرد، شارەزای هەموو کوچە و کۆڵان و بازاڕێکی بووم پارکێکی گەورەی تێدا بوو پێی دەوترا(تاڵڤەرە) ئەو چەند ڕۆژە بۆ مانەوە و پشوو دەچوومە ئەو شوێنە چونکە زۆرجار پۆلیس بڵاو دەبۆیەوە و نەفەریان دەگرت منیش ئەوراقم هیچ پێ نەبوو.
هەروەها شەمەندەفەرێکی خێرای تایبەت بە کەلوپەلی باری تێدا بوو ڕاستەوخۆ تا وڵاتی(سوید)دەڕۆشت و نەدەوەستا ماوەی وەستانی شەمەندەفەرەکەش تەنها دە دەقە بوو لەو کاتە کەمەدا قاچاخچیەکان خێمەی بارەکانیان دەدڕی و نەفەریان سەردەخست منیش بەم ڕوداوەم نەزانی تاوەکو قەدەری خوا یەکێك لەهاوڕێکانی ڕێگەی(تورکیا) بۆ(یۆنان)م بینیەوە لەو شارەدا و پاش هەواڵپرسین و گفتوگۆ، وتی: بەو شێوەیە دەڕۆم بۆ وڵاتی(سوید).
بۆ ئێوارە ئەو برایە هاتەوە لای سەیارەکە و هەندێ خواردنی تری بۆ هێنام و وتی: حاڵت چۆنە؟، وتم: وەڵا برام زۆرم سەرما بوو حاڵی شەوی ڕابردووی خۆمم بۆ باس کرد ئیتر باش بوو ئەم جارە ڕۆشت چەند بەتانیەکی بۆ هێنام و داوای لێبوردنی کرد کە نەیتوانی بە پێی پێویست هاوکاریم بکات منیش وتم: برام من داوای لێبوردن لە تۆ






دەکەم بومەتە ئەرك و بار بەسەرتەوە جا بەس نیە خوای گەورە تۆشی بۆ ناردوم!، پاش ئەوە وتی: ئەم دوو ڕۆژە بۆ خۆت بگەڕێ بەیانیش زوو تەواو دەبم لە ئیش دەتبەمە بازاڕ و چێشتخانەیەکی بچوکی عەرەبی لێیە سەروپێیەکی حەڵاڵیش دەخۆین تیایدا و مزگەوتێکی بچوکیشمان هەیە دەتبەم ئەوێشت پیشان دەدەم و ڕۆژانە دەتوانی بڕۆیت نوێژەکانتی تێدا بکەیت بەڵام ناتوانی بمێنیتەوە تیایدا چونکە توشی کێشە دەبن!.

بۆ ڕۆژی دواتر بۆ نیوەڕۆکەی هات بەدوامدا و چووینە دەرەوە و نانمان خوارد و پاشان چووینە مزگەوت ماڵی ئاوا بێت ئەم جارە تا ئێوارە لەگەڵمدا بوو پاشان ڕۆشت و وتی: بۆ ڕۆژی پێنج شەممە ئیشم نییە و دەبێت بڕۆین بۆ بازاڕ پۆشاك و جل و بەرگی تازە بکڕین وە لەناو بازاڕدا حەمام هەیە بە پارە لەوێ جوان خۆت بشۆ بۆ ئەوەی ئامادەبیت بۆ سەفەرەکەت چونکە یەك شەممە کاتژمێر شەشی بەیانی دەڕۆیت بەپاسی گەورە بۆ شاری(میوشن)ی وڵاتی (ئەڵمانیا) کە نزیکەی سێ کاتژمێر و نیو دوورە لێرەوە و بەناو خاکی وڵاتی (نەمسا)دا دەڕوات بەڵام ترست نەبێت هیچ کۆنترۆڵێکی نییە سوپاس بۆ خوا بەو شێوەیە ڕاهاتم لەگەڵ تەنهایی دا ئەو چەند ڕۆژە خۆم سەرقاڵ دەکرد و شەوانە دەچوومەوە ناو سەیارە شکاوەکە ڕۆژی شەممەش هاتە پێشەوە و سەرجەم ئیش و کارەکانمان پێکەوە ئەنجام دا و پۆشاك و جلو بەرگی تازەم کڕی و ئامادەکاری تەواوم کرد بۆ سەفەر و چوومە حەمام جوان خۆم شۆرد.

پاشان ئێوارە بلیتەکەی دایە دەستم و شوێنی سەرکەوتنی پاسەکەی پیشان دام و ماڵ ئاوایمان لەیەك کرد بۆ کۆتا جار لەناو سەیارە شکاوەکەدا خەوتم و کاتژمێر پێنجی سەرلەبەیانی هەستام و خۆمم ئامادەکرد و پۆشاك و جل و بەرگی نوێم لەبەرکرد و سەرجەم کەلوپەلەکانی ترم لەوێدا بەجێهێشت و ئەو برایە وتی: دواتر دەیانبەم بۆ لای خۆم ، چوومە شوێنی چاوەڕوانی پاسەکە سەرەتا کەسی لێنەبوو زۆر ترسام وتم:







لەوانەیە ڕۆشتبێت چونکە وەك وڵاتانی خۆمان بیرم دەکردەوە کە چۆن بە کاتژمێرێك یان زووتریش خەڵکی دەچنە گەراج بەڵام سوپاس بۆ خوا پاش ماوەیەکی کەم بینیم کۆمەڵێك نەفەر بە جانتاوە هاتنە وێستگەکە و دواتر زانیم لە وڵاتانی ڕۆژئاوا ئەو فرکان فرکانەی لای خۆمان نییە و بەچەند دەقیقەیەك پێشتر خەڵکی ئامادە دەبن لە وێستگەکاندا بۆ سەفەرکردن وە بەپێی ڕێنمایی پێش وەختە هاتوچۆ دەکەن!

پاسێکی سپی گەورە هات و وەستا منیش هەمیشە بۆ سەفەرکردن خۆم دەخستە بەشی ناوەڕاستەوە و پاش کۆمەڵێك نەفەر سەردەکەوتم بۆ ئەوەی ئەوانی پێشم چیان کرد منیش بەو شێوەیە بکەم جابییەك لەبەر دەرگاکە وەستا بوو یەك یەك پێشوازی لەنەفەرەکان دەکرد و ڕێپیشاندەری دەکرد بۆ نەفەرەکان هەڵبەت بە پەیوەندی تەلەفونی بلیتم بۆ بڕابوو هیچ پسوڵەیەکم پێ نەبوو نەشمدەزانی گەر پرسیاری کرد چی وەڵام بدەمەوە بەس ئەوەندە دەمزانی ناوێکیان پێ وتبووم!، شێوەشم زۆر مناڵ دیار بوو دەترسام ئاشکرا بم لەوکاتەدا گەشتە سەرەی من بەزەردەخەنەوە هەلەوێکم لە کابرای جابی کرد و بێ خۆتێکدان سواری پاسەکە بووم ئەویش هیچی نەوت لەبەشی ناوەڕاستی پاسەکەدا لە شوێنێکی دوو نەفەری دا دانیشتم بەتەنها بووم و کەسم لەگەڵ دانەنیشت شۆفێری پاسەکە بە مایکی ناو پاسەکە دەستی کرد

بە گفتوگۆکردن هەڵبەتە من دەتوت گوێزم بۆ دەژمێرن کاتێکم زانی بوو بەچەپڵە لێدان لە لایەن نەفەرەکانەوە.

پاش ئەوە پاس دەستی کرد بە ڕێکردن و نزیکەی نیو کاتژمێرێك ڕۆشتین و لە شوێنێکی تریشدا وەستا و کۆمەڵێك نەفەری تر سەرکەوتن دووبارە کەوتەوە ڕێ لەدڵی خۆم دا هەر دوعام دەکرد و دەموت تۆ بڵێی: بەهەڵە سوار نەبووبێتم؟،باشە بۆ وەستا خۆ پاسی نەفەری ناوخۆ نییە؟ بەهەرحاڵ لەم خەیاڵانەدا بووم سەیردەکەم بەرەو چیایەکی بەرز سەردەکەوێت بە لۆفەدا لەژیانم دا یەکەم جارم بوو لۆفەی وا سامناك







ببینم لەگەڵ ئەوەشدا بەفرێکی باشیش دەباری باوەڕتان بێت ئەو شۆفلانەی بەفرەکەیان لادەدا لەماوەیەکی کەم دا شوێنەکەی وەك خۆی لێ دەهاتەوە!.
گەشتینە کۆتا سنوری وڵاتی(ئیتاڵیا) و بەکۆنترۆڵێکدا تێپەڕین بەڵام سوپاس بۆ خوا کەس نەهاتە سەرەوە و ئیزنیان داین و گەشتینە خاکی وڵاتی(نەمسا) و لەوێش کۆنترۆڵ نەهاتە سەرەوە چونکە ئەو پاسە هەفتەی یەك ڕۆژ هەبوو زیاتر پیر و پەککەوتەکانیان بۆ گەشتوگوزار هاتوچۆیان پێ دەکرد!،ماشاء الله بەشێوەیەك بەفر دەباری نەمدەتوانی دەرەوە ببینم پاش کاتژمێر و نیوێك لە خواردنگەیەك لایدا و وەستا دوبارە شۆفێرەکە کەوتەوە گفتوگۆکردن و دەرگای پاسەکەی کردەوە و نەفەرەکان دابەزین بۆ نانخواردن سەرەتا منیش دابەزیم و دوای نەفەرەکان کەوتم بەڵام کە نزیك بوومەوە لەدەرگای ژوورەوە سەیرم کرد دوو خزمەتکاری کوڕ و کچ وەستاون و هەر نەفەرێك دەڕوات سینیەکی دەدەنە دەست، لەگەڵ ئەوەم بینی وتم: جا برا گیان ئێستا من لە خۆمەوە چی هەڵگرم یان داوای چی بکەم ئابڕوشم دەچێت و کەشفیش دەبم کوردەواری وتەیەکی جوانیان هەیە و دەڵێ: خوا دەلیلی داماوە، پێش ئەوەی بگەمە لای کوڕ و کچەکە بەدەستە ڕاست ئاماژە درابوو بە شوێنی دەست بە ئاوگەیاندن(تەوالێت) خێرا خۆم لادا و چوومە تەوالێتەکانی بەشی پیاوان تا نزیکەی چارەکێك نەهاتمە دەرەوە دواتر بێ ئەوەی خۆم تێك بدەم یان سەیری ناوەوەی چێشتخانەکە بکەم هاتمەوە بۆ ناو پاسەکە،سەیرم کرد هەندێك کەسی تریش دانەبەزیون،ئیتر نەفەرەکان خوارنیان خوارد و پشوویان دا و دووبارە پاسەکە کەوتەڕێ جابی دەستی کرد بە گەڕان بۆ بلیتەکان و هاتە سەرەی من و خشتەی ناوەکانی پیشاندام کە ناوم چییە خوا ڕەحمی کرد خۆی ناوەکەی پێ وتم ئەگینا من لەبیرم چووبۆیەوە بەناوی کێوە بلیتم بۆ براوە ئیتر کەمێك پێکەنی و ڕۆشت منیش هەر سەرم بۆ بادەدا و بەس دەمزانی بڵێم ثانکیو ڤێری ماچ!




بەو شێوەیە سوپاس بۆ خوا پاش سێ کاتژمێر و نیو گەشتینە ناو شاری(میوشن) ی (ئەڵمانیا) و ناسراوەکەم لە وێستگەکەدا چاوەڕوانی دەکردم و پاش دەست کردنە ملی یەك و ئەملاولا ماچکردن خێرا وتی: کاکە گیان تۆ هیچ وەرەقەیەکت لە گیرفاندا نیە و دوامبکەوە با نەگیرێیت پاش ئەوە بردمیە ژێر زەمینێك سواری شەمەندەفەرێکی کردم کە لەناو خۆی شاری میوشن هاتوچۆی دەکرد وتی: ئەمە پێی دەوترێت ئوبان و پاش ماوەیەك ڕۆشتن لەو دابەزین و سواری دانەیەکی تر بووین وتی: ئەمیان ئیسبانە! و میترۆشمان هەیە لێرە وتم ڕەحمەتی خوات لێبێت ئوبان و ئیسبان چییە بەکوردیەکەی خۆمان بڵێ: شەمەندەفەر و تەواو ئەم هەموو ناوە لە کوێ لەبەر دەکرێت؟!

پاش ئەوە بردمی بۆ ماڵێك چونکە ماڵی خۆی لەشارێکی تر بوو لەوێ خۆم شۆرد و کەمێك پشووم دا خەویشم زۆر دەهات ئیتر ئەو برایە وتی: لێرە بۆ خۆت دەتوانیت ئیسراحەت بکەیت و لەسەر ئیزنت من دەچم بۆ نوێژی هەینی بەڵام چونکە زۆر دەمێك بوو نوێژی هەینیم نەکردبوو وتم: وەڵا برام دێم لەگەڵتا ڕۆشتین بۆ مزگەوتێکی عەرەب تازە نوژەن دەکرایەوە مزگەوتەکە پاش نوێژکردن هەندێ مسوڵمانی کوردمان بینی و لەناویاندا چەند کەسێکم ناسیەوە کە لە وڵاتی(یۆنان) یەکمان بینیبوو

لە مزگەوتدا پاش هەواڵپرسین و بەخێرهاتن یەکێکیان لەدەمی دەرچوو وتی: کاکە خۆت تەسلیم کردووە؟ منیش وتم: ناوەڵا برام ئەوە چەند کاتژمێرێکە گەشتووم! باوەڕتان بێت لەگەڵ وام وت: تەنها یەك دوو نەفەر و ئەو برایە لام مانەوە و هەموویان لایان چۆڵ کردم و ڕۆشتن دەتوت بۆمبی ئەتۆمم پێیە و خێرا وتیان: بەخوا کاکە ماڵئاوا تۆ زۆر خەتەریت بۆمان پرسیم ئەرێ ئەو خەڵکە بۆ وا بە بەپەلە لایان چۆڵ کردم؟ لەویا ئەو برایە وتی: وەڵا کاکە گیان ناهەقیان نیە ئێستا تۆ لەگەڵ یەکێکی دانیشتووی ئێرەدا بگیرێیت تۆ دەبەن بۆ کەمپ و ڕزگارت دەبێت بەڵام ئەو نەفەرە داماوە بەتۆمەتی قاچاخچێتی حەوت ساڵ حوکم دەدرێت،ئەو کەسانەی کەدانیشتووی






وڵاتی(ئەڵمانیا)شـن دەزانـن کەوا چـۆن پـۆلیس داوای پێنـاس دەکـات لە خەڵکی بە بەردەوامی منیش وتم: جا ڕەحمەتی خوات لێبێت بۆ لەسەرەتادا وات نەوت! باشە خوا نەخواسـت گەر پـۆلیس بیگرتینـایە خـۆ مـن تـا ڕۆژی قیـامەت دەبـوایە سـەرم بەرز نەکردایەتەوە لە ئاست بەڕێزتاندا!

ئیتر باوەشی پێدا کـردم و دڵی دامەوە و وتی: هەرچی خـوا نەیکات نابێت یەکێك لەو برایانەی کەلامان مایەوە وتی: براکەم بۆ نایێریت بۆ(بەریتانیا) وەڵا ئێرە باش نیە بۆی یەکێکی تریشیان وتی: گەر بە نیازە لێرە خۆی تەسلیم بکات با هەر ئێستا بیبەین بۆ کەمپی میوشن وەرەقەیەکی بۆ دەکەن و پاش ئەوە شوێنی دەدەنێ و دواتر دەیبەینەوە بۆ ماڵەوە ئیتر ئەو برایە سەیرێکی کردم و وتی: براکەم لێرە خۆت تەسلیم دەکەیت ؟ یان دەڕۆیت بۆ (بەریتانیا)؟ بەڕاستی منیش تا خۆم تەسلیم نەکرد لە(ئەڵمانیا)ی کاول بـوو هـیچ یاسـا و ڕێسـایەکی ئەو وڵاتەم نەدەزانـی ئەوکـاتە سـاردیش بـوو وە زۆر نارەحەتیشم بینی بوو ئەو ماوەیەی ڕابردوو، خێرا وتم: وەڵا برام ناچم بۆ هیچ شوێنێکی تر و لێرە خۆم تەسلیم دەکەم، وتیان: باشە تۆ لەدوامانەوە بڕۆ تا دەتبەینە بەردەم کەمپەکە و لەهەر شوێنێك دەستمان بەرز کردەوە پاش ئێمە خۆت بکە بەو بینایەدا و هەر بڵێ: ئیراك ئیراك ئیتر دەرگات بۆ دەکەنەوە و دەتبەنە ژوورەوە و وێنەت دەگرن و ناوت دەنووسن و وەرەقەیەکت پێ دەدەن و پاشان دەتبەنە ژوور و هەندێك شتومەك و کەلوپەلـت پـێ دەدەن پـاش یەك دوو کـاتژمێر وەرە دەرەوە چاوەڕوانـت دەکەیـن بەو شـێوەیە خـۆم تەسـلیم کـرد بەڵام بەڕاسـتی گەورەتـرین هەڵە کە لەژیـانم دا بەسـەرم تێـپەڕی ئەو خۆتەسـلیمکردنە بـوو بەبـێ پرسـیارکردن لە حـاڵ و گـوزەران و ژیـانی نێو(ئەڵمانیا) کە بەدڵنیایی ویستی خوای لەسەر بوو، چونکە پاش ئەوەی خۆم تەسلیم کرد زانیم ژیانی کەمپ چەند نارەحەت و بە ئازارە و موچەیەکی کەمت دەداتێ و لە سی کیلـۆمەتریش زیـاتر تـا جـواب وەردەگریـت بـۆت نـیە بەهـیچ لایەکـدا بڕۆیـت وە







سەردانی کردنیش بۆ شارێکی تر مانگی جارێکە و دەبێت لەوپارە کەمەشت کە مانگی چل یۆرۆ بوو بەشی یەك سەر کرێی شەمەندەفەر و پاسی نەدەکرد گەر بۆ لای کەسێك بڕۆشتیتایە دەبوایە کەسوکارێکت هەبێت کە هاوکاریت بکات ئەگینا دەبوایە بە ڕەش سواری شەمەندەفەر و پاس بوویتایە لەناو شاریش و دەرەوەی شاریشدا کە ئەمە خەڵکی خاوەن ئیقامەشی گرتبۆیەوە!، لەگەڵ ئەوە بۆ پشوویەکیش یان سەردانی کردنی شارێکی تر دەبوایە بەپارە پشووت بکڕیایە و تەنها مانگی جارێکیش بۆت هەبوو!،وە ناونیشان و ژمارە تەلەفونی ئەو کەسەشت بدایە بەسۆشیال کەدەچیتە لای ئەگەر وات نەکردایە و پێتبزانرایە لە سۆشیال توشی لێپێچینەوەی یاسایی دەبوویت یان ئە گەر پۆلیس بیگرتیتایە لە دەرەوەی سی کیلۆمەترەکەی خۆت شەست یۆرۆ غەرامە دەکرایت و پاشان هەیانبوو خۆی دەیبردیتەوە بۆ کەمپەکەت گەر پارەشت نەبوایە بۆ غەرامەکە ئەوە ئیشی کەناسی و شارەوانیان بۆ دادەنایت بە ئەندازەی ئەو سزایەی بۆت دیاری کراوە!

بەهەرحاڵ هەرچەندێك باسی یاسا توندەکانی وڵاتی(ئەڵمانیا) و ڕەگەز پەرستیان بکرێت بەرامبەر خەڵکی بێگانە و پەنابەران ئەوە ناتوانین بە دەیان ڕاپۆرتیش دەست بخەینە سەر سەرجەم ڕووداو و ناڕەحەتییەکان.

ئەگەرچی ئەو وڵاتە هەرێمایەتییە و خراپترین هەرێمی هەرێمی(بایەرە) بۆ پەنابەران و تەنها باشترین هەرێمە بۆ ئیش و کار وە باشترین هەرێمیشیان بۆ پەنابەر بەشی سەرووی ئەو وڵاتەیە کەشاری(کیل) و دەوروبەرەکەیەتی و سنوری بەوڵاتی(دانی مارك)ەوە هەیە بەڵام وەك باسی دەکەن ئیش و کاری کەمە!

بەم شێوەیە سوپاس بۆ خوا کۆتایی بە سەفەری نێوان وڵاتی(ئیتاڵیا) و (ئەڵمانیا)ش هات و لەمەوپاش دەچینە سەر کۆمەڵێك ڕووداوی تر ئەویش





بریتیە لە : زنجیرەکانی ناڕەحەتی و ژیان لە وڵاتی (ئەڵمانیا) و ستەمکردنی ئەو وڵاتە لێم کە لەجیاتی کەسێکی تر بەهەڵە منیان سنورداشی وڵاتی(نەمسا)کردەوە پشتیوان بەخوا لەپەڕەی داهاتوودا بەدرێژی باسی ئەو ڕووداوە و ڕووداوەکانی دواتریشی دەکەم.

## ناڕەحەتی و سەختی ژیان لە وڵاتی (ئەڵمانیا) و زوڵمکردنی ئەو وڵاتە لێم بەوەی لەجیاتی کەسێکی تر سنورداشی وڵاتی(نەمسا)یان کردم!

پاش ئەوەی خۆم تەسلیم کرد لە وڵاتی(ئەڵمانیا) لە کۆتایی مانگی یەکی ساڵی(٢٠٠٣) ی زانینی وە کەمێك شارەزا بوون لە چۆنیەتی ژیانی پەنابەران لەو وڵاتەدا زانیم ژیانی کەمپ چەند ناڕەحەت و سەختە چونکە موچەیەکی کەمت دەداتێ و لە سێ کیلۆمەتریش زیاتر تا جواب وەردەگریت بۆت نیە بەهیچ لایەکدا بڕۆیت و سەردانی کردنیش بۆ شارێکی تر مانگی جارێکە و دەبێت لەوپارە کەمەشت کە مانگی چل یۆرۆ بوو کە بەتەنها بەشی ئەمسەر و ئەوسەری کرێی شەمەندەفەر و پاسی نەدەکرد گەر بە نیازی سەردان بڕۆیشتیتایە بۆ شارێکی تر دەبێت کەسوکارێکت هەبێت کە هاوکاریت بکات ئەگینا دەبوایە بە ڕەش سواری شەمەندەفەر و پاس بوویتایە لەناو شاریش و دەرەوەی شاریشدا!، واتە بێ پارە و بلیت وە ئەگەر بگیرایتایە غەرامە دەکرایت، ئەم حاڵەتە خەڵکی خاوەن ئیقامەشی گرتبۆیەوە!

لەگەڵ ئەوەشدا گەر بۆ پشوویەك یان سەردانی کردنی شارێکی تر بڕۆشتیتایە دەبوایە بەپارە پشووت بکڕیایە و تەنها مانگی جارێکیش بۆت هەبوو سەردانی بکەیت! وە لە بەرامبەردا دەبوایە ناونیشان و ژمارە تەلەفونی ئەوکەسەشت بدایە بەسۆشیال کەدەچیتە لای ئەگەر وات نەکردایە و پێت بزانرایە لە سۆشیال توشی لێپێچینەوەی یاسایی دەبوویت یان گەر پۆلیس بیگرتیتایە لە دەرەوەی سی کیلۆمەترەکەی خۆت شەست یۆرۆ غەرامە دەکرایت پاشان هەیانبوو خۆی دەیبردیتەوە بۆ کەمپەکەت هەشیانبوو هەر لەویادا بلیتێکی بۆ دەبڕیت بە پارەی خۆت و دەیناردیتەوە بۆ ئەو




شـوێنەی کەمپەکەتی لێیە گەر پارەشـت نەبوایە بۆ دانی پارەی غەرامەکە ئەوا ئیشی کەناسـی و شـارەوانیان بـۆ دادەنایـت بە ئەنـدازەی ئەو سـزایەی بـۆت دیـاری کـراوە کەوابـوو ژیـانی پەنـابەری لە ئەڵمانیـا ئەوکـاتە تـا ئەوکـاتەی ئیقـامە وەردەگریـت واتە: بەندی لە زیندانێکی سی کیلۆ مەتریدا!

هەوڵدان بۆ کارکردن بەشێوەی فەرمیش ئەستمە بۆ کەسێك کە سـەرەتایی بێت لەو وڵاتەدا چـونکە پاش سـاڵێك مانەوە ئەوجا دەتتـوانی داوای کارتی ئیش بکەیـت ئەگەر چی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەهـۆی خراپی بـاری ئـابوری ڕۆژئـاوا لە ئێسـتادا خـاوەن مـۆڵەت و ڕەگەزنامەکانیش ئیش و کار بۆیان سـەخت بووە و بە ئاسـانی ئیشـێکی باشـیان دەسـت ناکەوێـت! لەپـاش ئەوەش ئەگەر زمانـت نەزانیبـایە دەبـوایە یـان ئیشـی پـاك کـردنەوە بکەیت یان لەبەردەستی کەسێکی هـاوڵاتی پەنابەر و دەرەوەی وەك تـورك یـان کـورد بە پـارەیەکی کەم و دونیـایەك منەتکـردن بەسـەرتا ئیشـت بکـردایە بەڕاسـتی هەرچۆنێـك بـاس لە سـەختی و ناڕەحەتیەکـانی وڵاتی(ئەڵمانیـا) بکەیـت کۆتـایی پـێ نـایەت تەنهـا ئەوەندەم دەبیست کە تا دراوی (مارك)ی هەبووە باری ئابوری زۆر بەرز بووە وە ئیش و کاری زۆری تێـدا بـووە!، بەڵام کاتێـك بـووە بە(یـۆرۆ) ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بـاری ئـابوری ئەو وڵاتە و باقی وڵاتانی ڕۆژئاواش بەرەو داڕووخان دەچێت!

پاش ئەوەی خـۆم تەسـلیم کـرد لە کەمپی کاتی شاری(میوشـن) بـۆ مـاوەی هەفـتەیەك لەو شـارە هێشـتمیانەوە بەڵام کەمپێکی زۆر قەرەبـاڵغ و پـیس و پۆخـڵ بـوو بەسـەدان پەنـابەری وڵاتـانی تێـدا بـوو منـیش بەهـۆی ناسـراوەکەمەوە شـەوانە لەوێ نەدەخەوتم ویستی خوا وابوو لە ڕۆژی سێیەمم دا توشی نەخۆشیەکی توندی لەرزوتا بووم کە پلەی گەرمی لەشـم گەشـتبۆیە چـل و نیـو ناسـراوەکەمان هێنـامیەوە بـۆ کەمـپەکە و وتـی: لەوێـوە دەبێـت داوای پزیشـك و نەخۆشـخانە بکەیـت بەڵام بەداخەوە چەنـدێك داوام دەکـرد لە بەرپرسـانی کەمپەکە کە حـاڵم بـاش نیە و پێویسـتە بمبەن بـۆ نەخۆشـخانە






هیچ وەڵامێکیان نەدەدامەوە و دەیانوت دکتۆر تەنها بەیانیان دادەنیشێت و ئێستاش کاتی دوام تەواوبووە منیش چونکە زمانم نەدەزانی توانای تێگەشتنیانم نەبوو کەوا بۆیان ڕوونبکەمەوە حاڵم زۆر خراپە هەستام چوومە دەرەوەی کەمپەکە و لە کابینەیەکی سەر شەقامەوە پەیوەندیم کرد بە ناسراوەکەمەوە و وتم:
وەڵامم نادەنەوە و ناشمبەن بۆ نەخۆشخانە و دەڵێن: دەبێت تا بەیانی چاوەڕێ بکەیت ئەویش وتی: مادەم بەدەمتەوە نایەن چەند وشەیەکی فێر کردم و وتی: ئەوە ژمارەی پۆلیسە پەیوەندی بەوانەوە بکە زوو دەگەنە لات و دەتبەن بۆ نەخۆشخانە بەڵام کاتێك ئەو ژمارەیەم لێدا بە هەموو بیری خۆم دەموت ئێستا وەك فلیمەکان لەماوەی چەند دەقەیەك دەگەنە سەرم چونکە مێشکمان بەو جۆرە درۆیانە پڕکرابوو لەڕێی فلیمەکانیانەوە کە بەداخەوە زۆرێك لە گەنجانمانی فریوداوە تائێستاش وادەزانین ڕۆژئاوا زۆر بەخەم پەنابەر و مرۆڤەوەن و هەرچیت پێویست بوو خێرا ئامادەیە!، بەهەرحاڵ کاتێك پەیوەندیم کرد وەڵامیان دامەوە بەڵام هەرچەند داوای یارمەتیم کرد نزیکەی نیو کاتژمێر لەو کابینەدا وەستام نەك سەیارەی پۆلیس بەڵکو پاسکیلیش دیار نەبوو!
بەفر باریبوو زۆر ساردبوو تەواو خەریك بوو پەکمدەکەوت و کاتیش بەرەو ئێوارە دەڕۆشت ویستی خوا وابوو لەوکاتەی منیش دا کوردێکی هاوزمانی تێدا نەبوو کەمپەکە تا بتوانم لەڕێگەیەوە داوای یارمەتی بکەم بە ناچاری پەیوەندیم کردەوە بەو ناسراوەمە و حاڵەتەکەم بۆ باسکرد کە تەواو پەرێشانم و ئەوانیش نایەن بەدەم داواکاریەکەمەوە ئیتر خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە لەگەڵ هاوڕێیەکیدا پاش کەمێك گەشتنە لام و چووینەوە ناو کەمپەکە و زۆری هەوڵدا لەگەل پاسەوانی دەرگاکەدا کە سەیارەی فریاکەوتنم بۆ بانگ بکات بێسوود بوو بەڕاستی ئا لەویادا زانیم کە خەڵکی نازی و دەمارگیر واتای چی دەگەیەنێت لە وڵاتی(ئەڵمانیا)ئەگەرچی






لەنـاو هەمـوو گەل و نەتەوەیەکـدا چـاك و خـراپ هەیە بەڵام بەداخەوە لەوڵاتـانی ڕۆژئاوا بەگشتی ڕەگەزپەرستەکان کاربەدەستن و کاروباری خەڵکی بەڕێوەدەبەن زیاتر بە ناچـاری هەردووکیـان هـاتن لەگەڵـم دا و بردیـانم بـۆ نەخۆشخانەیەکی ئێشـکگر لەگەڵ بردیـانمە ژوورەوە پزیشـکێك هـاتە سـەرم و دەسـتێکی دا لە نـاو چـاوانم و پشکنینێکی خێرای پلەی گەرمی لاشەی بۆ کردم ، لەشوێنی خۆی سەرێکی ڕاوەشاند و وتی: خێرا بیخەوێنن و ئاوی بـۆ هەڵواسـن پـلەی گەرمی لەشی زۆر بەرزە هەرباشـە تـا ئیسـتا لەهـۆش خـۆی نەچـوە!، ئیتر سـەیرێکی ئەو دوو بـرایەی کـرد و وتی:بـۆ تائێسـتا نەتانهێنـاوە ؟، ئەوانـیش حـاڵ و مەسـەلەیان بـۆ گێـڕایەوە و وتـی: ئەو پاسـەوان و کاربەدەستانەی ئێستا ئێشکگرن دەبێت لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکرێت ئیتر نازانم کە ئایـا دواتـر بەدواداچـوونی کـردووە یـان نـا ئەو شـەوە لە نەخۆشخانە هێشـتمیانەوە و سـوپاس بـۆ خـوای گەورە تـا بەیـانی لەژێـر چـاودێری و چارەسـەرکردندا بـووم وردە وردە حـاڵم بەرەو بـاش بـوون چـوویەوە بەپێی ڕاپـۆرتی پزیشـکیش بەهـۆی مـانەوەی سـەرما لە لەشم دا لە ماوەی ڕابردوودا و سەفەری ڕێگەوە لەویا نەخۆشیەکەم لێ دیار کەوتبوو!، پـاش گەڕانەوەم بـۆ کەمـپەکە لە بەرواری(٢٠٠٣/٢/٦)دا ، لەگەڵ دوو نەفەری تـری کوردی هـاوڵاتی عێراق کە یەکیـان خەڵکی شـاری(دهۆك) بـوو ئەوی تریشـیان(کەرکوك) پـێکەوە پەنـجە مۆرمـان پێکـرا لە کەمـپەکەدا پـاش پەنـجە مـۆریش نەفەرەکـان نقـڵ دەکـران بـۆ کەمپێکـی تـری کـاتی بە هـۆی زۆری پەنـابەر لە کەمپی(میوشـن) دا بەهـۆی ڕوودانـی هەڵەیەك لەو پەنـجە مـۆرەوە ویسـتی خـوا وا بـوو تـاقی کـردنەوە سـەختەکانی سـەر شـانم دەسـت پێ بکات لە درێژەی باسـەکەدا هۆکار و ڕووداوەکان ڕووندەکەمەوە إن شاء الله.

ئیتر هەر ئەو ڕۆژە پۆستم بۆ هات کە دەبێت بەیانی کاتژمێر (٩) خۆمان ئامادە بکەین بـۆ نقـڵ کـردن بـۆ شـارێکی تـر کە نزیکـی سـنوری وڵاتـی (فەرەنسـا) بـوو بەنـاوی






شـاری(کارلثرۆ) جـا ئەوکەسـەی حەزی بەو شـوێنە نەبـوایە کە نـاوی بـۆ هـاتۆتەوە ئەو شـەوە خـۆی دەشـاردەوە و نەدەهـاتەوە کەمـپ تـاوەکو بەیـانی پاسـی نقـڵ کـردنەکە دەڕۆشـت و دواتـر بـۆ شـوێنێکی تریان دەبرد بەڵام گەر ئەم کارەت دووبارە بکردایەتەوە یان بەزۆر دەیاننارديت یان دەبوایە بەپارەی خۆت بڕۆشتیتایە بۆ ئەو جێگایەی خۆت لێ شـاردۆتەوە و ئیتر نەیانـدەکردیتە ژوورەوە بـۆ کەمپەکە و جێگەت هەڵـدەگیرا پـاش ئەوەی گەشتینە کەمپی کاتی شـاری(کارلثرۆ) وەرەقەیەکیـان دایە دەستم کەوا پـاش سێ ڕۆژ نقـــڵ دەکـــرێم بـــۆ کەمپـــی شـــاری(ڕۆیتلینگین) هەر ئەو ڕۆژە ناســـراوێکم لەشاری(شتوت گارت)ەوە هات بەدوامدا و بردیانم بۆ ماڵی خۆیان و پاش سێ ڕۆژەکە گەڕامەوە بـۆ کەمپەکە و بەرەو شـاری (ڕۆیتلینگین) بەڕێکەوتین ئەو کەمپە کەمپێکی کاتی بوو بەڵام هەر لەوێدا چاوپێکەوتنت لەگەڵدا دەکرا لەلایەن بەڕێوبەرایەتی کۆچ و کۆچبەرانی(ئەڵمانیا)وە.

کەمپەکە لەقەراغ شـاردا دروسـتکرابوو، دوو بینـای گەورە و درێـژی چەنـد قـات بـوو ، یەکیـان بـۆ نەفەری ڕەبەن بـوو یەکێکیشـیان خێزانی بـوو ڕەبەنەکان هەشـت نەفەر لە ژوورێکـدا بـوون و تەوالێـت و حەمامییـان تـێکەڵ بـوو خێزانەکانیش تەنهـا ژوورێکیـان پێـدرا بـوو بەڵام چێشـتخانە و جێگـای خۆشـۆردن و دەسـت بە ئـاو گەیاندنیشـیان جیابوو لەئێمە پاش دابەزینمان سەرەمان گرت بەڕیز و بردینیانە ژێر زەمینی کەمپەکە و بەتـانی و خـاولی و فلـچەو مەعجـونی دان و سـابون و شـامپۆو هەنـدێك قـاپ و قاچاخیـان پێـداین و پاشـان هەر لەویـادا خـواردنی وشـکەیان پێـداین و وتیـان هەفتـانە دوو ڕۆژ دێـن خـواردن لێرە وەردەگـرن وەك بـایەعی لای خۆمـان وابـوو مانگانەش تەنهـا چـل یۆرۆیـان دەدایـنێ جـا ئیتر خـاك بەسـەر جـگەرە کێشـی دامـاو دەبـوایە یـان دزی بکـردایە یـان کیسـەی تـوتنی هەڵگرتـایە پاشـان بردینیـانە ژوورەکەمـان و لەو کەمپەدا ئەوەی لەڕێـگەی وڵاتـانی(ئێران و) و( تورکیـا) و( یۆنـان) لێی دابڕابێتی دەتـدۆزیەوە لە







کەمپەکەدا بەڵام کەسیش نەیدەوێرا باسی وڵاتی(یۆنان) بکات چونکە گەر پێیان بزانیتایە لە وڵاتێکی ڕۆژئاوایی ترەوە هاتوویت ئەوە سنورداشیان دەکردیتەوە بۆ ئەو وڵاتە.
هەر بۆ خۆشی ئەمە باس دەکەم ئەوەی هاتبێتە وڵاتانی ڕۆژئاوا دەزانێت کەوا ڕێگەی ئاو تا وڵاتی(ئیتاڵیا)یە و لەوێوە دەبێت بەڕێی وشکانی خۆت بگەیەنیتە زۆربەی ولاتەکانی تر بەتایبەتی(ئەڵمانیا)ش ئیتر هەریەکەمان باسی خۆی و ڕێگەمان دەکرد کەچۆن گەشتووین هاتە سەر برادەرێك وتی کاکە من کاتێك لە وڵاتی(تورکیا)وە سواری کەشتی بووم لە(ئەڵمانیا) دابەزیم وەڵا ئیتر دامان لە قاقای پێکەنین و وتمان کوڕی باش خۆ ئێمە پۆلیسی (ئەڵمانیا) نین تا درۆمان لەگەڵ بکەیت و وابزانیت سنورداشت دەکەمەوە ئیتر لەویا برادەرێکی تر وتی: بابە وەڵا من بەچاوی خۆم لای چێشتخانەی عبداللە بینیومە لە(ئەسینا)ی پایتەختی(یۆنان) کەچی ئەو داماوە سوێندی دەخوارد کە نازانێت (یۆنان) لە کوێیە!، بەڵام لە سەرێکیشەوە دواتر بۆم ڕوونبۆیەوە کەوا ئەو باشی دەکرد کە نهێنیەکانی خۆی ئاشکرا نەدەکرد چونکە دەیان خۆ فرۆشی تێدا بوو بە ئەقڵی ساویلکەی وای دەزانی بۆ کەیسی باشە و جوابی پێ وەردەگرێت دەچوو پاشقولی لە هاوڕێکەی خۆی دەدا و هەواڵی لەسەر هاوڕێکانی دەدا چەند جار بیستومە لەلایەن کارمەند و سۆشیال تا پۆلیسیش کە ئەم جاسوسی یە لەناو کورد و خەڵکی عێراقدا زۆرە و بەڵام دواتر کاتێك بۆیان ڕووندەبۆیەوە کەسی جاسوس خۆی تاوانکارە نەك هەواڵ لێدراو کەسوپاس بۆ خوا ئێستا وای لێهاتووە تا بەڵگەیەکی بەهێزیان پێ نەبێت متمانەیان پێ ناکرێت ئەوجۆرە کەسانە تەنانەت لای ئەوانیش ڕێزیان نەماوە.
پاش پانزە ڕۆژ لەو کەمپەدا چاوپێکەوتنم بۆ هاتەوە و ماوەی کاتژمێر و نیوێك گفتوگۆم لەگەڵدا کرا و بە وتەی وەرگێڕەکە دادوەرەکە وتی: هەواڵەکانی ئەم گەنجە





تازەبوون و دووبارە نەبوون ئیتر نازانم دڵی خۆش کردم یان بۆ پێکەنین وای وت!، پاش تەواوکردنی چاوپێکەوتنەکەم وێنەیان گرتم و کارتێکی سەوزی شەش مانگیان دایە دەستم بە ناوی(ئۆزبایز) کە ئەم کارتە بۆ کاتی بوو وە هاتوچۆکردن لە سنوری وڵاتی(ئەڵمانیا) و ئەو ناوچەیەی بۆت دیاری کراوە و ئیتر گەر ئیقامەت وەرگرتایە ئەوە ئەوەت لێ وەردەگیرایە و گەر وەریشتنەگرتایە شەش مانگ جارێك بۆت تازە دەکرایەوە لەناو کەمپەکەدا ژوورێکی تێدا بوو بۆ نوێژکردن و نوێژەکانی ڕۆژانەمان لەوێدا دەکرد و نوێژی هەینیشمان لە مزگەوتێك دەکرد لەناو شارەکەدا سوپاس بۆ خوا چەند نوێژخوێنێکی تێدا بوو لەناو کوردەکاندا و باقی زمانەکانی تر، یاریگایەکی بچوکی باسکەشی تێدا بوو ئێمە زیاتر یاری دووگۆڵیمان تێدا دەکرد شوێنەکەش چونکە کەمپی کاتی بوو پاش مانگ و نیوێك کە چاوپێکەوتنت تەواو دەبوو نقڵ دەکرایت بۆ کەمپی هەمیشەیی تا کاتی جواب وەرگرتنت بەو شێوەیە هەفتانە نەفەری نوێ دەهات و بەشێك لە هاوڕێکانیشت سەفەریان دەکرد و نقڵ دەکران ئیتر لەخوامان دەویست کەسانی باش بێن و خراپەکان بڕۆن بەڕاستی ژیان بەسەربردن لەگەڵ کەسانی خراپدا وەك ژیان بەسەربردنە لەناو دارستان ئێمەش هەشت نەفەر لە ژوورێکدا بووین کەمێك ئەستەم بوو هەمووی باش دەرچن بەڵام سوپاس بۆ خوا نەمدەهێشت لە ژوورەکەی مندا مەشروب بخورێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لە هاوڕێکانم دەیانزانی من نوێژ دەکەم ڕێزیان لێ دەگرتم و دەچوونە ژوورەکانی تر دەیانخواردەوە!

چەند خزم و ناسراوێکم هەبوو لەشارەکانی تردا ماڵیان ئاوا بێت نەیاندەهێشت زۆر لە کەمپدا بمێنمەوە و دەیانبردمە لای خۆیان بەڵام دەبوایە بە نهێنی بڕۆشتمایە بەبێ ئاگادارکردنەوەی بەرپرسانی کەمپ و سۆشیالەکەم و دەبوایە مانگی جارێك بێمەوە بۆ وەرگرتنی پارە چونکە گەر ئەوکاتە ئامادە نەبوویتایە توشی کێشە دەبوویت بەهۆی هاتنی زۆری پەنابەرەوە لەو ساڵەدا زۆربەی نەفەرەکان نقڵ دەکران بۆ شوێنە دوور و






ناخۆشەکان کە بەتەواوی لەئاوەدانیان دادەبڕێت و زۆربەی پەنابەران بەو هۆیەوە توشی نەخۆشی بێ هیوایی و دەرونی دەبوون تیایدا بۆیە ناسراوێکم هاتە لای سۆشیالی کەمپەکەمان کە ناوی(ئەلیکساندرا) بوو،

داوای لێکرد نقلم بکات بۆ نزیکی شاری(هایل برۆن) ئەویش وتی: باشە بەڵام پێی دەچێت و دەبێت بۆ ماوەیەکی زۆر لێرە بمێنێتەوە تا شوێنێکی چۆڵ لەو ناوە پەیدا دەبێت بەو شێوەیە مانگی یەکەم و دووەمم بەسەر برد لە ماڵی ناسراوەکەماندا و تەنها سەری مانگان دەهاتمەوە تاوەکو ویستی خوای گەورە وابوو کەوا توشی نەخۆشی حەساسیەت و خورانێکی زۆر سەخت بووم بەهۆی خراپی ڕێگا و گۆڕینی کەشوهەواوە کە زۆربەی پەنابەران دووچاری ئەم حەساسیەتە خراپە دەبن لە کەمپەکەش پێیان زانیم کەوا لە دەرەوەی کەمپ دەخەوم!

پاش ئەوەی چوومە ماڵی ناسراوێکی نزیکم و لە کەمپ دوور کەوتمەوە هەستم کرد خورووەیەك لە لاشەم دا دەستی پێکرد سەرەتا تەنها دەست و قاچم بوو بەڵام وردە وردە ئەندامەکانی تری لاشەشم دەیگرتەوە و منیش لەڕووم نەدەهات باسی بکەم چونکە لە نێو کوردەواریدا کەسێك حەساسیەتی بۆ دروست بێت لە جیاتی بەدەمەوە چوون و هاوکاری کردنی زۆرێك لە خەڵکی خۆی لێ بەدوور دەگرێت و بەشێوەیەکی ناشرین سەیری ئەو کەسە دەکرێت تا ئەوەی بەشێوەیەك خوران زیادی کرد وەك زیبکە لەسەر لاشەم دەرکەوت و سەرجەم لاشەمی گرتەوە، بەڕادەیەك نارەحەتی کردبووم خەو و خۆراکی لێ تاڵ کردبووم وە بە نهێنی دەچوومە ژوورێکی ترەوە و بە کارتی وەحدەی مۆبایل خۆم دەخوراند!

هەڵبەتە بۆ ماوەی یەك مانگ و نیو زیاتر بەردەوام بووم لەسەر ئەم حاڵەتە، تا رۆژێکیان ناسراوەکەمان پێی زانیم و کاتێك بەشێك لە لاشەی بینیم زۆرم لێ تووڕە بوو کە بۆ تا ئێستا ئاگادارم نەکردونەتەوە منیش وتم: بەڕاستی بەلامەوە عەیب بووە و





شـەرمم کـردوە، وتـی: کاکە گیـان ئەمە شـەرمی ناوێـت ئێمەش هەمووماـن گرتومـانە و زۆربەی ئەو پەنـابەرانەی دێـنە ڕۆژئـاوا بەهـۆی گـۆڕینی کەشـوهەواوە توشـی ئەم جـۆرە حەساسیەتە دەبن!

کاتێـك ئەوەی پێ وتـم کەمێـك هێـور بـومەوە چـونکە لە ژیـانم دا توشـی هـیچ خـوران و حەسـاسـیەتێك نەبـووم بەڕاسـتی لەغەیـری وڵاتـی (ئەڵمانیـا) و کـاتێکیش چـووم بـۆ وڵاتی(بەریتانیـا) دووبـارە توشـم هـاتەوە و ئیتر لاشـەم خۆشـە بـوو لەگەڵ کەشـوهەوای ڕۆژئاوادا و سوپاس بۆ خوا لەپاش ئەو دوو جارە توشم نەبۆتەوە!

بـۆ سـەر لەبەیـانی سـەردانێکی نەخۆشـخانەمان کـرد لەنـاوچەی ناسـراوەکەمان بەڵام وتیـان: دەبێـت بـڕواتەوە بـۆ کەمپەکەی و لێرە چارەسـەرەی بـۆ ناکرێـت ئیتر خۆمـان چـووین بـۆ دەرمانخـانەیەك هەنـدێك کـرێم و دەرمانمـان کـڕی بەڵام بەهـۆی ئەوەی زۆر لاشـەم خوراندبوو پێسـتم ناسـك ببـۆیەوە و لەگەڵ بەکار هێنـانی دەرمانەکان بـۆ ماوەی دوو هەفتە کاتێکم زانی هێندەی تر نارەحەتی کـردم و بەتەواوی لاشـەمی سـوور کـردەوە و سـوتاند چـونکە دەبـوایە دەرمـانێکی پێسـت ناسککردنەوەشـم بەکـار بهێنـایە بەڵام قەدەری خـوا بە هەڵە بەکـارم هێنـا بـۆیە بڕیـارم دا بـڕۆمەوە بـۆ کەمـپەکەم و لەوێ بخرێمە ژێر چاودێری پزیشکەوە!

پاش دوو مانگ گەڕامەوە بۆ کەمپەکەم و هێشتا بڕیاری نقڵ کـردنم بۆ دەرنەچووبوو کاتێك گەشتمە بەردەمی کەمپەکەم تەلەفونی سۆشیالم بۆ هات کە بۆچی لە کەمپدا ناخەوم!، منیش بە پێکەنینەوە وتم: ئەوە نیە لەبەردەمی کەمپەکەدام ئیتر سوپاس بۆ خـوا هەسـتیان نەکـرد کە لە کەمپـدا نەخەوتبێـتم و بەو شـێوەیە ڕزگـارم بـوو لە لێپێچینـەوە!، کاتێـك چـوومە لای سۆشـیال داوای پزیشـکم کـرد ناردیـانمە لای پزیشـکی ئێشـکگر لەگەڵ بەشـێکی لاشـەمی بینی بەو شـێوەیە چـاوی زەق بـۆیەوە و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و وتی چەندێکە وایت؟ ، منیش وتم: ماوەی دوومانگ زیاترە بەپەلە تەلەفونی




هەڵگرت و پەیوەندی کرد بە نەخۆشخانەوە پاشان ناونیشانێکی پێ یام و وتی: دەبێت هەر ئێستا فریای نەخۆشخانە بکەویت هەر باشە ئەم نەخۆشیە نەگەشتۆتە سەر ئێسقانت!،پاش ئەوەی چوومە لای پزیشك و حاڵەتەکەی بینیم ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و بەپەلە بۆ ماوەی دوو هەفتە خرامە ژێر چاودێری پزیشکەوە و کۆمەڵێک مەرهەم و دەرمانم بۆ نوسرا و ڕۆژانەش پۆشاك و جلوبەرگەکانم و جێگەی نوستنەکەم لێ وەردەگیراو فڕێیان دەدا و پۆشاك و پێخەفی نوێیان دەدامێ، تا سوپاس بۆ خوای گەورە شیفای بۆ ناردم و لە پاش دوو هەفتەکە بەتەواوی باش بوومەوە ئیتر بڕیارم دا تا کاتی نقڵ کردنم لەکەمپدا بمێنمەوە و نەچم بەهیچ لایەکدا بۆ ئەوەی کاتەکانی نێو کەمپیشم بێتاقەت نەبم چونکە قەرزاریش بووم داوای ئیش کردنم کرد لە ناو کەمپەکەدا بۆ ئەو مەبەستە کوردێکی کرماشانی خەڵکی ڕۆژهەڵات کە ماوەی
بیست و پێنج ساڵ بوو لە وڵاتی (ئەڵمانیا) بوو سەرپەرشتی بەشی چاککردنەوە و چیمەن بڕینی ناو کەمپەکەی دەکرد چووم بۆ لای داوای ئیشم لێکرد وتی باشە بەسەرچاو بەڵام ڕۆژی هەشت کاتژمێرە و کاتژمێری بە یەك یۆرۆیە بۆ پەنابەرێك کە کارتی ئیشی نەبێت و لەسەر سۆشیال بێت هەڵبەتە پارەی ڕۆژێکمان تەنها پارەی کاتژمێرێک ئیشی سپی ئەوکاتە بوو بەلام بە نەچاری دەمانوت: شەڕکردن لە بەتاڵی باشترە!
بەو شێوەیە نزیکەی دوو مانگی تریشم بەسەر برد ، سەرجەم هاوڕێ بەڕێزەکانم نقڵ کران و زۆر بێتاقەت بووم و بەتەنها من مامەوە و ڕۆژانەش خەڵکی نوێ دەهات تا ئەوەی وەك بیتاقەی سوتاو چوار ئێزیدیان کرد بە ژوورەکەم دا کە بەڕاستی ژیان بەسەربردن لەگەڵ کەسانێك کە دووژمنی خوا بپەرستن وەك ژیان بەسەربردنە لەناو دۆزەخدا هەرچەندە من بەهۆی ئەوەی پێشتر هاتبوومە کەمپەکە و لەبەر خواش هەندێك هاوکاری و ڕێنیشاندەریم کردن ڕێزیان لێ دەگرتم و خۆیان دەپاراست لە




دژایەتیم بەڵام هەندێك هاوڕێی کوردم هەبوو نوێژیشیان نەدەکرد و ڕوو لەخواش نەبوون هەموو ڕۆژێك بەشەیتان بە لەعنەت بێت و وتنی أعوذ بالله من الشیطان الرجیم شێتیان دەکردن!

سۆشیالی کەمپیش بەهۆی مانەوەی زۆرم لە کەمپ دا و نەبوونی بچوکترین کێشە لەسەرم و دەشیزانی ئیش دەکەم لە ناو کەمپەکەدا، زۆری ڕێز دەگرتم و بۆ هەموو کێشەیەکی پەنابەرە کوردەکان بانگی دەکردم ڕۆژێکیان بانگی کردم و سکاڵای لە کوردەکان کرد و وتی: بەداخەوە ماوەیەکە لە ناو شوێنی خۆشۆردنەکاندا پیسایی دەکرێت لەو بەشەی کورد و عێراقیەکانی تێدایە منیش توشی سەرسوڕمان هاتم و وتم: ئێمە مسوڵمانین و هەرگیز لەو جێیانەدا پیسی ناکەین بەڵام هۆکار خۆتانن هەرکەس وتی هاوڵاتی عێراقیم یان کوردم دەیکەن بە ژووری عێراقیەکاندا نازانن کەوا عێراق دەیان ئاین و مەزهەب و نەتەوەی تێدایە کە زۆربەی ئەو شەڕانەی ناوکەمپ کە لە نێو خۆی عێراقیەکاندا ڕوو دەدەن پەیوەندی بە ئاین و نەتەوەی جیا جیاوە هەیە وتم ئێستاش بەڕێزتان کۆمەڵێك نەفەرتان هێناوە کە لەسەر ئاینی ئێزیدین و تەوالێت بە شوێنێکی پیرۆز دەزانن و هەندێکیان پیسایی تێدا ناکەن ، بۆیە بێگومان بن لەوکارە کە ئەوانن چونکە بینراون کە لە شوێنی خۆشۆردنەکاندا پیسایيان کردوە و ئامۆژگاریشمان کردون بەڵام بێ سوودە ئیتر داماوە چاوی ئەبڵەق بوو!، وتی: بەڕای تۆ چی بکەین؟ وتم ئەوان هیچ زمان نازانن گەر ڕێنماییشیان بۆ هەڵواسن سودی نیە بەڵکو دەتوانن وێنەیەك دروست بکەن کە شێوەی ئەوە بدات کە تەوالێت شوێنی پاشەڕۆیە نەك شوێنی خۆشۆردن وە دواتر بنوسن بەزمانی عەرەبی کە هەرکەس لە شوێنی خۆشۆردن پاشەڕۆ بکات سزا دەدرێت چونکە ئەوان کوردیش نازانن و باسی سزای پارەش بکرێت لایان باوەڕ ناکەم لە مەودواش هەر پیساییش بکەن و ئیتر ڕێجیم دەکەن!، ئیتر دای لەقاقای پێکەنین و لەسەر پێشنیارەکەی من ئەو کارەیان کرد!






پاش ئەوەی مانەوەم لەو کەمپەدا بوو بە چوار مانگ سوپاس بۆ خوای گەورە نقڵم بۆ هاتەوە بۆ لادێیەك بەناوی(نۆین شتات) کە دوانزە کیلۆمەتر لە شاری(هایل برۆن)ە وە دوور بوو کەمپەکەش نزیکەی پێنج کیلۆ مەتر لە لادێکەوە دوور بوو لەگەڵ پێناخۆشبوونی سۆشیالی کەمپەکەم بە نقڵ بوونم بۆ کۆتا جار ماڵئاوایم لە کەمپی(ڕۆیتلینگن) و یادەوەریە ناخۆش و خۆشیەکانیشی کردا!، بەڵام بەهۆی ناسینی دەیان خەڵکی جیا و فکرە و بیروباوەڕی جیاوە، بوو بە سەرەتایەکی بەهێز بۆدروست بوونم بەتایبەتی سوپاس بۆ خوای گەورە، پاش ئەوەی چوارمانگم تەواوکرد لە کەمپی(ڕۆیتلینگین) نقڵ کرام بۆ کەمپی هەمیشەیی تا کاتی ئیقامە وەرگرتن کە ناوی کەمپی(نۆین شتات) بوو، هەڵبەتە کەمپەکە زۆر ناخۆش و دوور لە ئاوەدانی بوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی لەماڵی ناسراوەکەمەوە نزیك بوو بۆ من باش بوو چونکە لە ناو کەمپەکەدا نەدەمامەوە و هەفتانە دوو ڕۆژ بە پاسکیلێك دەهاتم بۆ وەرگرتنی بەشە خۆراکەکەم و مانگانەش جارێك بۆ وەرگرتنی موچەی مانگانەکەم!

ویستی خوا وابوو جەنگی (عێراق) و هاتنی (ئەمریکا) و ڕووخان و لەناوچوونی سەدام لەبەهاری ساڵی(٢٠٠٣)دا دەستی پێکرد و پاش چەند مانگێك کۆتایی هات کە من شەو و ڕۆژ بەدیار کەناڵی(الجزیرة)ەوە دانیشتبووم و بەوردی سەیری ڕووداو و گۆڕانکاریەکانم دەکرد و بەوهۆیەوە بەبڕیارێکی سەرتاسەری وڵاتی(ئەڵمانیا) وەڵامدانەوە و ئیقامەی هاوڵاتیانی(عێراق)ی بە کوردستانەکەشیەوە ڕاگرت و ئیدی دەبوایە تا کاتێکی نادیار لەچاوەڕوانیدا لەو کەمپە قەراغ شار و ئاوەدانیەدا لەناو چەند کابینەیەکدا ژیان بەسەر بەریت لەناو کەمپەکەدا کوردێکی لێبوو توشی نەخۆشی دەروونی بوو تا ئەندازەی شێت بوون ڕۆژانە خۆی سەرخۆش دەکرد و هەرچی دەست بکەوتایە دەیشکاند لەناو کەمپەکەدا دەیوت یان وەڵامم بدەنەوە یان بمنێرنەوە بەڵام بەداخەوە هیچ وەڵامێکیان نەدەدایەوە لەگەڵ ئەوەی وەڵامدانەوەمان







ڕاگیرابوو بۆشمان نەبوو ئیش بکەین تا ساڵێك تەواو نەکەین منیش بەهۆی قەرزاری و خراپی باری ئابوری کەسوکارمەوە هاتبوومە دەرەوە و بەردەوام بەدوای ئیشدا دەگەڕام بەڵام قەدەری خوا ئیشێکی حەلاڵم بە بەشێوەی ڕەشیش دەست نەدەکەوت تەنها ئیشی بەراز و مەشروب هەبوو کەسوپاس بۆ خوا تائێستاش بەلایدا نەڕۆشتووم گەر لەوپەڕی ناڕەحەتیشدا بووبێتم.

ماوەی یەك هەفتە ئیشێکی پاك کردنەوەی دوو کاتژمێریم دەستکەوت لە مارکێتێکدا ئەویش خاوەنەکەی پارەکەی خواردم بەردەوام خاوەن قەرزێك پەیوەندی پێوە دەکردم و ناڕەحەتی دەکردم منیش نەمدەتوانی درۆی لەگەڵ بکەم و ئەویش داوای کاتی دەکرد تا خوای گەورە کردی پاش چەندین مانگ توانرا قەرزەکەی بۆ بگێڕدرێتەوە، بەوشێوەیە نزیکەی چوارمانگی تریشم لەماڵی ناسراوەکەمان بەسەر برد و جار جارە سەردانی یەك دوو شارم دەکرد بۆ لای دۆست و ناسراوی ترم بەڵام دەبوایە بەڕەش بڕۆم و بێ پرس و مۆڵەتی سۆشیال چونکە هێندە قورسیان کردبۆیەوە تا سەردانێکت بکردایە دەبوایە بچویتایەتە بەشی شارەوانی ناوچەکەت مۆڵەتت بە پارە بکڕیبایە و ناونیشانی ئەو شوێنەشت بدایە کەبۆی دەڕۆیت لەگەڵ کاتی مانەوەت، ئەمەش زۆرجار دەیا وت دەبێت مانگانە لەپاش سەری مانگەوە بێت ئیتر بەهۆی توندی و خراپی یاساکانی(ئەڵمانیا)خۆیان وایان لێدەکردیت کە سەرپێچیان بکەیت و بەپێچەوانەی یاساکانیان بجوڵێیتەوە، ئەگەر چی سوپاس بۆ خوا من تەنها لەڕووی نەمانەوەم لەکەمپ دا و سەردانی کردنی شارەکانم بەبێ مۆڵەت وەرگرتن نەبێت سەرپێچی ترم نەبوو ئەویش جارێکیان چووم مۆڵەت وەرگرم بەڕاستی فەرمانبەرەکە هێندە ڕەگەزپەرست بوو دەتوت بەرپرسی لێکۆڵینەوەی تاوانە و پرسیاری وای دەکرد ئیتر بڕیارم دا جارێکی تر نەچمەوە لای!




هەر ئەو یاسا توندانە بوو دزی کردن و بلیت نەبڕین بۆ شەمەندەفەر و چەندین تاوانی تریش وەك نان خواردن وابوو بۆ زۆربەی پەنابەران بەهۆی کەمی موچە و هاوکاریەوە بەشێوەیەك زۆربەی هاوڵاتیانی وڵاتی(جۆرجیا) کە داوای پەنابەریان کردووە لەو وڵاتە بەناوبانگترین کەس بوون لە دزیکردندا چیت بویستایە بە نیو قیمەت و کەمتر دەستت دەکەوت لایان.

لەبەرامبەریشدا هاوڵاتیانی وڵاتی(چین) بێوەیترین پەنابەربوون لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و تەنهاش خەریکی کار و کەسابەتن زۆرترین پەنابەر هاوڵاتیانی وڵاتی(تورکیا)یە کە زۆربەی مارکێت و ئیش و کارەکانی ئەو وڵاتەیان بەدەستەوەیە.

پاش ماوەیەك هاوڕێیەکم هەبوو لە کەمپەکەدا هەرکات پۆستێکم بۆ بهاتایە پەیوەندیەکی پێوە دەکردم هەواڵێکی ناخۆشی پێگەیاندم و وتی: براگیان تا زووە و نەیانگرتویت وڵاتی(ئەڵمانیا) بەجێبهێڵە منیش بەسەرسوڕمانەوە وامزانی گاڵتە دەکات بەپێکەینەوە وتم: بۆ برا جوابیان داومەتێ؟، وتی: نا کاکە گیان وەڵاهی بەڕاستمەو گاڵتە ناکەم ئەگەر دەزانی پەنجە مۆری وڵاتێکت هەیە ئەوە بڕۆ چونکە ئەم بەیانییە پۆلیس کاتژمێر شەشی بەیانی دای بەسەر کەمپدا و بۆ تۆ دەگەڕان و لەتۆ پرسیاریان دەکرد ئەو جۆرە هاتنانەش بۆ کەسانێکە کە پەنجە مۆری وڵاتێکیان هەبێت منیش وتم: وەڵاهی برام پەنجە مۆری هیچ شوێنێکم نییە لە غەیری وڵاتی(ئەڵمانیا) و تەنهاش لێرە کردوومە وتی: دەباشە گەر وایە ڕۆژی دووشەممە کاتژمێر هەشت بڕۆ بۆ بنکەی پۆلیسی(نۆین شتات) بزانە بۆچی هاتوون بەدواتا و ئیتر دەست خۆشیم لێکرد و ماڵئاوایمان کرد هەرچەندە بیرم دەکردەوە خوایە تۆ بڵێی چیم کردبێت؟ تۆ بڵێێ زانیبێتیان لە ناو کەمپ ناخەوم؟ یان ئاشکرا نەبووبێت لە وڵاتی(ئیتاڵیا) لە کەمپی منالان ڕامکردبێت؟، دەیان بیری وا کە بەس بەلای وڵاتی(نەمسا)دا نەدەڕۆشت بەهەرحاڵ هەواڵم دایە ماڵی ناسراوەکەمان و بۆ سەرلەبەیانی ڕۆژی دووشەممە کە




باران باریبوو کەشوهەوا تەمومژ بوو بە تراکسودێك و پێنج یۆرۆوە بەبێ هەڵگرتنی مۆبایل بەسەیارەی ماڵی ناسراوەکەم بەپێی خۆم چوومە بەردەم پۆلیسی(نۆین شتات) پاش ئەوەی لە زەنگی بەردەرگام دا پۆلیسێك وەڵامی دامەوە و منیش خۆمم پێناساند و دەرگام بۆکرایەوە و چوومە ژوورەوە بەڵام هەر ئەوەندەم خۆش بوو چوومە ژوورەوە خێرا کەلەپچە کرایە دەستم و لەسەر کورسیەك دایاننام!

لەدوای کەلەپچە کردنە دەستم خۆم تورە کرد لە پۆلیسەکان و پێم وتن چیم کردووە و بۆچی وام لێدەکەن؟،هەرچەندە داوای وەرگێڕێکم کرد هیچ وەڵامیان نەدەدامەوە و زۆر بە ڕەوشتێکی ناشرین مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردم تەنانەت ڕێگەشیان نەدام پەیوەندیەکی تەلەفونیش بکەم بە کەسێکەوە تا هەواڵی دەستگیرکردنەکەمیان پێبدەم و منیش مۆبایلم لەماڵی ناسراوەکەمان لەبیرچووبوو وە تەنها بە تراکسودێك و جووتێك نەعلەوە هاتبووم و تەنها پێنج یۆرۆشم لەگەڵ خۆم هەڵگرتبوو بۆ ئەوەی پاش تەواو بوونم لە لای پۆلیسەکە خواردنێکی پێ بکڕم بەهۆی نەخوێندنی کۆرسی زمانی ئەڵمانی کە لامانەوە نزیك نەبوو، تەنها چەند شتێکی سەرەتایی فێر ببووم و زمانم نەدەزانی و لێیان تێنەدەگەشتم کە بۆچی گرتویانم پاش کەمێك ئەو کارتە سەوزەی بۆم کرابوو لێیان وەرگرتم و لە دوای نیو کاتژمێر سواری سەیارەیەکی پۆلیسیان کردم و بردیانم بۆ شارۆچکەی(ڤای بلینگین) لەوێ بردیانمە ناو کۆمپانیایەکی گەورەوە کە هۆڵێکی زۆر گەورەی تێدابوو وەستا و کرێکارم بینی بە پۆشاکی ئیشەوە کاریان تێدا دەکرد.

ئیتر هەزار داڵغە و خەیاڵم بۆ دروست ببوو وامدەزانی لە تۆڵەی ئەو شەوانەی لە کەمپدا نەخەوتووم سزای ئیشکردنیان بۆ بڕیومەتەوە لەو شوێنەدا پاشان بردیانمە ژوورێك و کەلەپچەکەی دەستیان کردمەوە و دوو کەسی مەدەنی هاتن بۆ لام وەرەقەیەکیان خستە بەردەستم یەکێکیان قەڵەوێکی سوورکار بوو تیشێتێکی سوور و




سێ چارەکیەکی خاکی لە پێدابوو داوای کرد کە واژۆی بکەم منیش داوای وەرگێڕم لێ کردن و ڕازی نەبووم بەبێ زانیاری هیچ واژۆ بکەم زۆر هەوڵیدا لەگەڵم بەڵام واژۆم نەکرد دواتر بە پێکەنینێکەوە وەرەقەکەی لەدەستم وەرگرت و خۆی واژۆی کرد لە جیاتی من!

پاشان هێنامیانە دەرەوە و سواری دۆڵمشێکی سووریان کردم کە هیچ ڕەمزێکی پۆلیسی پێوە دیار نەبوو وتیان: سەرکەوە!، منیش کەوتمە ئینکاری کردن و وتم بۆ کوێم دەبەن؟، ئیتر یەکێکیان وتی: (ئویستەغایش)!،

منیش هیچ حاڵی نەبووم و نەمزانی بەزمانی(ئەڵمانیا) بە وڵاتی(نەمسا) دەوترێت(ئویستەغایش)!،دۆڵمش بەڕێکەوت و چووە سەر جادەی ئۆتۆبان، بەهۆی ڕووداوێکەوە جادە قەرەباڵغ بوو،کاتێکم زانی شۆفێرەکە گڵۆپێکی شینی پۆلیسی خستە سەر دۆڵمشەکە و چووە سەر جادەی خەتی پۆلیس کە لە هەموو جادەیەکی گشتی دا لای دەستە ڕاستەوە جادەیەکی تایبەتی هەیە بێ لە پۆلیس و فریاگوزاری کەس بۆی نیە بەسەریدا بڕوات ئا لەویادا هەستم کرد کە ئەمانە پۆلیسن بەڵام بۆ منیان گرتووە؟ ، ئەوەیان تەنها خوای گەورە دەزانێت کە تاوانبار کێیە و کێش لەجیاتیدا گیراوە پاش چەند کاتژمێر ڕێگە کردنم چونکە بەرەو سنوری شاری(میوشن) دەڕۆشتینەوە دەموت یان ئەوەیە دەمبەنەوە بۆ وڵاتی(ئیتاڵیا) یان ئەوەیە دەمبەنەوە بۆ کەمپی سەرەتاییم ئیتر بۆ خۆم خەوتم لەناو دۆڵمشەکەدا کاتێك بەخەبەرهاتم گەشتینە شارۆچکەیەکی بچوك بەناوی(لینداو)، بردیانمە بنکەیەکی پۆلیس دایانبەزاندم و خستمیانە ژوورێکی زیندانەوە تا دوو کاتژمێرێك کاتێکم زانی دەرگا کرایەوە و سێ پۆلیسی پۆشاك شینی کاڵ کە شێوەی پۆشاکەکانیان جیاواز بوو لە پۆلیسی ئەڵمانی کە شێوەیان سەوزە هاتنە بەردەمم و دەرگای دۆڵمشێکی سپی پۆلیسیان کردەوە دیسان شێوەی لەسەیارەی پۆلیسی (ئەڵمانیا) نەدەچوو بەهەرحاڵ سەریانخستم و دووبارە بەڕێکەوتین!







ئەم جارەیان بەتەواوی هەستم کرد کە بۆ وڵاتێکی ترم دەبەن بەڵام وامدەزانی وڵاتی(سویسرا)یە بۆیە کەمێك خۆشحاڵ بووم چونکە نیازم وابوو لەبەر بێ ئیشی و وەڵامنەدانەوە وڵاتی(ئەڵمانیا) بەجێ بهێڵم بۆ (سویسرا) چونکە تەنها ئەوێ مابوو پەنجە مۆر نەخوێنێتەوە لە ئەوروپا ڕێگای ئەم جارەیان چەند کاتژمێرێکی خایاند بەڵام زۆربەی زۆری بەناو تونێلدا بوو باوەڕتان هەبێت تونێلی وای تێدا بوو نزیکەی چارەکێك بۆ نیو کاتژمێری دەخایاند ئەوجا تەواو دەبوو!

ماشاءالله لەو هەموو چیا و شاخە بەرزە کە لەژیانم دا شتی وام نەبینی بوو کەشوهەوای زۆر ساردتر بوو ئەو ناوچەیە بەهۆی تابلۆی سەرجادەکانەوە زانیم کە بەرەو شارێکم دەبەن بەناوی شاری(سالزبۆرگ) کە بە زنجیرە چیایەك دەوری درابوو پاش ئەوەی گەشتینە شارەکە بردیانم بۆ بینایەکی بەرزی سپی لەشارەکەدا و لە هۆمی چوارەم دا دایاننام و پۆلیسەکان ڕۆشتن سەیرم کرد کۆمەڵێك نەفەر دانیشتبوون لە پەنابەر دەچوون پرسیارم لێکردن خەڵکی کوێن؟ وتیان: جۆرجیا، ئیتر بە ئاماژەکردنی دەست پێم وتن چی دەکەن لێرە بەدەست ئاماژەیان بۆ پەنجە مۆر کردن کرد لەو گفتو گۆیەدا بووین هەموومانیان بردە ژوورێکەوە و یەك یەك پەنجە مۆریان پێ دەکردین!

منیش هەرچۆنێك بێت هاتمە دەرەوە لە ژوورەکە چوومە لای فەرمانبەرێکی ئافرەت ، وتم بۆچی من لێرەم؟، ئەوەندەی تێگەیاندم کە پەنجە مۆرمان پێ دەکرێت و دواتر دەمانبەن بۆ کەمپ وەك باسیش دەکرێت ژیانی کەمپ لە وڵاتی(نەمسا) وەك زیندان وایە نەشمدەزانی ئەوێیە بەڵام هەر لەگەڵ هاتمە ناوشار و پیس و پۆخڵی ناو شارەکە و خۆڵ و خاشاکم بینی لەسەر جادە و جیاواز لە(ئەڵمانیا) گومانم بۆ دروست بوو کە(سویسرا)ش نەبێت!، ئیتر لەگەڵ ئەوەم بیست بەپەلە خۆم گەیاندە دەرەوەی ژوورەکە بۆ ئەوەی پەنجە مۆرم پێ نەکرێت تا بزانم کوێیە؟،بەهەمان ڕێگەی هێنامیان بەرەو خوارەوە هەوڵی خۆ ڕزگارکردنم دەدا، بە لەسەرخۆیی هاتمە بەردەمی



بەرزکەرەوەکە و خێرا پەنجەم پێدا نا، سەیری ژوورەوەم دەکرد کە پێم نەزانن ، باش بوو خێرا سەرکەوتم باش بوو تەنها خۆم بووم پەنجەم نا بە دوگمەی قاتی خوارەوەدا لەولاشەوە دڵم لەسەر سەد لێی دەدا و خەریکی دوعا خوێندن بووم چونکە ئەو بینایە بنکەیەکی پۆلیسی بوو هاتوچۆ کردن تیایدا ئاسان نەبوو پاش ئەوەی گەشتمە قاتی خوارەوە هاتمە دەرەوە لەبەرزکەرەوەکەدا، سەیری دەرگای دەرەوەم کرد سەیرم کرد نوقتەی پاسەوانی پۆلیسی تێدایە و تاك و تەرا نەفەریشم دەبینی دەهات و دەڕۆشت!
سەرەتا کەمێك وەستام تابزانم چۆن بچمە دەرەوە سەیرمکرد ئەوانەی دێن و دەڕۆن بەسەر یان بەدەم سەلامێك دەکەن و دێن و دەڕۆن و لێپێچینەوەیان لەگەڵ ناکرێت بۆیە وردە وردە بە دوعا و پاڕانەوە خۆم نزیك کردەوە لەدەرگاکە لەگەڵ گەشتمە نزیك دەرگاکە سەیردەکەم ئەو پۆلیسانەی هاتوون بەدوامدا بۆ (ئەڵمانیا) چاوەڕوانم دەکەن وا دیار بوو پاش پەنجە مۆر هەر ئەوان بەنیاز بوون بەلایەکم دا بەرن قەدەری خوای گەورە وابوو کە یەکمان بینی و ئیتر وتم تازە تەواو ڕزگاربوونم نییە لەدەستیان بەڵام سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لەتاریکترین شوێندا نزیکترینە لەبەندەکانییەوە باوەڕتان بێت لەوکاتەی پۆلیسەکانم بینی تەنها ئایەتی: **(وَجَعَلْنَا مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ)**[1] م خوێند ئەو ئایەتەی کەوا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەرامبەر بێباوەڕانی قورەیشی خوێندی و مشتێك خۆڵی کرد بە دەم و چاویاندا و خوای گەورە کوێری کردن لەئاستیدا!
منیش وەك شوێنکەوتەیەکی ئەو سەروەر و پێشەوایەم بەوپەڕی باوەڕمەوە ئەو ئایەتەم خوێند و بەزەردەخەنەیەکەوە سڵاوێکم لە پۆلیسەکان کرد و ئەوانیش وەك بڵێی نەفەرێکی تربم سەرێکیان ڕاوەشاند و وەڵامی سەلامەکەیان دامەوە و بە تەنیشتیاندا هاتمە دەرەوە و سوپاس بۆ خوا ڕزگارم بوو پاش ئەوەی لەو بنکەیە هاتمە

---

1 - (یس:٩)







دەرەوە هەوڵی ئەوەم دا سـەرەتا بـزانم ئەو وڵاتە کـوێیە!، بـۆ ئەو مەبەسـتە چـوومە مارکێتێـك و داوای کـارتێکی کـابینەی تەلەفـونی سەرشـەقامم کـرد بەزمانی(ئەڵمـانی) چـونکە وڵاتـانی دراوسێ و شـارە سـنوریەکان بەزمانی(ئەڵمانی) گفتوگۆ دەکەن لەویـادا خـاوەنی دوکانەکە کارتەکەی پێـدام و پێـنج یـۆرۆکەی لێ وەرگـرتم ئیتر دڵنیـا بـووم کە وڵاتی(سـویسـرا) نیـیـە چـونکە پـارەی سـویسـرا یـۆرۆ نەبـوو بەڵام نەشـمدەزانی کە وڵاتی(نەمسا)یە،

چـوومە نـاو کـابینەیەکی تەلەفـونەوە و پەیوەنـدیم کـرد بەمـاڵی ناسـراوەکەمانەوە و خێزانەکەی هەڵیگرت لەگەڵ سڵاوم کرد توشی سەرسـوڕمان بـوو، وتی: کوڕم ئەوە تـۆ لەکـوێی؟ ئەو ژمـارەیە کـوێیە؟، ئەی هـاوار ئـێمە لە بەیـانییەوە دووجـار چـووینەتە کەمپەکەت وتیـان نەمـانبینیوە هاوڕێکانـت!، تـۆ نابێـت بێیـتەوە؟ یـان بـۆ هەر شـوێنێك بڕۆیـت هەواڵمـان پێبـدەیت؟،منیش بەپەلە لەترسـی تەواو بـوونی کارتەکە وتەکانم پێ بـڕی و بە پێکەنیـنەوە وتـم: وەختـی گلەیـی نـیە دواتـر پێـت دەڵـێم بەس پـێم بڵێ(ئوسـتەغـایش) کـوێیە؟، وتـی: ئەهـا منداڵەکـان سـەیری کەنـاڵێکی کـارتۆنی دەکەن بەناوی(ئوستەغـایش)، چـۆن نـازانی کـوڕم واتە(نەمسـا)، ئیتر منیش وتـم: دە کەوابێـت مـن ئێسـتا لە وڵاتی(نەمسـا)م! ، فەقیرە توشـی شـۆك بـوو دەسـتی کـردە گریـان و وتـی: چۆن شـتی وادەبێت؟، وتم: مەگری نـازانم بـۆ سنورداشی ئێرەیان کـردوم خـۆ من هیچ پەنجەمـۆرێکم نـیە بێ لە(ئەڵمانیـا) بـا بـگەمەوە لاتـان إن شـاء الله قسـەی لەسـەر دەکەین!ئیتر ماڵئـاواییم لێکرد و کەمێك دڵم دایەوە و وتم: بەم زووانە دێمەوە إن شـاء الله خەمت نەبێت وادەچم بۆ وێستگەی شەمەندەفەر!

پـاش داخسـتنەوەی تەلەفـون سـەرێکم بەرزکـردەوە بـۆ ئاسـمان و وتـم: خـوای گەورە بەنـدەکەی خـۆت تەنهـا مەکە و غەیـری تـۆ بەم بێ پـارەییە هـیچ کەس شـك نـابەم بەفریادڕەسی خۆت فریام بکەوە بەپەلە کەوتمە پرسیارکردنی وێستگەی شەمەندەفەر




تا سوپاس بۆ خوا پاش نیو کاتژمێر دۆزیمەوە کاتژمێریش سەرووی سێ پاش نیوەڕۆیە خێرا چووم داوای پلانی کاتی ڕۆشتنی شەمەندەفەرم کرد بۆ شاری(میوشن) سەیرم کرد دوو شەمەندەفەر دەڕوات یەکیان نۆرماڵ و خاو یەکیان خێرا و بەپەلە کە هەمیشە خێراکان پارەی کرێی زۆرە منیش یۆرۆیەکیشم پێ نیە ئاوێکیشی پێ بکڕم،بیرم کردەوە کاتێك سواری شەمەندەفەرەکە بووم بچمە ناو تەوالێتەکان خۆم حەشار بدەم بۆ ئەوەی جابی پێم نەزانێت تا دەگەمە شوێنی خۆم نۆرماڵەکە بە حەوت کاتژمێر دەگەشت چونکە لەهەموو گوند و شوێنێك دەوەستا و زوتریش دەڕۆی سەرەتا چوومە ناو نۆڕماڵەکە بەڵام سەیرم کرد تەوالێتەکان لەناو خەڵکەکەدایە و هەرچۆن بێت ئاشکرا دەبم و توشی کارەسات دەبم بۆیە بەرنامەم گۆڕی بۆ خێراکە کە کاتژمێر پێنج دەڕۆشت و بە کاتژمێر و نیوێك دەگەشت یان کەمێك زیاتر زۆر لەخەیاڵم دا نەماوە بەڵام ئەمیان بۆ چوونە تەوالێتەکان دەرگای تایبەتی هەبوو وە زۆر پێشکەوتوو بوو لەژیانم دا سواری شەمەندەفەری وا نەببووم و تەنها لەفلیمەکاندا شتی وام بینیبوو ئیتر کاتی شەمەندەفەر هات و منیش وەك هەموو ئەو خەڵکە سەرکەوتم بەڵام من پارە و ئیقامەم پێ نەبوو وە زمانیشم نەدەزانی پشت بەخوا سەرکەوتم و خێرا چوومە ناو تەوالێتێکەوە تا سوپاس بۆ خوا دەستی کرد بە ڕۆشتن نزیکەی چارەکێك لەناو تەوالێتەکەدا بووم لەدەرگا درا، منیش بێ خۆ تێکدان دەرگام کردەوە، سەیرم کرد پێنج شەش نەفەر وەستاوە و دەیانەوێت دەست بەئاو بگەیەنن!، لەدڵی خۆم دا دەموت:ئێستا وادەزانن گوریسم قوت داوە نازانن لە ترسی جابی چوومەتە ناوی.

بەو شێوەیە دەستم کرد بە گۆڕینی تەوالێت لەسەرەتای شەمەندەفەرەکەوە تا کۆتایی چارەك چارەك دەچوومە ناو دانەیەکیان و کە لەدەرگا دەدرا دەهاتمە دەرەوە سەیرم دەکرد کۆمەڵێك نەفەر چاوەڕوان دەکات لەوکاتەدا لە دوورەوە جابیم بینی کە داوای بلیتی لەنەفەرەکان دەکرد هەڵبەتە لەسەرەتاوە و بەشی پێشەوە دەستی کرد بەگەڕان ،






بەپەلە دوو سێ فارغۆنم بڕی و خۆم نزیك کردەوە لە بەشی کۆتایی شەمەندەفەرەکە ماشاء الله زۆر دوور و درێژ بوو، هەر بەشێکیشیان تایبەت بوو بەشتێك دوکان و کافتریاشی تێدابوو منیش دەموویست لانی کەم گەر بگیرێم لە ناو خاکی(ئەڵمانیا) بگیرێم و لەوێ بۆیان ڕوونبکەمەوە کە من پەنجە مۆری وڵاتی(نەمسا)م نیە و بەهەڵە منتان ناردۆتەوە بۆ ئەوێ!

بەو شێوەیە جابی لەدوورەوە هات و منیش گەشتمە کۆتا فارغۆن و ئیتر ڕێگای ترم لەبەردەم دا نەما، ئەو بەشەش ژوور ژوور بوو لەدەستە چەپەوە ڕێڕەوێك هەبوو بۆ هاتوچۆ خێرا خۆم کرد بە کۆتا تەوالێتدا تا دەرفەتێکم بۆ بڕەخسێت و جابییەکە خۆی بکات بە ژوورێکدا و بەتەنیشتیدا بەرەو بەشەکانی خوارەوە بڕۆمەوە جار جارە سەیری دەرەوەم دەکرد تا ئەوەی بینیم تەواو نزیك بۆیەوە و گەشتە فارغونەکەی من بەپەلە خۆم کردەوە بەتەوالێتەکەدا!

کەچوومە تەوالێتەکەوە تەماشادەکەم جانتایەکی ئافرەتان هەڵواسراوە، دواتر زانیم هی ئافرەتێکی خەڵکی وڵاتی(ئیتاڵیا)بوو لە بیری چووبوو لەویا شەیتان دەیوت: دەبڕۆ دەی ئەوە پارەشت دەست کەوت بیکەوە و پارەکەی بەرە و بڕۆ سوێند بەخوا خێر نیەتم هاتەوە سەر باشە و وتم خوایە تۆ خۆت ئاگاداری من زۆر موحتاجم و هیچم پێ نیە و دەزانم ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی ترە بۆیە ئەم پارەیە موڵکی من نیە و لەبەر خاتری تۆ ئێستا بەدوای خاوەنی ئەم جانتایەدا دەگەڕێم تا بیدەمەوە، داوات لێدەکەم تۆش ڕزگارم بکە لەم تەنگانەیەدا هاتمە دەرەوە لە تەوالێتەکەدا و جابیش هاتبۆیە ناو ئەو بەشە بەڵام نەمزانی لەکام ژووردایە منیش بردم بۆ چەند ژوورێك بە ئیشارەت پیشانمدان هی کەس نەبوو تا بردمە ژوورێك سەیرم کرد کاکە جابی تێدایە و داوای تکت دەکات دەوەرە ئیتر فریشتەی گیان کێشان لەکوێیت بۆ گیان کێشان خێرا زەردەخەنەیەکم کرد و وتم سۆری و هاتمە دەرەوە ، کاتێکم زانی ئافرەتێك بەڕاکردن




بەرەو لام دێت و منیش جانتاکەم پیشان دا بە پێکەنین و زەردەخەنەیەکەوە هات و دەستی کرد بە سوپاس کردنم بە زمانی(ئیتاڵی) خەریك بوو باوەشم پێدا بکات منیش بە کوردی وتم: نابێت نەکەی بیکە لەڕێی خوا ناشەرعیە و خۆم لێ دوور خستەوە لەوکاتەدا من لەخوام دەویست خێرا دەرچم و بڕۆمەوە بەرەو بەشی خوارەوەی شەمەندەفەرەکە تا جابی نەمگرێت و داوای بلیتم لێبکات!

خێرا ئافرەتەکەم جێهێشت و گوێم لێبوو لەدواوە جابیەکە هات دەرەوە و بانگی کردم منیش خۆم لەگێلی دا و بە پەلە بەرەو بەشەکانی تر دەڕۆشتمەوە و نزیکەی چوار فارغۆنم بڕی و چوومەوە ناو تەوالێتێك و خێرا ئەو وەرەقانەم دڕی کە پۆلیسی(ئەڵمانیا) تەسلیمیان کردم کاتێك سنورداشیان کردمەوە و کردمە ناو تەوالێتێکەوە بۆ ئەوەی گەر گیرام نەزانرێت لە وڵاتی (نەمسا)وە گەڕاومەتەوە دواتر بیرم کردەوە کە جابی تەوالێتەکان دەگەڕێ بۆیە خێرا هاتمە دەرەوە و بەرەو بەشەکانی تر ڕۆشتم و لەدوورەوە ئەویشم دەبینی بەدوامدا دەگەڕا و خەریك بوو و نزیك دەبۆیەوە لێم تا سوپاس بۆ خوا نازانم بەهۆی قەرەباڵغی وێستگەی گەورەی(میوشن) لە وێستگەیەك پێش شاری(میوشن) وەستا ئیتر منیش بەباشم زانی دابەزم بەڵام کاتێکم زانی بەتەواوی لێم نزیك بۆتەوە و منیش چاوەڕوانم دەکرد دەرگاکە بکرێتەوە و دابەزم کەچی گەشتە لام بەڵام سوپاس بۆ خوا لەوکاتەدا دەرگا کرایەوە و خۆم هەڵدایە خوارەوە بە پێکەنینێکەوە دەستم بۆ بەرز کردەوە و ماڵئاواییم لێکرد ئەویش سەری بادەدا بەو شێوەیە لەڕێی میترۆی ژێر زەویەوە خۆم گەیاندەوە ناو شاری(میوشن) و لەوێشەوە بەپرسیارکردن لەخەڵکی سەر ڕەش و دەرەوە مزگەوتێکی مسوڵمانانی(تورکیا)م دۆزیەوە کە لەناو سەنتەری شاری(میوشن)دابوو زۆربەی کوردەکان ڕۆژانە هاتوچۆی ئەو مزگەوتەیان دەکرد ئیتر چوومە مزگەوتەکە و نوێژی مەغریب و عیشام تێدا کرد زۆر بێتاقەت بووم کوردێکم نەبینی تا ئەوەی وتم: پاش




نـوێژی عیشـا گەر کەسـم دەسـت نەکەوت دەچـمە لای ئیمـامی مـزگەوتەکە و داوای یارمەتی لێدەکەم بەڵام کاتێکم زانی بۆ نوێژی خەوتنان چەند برایەکی کورد دەرکەوتن کە پێشتر هەندێکیانم بینیبوو لەگەڵ منیان بینی وایانزانی بەسەردان هاتووم بەڵام کە حاڵیـان زانیم خێرا خـوا پاداشـتی خێریـان بـداتەوە بردیـانمەوە لای خۆیـان و بـۆ بەیـانی بلیتی شەمەندەفەریان بۆ بڕیمەوە بۆ شاری ناسراوەکەمان!

کاتێك گەشتمەوە ئەوێ ویستیان پارێزەرم بۆ بگرن بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر قەرزار بووم و بەتەواویـش وڵاتی(ئەڵمانیـا)م لە پێشـچاو ڕەش ببـوو، بڕیـارم دا سـەفەر بـکەم بـۆ وڵاتی(بەریتانیـا) و پەیوەنـدیم کـرد بە بـرایەکەوە کە پێشـتر لە وڵاتی(یۆنـان) پـێکەوە بووین بۆ ڕێنیشاندەری ڕێگە ئیتر پاش هەفتەیەك خۆم ئامادە کرد و بەڕێکەوتم بەرەو وڵاتی(بەریتانیا) لەڕێگەی شاری(کالاس) ی وڵاتی فەرەنساوە!

بەم شێوەیە سوپاس بۆ خوا کۆتایی بە سەفەری نێوان وڵاتی(ئەڵمانیا) و (نەمسا)ش هـات و لەمەوپاش دەچینە سـەر کۆمەڵێك ڕووداوی تـر ئەویـش بـریتیە لەو چیرۆك و ڕووداوانەی کە لەڕێـــی وڵاتـــی (ئەڵمانیـــا)وە بەرەو وڵاتی(فەرەنســـا) و نارەحەتیەکانی(کالاس) و گەشتنە وڵاتی(بەریتانیا) بەسەرم دا هاتوون.

## یەکەم سـەفەرکردنم لە وڵاتی(ئەڵمانیـا) بـۆ وڵاتـی (فەرەنسـا) و لەوێشەوە بۆ وڵاتی(بەریتانیا) (٢٠٠٣-٢٠٠٤)

پـاش ئەوەی وڵاتی(ئەڵمانیـا) سنورداشی وڵاتـی( نەمسـا)ی کـردمەوە بە نـاهەق و بەبێ ئەوەی پەنجەمـۆری ئەو وڵاتەم هەبێـت هەر ئەو ڕۆژە گەڕامەوە بـۆ وڵاتی(ئەڵمانیـا) بە قاچـاخ بەڵام ئەم جارەیـان زۆر نەمـامەوە لەو وڵاتە و پـاش هەفـتەیەك و پـێش هـاتنی وەرزی سەرماو زستان بڕیارم دا سەفەر بکەم بۆ وڵاتی(بەریتانیا).

بـۆ ئەو مەبەسـتە لەڕێـی تەلەفـونەوە پە یوەنـدیم کـرد بە برایەکی بەڕێـزەوە کە لە وڵاتی(یۆنـان)پێکەوە بـووین و بەڕێزیـان چووبـوون بـۆ وڵاتی(بەریتانیـا) و زۆر بەباشـتر لە





وڵاتانی تری ڕۆژئاوا باسی دەکرد بۆ پەنابەر و ئیش و کار و تەنانەت بۆ مسوڵمانیش ، خوا خێری بنووسێت ڕێنیشاندەری ڕێگای کردم کە چۆن سەفەربکەم بۆ ئەوێ خوا پاداشتی خێری بداتەوە زۆر یارمەتی داوم و هەرگیز لەیادم ناچێت لەڕێی ئەنتەرنێتەوە چوومە سەر نەخشەی(گوگڵ ئێرز) و سەرجەم ئەوشارە سنوریانەم سەیرکرد کە دەتباتە ناو وڵاتی(فەرەنسا) نزیکترین شوێنیش لە منەوە شارۆچکەی(کێل)ی سەرسنوری وڵاتی (ئەڵمانیا)بوو کە بە چارەکێك لەوێوە دەچویتە ناو شاری(ستراسبۆرگ)ی وڵاتی (فەرەنسا) بەهۆی ئەوەی پارەیەکی زۆر قەرزاربووین بەدوای کەمترین نرخدا دەگەڕام تاوەکو بتوانم پێی بگەمە(بەریتانیا)
بلیتێکی هەفتانەی شەمەندەفەرم کڕی کە پێی دەڵێن(فۆغن تکت) واتە بلیتی هەفتانە نرخەکەی بیست و پێنج یۆرۆ بوو ئەو بلیتە ئەوکاتە و ئەو شەمەندەفەرانەی بۆی دیاری کراوە دەتتوانی لەشەو و ڕۆژێکدا سەفەری پێ بکەیت لەناوخۆی وڵاتی(ئەڵمانیا)دا پاش ئەوەی ماڵئاواییم کرد لە هەندێك کەسوکار و دۆستانی بەڕێزم بەو بلیتە بەڕێکەوتم بۆ شارۆچکەی(کێل) و پاش دوانیوەڕۆکەی گەشتمە ئەوێ بەڵام وەك ئاگادارکرابوومەوە لەپێشتردا بەهۆی ئەوەی ئەو شارانە شاری سەر سنورین زۆرجار کۆنترۆڵی پۆلیسی لێیە!
یان گەر ڕاستەوخۆ بڕۆیت بۆ وڵاتی(فەرەنسا) سەردەکەون و داوای پاسپۆرت و ئیقامەت لێدەکەن و هەرکەس پێی نەبێت دەیانگرت بەڵام من وەك فێڵێك تا شارە سنوریەکە ڕۆشتم و لەوێ دابەزیم شەمەندەفەرەکە وەستا و منیش خێرا دابەزیم و چاوێکم کردبوو بەدەچاو تا بزانم پۆلیس یان کۆنترۆڵ لەکوێدا وەستاون! هیچ خۆم تێك نەدا وەك نەفەرێکی سادە دابەزیم و لەو شوێنەی کە نەفەرەکان چاوەڕوانی هاتنی شەمەندەفەر دەکەن چوومە سەر کورسیەك دانیشتم و بەوردی سەیری ئەملاولام دەکرد سوپاس بۆ خوا هیچ پۆلیسێك و کۆنترۆڵێکم نەبینی ئەو ڕۆژە شەمەندەفەرەکە

ڕۆشت و وێستگەکە چۆڵ بوو! بە تەنها لەسەر کورسیەکە مامەوە و هیچ زانیاریەکم نەبوو لەوەی کە چی شەمەندەفەرێك یان چی کاتێکی تر شەمەندەفەر بەرەو شاری(ستراس بۆرگ) دەڕوات!

لەو بیرکردنەوەیەدابووم کاتێکم زانی شەمەندەفەرێکی نۆرماڵ وەستا و لە بەشی پێشەوەیدا نوسرابوو(کێل - ستراس بۆرگ) منیش بەبێ خۆتێکدان سەرکەوتم و دەستم کرد بەخوێندنی زیکر و پاڕانەوە تا خوا بمپارێزێت لەدەستی جابی و کۆنترۆڵی پۆلیس دڵیشم لەسەر سەد لێی دەدا و هەرچی نەفەرە لێم ببوو بە جابی و پۆلیس!، چونکە نە ئیقامەم پێبوو نە دەشمتوانی بەبێ ئیقامە بلیت ببڕم لەوڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر بەو شێوەیە پاش چارەکێك گەشتینە ناو شاری(ستراس بۆرگ)و نەجابیم بینی نە پۆلیسیش دواتر بۆم ڕوون بۆیەوە ئەم شەمەندەفەرە شەمەندەفەرێکی نۆرماڵی سادەی بێ کۆنترۆڵە و لە نێوانی ئەو دوو شارەدا بەردەوام کار دەکات پاش ئەوەی دابەزیم لە وێستگەی شاری(ستراس بۆرگ) پەیوەندیم کرد بە کەسوکارەوە کە بەسەلامەتی گەشتومەتە وڵاتی(فەرەنسا) دواتر بلیتی شاری(پاریس)ی پایتەختم بڕی و پاش کاتژمێرێك شەمەندەفەرەکە هات و لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر قوتابی کەدیار بوو بۆ پشوو گەڕابوونەوە شارەکەیان بەڕێکەوتم بۆ شاری(پاریس).

لەگەڵ سەرکەوتنم خەوم لێکەوت تا نزیکی(پاریس) خەبەرم نەبۆیەوە چونکە زۆر هیلاك بووم وە کەسیشم نەدەناسی لە شاری(پاریس) تا بچمە لای و ئیسراحەتێك بکەم و نەشمدەتوانی بەبێ ئیقامە بچمە ئوتێل!

کاتژمێر دە بۆ یانزەی شەو بوو گەشتینە شاری(پاریس) لەوێش ئەو برایە ئاگاداری کردبوومەوە کەوا بەهۆی گەورەیی شارەکەوە دوو وێستگەی شەمەندەفەر هەیە و یەکیان تایبەتە بە شەمەندەفەری نێوان وڵاتان و یەکیشیان تایبەتە بە هاتوچۆی نێوان شارەکانی وڵاتی(فەرەنسا) و ئەوەی منیش پێی هاتم لە وڵاتی(ئەڵمانیا)وە






بەڕێکەوتبوو دەبوایە بچومایە بۆ ئەوی تریان چونکە من بەنیازی شاری(کالاس)ی سەرسنوری نێوان وڵاتی(فەرەنسا)و(بەریتانیا) بووم هەرچۆنێك بێت و بەهەر شێوەیەك و پرسیارکردنێك سوپاس بۆ خوا ئەو وێستگەیەم دۆزیەوە کە پێی دەوترا(گاردی نۆرد) بەڵام کاتێك چوومە ئەوێ کۆتا شەمەندەفەری(کالاس) ڕۆشتبوو دەرگای بەشی دانیشتنی نەفەرەکانیش داخرابوو تاوەکو لەوێ چاوەڕوانی بکەم خوا ڕەحمی کرد ئەو چەند کاتژمێرەی ناو شەمەندەفەرەکە پشوویەکم دا و خەوتوبووم.

لەسەر کورسیەك دانیشتم لەناو وێستگەکەدا کاتێکم زانی نەفەرێکی سەر ڕەشی شەرقی دەرکەوت هات بەرەو لام و سەلامی کرد سەیرم کرد گەنجێکی خەڵکی وڵاتی (میسر)ە ئیتر پێکەوە بووینە هاوڕێ و هەردوولاشمان بۆ وڵاتی(بەریتانیا) دەڕۆشتین بەڵام شارەکانمان جیاواز بوو لەیەك دەستمان کرد بە گفتوگۆ کردن بەڵام پاش کاتژمێرێك پاسەوانێك هات و دەریکردین و وتی تا بەیانی و کاتی هاتنی شەمەندەفەرەکان نابێت کەس لێرە بمێنێتەوە بە ناچاری تا نزیکی بەرەبەیان و هاتنی شەمەندەفەری (کالاس) بەناو بازاڕ و گەڕەکەکانی شاری(پاریس)دا دەسوڕاینەوە تا خەو زۆری بۆ هێناین و کەمێك ساردیش بوو چەند کارتۆنێکمان دۆزیەوە و چووینە گەراجێکی داخراو پشتمان نا بە پشتی یەکەوە تا بەیانی خەوتین!

سەر لەبەیانی گەڕاینەوە ناو وێستگەکە و ماڵئاوایمان لەیەك کرد و چوومە بەشی بلیت کڕین بەڵام هەرچەندە دەموت(کالاس) لێم تێنەدەگەشتن کەسیشم نەدەناسی تا هاوکاریم بکات دەستم کرد بەگەڕان هەتا خوای گەورە برایەکی مسوڵمانی خەڵکی(جەزائیر)ی کردە هۆکار سەلامم لێکرد و پاش ئەوەی تێمگەیاند کە بۆ شاری(کالاس) دەڕۆم زۆر پیاوانە هاوکاری کردم و بلیتەکەی بۆ بڕیم و پێی وتم لێرە بەو شارە دەوترێت(کالێ) ئیتر منیش بلیتم بڕی سوپاس بۆ خوا.

کاتی شـەمەندەفەر هـات و سـەرکەوتم و بەڕێکەوت بـۆ شـاری(کالاس) بەڵام ئامۆژگاری کرابووم کە لەگەڵ گەشـتمە ئەوێ بەپەلە لە وێستگەی شـەمەندەفەر بچمە دەرەوە و ڕووبەڕووی خـۆم بەڕێبکەوم تـا دەگەمە لای دوو کـابینە کە ڕێکخراوێکی خێرخـوازی لێ بـوو ڕۆژانە خواردنیـان دەدا بەو پەنـابەرانەی کە نیشـتەجێی ئەو شـارە بـوون چـونکە ڕۆژانە پۆلیس دەکەوتە گرتنی ئەو پەنابەرانەی کەدەیانویست بە ڕێگای قاچاخ بڕۆن بۆ وڵاتـی (بەریتانیـا) و بەسـەیارە چەنـدین کـاتژمێر دووریـان دەخسـتیتەوە بـۆ سـنوری وڵاتی(ئیسپانیا) لەدەشتێکی کاکی بەکاکی دا فڕێییان دەدایت و جێیان دەهێشتیت تەنها نەیانـدەتوانی لای ئەو کابینـانە کـاتی خـواردن پێـدان دەستبەسـەرت بـکەن نەفەری دامـاویش لەگەڵ ڕۆژی لێ دەبـۆیەوە یـان دەبـوایە لەنـاو دارسـتاندا خـۆی بشـارێتەوە و لەناو کیسە خەودا بخەوتایە یان دەبوایە بەپەلە پاش وەرگرتنی خواردنەکە بە چەند تـولە ڕێگەیەکـدا خـۆی بگەیانـدایەتەوە نـاو دارسـتان تەنهـا ڕۆژانـی شـەممە و یەك شەممان ئەو ڕەش بگیریە نەبوو!

سـوپاس بـۆ خـوای گەورە پـاش هـاتنە دەرەوەم لە وێسـتگەکە بە نیـو کاتژمێرێـك دوو کابینەکەم دۆزیەوە و کاتی خـواردن وەرگـرتنیش بـوو بێ ئێـوە نـاخۆش چـوومە ڕیـزەوە و شـۆربایەك و سـەمونێك و دەبەیەك ئاو و چایەکم وەرگرت و چـوومە لایەکەوە دەسـتم کرد بەخواردن دەتوت هەرێمی کوردستانە پڕبوو لە نەفەری کورد.

خـوای گەورە لەویـادا هـاوڕێیەکی پێ ئاشـنا کـردمەوە کە لە ڕێـی نێـوان وڵاتی(تورکیـا و یۆنـان) پێکەوەبـووین سـەیرم کـرد لەوێ نەفەر بـار دەکات و پـاش ئەمـلاولا مـاچکردن مـاڵی ئاوابێـت وتـی: خـۆم دەتنێرم و دواتـریش لەڕێی ئەوەوە گەشـتمە وڵاتـی (بەریتانیـا) بەبـێ ئەوەی هـیچم لـێ وەرگرێـت زۆر سـوپاسـیان دەکەم بەڕاسـتی! دوای ئەوەی ئەو هـاوڕێیەم بینـیەوە لە لای کـابینەی خواردنەکـان لەشـاری(کالاس) خێرا ڕێنیشـاندەری کردم و ئاگاداری کردمەوە لەگەڵ نانەکەمان خوارد دەبێت بڕۆینەوە بۆ ناو دارستان و






تا نزیکی ئێوارە و تاریکبوون نەفەر سەرناخرێت بۆ ناو شاحینەکان لە ترسی بەهێزی کۆنترۆڵی پۆلیس و کامێرای چاودێری.
زۆربەی کات لەماوەی هەفتەیەکدا قاچاخچیەکان وێنەیان دەگیرا لەکاتی کردنەوەی دەرگای شاحینەکان و سەرخستنی نەفەری قاچاخ بەو هۆیەوە زۆر بە زوویی ئاشکرا دەبوون و دەگیران پاش ئەوەی بەڕێکەوتین بەرەو ناو دارستان تا نزیکی پاش نیوەڕۆ لەگەڵ کۆمەڵێك نەفەری کورددا دانیشتین هاوڕێکەم وتی: دەبێت پرس بکەم بە قاچاخچیە سەرەکیەکەم چونکە من تازە هاتومەتە ئێرە و لەبەردەستیدا ئیش دەکەم بابزانم ڕێگەم دەدات بتنێرم؟! وتی: بۆ خۆشت ئازادیت تا ئەوکاتە لەگەڵ هەرکەسێك مامەڵە بکەیت منیش زۆر سوپاسیم کرد و وتم: نامەوێت بەهۆی منەوە ڕووگیر بیت و بە بوون و نەبوون هەڵوێستی جوانت بەرز دەنرخێنم!
ئیتر چووم بۆ لای ئەو تەرەفەی کە ناونیشانیان پێدابووم خەڵکی شاری(چەمچەماڵ) بوو نەفەری سەردەخست لەکاتی پێچکردنەوەی شاحینەکاندا لە فولکەیەکی پێش ساحەی چاوەڕوانی شاحینەکاندا لەویادا هێواشیان دەکردەوە و دەبوایە گیان بەختیانە لە ساتێکی کەم دا لەگەڵ دەرگاکە دەکرایەوە ڕاتکردایە بەدوایدا و سەرکەوتیتایە هەواڵیم پرسی وچوومە لای تەرەفەکەی و پاش سڵاو ڕێز خۆم پێ ناساند و وتم: هاتووم بۆ لای فڵان کەس کە شەریك بوون پێکەوە چونکە من ناونیشانی ئەوم پێدرابوو.
بەڵام قەدەری خوا ئەو برادەرە گیرابوو بەڵام ماڵی ئاوا بێت وتی: مادەم بۆ لای ئەو هاتوویت وە کەسێکی دیندار دیاری لەسەر سیقە من لەجیاتی ئەو سەرت دەخەم و پاش ئەوەی گەشتی پارەکەم بدەرێ کە ئەم فەزڵەش دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە و زۆر سوپاسی خوای لەسەردەکەم هەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ چەند نەفەرێکدا دەرگای شاحینەیەکی بۆ کردینەوە و وەك یاری ماراسۆن بەدوایدا ڕامانکرد و سەرکەوتین و







هەر بەڕۆشتنەوە دەرگاکەی لەسەر داخستینەوە و وتی خۆتان بشارنەوە بەڵام پاش دە دەقەیەك گەشتە بەردەم کۆنترۆڵی کەشتی و دەستگیرکراین و دەرنەچووین بەو شێوەیە ماوەی سێ ڕۆژ مامەوە لای ئەو قاچاخچیە یەك دووجاری تر سواری شاحینەی کردم لە فولکەکەدا بەڵام هەر دەگیراین و دەرنەدەچووین.

پاش ئەوە هاوڕێیەك هات بۆ لام وتی: غیرەتت هەیە شەو لەگەڵم دا بێیت بەسەر تەلبەندی پشت کۆنترۆڵەکەدا بچینە ناو ساحەی شاحینەکان و لەوێوە بڕۆین منیش وتم: بەس شارەزابیت سەرم پێوەی نیە و ئەوە بوو شەوەکەی یەك دووجار هەوڵمان دا و دەگەشتینە لای تەلەکە و بەپەلە سەیارەی پۆلیس دەگەشتە سەرمان و بەناچاری ڕامان دەکرد و نەمانتوانی دەربچین وە بۆ بەیانی هاوڕێیەکی تر ئاگاداری کردمەوە کەوا جارێکی تر هەڵەی وا دووبارە نەکەمەوە چونکە ئەو ڕێگەیە سامناکە و کامێرای چاودێری لێیە و تۆمەتی قاچاخچیش دەدرێتە پاڵت بەو شێوەیە مامەمەوە تا ئەوەی چەند برایەکی دیندارم ناسی تازە گەشتبوونە شاری(کالاس)دەیانویست لەڕێگەی قاچاخچیە هەڵەبجەییەکانەوە دەربچن لەساحەی ئەوانەوە وەك باسیان دەکرد نەفەر لای ئەوان باشتر دەردەچوو پاش یەکترناسین و هەواڵپرسین زانیان نوێژ دەکەم وتیان: لەگەڵ ئێمەدا بە و ئیتر بڕیارم دا بچمەوە لای ئەو هاوڕێیەم لەگەڵ ئەواندا نەفەری سەردەخست و کاتێك بینیمەوە وتی: کاکە ئەوە قسەم لەگەڵ تەرەفەکەم دا کردووە و ڕێگەی پێداوم و من یەك فلسم لەبەرێزت ناوێت چونکە بەهۆی کەسێکی نزیکمەوە هاوکاری کراین لەڕێگەی(تورکیا و یۆنان)دا و وەك وەفایەك ئەو پیاوەتیەی لەگەڵم دا کردەوە ڕۆژی هەینی بوو لەگەڵ برایەکدا هاتینە ناو بازاڕ پاش نان خواردن ویستمان کەمێك بگەڕێین بەڵام کاتێکمان زانی حەملە دەستی پێکرد پۆلیس وەك شارە مێرولە بە بەرگی مەدەنی و پۆلیسەوە کەوتنە گرتنی نەفەر قەدەری خوا ڕێگەی دارستانیان لێگرتین و کەوتنە دوامان بەسەیارە و ڕاکردن بەناو







گەڕەکەکانی ئەو شارەدا ئێمەش لەچەند گەڕەکێك ڕزگارمان بوو لەدەستیان تا کەوتینە گەڕەکێك تەنیشتمان ئاوێکی گەورە بوو بەشارەکەدا دەڕۆشت نەماندەتوانی بپەڕینەوە و سەر پردیشیان لێگرتبووین و ئەولاشمان هیچ شوێنێکی تێدا نەبوو تا خۆمانی تێدا بشارینەوە هەمووی دووکان بوو دۆڵمشێکی سپی دوامان کەوت دەیانویست پڕی بکەن لەنەفەرمن و ئەو برایەش ڕامان کرد لەدەستیان و لەچەند شوێنێك ڕزگارمان بوو تا کۆتا شوێنمان گەراجێکی سەیارە بوو چووینە ژێر دوو سەیارە خۆمان شاردەوە،بەڵام ویستی خوا وابوو پێیان زانین و گیراین!، سەرەتا بردینیان بۆ بنکەیەکی پۆلیس بۆ ئەوەی کۆمان بکەنەوە دواتر دوورمان بخەنەوە ،
بەڵام سوپاس بۆ خوا پاش چەند کاتژمێرێک هاتن و وتیان: بەختتان هەیە لەبەر ئەوەی بەیانی شەممەیە دوور خستنەوەکەتان ڕەتکراوەتەوە و دەمەو ئێوارە ئازادیان کردین!،لەڕۆژانی شەممە و یەکشەممەدا گرتن و دوورخستنەوە نەبوو بۆیە لەو دوو ڕۆژەدا دەهاتینە نزیك کابینەی خواردنەکان و لەوێ دەماینەوە دەچووینە ژێر پردێك دەخەوتین، یان قەڵایەکی کۆنی سەربازی لێبوو چەند ژوورێکی ڕوخاوی تێدا مابوو هەندێك لەنەفەرەکان تیایدا دەخەوتن منیش لەگەڵ چەند مسوڵمانێکی نوێژخوێندا پێکەوە بووین و سوپاس بۆ خوا کەشێکی ئیمانیمان بۆ خۆمان دروستکردبوو بانگیشمان دەدا و بە کۆمەڵیش نوێژەکانمان دەکرد و نان خواردن و خەوتن و هاتوچۆشمان پێکەوە بوو ئەوەی کە سەرنجی ڕاکێشام لەو وڵاتە زلهێزەی کە خاوەنی ئەتۆمی تایبەت بەخۆیەتی بینینی ئافرەتی خوار تەمەن هەژدە ساڵ بوو لەسەر شەقامەکان ئەوکاتەی من سێ ئافرەتی گەنجی فەڕەنسیم بینی کە هەر ڕۆژە و بەدەستی قاچاخچیەکەوە بوون گەنجێکی کورد لە وڵاتی سویسراوە هاتبوو پەیوەندی بەستبوو لەگەڵ یەکێك لە کچەکاندا چونکە لەبەشە فەڕەنسیەکەی ئەو وڵاتە ژیابوو زمانی فەڕەنسی زۆر باش دەزانی بانگم کرد و وتم: باشە ئەمانە دایك و باوکیان نییە یان





بەخێوکەریان نیە وا لەسەر شەقامن؟، وتی: بەڵێ هەیانە بەڵام نایانژیەنن و دەریان کردوون حوکمەتیش تا تەمەنیان نەگاتە هەژدە ساڵ مافیان بۆ دابین ناکات!، بەڕاستی لەویادا زانیم ئەو هات و هاوارەی زۆرێك لە ڕێکخراوەکانی ئافرەتان دەیکەن لە وڵاتی خۆمان ئەو دەنگی دەهۆڵە دوورەیە کە فریویان پێ خواردوە و ڕۆژئاوایان کردوە بە بەهەشتی ڕزگاری بۆ ئافرەتان نازانن کە مافی ئافرەت لە ڕۆژئاوا بەس خۆڕووتکردنەوە و بەکارهێنانیانە بۆ لەشفرۆشی و پڕوپاگەندەی بازرگانی!

ئەو دوو ڕۆژەی حەملەی گرتن نەبوو شەوێك لە ژێر پردەکەدا و شەوێکیش لەناو قەڵاکەدا خەوتم لەگەڵ برایەکدا ئیتر دەبوایە شەوی یەکشەممە لەسەر دوو شەممە بچووینایەتەوە بۆ ناو دارستانەکە، ویستی خوای گەورە وابوو سەرەمان هات بۆ سەرخستنی شاحینە و کۆتا شەوم بوو لە شاری(کالاس) و لە پێش بەرەبەیانی ڕۆژی دوو شەممەدا لەگەڵ پێنج نەفەری تردا سواری شاحینەیەکیان کردین و دووانمان بۆ سەر سندوقەکە و چواریشمان لەسەر ئەکسلی شاحینەکەدا دوو دوو پێکەوە دایاننایین و بەو شێوەیە دەنگمان لەخۆمان بڕی تا کاتژمێرێك و پاشان شاحینە کەوتەڕێ تا بەتەواوی چووە سەر سکەی شەمەندەفەر!،

سوپاس بۆ خوا لەهیچ کۆنترۆڵێکدا نەیانوەستاندین و بەڕێگەی تونێلە سی و پێنج بۆ چل دەقەییەکەی نێوان شاری(کالاس)ی وڵاتی(فەڕەنسا)و شاری(دۆڤەری) وڵاتی (بەریتانیا) کە بە نێو ئاودا ئەم تونێلە دروستکراوە و بێ لە شەمەندەفەری نەفەر گواستنەوە شاحینەش بەسەر سکەی شەمەندەفەردا دەوەستێنرێن و دەپەڕێنرێنەوە لەگەڵ چووە سەرسکەکە و کەوتەڕێ برایەکمان لەگەڵدا بوو بەدەنگی بەرز وتی: الله اکبر سوپاس بۆ خوا تەواو ڕزگارمان بوو وەرنە خوارەوە و دانیشن لەسەر سکەکە تا دەگاتە نزیك شاری (دۆڤەر) باوەڕتان بێت پاش چەند دەقەیەك بوو بە تاریکستانێك






چاو چاوی نەدەبینی جگەرە کێشێکمان لەگەڵدا بوو چەرخی داگیرساند تەنها دیوارێکی پتەومان دەبینی و هەستت دەکرد لەناو ئاودا دەڕۆیت!
گەشتینە نزیك شاری(دۆڤەر) و چووینەوە شوێنەکانی خۆمان و سوپاس بۆ خوا لە کۆنترۆڵی وڵاتی (بەریتانیا)ش ڕزگارمان بوو نزیکەی کاتژمێرێك شاحینەکە ڕۆشت و بەبەرد کەوتینە لێدانی و لە چۆڵەوانیەك وەستاندمان و دابەزین ، شۆفێرەکەش لەترسا گیانی دەلەرزی چونکە بگیرایە بە قاچاخچی تۆمەتبار دەکرا و خێرا سواری شاحینەکەی بۆیەوە و ڕۆشت بەو شێوەیە بۆ یەکەم جارم گەشتمە وڵاتی(بەریتانیا) و دوو نەفەر دوو نەفەر لەیەك جیابووینەوە بۆ ئەوەی نەگیرێین! پاش جیا بوونەوەمان لەیەکتر من و هاوڕێیەکم ناوی کاك کارزان بوو بەجیا بەرەو ئاوەدانی و شارۆچکەیەك ڕۆشتین کە لە دوورەوە لێمانەوە دیار بوو ئەوەی کە جێگای تێڕامانمان بوو بۆ یەکەم جار بینیم سەیارە بەپێچەوانەی سایدەکانەوە دەڕۆن و سوکانیش لای ڕاست بوو! دواتر زانیم وڵاتی(بەریتانیا) هەموو شتێکی بە پێچەوانەی وڵاتانی جیهانەوەیە گەشتینە ناو شارۆچکەکە و چووینە وێستگەی شەمەندەفەر بەڵام دراوی (یۆرۆ)مان پێ بوو وڵاتی(بەریتانیا)ش دراوەکەی ناوی پاوەنە و لەو شوێنەشدا بەهۆی بچوکییەوە شوێنی پارە گۆڕینەوەی لێنەبوو
کاتی شەمەندەفەریش بۆ شاری(لەندەن) چارەکێکی مابوو ئەندازەی ڕێگەکەکەشی کاتژمێر و نیوێك بوو بە ناچاری بەبێ بلیت بڕین سەرکەوتین و چاوێکمان کردبوو بە سەد چاو لەگەڵ هاوڕێکەم دا بۆ ئەوەی ئەگەر هاتو جابیمان بینی خۆمان بشارینەوە و دابەزین چونکە گەر بیگرتینایە پەیوەندی دەکرد بە پۆلیسەوە و دەیانداین بەگرت! سوپاس بۆ خوا گەشتینە شاری(لەندەن) و جابی سەرنەکەوت و نەگیراین گەشتینە شاری(لەندەن) بەپرسیار و ئاماژە نووسینگەیەکی پارە گۆڕینەوەمان دۆزیەوە و چووین دراوی (یۆرۆکەمان) گۆڕیەوە بە دراوی(پاوەن) و خێرا لە کابینەیەکی سەر شەقامەوە





پەیوەندیم کرد بەو برا بەڕێزەی کە ڕێنیشاندەری کردم و بەڕێزیان لەشاری(بێرمینگ هام) دادەنیشت ناونیشانی وێستگەی پاسی پێدان و بەپرسیارکردن پاش نیو کاتژمێرێك لەو نزیکانە دۆزیمانەوە و ئیتر بلیتمان بڕی بۆ شاری(بێرمینگ هام) و دەمەو ئێوارە گەشتینە شارەکە.

ئەو برایەش خوا پاداشتی خێری بداتەوە هات بەدوامانـدا بۆ وێستگەکە و پاش هەواڵپرسین و ئەملاولا ماچکردن بردینیەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و خۆمان شۆرد و بێ ئێوە ناخۆش خواردنێکی باشی بۆ ئامادەکردبووین کە چەندین ڕۆژ و هەفتە بوو خواردنی  خۆشمان نەخواردبوو پاشان داوامان لێکرد کە بەیانی ڕێگەمان پیشان بدات تاخۆمان تەسلیم بکەین هەڵبەتە سەرەتا داوای کرد کە بمێنینەوە و

پاش چەند ڕۆژێك خۆمان تەسلیم بکەین دوای ئەوەی سوپاسمان کرد و نەمانویست نارەحەتی بکەین بەڵام چونکە من پەنجەمۆری وڵاتی(ئەڵمانیا)م هەبوو دەبوایە دەستکاری پەنجەم بکردایە تاوەکو پەنجەمۆرم دەرنەچێت، بۆ ئەو مەبەستە بەڕێنیشاندەری برادەرێکی ئەو برایە بەسمارتە دەستم ساف کرد و پاشان جووتێك دەستکێشی لاستیکیم هێنا و کردمە ناو ڤۆدگاوە هەتا بەیانی پەنجەم بوو بە پەنجەی پاپای وا ئاوساندی، بەحساب بەو شێوەیە پەنجە مۆر دەرناچێت بەڵام هیچ ئەسڵێکی نەبو لەئازار زیاتر هیچ سودم لێ نەبینی!

سەر لەبەیانی زوو بەڕێکەوتین بۆ دەرەوەی شارەکە و چووینە سەرشەقامی گشتی ئۆتۆبان کە دەبێت نەفەر بچێتە سەر شەقامی ئۆتۆبان تا شك نەکرێت کە کەس دەناسن لەو وڵاتە و بۆ ئەوەی بوترێت تازە شاحینەیەك دایبەزاندوین کاتێك کە پۆلیس گرتینی! بەو شێوەیە لەپەنایەکەوە شەڕواڵێکی کوردیم لە پێکرد و کەمێك خۆڵ و خاشاکمان کرد بەسەر و چاوماندا و جلو بەرگەکانمان کەمێك پیس کرد!




ماشـاء الله لەوکاتەدا هەورێکی ڕەش هێنـای و بـوو بە بارانێك بەپەلە بەرەو پەنـاگەیەك ڕامان کرد و خێرا خۆمان کرد بە کۆمپانیایەکدا هەردووکمان بەڕاکردن چووینە بەشی پرسـگەی کۆمپانیـاکە و هەردەمـانوت پـۆلیس پـۆلیس ئافرەتێك لە بەشی پرسـگەکەدا بـوو بەپەلە تەلەفـونی هەڵگـرت و کاتێکمـان زانی چەنـد نەفەرێك بە چاکەت و پانتۆڵ خۆیـان کـرد بەژووردا و کەوتـنە پرسـیارکردن ئێمەش تەقەی سـەرمان دەهـات و تەنها دەمانوت پۆلیس و کوردش واتە کوردین بە ئیشـارەت وتیان دانیشـن و خـوا هیدایەتیان بـدات کێـك و قاوەیـان بـۆ هێنـاین و وەرگێڕێکی کـوردی سـۆرانیان بـۆ خسـتینە سـەر تەلەفـون و پاش پرسـیارکردن وتی: کاکە چیتـان دەوێ وا هـاتوونەتە ئێرە؟، وتمان: ئێمە نەفەری تازەین ودەمانەوێت پۆلیسمان بۆ بانگ بکرێت، ئەوانیش وتیان: زۆرباشـە ئەوە تەلەفونمان کردوە کەمێکی تر دەگەن!

پاش چارەکێك سـەیارەیەکی پۆلیس هات و کچ و کوڕێکی تێدا بوو زۆر بەڕێز و ئەدەبەوە جیـاواز لە پۆلیسـی وڵاتانی(یۆنان)و(ئەڵمانیا)و(فەڕەنسـا) کە زۆر بەناشـرینی و خـراپ و دەمـارگیری لەگەڵ پەنـابەردا مـامەڵە دەکەن هـاتنە لامـان و وتیـان دەتـوانن لەگەڵمـان بـێن بـۆ بـنکەی پـۆلیس؟ ئـێمەش وتمـان بەڵێ ئیتر بەبێ ئەوەی کەلەپچەمـان بـکەن سـواری سـەیارەی پۆلیسـەکەیان کـردین و بردینیـان بۆ بنکەیەکی پۆلیس پەنجەمۆریـان پێکـردین و لەڕێی پەیوەنـدی تەلەفـونیەوە وەرگێڕیـان بـۆ ئامادە کـردین و وتیـان: بەهـۆی کـات درەنگـیەوە بەشـی سـۆشـیال داخـراوە و ئێـوەش دوو گەنجـن و خێزانـدار نـین تـا بتـاننێرین بـۆ ئوتێل ئەمشـەو لێرە دەمێننەوە و بەیانی وەرگێڕ دێت و هەنـدێك پرسـیاری چـۆنیەتی هاتنتـان لێـدەکەین و پاشـان دەتـاننێرین بـۆ ئەو شـوێنەی بۆتـان ئامـادەکراوە بەو شـێوەیە ئەو شـەوە بەجیـا لە زینـدانی تاکەکەسـیدا هێشـتینیانەوە و خـواردنی حەڵاڵیشـیان بـۆ هێنـاین و هەر دوعـام دەکـرد پەنجەمـۆرەکەم دەرنەچێـت! بەیـانی وەرگێڕێك هـات و پاش کۆمەڵێك پرسـیار و وەڵام ، وتـی: ئێسـتا دەچـنە دەرەوە تەکسی




دێت بەدواتاندا و دەتانبات بۆ ئەو خانوەی بۆتان دیاری کراوە بەڵام تا خۆمان گۆڕی و هاتینە دەرەوە تەکسیەکە هاتبوو زۆر چاوەڕوانی نەکردبوو ڕۆشتبوو ئێمەش نەمانزانی هاتووە و ڕۆشتووە زۆر چاوەڕوانیمان کرد بێ سوود بوو تا چووینەوە ناو بنکەی پۆلیسەکە و پرسیارمان کرد وتیان: هاتووە و ئێوە لێرە نەبوون و ئێمەش هیچمان بۆ ناکرێت و ئەوەتا ناونیشانی شوێنەکەتان پێیە و خۆتان دەبێت تازە بڕۆن بۆ ئەوێ!

هەرچەندە وتمان پارەمان پێ نیە بێ سوود بوو وتیان: ئێمە ناتوانین هیچ هاوکاریەکتان بکەین هاتینە دەرەوە زۆر بێتاقەت بووین چونکە یەك پێنسی(بەریتانی)شمان پێنەبوو تا تەلەفونێکی پێ بکەین و نەشماندەزانی لەکوێین بەناچاری وتم: بەخوا کاکە گیان دەبێت چاوێکمان بکەین بەدە چاو بەڵکو لەم ناوە پەنابەرێك یان مسوڵمانێك بدۆزینەوە و داوای یارمەتی لێ بکەین هیچ نەبێت تەلەفونێکمان بۆ بکات بۆ ئەو برایە و بەڵکو بێت بەدواماندا پاش بێنە و بەردە و ئەملاولا کردن کوچە و کۆڵانمان زۆرکرد بۆ دەرمان مسوڵمانێکمان دەست نەکەوت هەتا ڕەشپێستێکم بینی و داوای یارمەتیم لێکرد هەندێك پارەی وردەی پێداین چوومە کابینەیەکی تەلەفون و پەیوەندیم کرد بەو برایەوە و وتم براگیان وەختی هەواڵپرسی نیە خێرا وەرە بۆ وێستگەی شەمەندەفەری شاری(بێرمینگ هام) بەدواماندا فلسمان پێ نیە بەو شێوەیە وێستگەی شەمەندەفەرمان دۆزیەوە و سەیرمان کرد لە دوو وێستگەی دەرەوەی شارەکەداین و دووبارە بە بێ بلیت هەتا وێستگەی شارەکە سەرکەوتین و کاتێك دابەزین ئەو برایە دیار نەبوو! چوومە لای پیاوێك و بە ئیشارەت داوای یارمەتیم لێکرد بۆ تەلەفونێك تەلەفونی کرد بۆ ئەو برایە و ناونیشانی پێدا بەڵام ئەو برایەش شارەزای وێستگەی شەمەندەفەر نەبوو چونکە تازە بوو لە شارەکەدا ئیتر بەو پیاوەی وت: ناونیشانی وێستگەی پاسی شارەکەمان پێ بدا بەو شێوەیە پاش نیو کاتژمێرێکی تر گەڕان وێستگەکەمان دۆزیەوە و ئەو برایەشمان خستە عەزیەتەوە و دووبارە بردینیەوە ماڵی







خۆی و بەیانی بردینی بۆ ناونیشانەکە!، لەوێشەوە بردینیان بۆ خانویەکی گەورەی چوار ژووری و لەگەڵ هاوڕێکەم دا ژوورێکی گەورەیان پێدااین و بێ لە ئێمەش چەند نەفەرێکی تر لە ژوورەکانی تردا بوو تەنها مەتبەخمان پێکەوە بوو بەڵام زۆرجار بەهۆی ئەوەی خەڵکی وڵاتانی تر و زمان و کلتوری جیاجیات لەگەڵدا تێکەڵ دەبوو کێشە و ئاژاوە و شەڕ دروست دەبوو لەناو ماڵەکاندا!

پاش ئەوەی خۆم تەسلیم کرد و خانومان وەرگرت لەشاری(بێرمینگ هام) لەدوای هەفتەیەك دەستم کرد بەگەڕان بەدوای ئیشدا چونکە پارەیەکی زۆر قەرزار بووین و دەبوایە لەماوەیەکی کەم دا بماندایەتەوە بەڵام ویستی خوا وابوو کە ماڵەکەم دوور بوو لە چێشتخانە و گەڕەکی کوردەکانەوە و زیاتر لەو شوێنەشەوە ئیش و کار دەست دەکەوت! ئەو دۆڵمەشانەی کە نەفەریان دەبرد بۆ ئیش نەدەهاتن بەدوامانندا وە ئەوکاتەی منیش گەشتمە ئەوێ پایز بوو بەرەو زستان دەڕۆشتین ئیش و کار زۆر کەم ببۆیەوە لەڕێگەی ئەو برایەی یارمەتی داین ژمارەی شۆفێرێکی دۆڵمشی کوردی بۆ پەیدا کردین کە ئیشی دەسك کردنی تەڕە پیاز بوو لە کارگەیەکدا بەڵام ئەو ئیشەش ماوەی هەفتەیەك بوو وە چەند کاتژمێرێك بوو کاتەکەی وە پارەکەی زۆر کەم بوو لەبەرامبەردا ڕێگەکەشی زۆر دوور بوو ئیتر نەچووینەوە و وازمان لێ هێنا.

بەو شێوەیە زستان هات و ماوەیەکی زۆر بێ ئیش و کار مامەوە بەهۆی هاتنی (ئەمریکا)ش بۆ (عێراق) جواب و ئیقامە بەگشتی وەستابوو بۆ (کورد)و(عێراق)ی لە ئەوروپادا خوای گەورە کردی هەندێك لەو برایانەی کە لە شاری(کاڵاس) پێکەوە بووین و یەکمان ناسی گەشتنە وڵاتی(بەریتانیا)و لەشاری(کۆڤەنتری) کە بیست دەقە دوور بوو لەشاری(بێرمنگ هام)ەوە خۆیان تەسلیم کرد و هەر لەوێش خانویان وەرگرتبوو پەیوەندیان پێوە کردم و وتیان: ئیش و کار زۆرە لای ئێمە وەرە بۆ لای ئێمە







جـێگە و ڕێگەشـمان زۆرە لەماڵـدا منـیش بەوپەڕی خۆشـحاڵیەوە بڕیـارم دا بچـمە شاری(کۆڤەنتری)!

دوای ئەوەی چوومە شاری (کۆڤەنتری) چەند ئیشێك هەبوو یەکیان کارگەیەکی پەتاتە بـوو بیسـت دەقە دوور بـوو لەشـارەکەوە بەهـۆی کەمی پـارەکەیی و قورسـی و گرانـی ئیشـەکە هەمـوو کاتێك دەتتـوانی بـڕۆی بـۆی و هەرکەس چەنـد ڕۆژێك ئیشی بکـردایە وازی لێ دەهێنـا چـونکە بەردەوام لەسـەر سـکە بەفەردە پەتـاتە دەهـات و دەبـوایە تـۆ بتخسـتایە سـەر بالێـت و پشـتت بـۆ ڕاسـت نەدەبـۆیەوە!، یەکیشـیان ئیشی گـوڵ بـوو لەوکاتەدا نەفەریـان پێویسـت نەبـوو بـۆیە منـیش بەناچـاری بڕیـارم دا بـڕۆمە کـارگەی پەتـاتەکە بەڵام پـاش ئەوەی یەك ڕۆژ ئیشـم کـرد تیایـدا بـووم بەعەرەبـانە و بـۆ ڕۆژی دوایی نەچوومەوە!

پاش یەك دوو ڕۆژ پەیوەندیان پێـوە کـردین بـۆ ئیشی بـارکردنی مریشـك بـۆ نـاو قەفەزی شـاحینە لە دەواجینێکەوە بۆ دەواجینێکی تـر بەڵام ڕێگەکەی سێ کاتژمێر دوور بـوو وە کاتی ئیشـەکەش داوانـزە کاتژمێر بـوو، منـیش لەبەر هۆکاری قەرزەکەم بڕیـارم دا بـڕۆم لەگەڵ دوو برای تر لەماڵەکەدا شـۆفێری دۆڵمشـەکەمان و سـەر کارەکەمان ناوی کاکە حەمە بوو، کاتمان دیاری کرد کە هەمـوو شـەوێك کاتژمێر سێی شـەو دێت بەدوامانـدا و کاتژمێر شەشیش دەچووینە سەر ئیشـەکە تا کاتژمێر شـەشی ئێوارە و

کـاتژمێر نـۆی شـەویش دەگەشـتینە مـاڵەوە، واتە: تەنهـا شـەش کاتژمێرمـان هەبـوو بـۆ خەوتن و ئیسـراحەت، دەبوایە زۆربەی کاتی خەومان لەنـاو دۆڵمشـەکەدا بێت شـەوی یەکەم بەڕێکەوتـین سـیانزە نەفەر بـووین ڕەشپێسـتێکیشـمان لەگەڵـدا بـوو لەکـاتی ئاسایی خۆماندا گەشتینە شوێنەکە و ئەو ڕۆژەمان تەواو کرد و کاکە حەمەش تا ئێمە تەواو بـووین لەنـاو دۆڵمشـەکەدا خەوتبـوو پـاش ئەوە بەڕێکەوتیـنەوە بەرەو مـاڵەوە قەدەری خوا وابوو کاکە حەمە گیان ڕێگەی لێ هەڵە بوو لەسـەر جادەی ئۆتۆبان، ئەو







شەوە لە جیاتی ئەوەی کاتژمێر نۆ بگەینە ماڵەوە کاتژمێر دوو و نیوی شەو گەشتینەوە چونکە ڕێگەی ئۆتۆبان هێڵی خێرایە و بچوکترین هەڵە بکەیت دەبێت ڕێگەیەکی زۆر ببڕیتەوە تا لادانێکت دەداتەوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگەکەت بەهەر حاڵ بە زەردەخەنەیەکەوە وتم کاکە حەمە گیان بۆ بڕۆینە ماڵەوە خۆ نیو کاتژمێری تر دێیتەوە بەدواماندا، وتی: بەخوا زۆر ماندووم دەبێت کەمێکیش بێت بخەوم و چایەکیش بخۆم بۆ ئەوەی خەوم لێ نەکەوێت، ئێمەش لەگەڵ دابەزین خەومان لێکەوت!

هێندە شەکەت و ماندوو بووین لەخوامان دەویست کاکە حەمە خەبەری نەبێتەوە و نەیەت بەدواماندا و تێر بخەوین! بەخوا کاتێکمان زانی کاتژمێر بوو بە سێ و نیو کاکە حەمە خەبەری بۆیەوە و کردی بە هات و هاوار و وتی: بۆ تەلەفونتان بۆ نەکردوم و هەڵمسێنن لەخەو؟، نیو کاتژمێر دواکەوتووین و دەبێت خێرا بڕۆین ئەگینا لەکاتی خۆیدا ناگەینە سەر ئیشەکە هەر ئەوەندەمان خۆش بوو سواری دۆڵمش بووین ماشاء الله کاکە حەمە دۆڵمشی کرد بە فیڕاری و بەو نیوە شەوە لەسەد و بیست دەرۆشت لەسەر ئەوجادانەشی کە نوسرابوو چل یان پەنجا و حسابی بۆ کامێراش نەدەکرد دواتر زانیمان دەستی لەخۆی شۆردووە!، لە چەند شوێنێکدا تابلۆ دانراوە کە خێراییەکەت پێ دەڵێت بە کۆمپیوتەر و وەك باسیشی دەکەن پەیوەستە بە پۆلیسەوە چەندین جار ئەو تابلۆیانەمان تێپەڕ کرد برادەرێك کە شارەزای یاساکانی هاتوچۆ بوو وتی: کاکە حەمە ئەوە ئاگادارت دەکاتەوە بەخوا هێواشی نەکەیتەوە پۆلس دەگاتە سەرمان بەم نیوەشەوە کەس لەجادەدا نیە و تۆش بەو خێراییە دەڕۆیت دواتر وادەزانن کەسی خراپین!،منیش وتم: برا گیان من پەنجەمۆری وڵاتی(ئەڵمانیا)م هەیە و لە بەر بێ ئیشی و قەرزاری هاتووم بۆ ئێرە تکا دەکەم با توشی کێشە نەبین!، بەڵام خوا ماڵی کاکە حەمەمان ئاوا کرد هیچ گوێی نەدا بەو وتانە و لەوەڵامدا دەیوت درەنگە







و کاکە خەمت نەبێت گەر سنورداش کرایتەوە خۆم دەتهێنمەوە لەسەر حسابی خۆم!، بەڵام دواتر واش دەرنەچوو!
پەنجەرەی لای شۆفێریش شکا بوو بە مقەبا و تیپ پێوەی نابۆیەوە دواتر زانیمان کە بەهۆی تیژ ڕەویەوە چەند ڕۆژێك پێش ئەوەی ئێمە بەرێت بۆ ئیش وەرگەڕاوە و دوو نەفەری ناردووە بۆ نەخۆشخانە و ئێمەی خستۆتەوە شوێنیان و بەنەفەرەکانیشی وتووە نابێت لای کەس باسی بکەن، لەو وتانەدا بووین کاتێکمان زانی سەیارەیەك لەدوامانەوە دەرکەوت و کەوتە فول لێدان بۆمان ئەو برادەرە وتی: برام بوەستە بەخوا لەگەڵ ئێمەیەتی و وابزانم پۆلیسە!، بەڵام دووبارە کاکە حەمە گوێی پێ نەدا و هەر دەڕۆشت تا فەڕارەی داگیرساند وتم: برا بوەستە دڵنیابە کە پۆلیسە!، کەچی سەیردەکەم دەڵێت: جا تۆ بڵێی لەگەڵ ئێمەی بێت؟
وتم: نا لەگەڵ باوکمیەتی لە کوردستان وتم: کێ لەسەر ئەم جادەیە دەڕوات غەیری بەڕێزت بەم نیوە شەوە؟، هەرچەند هاوارمان لێکرد نەوەستا نزیکەی یەك چارەکی تر ڕۆشت بەخوا کاتێکمان زانی پیشیشمان لێگیرا و بوون بە دوو سەیارەی پۆلیس دەتوت فلیمە و ئێمەش ئەکتەر ئیتر هەموومان دەستمان کرد بە هات و هاوار و وتمان: وابزانین تا کۆپتەری پۆلیسیش هەڵنەستێن بەسەرمانەوە باوەڕ ناکەیت!، وتمان: کاکە بیوەستێنە تا برۆیت خراپتر دەبێت و دەمانخەیتە ژێر گومانەوە سەیر دەکەم کاکم بەڵگەنامەی شۆفێریشی پێ نیە و چەند جارێکی تریش گیراوە و غەرامەی لەسەرە!،
وە تەرد و ڕەفزیشی هەیە فەقیرە لەهەمووی خۆشتر کە وەستا پۆلیسەکان لە پێش و پاشەوە دەرگای شۆفێر و سەکنیان کردبۆیەوە و میلی دەمانچەیان ڕاکێشابوو هاواریان دەکرد پڕ بەدەنگیان و دەیانوت: ئێوە کێن و بۆ کوێ دەڕۆن وا هێندە خێران؟ کەچی کاکە حەمە دەڵێت: گێرە گێر ئەوە چی دەڵێیت وەڵا زمانیش نازانم تا لێتان حاڵی بم ئەرێ ئەوە کەستان نیە زمان بزانێت تەرجومەم بۆ بکات؟،







بە هەناسەیەکی توندەوە و زەردەخەنە و پێکەنینەوە ڕووم کردە برایەك لەگەڵم دا بوو، وتم: بەخوا جوان دەڕۆینەوە چۆن ڕیشی خۆمان خستە بەردەستی کاکە حەمە!، هەر چۆنێك بێت برادەرێك ئینگلیزی دەزانی و وتی: کاکە داوا دەکات شۆفێر دابەزێت و هەردوو دەستیشی لەسەر سەری بێت و نەفەرەکانی تریش هەموویان پاڵ بکەون و سەریان داخەن لەناو دۆڵمشەکەدا!، پێش ئەوەی دابەزێت وتی: کاکە با نەزانێت بۆ ئیش دەڕۆین چونکە ئیشەکەمان ڕەشە و سۆشیال پێمان بزانێت پارەمان دەبڕێت و دەریشمان دەکەن لە خانودا دەڵێین: برادەرێکی کوردمان مردووە و دەڕۆین قەبری بۆ هەڵدەکەنین!، هێندە داماو بووین شتێکیشمان وت کە هەرگیز جێی باوەڕ نیە!، چونکە مردن و گۆڕ هەڵکەندنیش لەو وڵاتانە کاری شارەوانیە و دەبێت ڕووداوەکەش ڕاستی بێت ناتوانی بەو جۆرە درۆیانە خۆت ڕزگار بکەیت چونکە بەدواداچوونی بۆ دەکرێت!،بۆنی ناو دۆڵمشەکەش دەتوت دەواجینی مریشکە! ئیتر کاکە حەمە دەستی خستە سەر ملی و بەرەو لای پۆلیسەکان بەڕێکەوت و من و برایەکیش کە پەنجەمۆری وڵاتانی ترمان هەبوو بڕیارماندا ڕا بکەین!
پاش ئەوەی کاکە حەمە چووە بەردەمی پۆلیسەکان و لەدوورەوە گوێمان لە هات و هاواری پۆلیسەکان بوو پییان دەوت بۆ ڕاتنەگرتووە و بۆ کوێ دەچیت بەم نیوەشەوە بەم نەفەرانەوە؟، کاکە حەمە گیانیش هەر دەیوت: بەخوا تێناگەم هێژن چی کاکە غەرامەتان ناوێت بینووسن بابچێتە سەر ئەوانی تر!،وەرەقەی تەرد و ڕەفزەکەشی دەرهێنابوو بەکوردی دەیوت: هەر ئەوەشم پێیە بەڵگەنامەی شۆفێریشی تەواو نەبوو!
لەوکاتەدا یەکێك لە پۆلیسەکان هاتە لای ئێمە و لە پەنجەرەی دۆڵمشەکەوە سەیرێکی ناوەوەی کرد و وتی: کەس هەڵنەستێت و داشنەبەزێت و کەوتە پرسیارکردن وتی: بۆ کوێ دەڕۆن؟، برادەرێکیش وتی: بۆ گۆڕ هەڵکەندن، هاوڕێیەکمان مردووە! هەر ئەوندەمان خۆش بوو دەرگای دواوەی دۆڵمشی کردەوە، خەریك بوو بۆنی ڕیقنەی

مریشـك هەناسـەی سـوارکات بەپەلە دەرگاکەی داخسـتەوە نـاهەق نـاگرم کەسـمان فریـای خۆشـۆردن نەکەوتـین بەهـۆی هەڵەی کـاکە حەمەوە بـۆنی دەواجینەکەمـان لێـدەهات لە هەمـووی ناخۆشـتریش ڕەشپێستێکیشـمان لەگەڵـدا بـوو هێنـدەی تـر خستینیە ژێر گومانەوە چونکە ڕەشپێستەکان بە دز و پیاوکوژ و شەڕانی ناسراون لە وڵاتی(بەریتانیا) ئێمەی کورد و ئەو ڕەشپێستەش وەك جیاوازی زەوی و ئاسمان وا بوو! پاش کەمێك پۆلیسەکە هاتەوە بۆ لامان داوای وەرەقە و ئایدی کارتی لەسەرنشینەکان کـرد چەنـد کەسـێکمان پێمـان نەبـوو وە هێشـتا مـن بـۆم دروسـت نەکرابـوو تەنها وەرەقەیەکـم بـۆ کرابـوو کەنـاوی خـۆمی لەسـەر بێـت ئەویشـم لەنـاو جـزدانەکەم دا لەپەلەپەلیدا لێ بەجێما لەماڵەوە هەندێکیش پێیان بوو نەیانوێرا دەری بخەن و وتیان: کـاکە دواتـر پـارەی سۆشـیال و ناسـمان دەبڕێـت و خانومـان لێ وەردەگیرێتەوە بـۆیە هەمـوو وتمـان: پێمـان نیـیە!، بەڵام پۆلیسـەکە وتـی: گەر وابێـت دەبێـت بتـانبەین بـۆ بنکەی پۆلیس کێ دەڵێت ئیوە نەفەری تازە نین و بە قاچاخ نەهاتونەتە ئەم وڵاتە! بەو شێوەیە کاکە حەمە غەرامە کرا و هاتەوە لامان و وتی:پۆلیسەکە بەئیشارەت پێی وتوم کەسـیان وەرەقەی پێ نـیە و یەکێکیشـیان بـۆ دڵنیـایی بەڵگەیەکمـان پیشـان بـدات ئیزنتان دەدەین: هەرچەندە وتی: کاکە یەکێك وەرەقەیەکیان بداتێ باشترە با نەمانبەن بـۆ بـنکە دواتـر هەمـوو شـتێکمان کەشـف دەبێـت لەوێ، بەڵام بەداخەوە کەس خـۆی نەخسـتە ژێـر بـارەوە، بـۆیە دوو سـەیارەی پۆلیسـەکە پێش و پاشـیان لێگـرتین و بەرەو نزیکترین بـنکەی پۆلیسـیان بـردین و مـن و ئەو برایەشـی کە پەنـجە مۆرمـان هەبـوو لەڕێـگەدا ویسـتمان دەرگـاکە بکەیـنەوە و ڕابکەیـن بەڵام مـن ڕازی نەبـووم و وتـم: بـا بەهۆی ئێمەوە توشی گرفـت و لێپێچینەوە نەبن تـازە بـابڕۆین و جزدانیشـم لەبیرچـووە بەم نیوەشـەوە لەم چـۆڵەوانیەوە بـۆ کـوێ بـڕۆین؟ هەرچی نوسـرابێت لای خـوا هەر ئەوەیە و گەڕانەوەی نییە!




کاتێك گەشتینە بنکەی پۆلیس یەك یەك بردینیانە ژوورەوە و وەرگێڕیان خستە سەر تەلەفون و دەستکرا بە لێکۆڵینەوە و هەر لەسەرەتاوە ئاشکرا بوو کە بۆ ئیش دەڕۆین و ئیشەکەش ڕەش بوو لەڕووی یاساییەوە چونکە کارتی ئیشمان نەبوو وە لەسەر سۆشیال و ناس بووین!، پاش لێکۆڵینەوەکە یەك یەك دەیانبردین بۆ ژووری تاکە کەسی و هەتا بەرەبەیان تێر بۆی خەوتم لەهەمووی ناخۆشتر لەوشوێنەدا توشی لەشگرانی هاتم و خەریك بوو ئەو دڵەم دەتەقی لەبەر خۆمەوە دەموت: تخوا ئەمە کات و شوێنی لەشگرانییە؟، نەمدەزانی چۆن خۆم بشۆم!، چونکە تەنها تەوالێتێك لەژوورە تاکە کەسیەکاندا هەیە و ئاوی تێدا نییە!، بەناچاری بە تەیەموم نوێژی بەیانیم کرد!
سەر لەبەیانی دەرگای زیندان کرایەوە و پارچەیەك پەنیر و سەمونیان لەسەر قاپێك بۆ هێنام و پاش ئەوە بردیانم بۆ لێکۆڵینەوە و جیهازێکیان خستە بەردەمم وەك مۆبایلی سورەیا وابوو پەنجەی شایەتومانمیان خستە سەری و بردمیانەوە بۆ زیندانە تاکە کەسیەکە!، پاش یەك کاتژمێر هاتنەوە بەدوامدا و وتیان تۆ پەنجەمۆری وڵاتی(ئەڵمانیا)ت هەیە و دەبێت دەستبەسەر بیت لای ئێمە و ڕەوانەی زیندان و کەمپی داخراوت دەکەین تا ئەوکاتەی بڕیاری وەرگرتنەوەت دێت لە وڵاتی(ئەڵمانیا)وە و برادەرەکانیشت چاوەڕوانت دەکەن لەدەرەوە چونکە تەنها تۆ مابوویت لێکۆڵینەوەت لەگەڵ بکرێت ئێستا پێیان دەڵێین بڕۆن و چاوەڕوانت نەکەن.
بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەوبرایەی تر پەنجە مۆرەکەی دەرنەچوو منیش سوپاسی خوای گەورەم کرد و وتم دیارە خێری تێدایە و خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێت چی باشە بۆ بەندەکانی هەر ئەو شەوە داوام کرد لەبەرپرسی زیندانەکە کە دەمەوێت خۆم بشۆم و وتم: من مسوڵمانم و لە شەو ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژ دەکەم ئاویش لە ژوورەوە نییە بۆیە لەوکاتانەدا لەدەرگا دەدەم بۆم بکەنەوە تا دەست نوێژەکانم بگرم ئیتر خوا هیدایەتیان بدات بردیانم بۆ حەمام و غوسڵم دەرکرد دواتر داوای قورئانێکم کرد






وتیـان: داوای لێبـوردن دەکەیـن لێـرە دەسـتمان ناکەوێـت بەڵام کەچـوویتە کەمـپە داخراوەکە مزگەوتیشی تێدایە و لەوێ قورئانت دەست دەکەوێت!

بەو شـێوەیە سـێ شـەو و دوو ڕۆژ لەو زینـدانە تاکەکەسـیە مـامەوە پۆلیسـەکان زۆر ڕێزیـان لێـدەگرتم کەزانیـان نـوێژ خـوێنم جـاری واهەبـوو دەرگای ژوورەکەیـان لەسـەر دانەدەخسـتمەوە کۆتـا شـەوم بـوو لە زینـدانەکە کـاتژمێر دوانـزەی شـەو وبـو بەسەیارەیەکی پۆلیس بە چەند کاتژمێرێك بردیانم بۆ کەمپێکی داخراو کەتایبەت بوو بەو نەفەرانەی پەنجەمۆریان هەبوو یان سنورداشی وڵاتی خۆیان دەکرانەوە لەویادا دەیانهێشـتنەوە تـا ئەوکـاتەی سـنورداش دەکـرانەوە کەمـپەکە وەك زینـدانی گەورە بەتەلبەنـدی بەرز و گەورە دەوری درابـوو لەبەشی دەرەوەشـیدا دیـوارێکی بەرز بـوو کە ئەگەر تەلبەندەکانیشت ببڕیبایە ڕزگار بوونت ئاسان نەبوو!،بۆیە هەر هەوڵدانێك بۆ ڕاکردن بێ سـوود بوو.ناو کەمپەکە خۆش بـوو مزگەوتی تێدابوو هەفتانە لەدەرەوەی کەمـپەکە ئیمـامی بـۆ دیـاری کرابـوو وە شـوێنی هـۆڵی وەرزشـی یـاری ئاسـن و تێـنس و بلیـاردو پلەیستەیشـن و تـۆپی پێشی تێـدابوو سینەمایەکی گەورەشی تێدا بـوو شـەوانە دەیـانکردەوە و فلیمێکی پۆلیسـیان دەخستەسـەر بۆمـان تـا بێتـاقەت نەبین بێ لەوەش مەکتەبەیەکـی گەورەی تێـدا بـوو بە چەنـدین زمـانی وڵاتـان کتێبـی تێـدابوو ڕۆژانە وەرتدەگرت و لەکاتی خۆیدا دەبوایە بتبردایەتەوە،

بەڵام بەداخەوە کەمترین کتێبی کوردیـت دەسـت دەکەوت یـان هەر نەبـوو تیایـدا کـابینەی تەلەفـونی تێـدا بـوو مـارکێتێکی بچوکیشـی تێـدا بـوو دەتتـوانی پەیوەنـدی بەدەرەوە بکەیت و جیهازێکیشـیان دابـوو بە هەمووموان نەدەبـوایە دامانـنایە و دەبـوایە وەك بـازن بمـانکردایەتە دەسـتمان چـونکە گەر زەنگـی لێبـدایە دەبـوایە خێـرا لەو شوێنەدا دەسکی تەلەفونت هەڵبگرتایە چونکە یان ئیشیان پێت دەبوو یان پەیوەندی دەرەوەت بۆ دەهات و بەو شێوەیە دەتتوانی پەیوەندیشت بۆ بێت لەدەرەوەی زیندان







لەڕێی ژمارەی زیندانەکەوە تەنها ناوی کەسەکەت بە ڕاستی دەوت ئیتر بۆتیان وەردەگرت لەشەو و ڕۆژێکدا سێ جار خواردنیان دەدا لە چێشتخانەیەکی گەورەدا و دەبوایە ئامادە بویتایە لەکاتی خۆیدا ئەگینا دواتر دادەخرا و بێبەش دەبوویت لەخواردن خواردنی حەلاڵیشیان ئامادە دەکرد بۆ مسوڵمانەکان لەکاتژمێر دەی شەویشەوە پاش تەماشاکردنی فلیمە سینەماییەکە ئینزاری چوونە ژوورەکان لێدەدرا و دەرگا سەرەکیەکان دادەخرا! ئیتر کەس بۆی نەبوو هاتووچۆ بکات تەنها دەرگای ژوورەکەی خۆت کراوە بوو لەسەر بەشی تەوالێت و حەمامەکان و هەر ژوورەش چەند نەفەرێکی تێدابوو!

ئەوەی کەجێی نیگەرانیم بوو ئەو ناوەی بۆم هاتبوو لە وڵاتی(ئەڵمانیا) ناوەکەی خۆم نەبوو ناوی کەسێکی تر بوو! دەترسام توشی کێشەم بکات کە ویستی خوا وابوو

توشی نارەحەتی و ئازاری زۆریشی کردم تائێستاش کە ئەم چیرۆك و ڕووداوانە دەنووسمەوە لەلایەن وڵاتی(ئەڵمانیا)وە چارەسەری کێشەکەی نەکردوم لە ڕێکخراوی(یۆرۆ داك)دا کە تایبەتە بە پەنجەمۆری ئەو وڵاتانەی ڕۆژئاوا کە ئەندامن لە وەرگرتنی پەنابەردا! چونکە لەسەری دەکەوێت و دەبێت باجیشی لەسەر بدات لەبەر ئەوەی ژیانی منیان خستۆتە نارەحەتی و ئازار و زیندانی و خەتەریات لە بری کەسێکی تر تەنها لەناو وڵاتی(ئەڵمانیا)دا پاش زیندانی کردنم و نارەحەت کردنم کە بەتەواوەتی بۆیان ڕوون بۆیەوە ئەوکاتە ئەو هەڵەیەیان ڕاست کردۆتەوە و بەناوە ڕاستیەکەم بانگم دەکرێت! بەڵام بڕۆمە هەر وڵاتێك خۆم تەسلیم بکەم و داوای مافی پەنابەری بکەم کاتێك پەنجەمۆری(ئەڵمانیا)م دەردەچێت هەمان ناوم بۆ دێتەوە کە ناوی ئەو کەسەیە کە منیان لەجیاتیدا ناردۆتەوە بۆ وڵاتی(نەمسا) بەڵام وڵاتی(ئەڵمانیا) پەردەپۆشی ئەم ڕاستیانەی کردوە و مافی مرۆڤ لەهەندێك وڵاتی







ڕۆژئاواش تەنها مرەکەبی سەر کاغەزە و چەندێك هەوڵمداوە هیچیان بۆ نەکراوە و خۆیان لە باسەکەم دزیوەتەوە!
بابێینەوە سەر باسەکە و دەزانم هێشتا ڕوون نیە لای هەندێکتان گەر بەردەوام بیت لەگەڵم إن شاءالله ئەوە بە جوانی بۆت ڕوون دەبێتەوە و دەگەیتە ئەنجام کە وڵاتی(ئەڵمانیا)ی نازی و ڕەگەزپەرست چی بەسەر من و دەیان پەنابەری داماو و دەربەدەردا هێناوە کە پەنایان بردۆتە بەر ئەو وڵاتە و داوای پەنابەرییان کردوە!، سوپاس بۆ خوا نهێنیەکی گەورە لەپشت ئەم گیران و سنورداشیەوەم هەبوو بۆ ئەوەی بەتەواوەتی بۆم ڕوون بێتەوە بۆچی من سنورداشی وڵاتی(نەمسا)کراومەتەوە؟، ماوەی هەفتەیەك لەو کەمپە مامەوە و پەیوەندیم کرد بە پارێزەرەکەم کە کوردێکی خەڵکی شاری(هەولێر)بوو باسی ژیانی خۆمم بۆ کرد کە وڵاتی(ئەڵمانیا) چۆن ئازاری داوم و سنورداشی وڵاتی(نەمسا)یان کردومەتەوە بەبێ ئەوەی لەو وڵاتە خۆم تەسلیم کردبێت و پەنجەمۆرم هەبێت لەسەر ناوەکەش قسەم لەگەڵ کرد بەڵام بەداخەوە وتی: تۆ ئێستا پەنجەمۆری(ئەڵمانیا)ت هەیە و بڕیاریشی داوە وەرتبگرێتەوە ناویش کێشە نیە چارەسەر دەکرێت بۆیە هیچمان پێ ناکرێت و هەردەبێت سنورداش بکرێیتەوە و لەوێ چارەسەری کێشەکەت دەکرێت!.دوای هەفتەکە پۆستم بۆ هات کە سنورداشم بکەنەوە خۆمم ئامادەکرد و بردیشیانم بۆ فڕۆکەخانە بەڵام ویستی خوا وابوو بەفرێکی زۆر باری بوو چونکە کاتەکە لە سەروی نیوەی مانگی دوانزەی ساڵی(٢٠٠٣)دا بوو ئەو ڕۆژە گەشتی فڕۆکە وەستا و سنورداش نەکرامەوە! بردیانم بۆ کەمپێکی داخراوی تری نزیك فڕۆکەخانەی(هێترۆ) لەشاری(لەندەن) کە ڕۆژانە و شەوانە فڕۆکەکان زۆر بە نزمی هاتووچۆیان دەکرد بەسەرماندا ئەو کەمپەش وەك کەمپەکەی پێشوو وابوو بەڵام جیاوازیەکەی ئەوەبوو سینەمای تێدا نەبوو بەڵام ژووری کۆمپیوتەری تێدابوو هەر ژوورە و تەلەفزیۆنی خۆی تێدا بوو لەگەڵ ڤیدیۆی کاسێتدا دەتتوانی لە







مەکتەبەکە ڕۆژانە کاسێتی ڤیدیۆیی وەرگریت و دواتر بتبردایەتەوە وە هەر لەناو ژوورەکانیشدا تەلەفونێکی پەیوەندی کردنی تێدا بوو ڕۆژانەش وەك کەمپەکەی پێشوو نەبوو تا شەو بتوانیت بچیت بۆ هۆڵی وەرزش و مزگەوتەکە بەڵکو تەنها چەند کاتژمێرێك دەکرایەوە و دادەخرا دەبوایە زوو بچوویتایەتەوە ژوورەکەی خۆت!
بەو شێوەیە پشووی سەری ساڵی نوێش هاتە پێشەوە و وتیان: تازە لە مانگی یەکدا و پاش کریسمس سنورداشت دەکەینەوە و دەبێت چاوەڕوان بیت تا ئەوکاتە بەهۆی پشووەوە، ئیتر بەناچاری پەیوەندیم کرد بە خێزانمەوە کە ئەوکاتە دەستگیراندارم بوو بەتەنها ئەوم ئاگادارکردەوە لەناو کەسوکارم دا کە گیراوم و پێموت: سنورداشی وڵاتی(ئەڵمانیا)م دەکەنەوە و ئەویشم هێنایە ناو خەمەکانی ژیانمەوە چونکە لەسەرەتاوە بەڵێنمان داوە پێکەوە شان بخەینە بەر ناڕەحەتی و خۆشیەکانی ژیانمان سوپاس بۆ خوا! جێگای خۆیەتی کە سوپاسی سەرجەم ئەو برا دیندارانەم بکەم کە لەبەر خوا یەکمان ناسی بوو بەبێ ئەوەی خزم و دۆست یان خەڵکی ناوچەیەکیش بین بەردەوام بێ پەیوەندیان نەکردوم و برایەکی خۆشەویستیشم لە ئیش و کاری خۆی گرت و هات بۆ سەردانیم و هەندێ پارەشی بۆ هێنام بەدیاری زانی کە هیچ پارەم پێ نیە ئەگەرچی ئەو کەسەی دوور و نزیك منی ناسیبێت سوپاس بۆ خوا دەزانێت کەوا عیزەتی نەفسم ڕێگەی نەداوم کە خۆم وا دەرخەم نەبوو بووبێتم!
بەڵام خوای گەورەش چەندین مسوڵمانی بۆ خوا سوڵحاوی بۆ ڕەخساندوم کە بێن بەدەممەوە لەوکاتانەی کە موحتاج بووم هەر بۆیە تا ڕۆژی دوایی ئەو چاکانەم لەیاد ناچێت داواکارم لەخوای گەورە هەر مسوڵمانێك ڕۆژێك لەڕۆژان هاوکاری ئەم بەندە تاوانبارە و ماڵ و منداڵی کردبێت دەرفەتم بۆ برەخسێنێت کەوا خزمەتی بکەم یان خۆی لەپاداشتی نەبڕاوەی بێبەشیان نەکات و پێداویستییەکانیان جێ بەجێ بکات!







چووینە ساڵی نوێوە و نزیکەی بیست و یەك ڕۆژ لەهەردوو کەمپی داخراودا مامەوە و لە بەرواری(٧/ ١/ ٢٠٠٤)دا لەڕێی فڕۆکەخانەی(هێترۆ)ی شاری(لەندەن)ەوە بەرەو فڕۆکەخانەی شاری(شتوت گارت)ی وڵاتی(ئەڵمانیا)یان ناردمەوە پاش ئەوەی بەسەیارەیەکی پۆلیس بردیانم بۆ فڕۆکەخانە تەسلیمی پۆلیسیان کردم و پۆلیسێکی مەدەنیم لەگەڵدا هات و سەیرێکی کردم و وتی: تۆ لە کوڕێکی خراپ ناچیت و نامەوێت کەلەپچە بکەمە دەستت بۆ ئەوەی خەڵکی بە خراپ سەیرت نەکات وتی: ئایا دەتەوێت کەلەپچەت بکەمە دەست و دەستت بەخۆمەوە بێت یان بەڵێنم دەدەیتێ ڕانەکەیت؟ منیش کەمێك ئینگلیزی شەق و شڕ فێر ببوم و بە زەردەخەنەیەکەوە وتم: دڵنیات دەکەم خۆشت بڵێی بڕۆ من ناڕۆم چونکە من مسوڵمانم و درۆ ناکەم لەگەڵت وەڵامەکەی زۆر بەلاوە جوان بوو زۆر سوپاسی کردم و تا بەردەم فڕۆکەکە هات لەگەڵم و ماڵئاوایی لێکردم بەو شێوەیە بۆ یەکەم جار سواری فڕۆکەش بووم و ماوەی کاتژمێر و نیوێك بە ئاسمانەوە بووین و پاشان گەشتینە شاری(شتوت گارت) لەڕێگە کەسێك هاتە لام وتی: تۆ دامەبەزە تا کۆتایی نەفەرەکان، چونکە پۆلیس دێت وەرتدەگرێت منیش چاوەڕوانم کرد تا هەموو نەفەرەکان دابەزین و پاش کەمێك سەیارەیەکی پۆلیس هات و دوو پۆلیس هاتن بەرەو ڕووم بەساردیەکەوە پێشوازیان لێکردم و خێرا کەلەپچەیان کردم و لەگەڵ خۆیاندا سەریان خستم و بردیانم بۆ ژووری لێکۆڵینەوە!

کاتێك بردیانم بۆ ژوورەکە یەکیان وتی: بۆ چوویت بۆ(بەریتانیا)؟، منیش وتم(ئەڵمانیا) دەزانێت! ئیتر پۆشاك و جل و بەرگەکانمیان پێ لابردم و یەك یەك کەشفیان دەکرد دەتوت تێنتیم پێیە هێندە بێ هەست بوون نەیاندەوت ئەم کەسە ئێستا لە زیندانەوە هاتۆتەوە بۆ لای ئێمە و پێشتریش پشکێنراوە! بەهەرحاڵ پەنجەمۆری سەر کاغەزیان پێکردم و وێنەیەکیان گرتم و هەر لەویا دایان لە وەرەقەیەك و وتیان: ئەمە وەك





بەڵگەنامەیەك پێت دەبێت تا دەچیتەوە کەمپەکەت و دواتر پیشانی سۆشیالەکەتی دەدەیت لەوێ بۆت دەگۆڕن و ئیش و کارەکانتی پێ جێبەجێ دەکەن!
بەڵام کاتێك سەیری ناوەکە و کەمپەکەم کرد نەناوی خۆم بوو نە کەمپەکەی پێشووتری خۆشم بووا، هەرچەندە وتم ئەو ناوە و ئەو شوێنە هی من نەبووە بەڵام گوێیان بۆ نەگرتم و وتیان: لەوێ لەڕێی سۆشیالەکەتەوە چارەسەری کێشەکەت بکە پاش کاتژمێرێك پۆلیسێکیان هێنامیە دەرەوە و بردمی بۆ وێستگەی شەمەندەفەر و دەستی کرد بەناو گیرفانم دا و وتی دەبێت لەسەر حسابی خۆشت بڕۆیتەوە بۆ کەمپەکەت چوو پارەی پاوەنەکەی گۆڕیەوە بۆ دراوی یۆرۆ و بلیتێکیشی تا کەمپەکە پێ بڕی و باقیەکەی دایەوە دەستم و بەبێ پێدانی ناونیشانی کەمپەکەم بەجێی هێشتم و وتی: خۆت دەزانی لە کوێیە و ئیتر ڕۆشت!
منیش هەر لەویادا کارتێکی کابینەم کڕی و پەیوەندیم کرد بە ناسراوێکمەوە لەشاری(شتوت گارت) و هەواڵم دایە کە لە فڕۆکەخانەم و بەرەو ماڵی ئەوان بەڕێدەکەوم دەمەوێت پشوویەك بدەم و بۆ ڕۆژی دواتر دەڕۆم بۆ کەمپەکە بەو شێوەیە ئەو شەوەم بەسەر برد و بەیانی ئەوبرایە هات لەگەڵم تا بەردەرگای کەمپەکە چونکە ناونیشانی کەمپەکەی دەزانی نزیکەی بیست دەقە بە شەمەندەفەر دوورە لە شاری (شتوت گارت)ەوە گەشتینە کەمپەکە و ئەو برایە ماڵئاوایی لێکردم و وتی: پاش ئەوەی جێ و شوێنیان بۆ دیاری کردیت وەرەوە بۆ لای من.
خوا پاداشتی بداتەوە زۆر ئەرکی پێوە کێشاوم لە وڵاتی(ئەڵمانیا)!،بەڵام هەر ئەوەندەم خۆش بوو چوومە ژوورەوە بۆ ناو کەمپ و چووم بۆ لای سۆشیال ئیتر ئازار و ناڕەحەتی لێرەوە دەستی پێکردا!
کاتێك چوومە ژووری سۆشیالەکە دوو کارمەندی ئافرەتی لێ بوو سڵاوم لێکردن و وەرەقەکەم پێدان کە لە فڕۆکەخانەی(شتوت گارت)بۆیان کردبووم بەناوی کەسێکی




تـرەوە و وتـم: ناونیشــانی ئێرەیــان پێــداوم و وتویــانە ئەمە شــوێنتە کاتێـك ســەیری وەرەقەکەیان کردم وتیان: ئەم ناوە لێرە هەیە و کەسەکەش نیشتەجێی ئەم کەمپەیە یانی چی دووکەس بەم ناوەوە لە یەك کەمپدا؟!،منیش وتم: دەبێت پرسیار لە پۆلیسی فڕۆکەخـانە و کاربەدەسـتانی وڵاتـی خۆتـان بـکەن نەك من؟،چـونکە منـیش بـۆ خـۆم توشــی شــۆك و سەرســوڕمان بــووم کە لەم مــاوەیەدا هەنــدێك شــتی ســەیرم بەسەرداهاتووە! وە لەلایەن وڵاتی (ئەڵمانیا)وەو توشی ناڕەحەتیەکی زۆرتان کردوم بە بێ تاوان!، بەشێوەیەك کە بڕوا ناکەم لەوڵاتانێکی دواکەوتوشدا ئاوا مامەڵە لەگەڵ مرۆڤێکی بێ تاواندا بکەن! بەهەرحاڵ شوێنیان بۆ دابین کردم و هەندێك پێداویستیان پێدام و ناردمیان بۆ ژوورێك لەناو کەمپەکەدا و وتیان: ئەوە ژووری خۆتە و لەڕۆژانی داهاتوودا هەوڵ دەدەین چارەسەری ئەم کێشەیە بکەین بەڵام کاتێك چوومە ژوورەکە ســەیر دەکەم کـوردێکی خەڵکی بادینـانی لێـیە و پـاش سـڵاو کـردن و هەواڵ پرســین شـێوەیم کـرد و کەمێك شێوەشمان دەچوەوە سەر یەك ئەو منی ناسیەوە بەڵام من خــۆم پــێ نەناســاند کەوتیــنە گفتوگــۆ و وتــی نــاوت چیــیە: منــیش بە زەردخەنە و پێکەنینەوە وتم: هێندە ناویان لێناوم نازانم کامیانت پێ بڵێم؟

بەڵام باشــترە ئەم نــاوە تــازەیەت پــێ بڵــێم کە لێرە بۆیــان دانــاوم بــۆ ئەوەی ســەر لە بەڕێزیشـت نەشـێوێت چـونکە تـا ئێسـتا خۆشـم نـازانم چی نهێنیەك هەیە لەم ڕووداوە سـەختانەی بەسـەرم دا تێپەڕ دەبێت هەر ئەوەنـدەی نـاوەکەم پێـوت خێرا ڕەنگی زەرد هەڵـگەڕا و وتـی: کـاکە ئەوە نـاوی مـنە و بێـزەحمەت بـا سـەیرێکی وەرەقەکەت بـکەم لەگەڵ پیشانم دا وتی: چۆن شتی وادەبێت؟ خۆ ناوی باوك و باپیریشم و ناوچەکەشم هەر هی منە! چۆن دەبێت کەسێکی تر بەناوی منەوە لەم وڵاتەدا بژی؟منیش وتم: دەی کەوایە خێرا بابچین بۆ لای سۆشیال تا ئەم کێشەیە چارەسەر بکەین لەگەڵ وام وت: کەمێـك بیـری کـردەوە و وتـی: هەرچی سـەیری تـۆ دەکەم لەشـوێنێك تـۆم بینیـوە تـۆ






کێیت؟ کاکە من دەمێکە لێرەم و وا خەریکە کارتی ئیش وەردەگرم ئەگەر دەزانی لەم وڵاتە نامێنیتەوە بڕۆ باشترە با کێشەش بۆ من دروست نەبێت! سبحان الله هەر لەخۆمەوە کاتێك ئەو قسانەی کرد کەوتمە گومان لێی وتم: جا بۆ من دەبمە کێشە بۆ بەڕێزت؟ وتی: نا هەروا وا دەڵێم ئیتر چووین بۆ لای سۆشیال و هەردووکمان وەرەقە و ناسنامەکانمان پێدان و وتمان: چۆن دەبێت دوو کەس لەیەك شوێن بەیەك ناوەوە بن؟ ئیتر سۆشیالەکە پەیوەندی کرد بە سەرووی خۆیەوە و خێرا ناونیشانێکیان پێداین بڕۆین بۆ ئەو جێگایە تا چارەسەری کێشەکەمان بکەن!

لەهەمووی خۆشتر ئەو برادەرە خۆی سوور کردبۆیەوە لای سۆشیالەکە و خۆی بەخاوەنی هەق دەزانی و ئێمەش بە تاوانبار! نەیدەزانی کەوا پێچەوانەکەیەتی و هەرچی نارەحەتی و باج هەیە من لەجیاتی ئەو داومە و لەجیاتی ئەو سنورداشی وڵاتی(نەمسا)بکرێتەوە، منیان ناردۆتەوە بۆ ئەو وڵاتە پێکەوە ڕۆشتین بۆ ئەو شوێنەی ناونیشانیان پێدابووین و وەرەقە و ناسنامەکانمان پێدان وتیان: چاوەڕوان بن تا بزانین کێشەکەتان چییە؟ بەڵام چاوەڕوانیەکەمان بۆ فریودان بوو چونکە خۆشیان نەیانزانی کێشە چییە! پاش چەند دەقەیەك کاتێکمان زانی دوو سەیارەی پۆلیس بە لورە لور گەشتنە بەردەم شوێنەکە و ئێمەش وامان زانی شتێك ڕوویداوە!، نەمانزانی هاتوون بۆ دەستگیرکردنی ئێمە!، چەند پۆلیسێك هاتنە ژوورەوە زۆر بەشێوەیەکی ناشرین داوایان لێکردین کە ڕوومان وەرگێڕین تا کەلەپچەمان بکەن!،

هەرچەندە داوامان کرد بۆ وادەکەن بێ سود بوو کەلەپچە کراین و براین بۆ بنکەیەکی پۆلیس و بەجیا خراینە ژووری تاکەکەسیەوە لەویادا سوپاسی خوای گەورەم کرد لەسەر تاقیکردنەوەکانی و زۆر بەتاسەوە داوای پشتیوانی و هاوکاریم لێکرد ئەو ڕۆژە هێشتینیانەوە و بۆ ئێوارەکەی پارچەیەك سەمونی بچوك و کەمێك پەنیریان بۆ هێنام و ئیتر کەس لێی نەپرسیمەوە هەتا ڕۆژی دواتر ئەوەی کەزۆر پێی نارەحەت بووم ئەوە







بوو دەرگایان نەدەکردەوە کە بتوانم دەستنوێژ بگرم بۆ نوێژەکانم چونکە شوێنەکە تەنها تەوالێتێکی تێدا بوو ئاوی پاك و خواردنی تێدا نەبوو ڕۆژی دواتر هاتن بەدوامدا و وەرگێڕیان هێنا کەوتنە لێپێچینەوەم و پاش ئەوەی لێکۆڵینەوە تەواو بوو وتیان: جارێ دەبێت لای ئێمە بمێننەوە تا کێشەکەتانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە و چارەسەری دەکەین بردیانمەوە بۆ ژوورە تاکە کەسیەکە!

لەوکاتەی کە ویستیان بمبەنەوە بۆ زیندانەکە وتم: من مسوڵمانم و تەنها دەمەوێت لەکاتی نوێژەکانم دا دەرگام بۆ بکەنەوە کەدەستنوێژ بگرم چونکە ئاوی تێدا نییە بەڵام وەڵامیان نەدامەوە و بردیانمەوە بۆ ژوورەکە زەنگێکی پەیوەندی کردن بەدیواری ژوورەکەوە بوو بۆ حاڵەتی پێویستی چەند جارێك زەنگم لێداو داوای ئەوەم کرد کەوا دەرگای ژوورەکەم بۆ بکەنەوە و دەموت: پێویستم بە ئاوە بەڵام بێ سوود بوو!، چەند جارێك لەدەرگاکەم دا دەهاتن لە پەنجەرەی دەرگا ئاسنەکەوە سەیرێکیان دەکردم و بەبێ وەڵام دانەوە دەڕۆشتن نەدەرگایان لێ دەکردمەوە نە خواردنێکیشیان بۆ دەهێنام ئەوەی ناوی ویژدان بێت لە ناخی پۆلیسی وڵاتی(ئەڵمانیا)دا نییە بەناچاری نوێژەکانم بە تەیەموم کرد و برسێتی زۆری بۆ هێنام و تا شەو هیچیان بۆ نەهێنام دووبارە لە زەنگم دایەوە و لەدەرگاکەم دا پۆلیسێك هات و وتی: چیت دەوێت؟، منیش وتم، منیش مرۆڤم و پێویستم بەخواردنە وەك ئێوە! لەوەڵامدا وتی: دەبێت پارەم بدەیتێ تا بچم خواردنت بۆ بکڕم چونکە لێرە خواردن نیە منیش وتم: دەکرێت زیندانی بە بێ ویستی خۆی و بێ تاوان زیندان بکرێت و خۆشی خواردن بکڕێت لە زینداندا؟،وتی: ئەوە کێشەی من نیە و دەرگاکەی داخست و ڕۆشت!

لەگەڵ ڕۆشت هاتمە لای دەرگاکە و دەستم کرد بە هاوارکردن بەدەنگی بەرز وە کەوتمە لێدانی دەرگای زیندانەکە هەتا ناچارم کردن پارچەیەك پەنیر و سەمونیان بۆ هێنامەوە لەگەڵ چایەکدا ئەو شەوەشم بەو شێوەیە بەسەر برد تا ڕۆژی سێیەم هات







و سەیرم کرد بەهیچ شێوەیەك لێیان نەپرسیمەوە تانزیك نیوەڕۆکەی نەدەرگایان لێ کردمەوە نە خواردنێکیشیان بۆ دەهێنام بۆیە دووبارە کەوتمەوە لێدانی زەنگ و دەرگاکە تا ئەم جارەیان دوو پۆلیس هاتن و دەرگایان کردەوە و سوورکارێکی بالا بەرز سمێڵێکی سووری هەبوو زۆر بە بێ ئەدەبی وتی: چیت دەوێت؟، منیش وتم:خۆ پیاوکوژتان نەگرتووە هەڵەیەك کەخۆتان کردوتانە دەبێت خۆتان باجی بدەن نەك ئێمەی بێ تاوان!،بۆچی منتان هێشتۆتەوە لەم زیندانە تاکەکەسیەدا؟

ئاوا مافی مرۆڤ دەدەن لە وڵاتەکەتاندا؟ زۆری پێناخۆش بوو بەڵام دەیوت؟ من هیچ نازانم و دەبێت ئارامت هەبێت تا بزانین کێشەکەت چی بەسەر دێت؟

وتم:جا بۆ لێرەدا دەمانهێڵنەوە خۆ ئێمە ڕاناکەین و خۆمان بەپێی خۆمان هاتووین تا کێشەکەمان چارەسەر بکەن!، بەڵام ئەوان جەنگی دەروونیان لەگەڵدا دەکردم ویستی بڕوات و دەرگاکە دابخات، وتم: دەمەوێت بڕۆم دەست و دەموچاوم بشۆم من لەشەو و ڕۆژێکدا دەبێت پێنج جار نوێژ بکەم و پێویستم بە ئاوە دەبێت یان ئاوم بۆ بێنن یان دەرگام بۆ بکەنەوە لەوکاتانەدا کەچی هێندە بێ ئەدەب بوو وتی: دەتوانیت لەئاوی تەوالێتەکە بەکار بهێنیت بۆ خواردن و دەست و دەموچاو شۆردن!، لەگەڵ وای وت منیش وتم: سەرەتا تۆ وەرە لێی بخۆرەوە و دەموچاوتی پێ بشۆ ئەوکات منیش وادەکەم! بەو وتەیە زۆر تورە بوو هاتە پێشەوە و ئاگام لەخۆم نەبوو زلەیەکی لێدام و بەهەردووکیان گرتیانم و کەلەپچەیان کردم بەو شوێنەوە کە لەسەری دەخەوتم ئیتر منیش وتم: خوای گەورە خۆت ئاگاداری بەندەکەتیت و تا توانام هەبوو هەوڵم دا کە بتوانم بەدەستی بەدەست نوێژەوە نوێژەکانم بکەم بەڵام ئەوە حاڵی بەندەکەتە لێم ببورە کە بە تەیەموم و دەستی کەلەپچەوە نوێژەکانت بۆ دەکەم و تکا دەکەم عوزرەکانم قبوڵ بکە!





بەو شێوەیە بانگم دا و دەستم کرد بە نوێژ کردن دیاربوو ئەوان بە کامێرا سەیریان دەکردم کاتێك جوڵەی کڕنوش و چەمینەوەکانیان بینیم وام هەست کرد کە بزانن خۆم لەناو دەبەم!، لە ڕکاتی کۆتاییدا بووم دەنگێکی زۆری تەپەی پێ دەهات بەرەو لای ژوورەکەم سەرەتا پەنجەرەی دەرگاکەیان کردەوە و هەرچەندە بانگیان کردم و کەوتنە گفتوگۆ کردن لە دوورەوە من هیچ وەڵامم نەدانەوە و بەردەوام بووم لەسەر نوێژەکەم تا ئەوەی بەپەلە دەرگایان کردەوە و لەکاتی تەحیات خوێندندا بووم چەند کەسێك خۆیان دا بەسەرم دا و هەر هات و هاواریان بوو خوا دەزانێت دەتوت پیاوکوژیان لەبەردەستە بەو کەلەپچەیەشەوە سەرەتا نەیانوێرا بێنە پێشەوە تا دانیشتم و لەکاتی تەحیات خوێندندا خۆیان دا بەسەرم دا باوەڕتان بێت لەسەر دەم پاڵیان خستم و لە پشتەوە کەلەپچەیان کردم ئەوکاتە سەلامی نوێژەکەمم دایەوە هیچ خۆمم تێك نەدا پاش ئەوەی هەڵیانساندم و دوو پۆلیس ئەملاولایان گرتم و دووان سیانێکیش لەپێش و پاشەوە دەڕۆشتن منیش زەردەخەنەیەکم بۆکردن لەوکاتەدا هینامیانە دەرەوە سەیرم کرد کوڕەکەی تریش لە ژوورەکەی تەنیشتم بوو ئەویشیان هێناوەتە دەرەوە بەڵام هیچ پۆلیسێکی لەگەڵدا نەبوو.

وتم" ئەوە تۆش ماویت لێرە پسمام؟ وتی: ئەرێ وەڵا برام بۆ ئاوات کرد ، وتم: ئەی بۆ وامان لێدەکەن بەبێ تاوان؟،گەر هۆکار ئەو هاوار و دەنگە دەنگەی من نەبوایە دەبوایە تا چەند ڕۆژتێکی تر هەر لەم شوێنە تەنیاییەدا بماینایەتەوە!،خێرا پۆلیسێك وتی: بۆتان نیە قسە بکەن پێکەوە سواری دوو سەیارەی پۆلیسیان کردین بەجیا!،

پێش من ئەویان سواری سەیارەیەك کرد کە تەنها دوو پۆلیسی لەگەڵدا بوو بە شۆفێرەکەوە بەڵام من دوو پۆلیس ئەملاولایان گرتم و سەرکەوتن لەگەڵم دا لە بەشی دواوە دوو پۆلیسیش لە پێشەوە سەرکەوتن بە شۆفێرەکەوە و بردینیان بۆ شوێنێك وتیان: دادگایتان دەکرێت وەرگێڕێکی کرمانجیان هێنابوو باوەڕ بکەن لە






زمانی(ئەڵمانی)یەکە باشتر تێدەگەشتم بەڵام بۆ کوڕە بادینیەکە باش بوو چووینە ژوورێکەوە ئافرەتێکی بەتەمەن دانیشتبوو کەوتە پرسیارکردن لێمان ناوی خوێندینەوە هەردووکمان هەستاینە سەرپێ.

وتی: سەرتان لە منیش شێواندووە وتی: ناوت چییە بە من؟ منیش ناوە ڕاستیەکەی خۆم و ناونیشانی پێشووی نیشتەجێبوونم لەوڵاتی(ئەڵمانیا) پێوت دوای ئەوەی هەندێك پرسیاری لەو برادەرەش کرد و ڕووی کردەوە بەلای مندا وتی: ئەی بۆ ئەم ناوەت ساختە کردووە و بەناوی کەسێکی ترەوە وەرەقەت دروست کردوە؟

منیش دەستم کرد بەپێکەنین و وتم: ئافەرین بۆ وڵاتی پێشکەوتو تائێستا بۆتان ڕوون نەبۆتەوە کە ئەم وەرەقەیە لە فرۆکەخانەی(شتوت گارت)ی خۆتان لەلایەن پۆلیسەوە بۆم کراوە و پێشم وتون ئەوە ناوی من نییە بەڵام کێ گوێ لە ئێمەومانان دەگرێت؟، هەر هەڵەیەك ڕوویدابێت ئێوەن تاوانبار نەك من!

پاش نیو کاتژمێر هیچی بۆ ڕوون نەبۆیەوە دیار بوو زۆر ڕەگەزپەرست بوو هەرگیز ئامادە نین دان بەهەڵەکانی خۆیان دا بنێن گەر بشزانن تاوانبارن کارێکت لەبەرامبەردا دەکەن کەوا هەرچی تۆمەتە بەسەر تۆدا ساغی بکەنەوە! ئیدی خۆی تورە کرد و وتی: بەتۆمەتی ساختە کردنی ناوی یەك وتی: هەردووکتان یەکی یەك ساڵ حوکمن و ئێستاش داوا دەکەم بتانبەن بۆ زیندانی چاوەڕوانی تا ڕۆژی دادگایی کردنتان و یەکلایی بوونەوەی کێشەکەتان منیش وەك پیشەی هەمیشەییم زەردەخەنەیەکم کرد و وتم: خوایە سوپاس بۆ تۆ هەرچی تۆ ویستت لەسەر بێت هەر ئەوە دەبێت!،

بەڵام ئەو برادەرە خەریك بوو دەست بکاتە گریان و هەندێك ئەملاولای کرد بێ سوود بوو خێرا کەلەپچە کرایەوە دەستمان و بەرەو زیندانی چاوەڕوانی شاری(شتوت گارت) بەرێ کراین!







پاش ئەوەی بڕیاردرا دەستبەسەر بکرێین تا ڕۆژی دادگایی کردنمان بڕیارەکە لە ڕۆژێکەوە تا ساڵێك زیندانی کردن بوو بردینیان بۆ زیندانێك لەدەرەوەی شاری(شتوت گارت) بەناوی(کامپس فێلد) زیندانێکی گەورە بوو لە چەند قاتێکی بەرز پێك هاتبوو هەرچی پیاوخراپ و پیاوکوژ و دز بوو تیایدا کۆببۆیەوە تا خەڵکێکی بێ تاوانی وەك ئێمەش!

کاتێك گەشتینە زیندانەکە بە دەرگایەکی گەورەدا چووینە ژوورەوە و بەدیواری پتەو و پۆڵاینی بەرز چواردەوەری زیندانەکە گیرا بوو لەسەر دیوارەکانیش تەلبەندڕێژ کرابوو کە هیچ کەس نەیدەتوانی بیری ڕاکردن بکاتەوە تیایدا.

هەر قاتێکی زیندانەکەش تایبەت بوو بە کۆمەڵێك تاوانەوە و دەیان ژووری تێدا بوو هەر ژوورەو پەنجەرەیەکی گەورەی تێدا بوو کە ناو شاری(شتوت گارت)ت لێوە دیاربوو بەڵام لەدیوی دەرەوە بە ئاسن و تەلبەند دەوری گیرابوو!، ساحەیەکی گەورەش هەبوو لەناو زیندانەکەدا تایبەت بوو بەوکەسانەی کە حوکم درابوون تیایدا، لەگەڵ چووینە ناو زیندانەکە خێرا پۆشاکەکانیان پێ داناین و هەرچی کەلوپەلمان هەیە لێیان وەرگرتین بۆمان نەبوو پارەشمان پێ بێت و لای خۆیان بۆیان هەڵدەگرتین و هەرکات پێویستیت پێی بوایە داوای ئەشیات دەکرد و لەپارەکەتیان سەرف دەکرد پاشتر یەکی بەدلەیەکی ڕەساسیان پێداین و وتیان: هەر ئێستا خۆتان بگۆڕن لەگەڵ خاولیەك و فلڵچە و مەعجونێکدا، پاش ئەوە بردینیانە ژوورێکەوە وێنەیان گرتین ، ئەو شەوە بردمیانە ژوورێکی کاتییەوە زۆر ناخۆش بوو لەگەڵ چەند کەسێکدا بووم هیچیان کورد یان عەرەب یان مسوڵمان نەبوون و هەمووشیان سەروچاویان لەپیاوخراپ دەچووا!،

زۆر ناخۆشە کە لە ناو زینداندا بیت و هاوڕێ و هاوزوبان هاودەمت نەبێت و زمانی(ئەڵمانی)ش نەزانیت بۆ بەیانیەکەی ناویان خوێندمەوە و بردیانم بۆ قاتی پێنج وابزانم زۆر لەیادم نەماوە چەند بووا چوومە ژوورێك سێ کەسی تری تێدا بوو کە





یەکیـان (ئەڵمـانی)بوو دووانیشـیان کرمـانجی (تورکیـا)بوون خـوا هیـدایەتیان بـدات ئەگەرچی بیر و باوەڕمان لێك جیاواز بوو بەڵام ڕێزمان لەیەك دەگرت و بۆ منیش باش بـوو کە دوو کەسی هاوزوبـانی خـۆمم دۆزیەوە ئەگەرچی مـن کرمـانجیم نەدەزانی بەڵام دەمانتوانی لێك حاڵی ببین!

هەر ژوورەو دوو قەرەوێـڵەی دوو نەفەری لەســەر یەك تێـدابوو بـێ لەوەش دۆڵابێکـی چـوار تـاکی تێـدا بـوو بـۆ پۆشـاك و جـل و بەرگ وهەرکەسـەو تـاکێکی خـۆی پێـدرابوو تەوالێت و شـوێنی دەسـت شـۆردن و ئـاو خواردنەوەشی تێدابوو لەگەڵ تەلەفزیۆنێکدا لەشـەو و ڕۆژێکیشـدا سێ جـار خواردنیـان بـۆ دەهێنـاین و کـاتی دەرگا کردنەوەشـمان دووجـار بـوو ڕۆژانە بەیانیـان و پاشـنیوەڕوان بـۆ مـاوەی کاتژمێر و نیوێك بـۆ دووکاتژمێر دەیـانبردینە سـەربانی زینـدانەکە لەوێ پیاسـەت دەکـرد یـان یـاری تێـنس کە تەنهـا ئەو یـاریەی لێ بـوو زۆر بەئاسـانی بەرتنەدەکەوت، نـاچـار بوویت تەنها ڕابکەیت یـان پیاسـە بکەیت لەبەر ئەوەی لاشەت قورس نەبێت بەمانەوەی ناو زیندانەکە بەشی سەرەوەش بە تەلبەندێکی زۆر پتەو و بەهێز گیرابوو هەفتەی یەك ڕۆژیش دەیانبردین بۆ حەمام تا خۆمـان بشــۆین بەڵام بەداخەوە حەمــامەکە ژوور ژوور نەبــوو! بەڵکـو حەمــامێکی گەورەبـوو چەنـد دووشـێکی ڕەشـاش و فـوارەی لێ بـوو دەبـوایە دەیـان نەفەر پـێکەوە بەڕووتی خۆیـان بشـۆردایە لەویاشـدا ناچاربووم کە تراکسـودەکەم دانەکەنم تـا گیـانم دەرنەکەوێت کە زۆرجار دەبوویتە جێگای سەرنجی زیندانیەکان! چونکە ئەوان بەڕووتی خۆیان دەشۆرد و گوێیان پێ نەدەدا کەچی ئەوەی منیان بەلاوە سەیر بوو!،

سـوپاس بـۆ خـوا تەنهـا جارێـك چـوومە ئەوێ و بـاقی جارەکانی تـر لەنـاو تەوالێـتەکەی ژوورەکەم دا بە ئـاوی سـارد خـۆم دەشـۆرد ئەگەرچی نەفەرەکانی هـاوڕێم پێیـان نـاخۆش بـوو بەڵام گـوێم پـێ نەدەدان ناخۆشـترین شـتی نـاو زینـدانەکە ڕێـگە پێـنەدان بـوو بـۆ پەیوەندی کردن بە کەسوکار و دەرەوە لەڕێی پەیوەندی تەلەفونی و دەبوایە ناونیشـانی






کەسێکت لابوایە و بەڕێگەی نامە ناردن هەواڵی خۆتت بگەیاندایە بەو شێوەیە هەفتەیەکم بەسەر برد تا داوای قورئانێکم کرد لە بەرپرسی زیندانەکە وتی : لەبەر ئەوەی مسوڵمانی زۆر تێدایە لە کتێبخانەی زیندانەکە قورئانی لێ نەماوە هەرکات دانەیەك گەڕاوە بۆتی دێنم ڕۆژێکیان ئافرەتێك هاتە ژوورەکان دەگەڕا پێی دەوترا سۆشیالی یارمەتیدەر بۆ کێشەی زیندانەکان داوام لێکرد کە لەڕێی ژمارەی ناسراوێکمەوە کەسوکارم ئاگاداربکرێتەوە کە من دەستبەسەرم لەو زیندانەدا چونکە هیچ کەسێك لە کەسوکارم نەیاندەزانی چیم بەسەر هاتووە و بێئاگا بوون لێم! باش بوو ڕازی بوو وە ژمارەکەی وەرگرت و دواتر لەڕێ ئەوەوە زانرا کە من دەستبەسەرم!

یەکێك لە هاوڕێ کرمانجەکان کەسێکی زیرەك بوو کاتێك بەسەرهاتی ژیانمم بۆ گێڕایەوە، وتی: هیچ خەمت نەبێت بەزووترین کات ئازادت دەکەن چونکە دڵنیابە ئێستا بەهۆی ئەو هەڵەیەی کە وڵاتی(ئەڵمانیا) ئەنجامی داوە ئەم چەند ڕۆژە بە جددی بەدوای ئەم کێشەیەدا دەڕۆن بەس بزانن تاوان و هەڵەکە لەخۆیانەوەیە بەزووترین کات ئازادت دەکەن تا هەرچۆنێك بێت پەردەپۆشی بکەن و یاساییەن لەسەریان نەکەوێت!

منیش وتم: ئەی مافی من؟، ئەو هەموو سنورداشی و گیران و ناڕەحەتی و ئازارەم چی لێ بەسەردێت؟، وتی: گەر بە نیازی ئەمان بیت ئەوە هێندە ڕەگەزپەرستن بەتەمای هیچ مەبە و دڵنیابە هەوڵ دەدەن تاوانباریشت بکەن! تەنها دەتوانیت لەڕێی پارێزەرەوە خۆت داوای مافی خۆتیان لێ بکەیتەوە منیش زانیم کەوا کێشەکەم زۆر ئاڵۆزە و بەئاسانی بۆیان ڕووننابێتەوە،

هەستام بە دوور و درێژی بەسەرهاتی خۆمم نووسیەوە لەسەر چەند پەڕەیەکی گەورە لەو ڕۆژەی کە وڵاتی(ئەڵمانیا) سنورداشیان کردمەوە بۆ وڵاتی(نەمسا) تا هێنانەوەشم لە وڵاتی(بەریتانیا)و تۆمەتبار کردنم و زیندانی کردنم لەلایەن وڵاتی(ئەڵمانیا)وە







لەگەڵ گیرانی ئەوکەسەی کە پەنجەمۆرم لەگەڵیدا تێکەڵ کراوە و هەرچی نارەحەتی بەسەر من هاتووە لەسەر ئەو کورە بووە کە لەگەڵ مندا گیراوە کردمە ناو زەرفی نامەیەك و پوڵی دەرەوەی وڵاتم لێدا کە هەر لەناو زیندانەکەدا دەیاندا پێمان دواتر ناردم بۆ ئەو ناونیشانەی ماڵەکەم کە لەوڵاتی(بەریتانیا) تیایدا نیشتەجێ بووم بۆ ئەو هاوڕێیەم کە پێکەوە خۆمان تەسلیم کرد لەوێ چونکە ئەدرەسی ماڵەکەم بەجوانی لەبەر کردبوو وە ژمارەی ناسراوێکم کە لە وڵاتی(ئەڵمانیا) نیشتەجێ بوو بۆم نووسیبوو کە بەزووترین کات پەیوەندیان پێوە بکات و پاریزەرێکم بۆ بگرن و ئەگەر توانیشت ئەم نامەیەیان پێ بگەیەنە یان بۆیان باس بکە تا وڵاتی(ئەڵمانیا) کێشەکەم بە لایەکی تردا نەبات و پاش ئەو هەموو نارەحەت کردنەشم دووبارە تاوانبارم بکاتەوە!

هەڵبەتە من دەمزانی ئەم نامەیە بەرپرسانی زیندانەکە نایگەیەننە شوێنی مەبەست و تەنها مەبەستم ئەوە بوو کەوا ئەو ئاڵۆزیەی بەسەریاندا هاتووە لەسەر من و ئەو کورەی بەناوی ئەوەوە بانگیان دەکردم و لەجیاتی ئەو سنورداشی وڵاتی(نەمسا) بکەنەوە منیان دا بەداری گۆڵەکەدا!، بۆیان ڕوون ببێتەوە و چیتر لەو شوێنەدا نەمهێڵنەوە! وە لەو زیندانەش بۆیە تەنها ڕێگە بە نامە دەدرا تاوەکو نامەکە وەربگێڕدرێتە سەر زمانی(ئەڵمانی) و بزانرێت چی تێدایەباوەڕ بکەن پاش دوو بۆ سێ ڕۆژ لە ناردنی نامەکەم کاتێکم زانی دەرگای ژووری زیندانیان کردەوە و بەو ناوە ئەسڵیەی کە کاتی خۆی خۆم لە وڵاتی(ئەڵمانیا) تەسلیم کرد بانگیان کردم منیش سەرەتا لەداخدا وەڵامم نەدانەوە هاوڕێکانیشم وتیان: ئەو ناوە لێرە نییە!، نەیانزانی بۆ خۆمم! کارمەندەکە زۆری بەلاوە سەیر بوو!

دووبارە ڕۆشت و پاش کەمێك هاتەوە وتی تۆ ناوت چیە؟ منیش ناوی کوڕەکەم پێدا کە بەزۆر سەپاندبوویان بەسەرم دا وتی: نا تۆ ناوت ئەوە نەبووە پێشتر؟ منیش وتم: با بەڵام بۆ واتان لێکردم ناویشتان گۆڕیوم و تاوانباریشتان کردوم؟ وتی: من نازانم و تۆ







بڕیاری ئازادکردنت دەرچووە و بەم ناوەش ناوت هاتۆتەوە و هەر ئێستاش دەچیتەوە بۆ کەمپەکەی یەکەم جارت!

سەرەتا ویستم کەمێك خۆم ناڕەحەت بکەم بەڵام یەکێك لە هاوڕێکانم وتی: پسمام ئێستا بڕۆیتە دەرەوە باشترە بەخوا نەڕۆیت بەشەق دەتبەن ، با توشی کێشەش نەبیت چی دەکەیت لێرە بڕۆ لەدەرەوە کێشەکەت چارەسەر بکە منیش بەپێکەنینەوە وتم : ئەوە بەڕاستە مادەم بوو بە قسەی خۆش هەرئێستا دەڕۆم! ئیتر خۆم کۆکردەوە و ماڵئاواییم لێکردن!

بەو شێوەیە سوپاس بۆ خوا بەهۆی نامەکەوە کە وەریان گێڕابۆیە سەر زمانی(ئەڵمانی) تەواو کێشەکەیان بۆ ڕوونبۆیەوە و لەو زیندانە ناخۆشەدا ڕزگارم بوو! کە سوپاس بۆ خوا زۆر خۆڕاگربووم تیایدا و بۆ تەنها ساتێکیش یادی خوام لەبیر نەکردووە و ناشوکریم بەرز نەکردۆتەوە بەناخی دڵیشم!، کاتێك هاتمە دەرەوە سەیر دەکەم ئەو برادەرەشی کە هەرچی ناڕەحەتی هەیە لەسەر جەنابی توشم بووە ئازاد کراوە و هاتە دەرەوە سەرەتا بوو بە دەنگەدەنگمان و زۆر قسەم پێ وت و سوێندم دا کە پەنجەمۆری وڵاتی(نەمسا)ی هەیە؟ وتی: ئەرێ وەڵا من پەنجەمۆری ئەوێم هەیە بەڵام من نازانم بۆ تۆیان ناردۆتەوە لەجیاتی من؟ دواتر بۆمان ڕوونبۆیەوە کەوا ئەوکاتەی پەنجەمۆر کراوین ئەوکەسەی پەنجە مۆرەکەی پێکردوین وێنەی منی داوە لە پەنجەمۆرەکەی ئەو کوڕە و وێنەی ئەویشی داوە لە پەنجەمۆرەکەی من لەشاری(میوشن) کاتێك پەنجەمۆری وڵاتی(نەمسا)ی ئەو کوڕە دەرچووە بەبێ ئەوەی جارێکی تر پەنجەمۆر بە من بکەنەوە لەسەر پەنجەمۆری ئەو کوڕە منیان سنورداش کردەوە بەشێوەیەکی زۆر خراپ و نامرۆڤانە پاش ئەوەی لەگەڵ ئەو نەفەرە ئازاد کراین زۆر داوای لێکردم کە پارێزەر نەگرم بۆ چارەسەری کێشەکەمان چونکە کێشە بۆ ئەو دروست دەبێت و بە وتەی خۆی کاتی وەرگرتنی کارتی ئیشی نزیك ببۆیەوە منیش





پـێم وت: بەڕێـزەکەم تـۆ بەچی ڕوویەکەوە ئەو داوایە لەمـن دەکەیـت؟، پـاش ئەوەی لەسـەر بەڕێزت ژیانم فەوتـا!، لەجیاتی داوای لێبوردن بکەیت کە نازانم تۆ دەستکاری وەرەقەی پەنجەمـۆرەکەت کـردووە ئەو ڕۆژەی پـێکەوە پەنجەمـۆر کـراین یـان هەڵەی کارمەنـدەکە بـووە؟! وتم تـۆ: دەزانی من چیم بەسـەر هـاتووە ئەم ماوەیە؟، لەسـەر ئەم پەنجەمۆرە قۆڕەی جەنابت چیان پێکردوم؟

وتـم: داوای لێبـوردن دەکەم مـن دەبێـت پـارێزەر بگـرم و ئەم پەنجەمـۆرەی تـۆ لەکـۆڵی خۆم بکەمەوە خـوا دەزانێت تۆ خەریکی چی کارێکیت؟ بۆ لەهیچ و خـۆڕایی بەبێ تـاوان ئەم هەمـوو قوربـانیە بدەم؟بەشـێوەیەك منیـان سنورداشـی وڵاتی(نەمسـا) کـردۆتەوە دەتوت پیاوکوژیـان گرتـووە! لەو وتـانەدا بـووم، وتی: ڕاسـتیەکەی من کارتی ئیش تەزویـر دەکەم بۆ خەڵکی ئەم جـارەش کە پێکەوە گیراوین چـوونەتە ژوورەکەم زۆر وەرەقەیـان گرتووە لەژوورەکەم دا! بۆیە ئەگەر پارێزەرت گرت ئەوە ژمارەکەمە پەیوەندیم پێوە بکە من دەبێت لێرە هەڵبێم چونکە توشی کارەسات و دادگا دەبم!

بەڕاستی زۆرم بەلاوە سـەیر بوو ئا لەویادا نهێنی ئەم گیران و سـنورداش کردنەوانەم بۆ ڕوونبـــۆیەوە کەوا خـــوای گەورە ویســـتی وابـــووە هەم تاقیمبکـــاتەوە! وە هەم لە پەنجەمۆری ئەم کەسە ڕزگارم بکات! چـونکە بەپێی وتەکانی خـۆی دەرکەوت کە ئیشی یاسـاغ دەکات گەر ئەوگیرانەش هۆکار نەبـوایە پێکەوە ئەوە هەرچی تـاوانی ئەو هەبـوو بەسـەر منـدا سـاغ دەبـۆیەوە چـونکە پەنجەمـۆری ئەو لەسـەر نـاوی مـن بـوو منـیش لەسەر ناوی ئەو! کە دواتر پارێزەرێکی (تورك) زیاتر ئەم باسەی بۆ ڕوون کردمەوە!

بە شـەمەندەفەر گەشتینەوە ناو شاری(شـتوت گارت)و ماڵئاوایمان لەیەك کرد منیش چـوومەوە بـۆ مـاڵی ناسـراوێکمان سـەرگوزەشـتە و ڕووداوەکانی خـۆمم بـۆ گێڕایەوە خـوا پاداشـتی بـداتەوە بەزووتـرین کات پەیوەنـدی کـرد بە پـارێزەرێکی (تـورك)ەوە و کاتی بـۆ




دیاری کردین و چووین بۆ لای و پاش باسکردنی ڕوداوەکان وتی: من ناتوانم لەسەدا سەد بەڵێنتان پێ بدەم کەوا شکاتەکەمان سەرکەوتوو دەبێت!
بەڵام ئەوەی کە زۆر گرنگە دەبێت وەك لە وڵاتی(ئەڵمانیا) پەنجەمۆرەکان ڕاست کراونەتەوە دەبێت سەرەتا ئێمە کاربکەین بۆ ئەوەی پەنجەمۆرەکانیش لە ڕێکخراوی (یۆرۆداك) چاك بکەین چونکە بەدڵنیاییەوە وڵاتی(ئەڵمانیا) لەوێ چاکی نەکردووە تا توشی کێشەی یاسایی نەبێت! چونکە لەوێ ئەندامی ئەو وڵاتە ئەوروپاییانەی تێدایە کە پەنجەمۆری پەنابەرانی تێدا هەڵدەگیرێت! بەو هۆیەوە سزا دەدرێت لەبەر ئەوەی مافی کەسێکی پێشێل کردووە و لەسەر کەسێکی تر توشی ناڕەحەتییان کردوە!
منیش لەویادا وتم: بێزەحمەت ئایا چەند کاتمان دەوێت بۆ چارەسەری کێشەکان؟ وە چەند پارەی دەوێت؟ وتی: نازانم چەندی پێدەچێت بەڵام دەبێت چاوەڕوان بیت چونکە کێشەکەت ئاڵۆزە! وە من بۆ چاککردنەوی پەنجەمۆرەکەت و شکاتکردن لەو پۆلیسەی لێی داویت پێنج سەد یۆرۆم دەوێت! سەرەتا پەنجا یۆرۆ مانگانەش ئەوی ترم دەوێت!، لەڕاستیدا بەهۆی ئەوەی کە کەسوکارم و خۆشم قەرزار بووین و خاوەن قەرزیش زۆریان بۆ کەسوکارم هێنابوو دەستخۆشیم لە پارێزەرەکە و ئەو ناسراوەشمان کرد و وتم من دووبارە ئێرە بەجێ دەهێڵمەوە و ئەو توانایەم نیە وە لێرەش ئەو هەموو چاوەڕوانیە کاتم لێ دەبات و ئیشیشم دەست ناکەوێت تا بتوانم قەرزەکانمی پێ بدەمەوە پاش ئەوە ناردیانم بۆ کەمپێکی تر لە نزیك شاری(هایل برۆن) شارۆچکەیەکی بچوك هەبوو ناوی(نیکارس ئولم)بوو دووەمین گەورە کۆمپانیای دروستکردنی سەیارەی(ئاودی) لێ بوو کەڕۆژی هەشت سەد سەیارەی لێ دروست دەکرا! چونکە کەمپەکەی خۆم داخرابوووە نەفەرەکانی نقڵ کرابوون بۆ ئەم کەمپە کاتێك گەشتمەوە کەمپەکە چوومە لای سۆشیال و هەندێك ئەشیای پێدام و ڕێنماییان کردم بۆ ژوورێك سەیرم کرد شەش نەفەری تری تێدایە و منیش بووم بە






بـارێکی تـر بۆیـان و بـووین بەحەوت! لەدوای ئەوە ناردیـانم بـۆ بەشـی پەنـابەران بـۆ پێـدانەوەی ئۆزبـایزەمەکەم بەڵام وەك باسـیان دەکـرد کابرایەکی سـمێڵ بـابڕی سـمێڵ سـوری نـازی لێ بـوو کە زۆر ڕقی لەپەنـابەران بـوو کەس نەیـدەوێرا گفتوگۆی لەگەڵـدا بکات!

هـاوڕێیەکم زمانی(ئەڵمـانی) دەزانی لەگەڵـم هـات بـۆ لای و بەبێ ئەوەی هـیچم لەگەڵـدا بڵێت وەرەقەیەکی بۆ کردم بۆ دوو هەفتە و وتی:

با پاش دوو هەفتەی تر بێتەوە بۆ لام پاش دوو هەفتەکە چوومەوە بۆ لای سـەرەتا زۆر بێ شـەرمانە وتی: بۆ هـاتوویتەوە بۆ(ئەڵمانیا) برۆرەوە بـۆ وڵاتێکی تـر منیش وەرەقەکەم لێ وەرگرت و وتم: ئەگەر ڕاستگۆیت پەنجەمۆرەکەم بسـڕەوە ئەگەر لەماوەی بیست و چـوار کـاتژمێر ئەم وڵاتە جـوانەتم بـۆ بەجێنەهێشـتیت ئەوە سنورداشـی وڵاتەکەی خـۆمم بـکەنەوە گەر پـاش ئەوکـاتە گیرام!،باوەڕتـان بێـت لەگەڵ وام وت خێـرا وەرەقەکەی لێ وەرگـرتم و بـۆ مـانگێکی تـر بـۆی تـازە کـردمەوە و وتی: مـادەم وایە بـڕۆیتە هەر شـوێنێك دەتهێنمەوە!، منیش بە پێکەنینێکەوە بۆ ئەوەی زیـاتر دەمـاری بگرم وتم: جـا منـیش ئەوەم دەوێـت چـۆن دڵـم دێـت ئەم وڵاتە جێ بهێڵم ئەوە بـۆ خۆشـی وام پێ وتیـت!، بـاوەڕ بـکەن دەموچـاوی هێنـدەی تـر سـور هەڵـگەڕا و بـوو بەتەمـاتەی سـورەوەکراو هـاتینە دەرەوە لەگەڵ ئەو هـاوڕێیەی وەرگێـڕی بـۆ دەکـردم و وتـی: ئەی ئافەرین باوەڕ بکە تا ئێستا کەس نەیوێراوە ئاوا گفتوگۆی لەگەڵ بکات!

بەو شـێوەیە چـوومەوە مـاڵی ئەو ناسـراوەمان کە پێشـتر لەلایـان دەژیـام و مـاوەی دوو مـانگێکی تـر لە وڵاتی(ئەڵمانیـا) دانیشـتم مانگانە وەرەقەیـان بـۆ تـازە دەکـردمەوە و بـۆ ئەوەی پەردە پۆشی کێشەکەم بکەن و لەسەر وڵاتی(ئەڵمانیا) نەکەوێت

دۆسیەکەیان داخستم و(دۆڵدنیان) پێدام ئەوکەسەی شارەزا بێت لە یاسای ئەو وڵاتە دەزانێت(دۆڵـدن) بـدرێت بەهەرکەسـێك ئەوە سـەرۆکی ئەو وڵاتەش ناتوانێـت دۆسـیەی





بكاتەوە بە ئاسانی! یان ئەوەیە دەبێت ئەو وڵاتە بەجێبهێڵیت یان دەبێت تاماوە ئاوا ژیان بەسەر بەرێت! منیش چونكە پارێزەرم نەبوو ئەوان زیاتر هەلەكەیان بۆ ڕەخسا و بەتەواوەتی دەستم لە وڵاتی(ئەڵمانیا) شۆرد و دووبارە بڕیارم دا بەرەو وڵاتی(بەریتانیا) بەڕێ بكەومەوە و بۆ هەتاهەتایە حەوت بەرد فڕێ بدەم بەدوای وڵاتی(ئەڵمانیا)دا.

دووبارە پەیوەندیم كردەوە بەو برایەی كە جاری پێشووتر هاوكاری و ڕێنمایی كردم بۆ وڵاتی(بەریتانیا)و ئاگادارم كردەوە كە من ئەم جارە دێمەوە بەڵام نامەوێت خۆم تەسلیم بكەمەوە لەبەر پەنجەمۆرەكەم بەڵكو دەمەوێت بەدوای ئیشدا بگەڕێم تاوەكو قەرزەكانم بدەمەوە خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە وتی: من لەخزمەتتدام هەر لەلای خۆشم دەتهێڵمەوە هەتا ئەوكاتەی ماڵم هەبێت من خاوەنی نیم و جێگای شانازیە برایەكی وەك تۆ لەگەڵم دا ژیان بەسەر ببات ئەوەش تەنها لەفەزڵی خوای گەورەیە و هیچ ئازایەتییەكی ئەم بەندە تاوانبارەی تێدا نییە.

بەو شێوەیە نزیك بوونەوە لەمانگی چواری ساڵی(٢٠٠٤) و كەمێك سەرما و سۆڵەكەی خستی و پێش تەواوبوونی كاتی وەرەقە یەك مانگی یە دۆڵدنەكەم بڕیارم دا جارێكی تر وڵاتی(ئەڵمانیا) بەجێبهێڵم دووبارە لەڕێگەی وڵاتی(فەرەنسا)وە بەڕێكەوتمەوە بۆ وڵاتی(بەریتانیا).

لێرە بەدواوە دەچینە سەر باسی چیرۆك و ڕووداوەكانی دووەم سەفەركردنم لە وڵاتی(ئەڵمانیا) بۆ وڵاتی(فەرەنسا)و لەوێشەوە بۆ وڵاتی(بەریتانیا)(٢٠٠٤-٢٠٠٥)

## دووەم سـەفەرکردنم لەوڵاتی(ئەڵمانیـا) بـۆ وڵاتـی (فەرەنسـا)و لەوێشەوە بۆ وڵاتی(بەریتانیا) (٢٠٠٤-٢٠٠٥)

پـاش ئەوەی بـێ هیـوا بـووم لە وڵاتی(ئەڵمانیـا)و دۆسـیەیان داخسـتم و مانگـانە وەرەقەیـان بـۆ نـوێ دەکـردمەوە! دووبـارە بڕیـارم دا بەڕێگەی قاچـاخ خـۆم بگەیەنمەوە وڵاتی(بەریتانیا) بەڵام ئەم جارەیـان بەنیـاز نەبـووم خـۆم تەسـلیم بـکەم لەو وڵاتە تەنها بۆ ئیش و کار ڕۆشـتمەوە تـا بتـوانم هاوکاری کەسـوکارم بکەم بۆ دانەوەی قەرز پاشـان ئەوکاتە خێزانم مارە بکەم چونکە هەر لە کوردستان دەستنیشـانم کردبوو!

بۆ ئەو مەبەسـتە ئەم جـارە لەشـاری(شـتوت گارت)ەوە لەڕێی ناسـراوێکەوە بلیتی پاسـی نێـوان شاری(شـتوت گـارت) بـۆ شـاری(پاریس)ی پـایتەختی وڵاتـی (فەرەنسـا)مان بـڕی سـەر لە ئێـوارە و کاتی خۆرئاوابون ڕۆژی شـەممە بـوو وابـزانم بەڕێ کەوتـم ، بـۆیە بلیتی شەویشـم بـڕی چـونکە بەرەبەیـان پاسـەکە دەگەشـتە(پاریس) تـاوەکو ئەو شـەوە لەدەرەوە نەمێنمەوە و لەسـەر شـەقام نەخـەوم وەك جاری پێشـوو!






سوپاس بۆ خوا بەبێ کۆنترۆڵ بەرەبەیان گەشتینە شاری(پاریس) بەڵام لەشوێنێکی زۆر دوورتر لە وێستگەی شەمەندەفەر دایبەزاندین و دەبوایە بە میترۆی ژێر زەوی بڕۆشتیتایەتەوە بۆ وێستگەی شەمەندەفەر منیش هیچ شارەزاییەکم نەبوو وە زمانیشم نەدەزانی تا خەڵکێك تێبگەیەنم ڕێنیشاندەریم بکات بەهەرحاڵ ئەو ڕۆژە نزیکەی دوو کاتژمێر زیاتر لەژێر زەویدا لەم میترۆ بۆ ئەو میترۆ بەس خەریکی هاتووچۆ بووم تا لە کۆتایی دا ئافرەتێکی(فەرەنسی)م دەست کەوت خوا هیدایەتی بدات هەر چۆنێك بێت تێمگەیاند تا نزیك وێستگەی شەمەندەفەر لەگەڵم هات و دۆزیمەوە هەر ئەو ڕۆژە بلیتی شاری(کالاس)م بڕی و گەشتمەوە ئەوێ بەهۆی ئەوەی جاری پێشوو شارەزاییم پەیدا کردبوو لەو شوێنەی نەفەرەکان تیایدا دەخەوتن چوومەوە شوێنەکە بەڵام هیچ کەسێکی ناسراوم نەدۆزیەوە کە پێشتر مابێتنەوە غەیری شەریکی قاچاخچیەکەم نەبێت کە جاری پێشوو پەڕاندمیەوە، چوومە لای و پاش هەواڵپرسین بەداخەوە هەواڵی پێدام کە ئەو هاوڕێیەم گیراوە کە پێشتر منی پەڕاندبۆیەوە بەڕاستی زۆرم پێ ناخۆش بوو چونکە پارەم کەم پێ بوو توانای خەواندنی پارەشم نەبوو لە کوردستان وتم: کاك فلان کەس دەتوانم داوایەکت لێبکەم؟ وتی: فەرموو وتم: تۆ من ناناسیت و ناشزانی خەڵکی کوێم!، وتی ڕاستە وتم دەتوانیت بمپەڕێنیتەوە لەسەر سیقە و تەنها خوا لەنێوانماندا بێت و بەڵێنت دەدەمێ بەوپەڕی متمانە بمپەڕێنەوە پارەم نیە و درۆت لەگەڵدا ناکەم بەڵام ئیش دەکەم و لەهەر کوێ بتەوێت خۆم بەدواتا دەگەڕێم و پارەکەت دەدەمێ سەیرێکی کردم و وتی: قەسەم بەخوا کاکە مەلا براکەم بێتە ئێرە سیقەی پێناکەم و کاری وای لەگەڵ ناکەم! بەڵام دەتپەڕێنمەوە چونکە لەخواترسیت و دەزانم مافم ناخۆیت!

سوپاس بۆ خوا ئەم جارەیان تەنها سێ شەو مامەوە و بەیەك جار سەرکەوتن دەرچووم باوەڕتان بێت نەفەرێکی زۆری لێ بوو سێ مانگ بوو مابوونەوە بەڵام ڕێگە





زۆرخراپ بوو کەس بەئاسانی دەرنەدەچوو ئەو شەوەی کۆتا شەوم بوو لە(کالاس) دەمەو ئێوارە بوو قاچاخچیەکی لێ بوو زۆر کفری دەکرد چەقۆ وەشێنیش بوو کەس غیرەتی نەبوو قسەی لەبەرامبەردا بکات و لەو هەموو نەفەرەشدا تەنها من نوێژم دەکرد کوفرێکی کرد و خۆم بۆ ڕانەگیرا هەستامە سەر پێ بۆی بەتوڕەییەکەوە هاوارم کرد بەسەریدا و بەبێ ئەوەی پەلاماری بدەم یان جوێنی پێ بدەم و وتم: باشە تۆ لەو خوایە ناترسیت ئا ئێستا بتکات بەناخی زەویدا؟ بەهۆی تۆوە توشی سزامان بکات؟باوەڕبکەن حسابی بۆ فیل نەدەکرد بەتەمای ئەوە بووم کەتەرەکەی دەربهێنێت و لێم بدات چونکە کەمێك بەخۆ بوو! دەموچاوی ڕەش هەڵگەڕا و وتی: تۆ نوێژ دەکەیت وا بەرگری لە خوا دەکەیت؟ منیش وتم: سوپاس بۆ خوا ڕووی کردە نەفەرەکان وتی: کێ ئەمەی بینیوە نوێژ بکات؟
چونکە گەر وا نەبێت بەکەتەر دایدەدوورم! ئیتر چەند نەفەرێك دیار بوو منیان بینی بوو وتیان کاکە وەڵا بینیومانە نوێژی کردووە هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: وەڵاهی خۆشم بێتاقەتم کە ئەو کوفرانە دەکەم بەڵام توڕەم دەکەن! منیش وتم: کوفرکردن نیشانەی بێ دەسەڵاتیە نەك ئازایەتی بەڕێزەکەم وتی: کەوایە ئادەی دانیشە با لەسەر ئیسلام گفتوگۆ بکەین من ڕەخنەم هەیە لە ئیسلام ئیتر دەرگای گفتوگۆ کرایەوە و هەرچی قاچاخچیەکانە کۆبوونەوە لامان و دەستمان کرد بە گفتوگۆ باوەڕتان بێت لەدەقەیەکدا چەندین نەفەر و قاچاخچی پرسیاریان دەکرد و لەجیاتی گفتوگۆ بوو بە هات و هاوار و وەڵام دانەوە سوپاس بۆ ئەو خوایەی زمانی پاراو کردم کە بەهەموویان دەگەشتم یەك کەسی تێدا نەبوو پشتگیرم بکات غەیری قاچاخچیەکەم نەبێت کەمێك بەرگری لێدەکردم ئەویش لەبەر ڕێزێك بۆمن!
لەوکاتەدا قاچاخچیەك هاتە بەردەمم و وتی: ئەگەر ئەوەندە مسوڵمانیت و لەخوا ترسیت بۆ خواکەت وای لێکردوویت و هەر ڕۆژەو لەوڵاتێکیت؟ ئەگەر خواکەت



ڕاست دەکات با ئەمشەو ڕزگارت بکات! خوا شاهێدە و لەڕۆژی دوایی دا لەپێش دادگای خوا ئەم وتەیەم پێ دووبارە دەکەنەوە شتێك هاتە دڵم و هەستامە سەرپێ و وتم: وەڵاهی ئەگەر ئەمشەو سواری شاحینەیەك ببم لە وڵاتی(بەریتانیا)وە تەلەفونتان بۆ دەکەم! باوەڕتان بێت هەموو نەفەر و قاچاخچیەکان دەستیان کرد بە پێکەنین وەك گاڵتە پێکردن، یەك دەیوت: فیزەت بۆ بڕاوە ، یەك دەیوت بەجێمان نەهێڵیت بە ئاسانی تا ئەوەی خوای گەورە کەسی ڕزگارکەری بەپێکانی خۆی بۆ ناردم گفتوگۆکەمان تەواو نەکردبوو قاچاخچیەکی تر کە ئەو ڕۆژە گیرابوو هاتە لامان بە مەرجێك ئازاد کرابوو قاچاخچی بدات بەدەستەوە! ئیتر قاچاخچیەکان کە بینیان وازیان لە گفتوگۆکە و من هێنا و وتیان: کاکە یان دەبێت تۆ بڕۆیتە ئەوبەر یان ئێمە ئێرە جێدێڵین! چونکە دەیانزانی ئەوەی بەربدرێت بۆ تەڵەیە!
وتی: کاکە وەڵا دەڕۆم بەس هاتووم بەدوای نەفەرێکی وت و وریا کە شارەزا بێت یان پەنجەمۆری وڵاتێکی هەبێت چونکە من نامەوێت لەوبەرەوە بگیرێم و ئیقامەی (بەریتانیا)ی هەبوو دەیویست خۆی بچێتە سەر ئەکسلی شاحینەیەك و یەکێکیش بچێتە ناو کڵاوەکەی تا کاتێك شاحینەکە گەشتە(بەریتانیا) لە سەقفی شاحینەکە بدرێت و شۆفێرەکە بوەستێت و ئەو دابەزێت!، سبحان الله شتێك خۆشیەك بەدڵم دا هات و وەك بڵێی: ئەوە خوا بۆ تۆی نارد خێرا قاچاخچیەکەم ڕووی کردە من و وتی: کاکە وەڵا ئەم نەفەرەش تازە سنورداشی(ئەڵمانیا)کراوەتەوە و نایەوێت خۆی تەسلیم بکات و کەسێکی ئازاشە بەوتەی ئەو لەمیشت باشتر دەست ناکەوێت!
لەڕاستیدا کەس نەیدەوێرا خۆی بدات لەو ڕۆشتنە چونکە ترسی گیران و تۆمەتی قاچاخچی بوونت دەدرایە پاڵ خوانەخواستە گەر بگیرایتایە لەگەڵیدا لەوکاتەدا هەستایە سەرپێ و وتی: دێیت لەگەڵم منیش وتم: بەڵێ ئیتر وتی: دە بەردێك بخە گیرفانت بۆ وەستاندنی شاحینەکە لەوبەرەوە منیش هەستام و ڕووم کردە ئەو







قاچاخچیەی کە پێی وتم: باخواکەت بتگەیەنێت!، وتم: بێزەحمەت ژمارەی تەلەفونەکەتم بەرێ وتی: بۆچیتە؟ وتم: کاتێک خواکەم گەیاندمیە ئەوبەرەوە دەمەوێت تەلەفونت بۆ بکەم!،دووبارە دایانەوە لەقاقای پێکەنین و وتی: فەرموو ئەوە ژمارەکەمە بەپێکەنینێکەوە پێی دام منیش ڕووم کردە قاچاخچیەکەم و وتم: من سوورم لەسەر بەڵێنەکەم و پاشان ڕووم کردە نەفەرەکان و ماڵئاواییم لە هاورێکانم کرد تا یەکیان پێی وتم: کاکە ماڵئاوایی چی دەکەیت ئەوە ڕێی قاچاخە و ئێستا لەوسەرەوە دێیتەوە بۆ خۆت عەیبە ئەم ماڵئاواییە!، منیش سەیرێکم کرد و بە پێکەنینێکەوە پیم وت: سوێند بەخوا هێندە یەقینم هەیە بەخوای گەورەم ئەگەر سواری شاحینەیەك ببم کە بچێت بۆ وڵاتی(بەریتانیا) لەوێوە تەلەفونتان بۆ دەکەم پشتیوان بەخوا ئیتر بەجێمان هێشتن!

پاش ئەوە هەردووکمان بەرێکەوتین بەرەو لای کۆنترۆڵی کەشتیەکان ئەو شارەزا و منیش نەشارەزا کاتێك نزیك بووینەوە لە جادەی ئۆتۆبان شاحینەیەکی سپیم بینی بەرەو بەنزینخانەیەك دەڕۆشت ناویان نابوو بەنزینخانەی هەڵەبجەییەکان و تەنها خەڵکی ئەوان نەفەریان سەردەخست وتی ڕاکە بەخوا ئەوە باری شوشەیە و بۆ ناو باخیرەش دەڕوات پاش گاز تێکردن! زۆر باشیشە لەژێر شاحینەکەوە دەتوانین سەرکەوین و ئەکسل و کڵاویشی ناوێت! وتی: بەڵام کە نزیك بووینەوە لە بەنزینخانەکە دەبێت لوتمان بگرین چونکە ئەزانن نەفەر سەردەخرێت سەگیان داناوە بۆ پاسەوانی! ئیتر بە ڕێی قەدبڕ پێش ئەوەی شاحینەکە بگات بە ڕاکردن خۆمان گەیاندە بەنزینخانەکە و چاوەڕوانی شاحینەکەمان کرد کە بوەستێت و خاوەنەکەی دابەزێت بۆ گاز تێکردن!

کاتێك شاحینەکە وەستا پاسەوانێکی بەنزینخانەکە بەسەگێکەوە هاتە لای شاحینەکە و کەمێك سوارەیەوە بەدەوریدا و پشکنینی بۆ کرد پاشان کەمێك





دوورکەوتەوە بەپەلە قاچاخچیەکە وتی: دەستت بگرە بە لوتتەوە لەسەر نوکی پێ بڕۆ بەخێرایی با تەپەی پێمان نەیەت! چونکە دەچینە ژێر شاحینەکە لەبەشی دواوەی باری شوشەیە بۆ ئەوەی شوشەکان نەتەقن هەواکێشێکیان بۆ دروسکردووە لەژێر شاحینەکەدا، بەچوپ دەرگایان بۆ کردووە و دەکرێتەوە!

بەپەلە خۆمان گەیاندە ژێر شاحینەکە شۆفێرەکەشی لەدیوی ئەولاوە گازی تێدەکرد ئێمە جوان قاچیمان دەبینی بەڵام ئەو ئێمەی نەدەبینی بەڕاستی قاچاخچیەکە زۆر زیرەك و شارەزا بوو بەپەلە ئەوشوێنەی کردەوە بەهێواشی وتی: جارێ سەرناکەوین با تەقەتەقمان نەیەت تا شۆفێرەکە دەچێت پارەی گازەکە بدات لەگەڵ شۆفێرەکە ڕۆشت بۆ پارەدان ئێمە سەرکەوتین!

بەڵام سەگەکە هەستی پێکردین و زۆر بە دەنگی بەرز ڕووبەڕوی شاحینەکە دەستی کرد بە وەڕین ئیتر دەرگاکەی دانەخستەوە وتی: با تەقەی نەیەت و دووبارە لوتمان گرتەوە هەستمان کرد پاسەوانەکە بەرەو لامان هاتەوە و هەستی بەشتێك کرد!، بەڵام سوپاس بۆ خوا شۆفێرەکە سواری شاحینەکە بوو تا ئەوان گەشتنە لامان ڕۆشت و ڕزگارمان بوو ئەوجا دەرگاکەی داخستەوە!

کاتێك سواری شاحینەکە بووین سەیرم کرد لە ناوەڕاستدا بەدرێژی شاحینەکە شوشەی گەورەی تێدایە و لەم لاولاوە وەك تەختەبەستی سەقفی خانو دەوری گیرابوو بۆ ئەوەی شوشەکان نەکەون و نەشکێن قاچاخچیەکە وتی: وەرە بەشی سەرەوەی شوشەکان با خۆمان بشارینەوە تا لە کۆنترۆڵ دەردەچین منیش هەر دوعام دەکرد و دەموت: خوایە بۆ خاتری ناو و سیفاتە بەرزەکانت سەرشۆڕم نەکەیت لای ئەوانەی ئەمشەو گاڵتەیان بە دینەکەت و بەندەکەت دەکرد سوێند بەخوا بەو هەمووو کۆنترۆڵەدا ڕۆشتین یەکێکیان نەیانوەستاندین و لەگەڵ گەشتە ناو کەشتیەکە پاش بەستنەوەی شاحینەکە کەشتی کەوتە ڕێگە کردن!






بەڕاستی زۆر سوپاسی خوام کرد و فرمێسك بەچاوەکانم دا دەهاتە خوارەوە وەك موعجیزەیەك خوای گەورە دەسەڵات و توانای خۆی پیشان دام و سەری خستم بەسەر نەیاران و نارەحەتیەکانی ژیانم دا پاش ئەوەی کەشتی کەوتە ڕێگەکردن قاچاخچیەکە وتی: ئێستا دەتوانیت بڕۆیتە خوارەوە بە ئیسراحەت دابنیشیت، تا دەگەینە کۆنترۆڵەکەی شاری(دۆڤەر)ی بەریتانیا خۆم بانگت دەکەمەوە کاتێك نزیك بووینەوە!

لەویادا بەهۆی گڵۆپەکانی ناو کەشتیەکە و چادری شاحینەکەوە کە سپی بوو ناوەوە زۆر ڕۆشن بوو منیش نوسخەیەکی قورئانم پێ بوو کە چەند سورەتێکی قورئانی تێدا بوو، ئەو ڕۆژەش هەینی بوو دەستم کرد بەخوێندنی سورەتی (کەهف).

چونکە سوپاس بۆ خوا لەوکاتەوەی بیستوومە خوێندنی ئەم سورەتە پیرۆزە دەبێتە ڕۆشنکەرەوەی تاریکایی پێش پردی سیرات و خوێندنی لە ڕۆژانی هەینی سوننەتە و تا هەفتەکەی تر وەك نورێکە بەسەرتەوە وازم لەخوێندنی ئەو سورەتە پیرۆزە نەهێناوە!

لەکاتی تەواوبوونی خوێندنی سورەتەکە نزیك ببومەوە کاتێکم زانی قاچاخچیەکە بە هێواشی بانگی کردم و وتی: ئەوە خەریکی چیت؟، منیش بەئیشارەت قورئانەکەم بەرز کردەوە کە قورئان دەخوێنم باوەڕتان بێت بەپەلە هاتە خوارەوە بۆ لام ، وتی: ویستم بانگت بکەمەوە بۆ سەرەوە چونکە نزیك بووینەتەوە بەڵام مادەم قورئانم بینی بەدەستەوە دڵنیابە دەرچووین وهیچ ترسم نیە لەمەودوا خوامان لەگەڵە ئیتر ئەویش هاتە لامەوە گوێی لێدەگرتم بەوشێوەیە گەشتینە ناو شاری(دۆڤەر) و سوپاس بۆ خوا لەوێش لەهیچ کۆنترۆڵێکدا نەیانوەستاندین و ڕزگارمان بوو لەکاتی وەستانی شاحینەکەش لە ترافیکلایتێکدا دووبارە دەرگا چوپەکەی لادایەوە و وتی: لەگەڵ وەستا و گڵۆپەکە سوور بوو خێرا دابەزە دەبێت بەپەلە بەژێر شاحینەکەدا بڕۆینە دەرەوە ئەگەر زوو فریا نەکەوین گڵۆپی ترافیك لایتەکە سەوز بێت پانمان دەکاتەوە،




ئیتر لەگەڵ وەستا دابەزین و هاتینە دەرەوە لەخوا بەزیادبێت بەبێ کێشە باوەڕتان بێت هێنــدە دڵخــۆش بــووم لەژیــانم دا هێنــدە خۆشــحاڵ نەبــووم بەتــایبەتی کە هێشــتا بەرەبەیان بوو دەمزانی قاچاخچیەکان نەخەوتونەتەوە داوام کرد لە قاچاخچیەکە کە پارەی وردەی پاوەنی پێیە؟ چونکە خۆم تەنها یۆرۆم پێ بوو،

وتی: بـۆچیتە؟ وتـم: تەلەفونێك بـۆ ئەو قاچـاخچیە دەکەم پێی دەڵـێم: گەشـتووم ئیتر وابــزانم پــاوەن و نیــوێکی پــێ بــوو دایە دەســتم منــیش بەســەری بەرزەوە چــوومە نــاو کــابینەیەك و ئەو ژمــارەیەی وەرمگرتبــوو لەو قاچــاخچیەی کە وتــی" بــاخواکەت ئەم شــەو بــت گەیەنێــت" لێــدا و زەنگی مۆبایــل لێیــدا و هەڵیگــرت لەگەڵ وتــی: ئەلــو وتــم دەزانی من کێم؟ وتی: نەخێر کێی جەنابت؟ وتم:

ئەو نەفەرە بووم کە چەند کاتژمێرێك لەمەوبەر پێت وتم: گەر خواکەت ڕاست دەکات بـا ئەم شـەو بتپەڕێنێـتەوە بـۆ وڵاتی(بەریتانیـا) جـا ئەوە ئێسـتا من لە شـاری(دۆڤەر)م و ســوپاس بــۆ خــواکەم کە گەیانــدمیە وڵاتی(بەریتانیــا)و وتــم بــا ئاگــادارت بــکەمەوە کە چەنــد بەتوانــا و دەســەڵاتە! خــوا شــاهێدە ئەو کــوڕە زمــانی کەوتە تەتەڵە چەنــد ســانیەیەك نــوتقی بــڕ پاشــان زۆر بە ڕێــزەوە وتــی: کاکە وەڵا خــواکەی تــۆ ڕاســتی کــرد و منــیش هەڵەم کــرد و داوای لێبــوردن دەکەم! منــیش: وتــم نــا بەڕێــز داوای لێبــوردن لەخــوای گەورە بــکە بە هاوڕێکەشــت بڵــێ ئەوەی کە مــن نەفەری ئەو بــووم و لەســەر سیقە پەڕاندمیەوە کەوا من سوورم لەسەر بەڵێنەکەم گەر سواڵم کردبێت پارەکەی دەدەمێ ئیتر پەیوەندیەکە داخرایەوە و پارەی تێدا نەما!

پــاش پەیوەنــدیەکە هەناســەیەکی قــوڵی خۆشــیم هەڵمــژی و چاوەکــانم پڕبــوون لە ئەسـرین و وامـدەزانی هەمـوو دونیـا هی خـۆمە چـونکە ئەوەنـدەم گـوێ لێ بـوو لەکاتی پەیوەنـدیەکەم دا کە وتـم" گەشـتومەتە ئەوبەر" قاچـاخچیەکەم گـوێی لەدەنگم بـوو






بەدەنگی بەرز هاواری کرد و وتی: ئەرەوەڵا نەفەرەکەم گەشت و خواکەی تڕی بڕین و گەیاندیە ئەوبەر!
ئیتر لەگەڵ قاچاخچیەکەی تردا چووین بۆ کەمپی پەنابەرانی(دۆڤەر) لەوێ هەندێك پەنابەری تازەی لێ بوو چامان خوارد تا دونیا ڕۆشن بۆیەوە و پاشان هاتمە(دۆفیزێك) پارەی یۆرۆکانم گۆڕیەوە و کردم بە پاوەنی(بەریتانی)و ماڵئاواییم لەو برادەرە کرد و دەستخۆشیم لێکرد و وتم: هیوادارم بگەڕێیتەوە بۆ لای ئەو خوایەی ئەم شەو من و تۆشی ڕزگار کرد ئیتر بەڕێگەی شەمەندەفەر ڕۆشتمە شاری(لەندەن) لەوێشەوە بەپاسی گەورە چوومەوە بۆ ماڵی ئەو برا بەڕێزەی پێشتر هاوکاری و ڕێنیشاندەری کردم لەشاری(بێرمینگ هام) سوپاس بۆ خوا پاش تەنها دوو ڕۆژ گەڕانەوە و گەشتنەوەم بۆ وڵاتی(بەریتانیا) خوای گەورە دەرگای خێر و بەرەکەتی خۆی لێ واڵا کردم و لەڕێگەی برایەکی خۆشەویستی ئیماندارمەوە لە کارگەیەکی زەڵاتە ئامادە کردن وەرگیرام
تا ئەو ڕۆژەشی وڵاتی(بەریتانیا)م بەجێهێشت لەوکارگەیەدا ئیشم دەکرد بەو شێوەیە توانیم قەرزەکانم بدەمەوە و خێزانیشم مارە ببڕم و پاشەکەوتیش کۆبکەمەوە پاش ئەوەی بۆ جاری دووەم گەشتمەوە وڵاتی(بەریتانیا) گەڕامەوە بۆ لای ئەو برایانەی لەشاری(کۆڤەنتری) ژیانیان بەسەر دەبرد کاکە حەمەی پەندەر لەگەڵ هەواڵی هاتنەوەی بیستبووم وتبوی ژمارەکەیم بۆ پەیا بکەن بابێت دەیبەمەوە بۆ ئیش لەگەڵ خۆم دا منیش وتم: بەخوا کاکە مارانگەز جارێك مار دەیگەزێت و ماڵی ئاوابێت گەر تا ماوم ئیشم دەستنەکەوێت یەك ڕۆژ ناڕۆم لەگەڵی بۆ ئیش!
پاش دوو ڕۆژ خوای پەروەردگار لە فەزڵ و منەتی خۆیەوە دەرگای خێر و خۆشی لێکردمەوە و لەڕێگەی برایەکەوە پەیوەندی کرا بەو برایانەی جێیان کردمەوە لای خۆیان وتی: کارگەیەکی زەڵاتە لەناوچەیەك بەناوی(ئیفشام) نەفەر وەردەگرێت بۆ




ئیش خوا پاداشتی خێریان بداتەوە منیشیان برد بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرپرسی کارگەکە کەچی ویستی خوا وابوو تەنها من و برایەك وەرگیراین!

ئەو برایانەی تر کەسیان وەرنەگیران لەبەر دووری شوێنەکەش دەبوایە بەسەیارە ماوەی چل و پێنج دەقە بۆ کاتژمێرێك بەسەیارە هاتووچۆت بکردایە ئەو برایەی تریش سەیارەی دەست نەکەوت و نەهات بەڵام بۆ من ئەو برایەی ئیشەکەی دۆزیەوە بۆم لەشاری(بێرمینگ هام)دەژیا وتی: تا سەیارەت بۆ پەیدا دەکەم دەتبەمە لای خۆم و لەگەڵ خۆماندا هاتووچۆت پێدەکەین ویستی خوا وابوو منیان خستە بەشی دوانیوەڕوان و لەوێشدا تەنها کەوتم بەڵام سوپاس بۆ خوا چەند برایەکی بەڕێز لەو کاتەدا ئیشیان دەکرد سەیارەیان پێ بوو هەرچۆنێك بێت جێگای منیشیان کردەوە و ماوەیەك لەماڵی ئەو برایە دەمامەوە کە مامۆستایەکی خوێندنگای سەرەتایشم بوو لە هەرێمی کوردستان زۆر هاوکاری کردم یارەبی خوا خۆی و خانەوادە بەڕێزەکەشی پارێزراوبکات.

خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە سێ کەس بوون ماوەی دوو هەفتە زیاتر خواردنیشیان بۆ ئامادە دەکردم کاتێك دەگەڕامەوە لە ئیش زۆر ڕێزیان لێدەگرتم بەڵام ئەوانیش هەر یەکەیان کەوتە لایەك و بەناچاری گەڕامەوە لای ئەو برایەی یەکەم جار ڕێنشاندەری کردم بۆ وڵاتی(بەریتانیا) بەو شێوەیە ماوەی شەش مانگ لەگەڵ ئەو برایەشدا ژیام وەك براگەورەم وابووە و زۆر ئاگاداری کردوم خوا پاداشتی بداتەوە و تائێستاش هەر یەکمان خۆشدەوێت چونکە هەریەکەمان خەڵکی شارێك بووین بەڵام لەبەر خوا یەکمان ناسیوە و خۆشویستووە بۆیە دڵنیام هەرگیز کۆتایی پێنایەت ئەم برایەتیەمان لەگەڵ هەر برا و خوشکێکی تریش کە لەبەر خوا پەیوەندیمان دروست کردووە و یەکمان ناسیوە سوپاس بۆ خوا تائێستاش بەردەوامی






هەیە ئەوەشی کەتەنها ڕووکەشانە بووە یان بۆ بەرژەوەندی یەك بووە خوا زوو لێی دوورخستومەتەوە لەفەزڵ و گەورەیی خۆی!

ویستی خوا وابوو ئەو برایەش تەرد و ڕەفزی وەرگرت یاسای ئەو وڵاتەش ئەوکاتە وابوو هەرکەس تەرد و ڕەفزی وەرگرتایە پارە و خانوی لێ دەبڕی و دەریدەکرد لەخانوش دەبوایە یان لای خزم و هاوڕێیەکی ژیانی بەسەر ببردایە یان لەسەر حسابی خۆی بژیایە یان ئەو وڵاتە بەجێبهێڵێت چونکە دەکەوتە سەر شەقام پاش ئەوەی خانوی لێ سەنرایەوە بەڵام لەبەر من کلیلی تەسلیمی سۆشیالەکە نەدەکردەوە و خۆشی بەیانیان زوو دەچوو بۆ ئیش بەڵام من کێشەم هەبوو چونکە دەبوایە تا نیوەڕۆ لەماڵەوە بوومایە لەو کاتەشدا سۆشیال دەهاتە ماڵەکە و هەرکەسی ببینیایە کلیلی لێ وەردەگرت و گەر نەشرۆشتیتایە پۆلیسی بۆ بانگ دەکردی منیش حاڵم باش نەبوو چونکە لەوماوە دوور و درێژەدا خۆم تەسلیم نەکردبۆیەوە و بە نایاسایی دەژیام بۆیە بەناچاری بەیانی زوو دەبوایە بڕۆشتمایە بۆ ناو پارك و دەرەوە تا ئەوکاتەی کاتی ئیشم دێت و هاوڕێکانم دێن بەدوامدا ئەگەر چی تا درەنگی شەو لە ئیش بووم و زۆر ماندوو دەبووم بەڵام هیچ ڕێگەچارەیەکی ترم نەما بوو چونکە هەم خانو گرتن بۆ من ئاسان نەبوو هەم زۆر گران بوو نەمدەتوانی بەپارەی ئیشەکەشم کرێی خانو و ئاو و کارەبا دابینبکەم چونکە پارەی ئیشەکەم کەم بوو بەڵام سوپاس بۆ خوا لەماوەی ئەو شەش مانگەدا سەرجەم قەرزەکانم دایەوە و خێزانیشم مارەبڕی و دەستنیشانم کرد بەڵام ئەو لە (کوردستان) و منیش لە(بەریتانیا) پاش دوو ساڵ خوای گەورە گەیاندنینی بەیەك لەبەر ئەوەی بەنیاز نەبووم لەو وڵاتە بمێنمەوە ڕۆژانی شەممان جار جارە کاری زیادەیان دەدا بە کرێکارەکان و ناوم دەنووسی و دەچووم بەڵام دەبوایە بەیانیان زوو بڕۆشتیتایە و لەگەڵ شۆفێرێکدا ڕێکبکەوتیتایە کە لەگەڵ خۆی بیبیردیتایە بۆ ئیش بەڕاستی بەداخەوە تا ئەوکاتەی منیش کەم کورد هەبوو مۆڵەتی شۆفێری پێ بێت و







زۆربەی زۆریان بە بێ مۆڵەت سەیارەیان لێ دەخوڕی! بۆیە زۆربەیان دەگیران و ڕێگەی سەیارە لێخوڕینیان لێ قەدەغە دەکرا!

بەیانیەکیان زووەکەی بەرەو ئیش دەڕۆشتین لای مارکێتێکی گەورەی شاری(بێرمینگ هام) کە ناوی (تێسکۆ)یە بەرەو لادانەوەکەی مزگەوتی (قورئان)ی ئەو شارە پۆلیس دوامان کەوت و وەستاندینی تەنها منیش وەرەقەم پێ نەبوو ، بەڵام پۆلیس تەنها داوای ئەوراقی لە شۆفێر دەکرد کە چی ویستی خوا وابوو ئەو شەوە داوای ناسنامەی لە نەفەرەکانیش کرد و ئێمەش چوار نەفەر بووین بە شۆفێرەکەوە ئەگەرچی ئەوان هەموویان خاوەنی ئیقامە بوون بە فەرمی ئیشیان دەکرد بەڵام من تەنها وەرەقەیەکی ساختەی کارم پێ بوو خۆم موالیدم خستبۆیە سەری!، ناسنامەکانی ئەوانی دایەوە و هاتە سەرەی من تەنها وەرەقەکەم پێ بوو داوای کرد و دامە دەستی ژمارەیەکی لەسەرە پێی دەوترێت(ڕیفرانس) کۆدی ئەوکەسەیە و لەڕێی ئەو کۆدەوە مەلەفی ئەوکەسە پیشان دەدات!

سەیرێکی کرد و موالیدی نەبینی لەسەری و وتی: بۆ تەنها ئەوەت پێیە؟، منیش وتم: بەپەلە هاتمە دەرەوە لەماڵەوە لەیادم کردووە هەر ئەوەندەم زانی تەلەفونێکی کرد و پاش هەندێ گفتوگۆ هەستم کرد ئاشکرا بووم!، چونکە پۆلیسی ئەو وڵاتە زۆر فێڵبازن هەر بەپێکەنینەوە سواری سەیارەت دەکەن تا دەتخەنە سوچی زیندانەوە!، من لەپشتی شۆفێرەکەوە سەرکەوتبووم برایەکی بەڕێز بوو لەگەڵ پۆلیسێکیاندا لەناو سەیارەکەیان لێکۆڵینەوەی مۆڵەتی شۆفێری و شوێنی ئیشەکەیان لێ دەکرد!

لەوەیە ئێستاش ئەم ڕووداوە بخوێنێتەوە بۆ یادگاری پۆلیسەکە ڕووی کردەوە لام و وتی: موالیدت چەندە چونکە لێرە نەنووسراوە!، بەدەستێکیشی بەتەلەفون لەگەڵ بنکە گفتوگۆی دەکرد! منیش وەڵامم نەدایەوە چونکە خۆم دامنابوو دەترسام بیڵێم و خێرا هەر لەوێدا نەیەڵێت دابەزم کەلەپچە بکاتە دەستم ئەویش چەند جارێک







دووبارەی کردەوە وایدەزانی تێناگەم تا هاوڕێیەکم لە تەنیشتدا بوو وتی: کاکە دەڵێت: کەی لەدایك بوویت وتم: دەزانم بەڵام من نیازم هەیە دەرفەتێکم بۆ بڕەخسێت و ڕاکەم!

کەچی داماوە من بەنیاز بووم ڕابکەم ئەو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا وتی:چی؟ کاکە توشی کێشەمان دەکەیت و لەو قسانەدا بووین پۆلیسەکە وتی: دەبێت بێیت لەگەڵمان بۆ بنکە!، وتم: ئەی ئیشەکەم؟ وتی: خەمت نەبێت خۆمان تەلەفونیان بۆ دەکەین و هیچ کێشەیەکی یاساییت توش نابێت و پاش هەندێك لێکۆڵینەوە دەڕۆیتەوە بۆ ماڵەوە!، منیش زانیم کە بەس ڕاست ناکات و گەر بمبات بۆ بنکەی پۆلیس پەنجەمۆرەکەم دووبارە ئاشکرا دەبێتەوە و ئەم جارەشیان چونکە جاری دووەمە شەش مانگ زیندانیم دەکەن پاشان سنورداشی وڵاتی(ئەڵمانیا)شم دەکەنەوە لەگەڵ دایبەزاندم و دەستی گرتم خێرا سەیرێکی ناو جادەکەم کرد بینیم لەناوەڕاستی هەردوو سایدەکەدا شیش هەیە و ناتوانن بەسەیارە دوام بکەون و پۆلیسەکەش بەتەمەنێکی باڵابەرز بوو وتم: توانای ڕاکردنی نیە گەر خۆم بگەیەنمە ئەو بەر جادەکە!

سوپاس بۆ خوا غیرەتی پێ بەخشیم و وتم خوایە بە پشتیوانی تۆ کاك حاجی و پۆلیسەکەی تر سەیریان دەکردم لەناو سەیارەکەی ئەواندا خێرا دەستم ڕاتەکاند و دەستم بەردا و پاڵێکم نا بە پۆلیسەکەوە پاشان بەپەلە بەرەو ناوەڕاستی جادەکە ڕامکرد چونکە دنیا تاریك و لێڵ بوو سەیارە کەم کەم هاتووچۆی دەکرد خێرا گێڕم بۆ گۆڕی و وەك ماراسۆن بۆی هەڵهاتم و ئاوڕم نەدایەوە تەنها گوێم لە هات و هاواری بوو دەیوت بوەستە و ڕامەکە!، بەڵام سوپاس بۆ خوا پاش ئەوەی من بەسەر شیشی سایدی ئەوبەر خۆم فڕێدا شەقامەکەی ئەوبەر بوو بە شەقامی سەهۆڵەکەی سلێمانی هێندە سەیارە هاتن لەوکاتەدا نەیتوانی دوام بکەوێت هەتا بەتەواوی لە جادەکە دوورکەوتمەوە لەبەرامبەرم دا چەند شوقەیەکی بەرزی لێ بوو بەسەر چەند





سیاجێکی شوقەکاندا خۆم هەڵدایە ناو شوقەکان تا لەژێر چەند دارێکی چڕوپڕدا خۆم شاردەوە لە تەنیشت سیاجەکان لە دیوی ناوەوە ئیتر بێدەنگیم لێکرد و باش بوو کەس نەیبینیم لەوکاتەشدا کاك حاجی کە شۆفێری سەیارەکەمان بوو تەلەفونی بۆکردم کە سەیرم کرد ئەوە وتم: لەوەیە پۆلیسەکە بەزۆر پێی کردبێت و بیەوێت بەو هۆیەوە شوێنم دیاری بکەن و بمگرن بەپەلە مۆبایلم داخست و پاتریەکەیم دەرهێنا و سیمکارتەکەشم شکاند چونکە وام بیستبوو گەر پۆلیس کەسێکی بۆ نەگیرێت ئەوە بە فرۆکە بەدوای دەگەڕێن و لەڕێی مۆبایل و سیمکارتەوە دەتوانن شوێنی دەستنیشان بکەن! هەڵبەتە ئەم حاڵەتەش بۆ کەسی ترسانەکە نەك کەسێکی بێ تاوانی وەك من بەو شێوەیە چەند کاتژمێرێك هەتا کاتی خۆرکەوتن لەویادا مامەوە جار جارە گوێم لەدەنگی لورەی سەیارەی پۆلیس بوو لەونزیکانە ئیتر کاتێك دونیا بەتەواوی ڕۆشن بۆیەوە بە هێواشی هاتمە دەرەوە سەیرم کرد جوڵەی خەڵك دەستی پێکردووە قەمسەڵەکەم دوو بەرگ بوو و ڕەنگیشیان جیاواز بوو خێرا هەڵمگێڕایەوە و بە پێچەوانەوە کردمە بەرم و
بەرەو لای مزگەوتی(قورئان) بەڕێکەوتم سەیر دەکەم دوو سەیارەی پۆلیس لە دوو شوێن دا وەستاوە!،منیش خۆم تێکنەدا و دەستم کرد بەپاڕانەوە و بەرەو لایان ڕۆشتم چونکە نەمدەتوانی بەهیچ لایەکی تردا بڕۆم پشت بەخوای گەورە بەلایاندا ڕۆشتم و خۆم تێکنەدا سوپاس بۆ خوا بەسەلامەتی ڕزگارم بوو وە گەڕامەوە ماڵەوە پاشنیوارۆ کاك حاجی هات بۆ لام و وتی: باش بوو فریات کەوتم!، وتم: چۆن؟، وتی: سەرەتا کە ڕاتکرد لەگەڵ پۆلیسەکەی تر دەستمان کرد بە پێکەنین و ئەوی تریش ویستی دوات بکەوێت ماشاء الله وا خێرا دەرچوویت توانای نەبوو بێت بەدواتدا چەند هاوارێکی کرد تا بوەستیت تۆش حسابت بۆ نەکرد دواتر بە منی وت: باشە بۆ ڕای کرد؟، منیش وتم: لای ئێمە پۆلیس ترسناکە و لەوەیە ترسابێت!، ئیتر وتی: زۆرباشە ئێمە خۆ هیچمان لێ




نەدەکـرد و وتـم: لەوەیە کەسـێکی خـراپ بێت!،نەیـدەزانی گەر بمبـاتە ژوورەوە دەرەوە نابینم و دووبارە زیندانیم دەکەن و سنورداشم دەکەنەوە!

ئیتر وتی: منیش پێم وت: دەباشـە وەرەقەکەیم بەرەوە دواتـر خـۆم دەیدەمەوە!، وتی: نـا لای خۆم دەبێت و یان خۆم بۆی دێنمەوە یان با بێت بۆ بنکە وەریگرێتەوە!، منیش وتم: ئەی پێت بووتایە بۆ بۆ حەلاوخانی باس ناکات؟ ئیتر دەستمان کرد بە پێکەنین و گوێم پێ نەدا و هەر دەچـووم بـۆ کارگەکە بەڵام زۆربەی جـار لە لای دەرگـای فریـاگوزاریەوە ئیشـم دەکـرد و چاوێکیشـم لەسـەر دەرگای هـاتنە ژوورەوە بـوو تـا مـاوەی مانگێـك بـۆ ئەوەی گەر پۆلیس هات دووبارە هەڵبێم بەڵام سوپاس بۆ خوا هیچ دەنگێکیان نەما!

پاش ئەوە ئەو بـرایەی لای دەژیـام هەمـوو شـتێکی لێ وەرگیرایەوە و بە ڕێگەی نایاسـایی لەماڵەکەدا دەخەوتین بەڵام باش بوو بەیانیان زوو ئەو دەڕۆشت بۆ ئیش تەنها بۆ من نـاڕەحەت بـوو چـونکە دەبـوایە تـا نیـوەڕۆ لەمـاڵ بمایـاتەوە بەناچاری دەچـوومە دەرەوە لەپارکێکی تەنیشـت ماڵەکەدا دەسـوڕامەوە گەڕەکەکەشمان ناوبـانگێکی خراپی هەبـوو چـونکە ئافرەتـانی لەشـفرۆش بەڕێـگەی نایاسـایی دەوەسـتان بـۆ کـاری لەشفرۆشـی بەردەوام پۆلیس هـاتووچۆی دەکرد و دەستگیری دەکردن و زۆرجار گومانیـان هەبوایە داوای ناسنامەشیان لە خەڵکی دەکرد کە لەو ناوەوە هاتووچۆیان بکردایە هەواڵم پێ گەشـت کە ئەو برایە لای ناسـراوێکیان شـوێنی بۆ پەیدا کراوە بەڵام لەبەر من ناڕوات! لەگەڵ ئەوەم زانی وتم سـوێند بەخـوا لێت زویر دەبم گەر نەڕۆیت و من إن شـاء الله وا خەریکـم لەوشـارەی کارگەکەی لێیە ژوورێك بە کـرێ بگـرم بـۆ خـۆم خـوا سـەربەرزی بکـات وتـی: تـا تـۆ نەڕۆیـت مـن ئەم مـاڵە جێنـاهێڵم بەیانیەکیـان لەحەمـام دا بـووم سۆشـیال خـۆی کـرد بە ژووردا مـن نەمزانی کە هـاتوون چاوەڕوانیـان کـرد هەتـا تەواو بـووم!، لەگەڵ هـاتمە دەرەوە سـەیرم کـرد ژن و پیاوێـك بەسـەرمەوە وەسـتاون خـۆم تێکنەدا و سڵاوێکم لێکردن ویستم بچمە ژوورەکەمان بانگی کردم وتی: تۆ ناوت چییە




و چی دەکەیت لێرە؟ منیش: خۆم لێکرد بە کەڕەی شەربەت و وتم: زمان نازانم! تەنها هاتووم بۆ پۆستی ئەو برادەرەم لێرە دەژی! چونکە سوپاس بۆ خوا نازانم چۆن درۆ بکەم شتێکم وت کە هەر ڕێی تێنەچێت و خێرا ئاشکرا بێت!،وتی: تۆ چوویتەتە حەمام و خۆت دەشۆیت پۆستی چی؟ ئەو لێرە دەرکراوە و بەوەشەوە نەوەستاوە نەفەری تری هێناوەتە لای خۆی!

لەویا کلیلەکەیان لێ سەندم و وتیان: جارێکی تر لێرەدا بتبینینەوە پەیوەندی بە پۆلیسەوە دەکەین! بەو شێوەیە شاری(بێرمینگ هام)م بەجێهێشت و چوومە شاری(ئیفشام) لە نزیك کارگەکەوە ژوورێکم بەکرێ گرت لە کوڕێکی پاکستانی لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی خەڵکی شاری(ڕانیە)دا بەڕاستی شوێنێکی زۆر خراپ و پیس بوو چونکە ژێر ژوورەکەی من چێشتخانەیەکی پاکستانی بوو هەواکێشی خواردنەکەی بە ژوورەکەی مندا تێپەڕ دەبوو بۆنێکی زۆر ناخۆشی هەبوو ئیسراحەتی تێك دابووم تا بەو هۆیەوە دووبارە توشی نەخۆشی حەساسیەت بوومەوە هیچ ئەوراقێکیشم نەبوو تا بتوانم سەردانی دکتۆری پێ بکەم بەڵام ئەو برایەی لای دەژیام هەواڵی نەخۆشیەکەی بیستم و لەسەر وەرەقەی ئەو سەردانی دکتۆرم کرد و سوپاس بۆ خوا پاش بەکارهێنانی چەند مەرهەم و کرێمێك باش بوومەوە لەناو کارگەکەدا برایەکم ناسی کە خەڵکی شاری سلێمانی بوو هات بۆ لام وتی: کاکە گیان بۆچی ئەو کرێ زۆرە دەدەیت لەوشارە من خانوم هەیە و سەیارەشم پێیە بۆ هاتووچۆ کردن تازەش دەستم کردۆتەوە بە نوێژکردن بەخوا بەدوای برایەکی وەك تۆدا دەگەڕێم کە لەگەڵی ژیان بەسەر بەرم تا هەم بۆ ئیمانەکەم یارمەتیدەرم بێت هەم بەتەنهاش نەبم سەرەتا نیازم نەبوو بگەڕێمەوە بەڵام خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە کەوا بەزۆر هات ماڵەکەی بارکردم و بردمیەوە بۆ شاری(بێرمینگ هام) سوپاس بۆ خوا تا ئەو ڕۆژەی بە یەکجاری وڵاتی(بەریتانیا)م بەجێهێشت لای ئەم برایە ژیام و بە کاك حاجیشەوە بووین بە سێ






نەفەر لە ژوورێکی بچوکدا دەژیاین بەڵام هەرکەس بۆ تەنها جارێك بیبینینایە ئێرەیی بە یەکرپزی و برایەتیەکەمان دەبرد کە سوپاس بۆ خوا تا ئێستاش پەیوەندی برایەتیمان پێکەوە ماوە!

لەمانگەکانی کۆتایی ساڵی (٢٠٠٥)وڵاتی (بەریتانیا) کەوتە گرتنی پەنابەرانی کورد و بە ڕێکەوتنێك لەگەڵ(هەرێمی کوردستان) کەوتە ناردنەوەی پەنابەران بە زینندانیکراوی بۆ فرۆکەخانەکانی کوردستان بەو هۆیەوە زۆربەی ئەو پەنابەرانەی کە دۆسیەیان داخرابوو وە ناردنەوەیان لەسەر بوو یان خۆیان دەشاردەوە یان وڵاتی(بەریتانیا)یان بە ڕێگەی نایاسایی بەجێدەهێشت بۆ وڵاتێکی تر دەرۆشتن لەوکاتەدا دەنگۆ بڵاوبۆیەوە کەوا وڵاتی(ئیرلەندا)ی سەربەخۆ ئیقامە دەدات و کۆمەڵێکی زۆر لەو خەڵکەی ئیقامەیان نەبوو لە وڵاتی(بەریتانیا) خۆیان دەگەیاندە ئەو وڵاتە و بە چەند مانگێکی کەم جوابیان وەردەگرت هاوڕێیەکی منیش کە خەڵکی شاری(ڕانیە)بوو پێکەوە لەکارگەی زەڵاتەکە کارمان دەکرد و ماوەی چەند مانگێکیش پێکەوە دەژیاین سەفەری کرد وا ڕێك کەوتین کە ئەگەر دەنگی جوابەکە ڕاست بێت منیش بچم بۆ ئەوێ،

تا ئەوەی ئەو گەشتە وڵاتی(ئیرلەندا)و لەپاش چەند مانگێکی کەم وەڵامی سیاسی وەرگرت و پەیوەندی پێوە کردم کە پێش ساڵی نوێی(٢٠٠٦) بگەمە ئەو وڵاتە چونکە هەموو سەری ساڵێك یاسای وڵاتانی ڕۆژئاوا گۆڕانکاری بەسەردا دێت!

منیش بەهۆی پەنجەمۆرەکەم و مارە بڕینی خێزانمەوە دەبوایە کارێکم بکردایە تا بتوانم چیتر خێزانم لە چاوەڕوانیدا نەهێڵمەوە چونکە لەساڵی(٢٠٠٤) لەڕێگەی وەکالەتەوە بەتەلەفون مامۆستا مەحمودی ئازادی بەڕێز خێزانی لێ مارەکردم.

بڕیارم دا سەفەری وڵاتی(ئیرلەندا)ی سەربەخۆ بکەم تاوەکو لەو وڵاتەدا هیچ نەبێت ئیقامەیەك وەرگرم و بتوانم خێزانم ڕابکێشم بۆ لای خۆم یان ئەگەر هیچ دەنگۆیەك نەبوو بەیەکجاری بگەڕێمەوە بۆ زێدی خۆم لە(هەرێمی کوردستان)!







بەم شێوەیە سوپاس بۆ خوا کۆتایی بە سەفەری دووەمم هات لەنێوان وڵاتی(ئەڵمانیا) بۆ وڵاتی(فەرەنسا)و لەوێشەوە بۆ وڵاتی(بەریتانیا) و لەمەوپاش دەچینە سەر کۆمەڵێك ڕووداوی تر ئەویش بریتیە لە : زنجیرەکانی سەفەرکردنم لە وڵاتی (بەریتانیا)وە بەرەو وڵاتی(ئێرلەندا)ی سەربەخۆ.

## سەفەرکردنم لەوڵاتی (بەریتانیا) بۆ وڵاتی (ئێرلەندا)ی سەربەخۆ وگەڕانەوە بۆ وڵاتی(بەریتانیا)و لەوێشەوە بۆ (هەرێمی کوردستان)(٢٠٠٥-٢٠٠٦).

پاش ئەوەی وڵاتی(بەریتانیا) کەوتە گرتن و ناردنەوەی پەنابەرانی کوردی (هەرێمی کوردستان) مانەوەم لەو وڵاتە باش نەبوو چونکە ڕێگەی ئیشەکەم بەسەیارە دووربوو زۆرجار پۆلیس دوامان دەکەوت و بەهۆی بێ مۆڵەتی شۆفێری ئەو برایەی ئیشم لەگەڵ دەکرد ڕایدەوەستاندین و داوای ناسنامەی دەکرد منیش چونکە خۆم تەسلیم نەکردبۆیەوە هیچ ناسنامەیەکم پێ نەبوو بۆیە بڕیارم دا ئەو وڵاتە بەجێبهێڵم و بەڕێبکەوم بەرەو وڵاتی(ئێرلەندا)ی سەربەخۆ کە لەوکاتەدا جوابی دەدا پاش گفتوگۆ لەگەڵ ئەو برا بەڕێزەی سەفەری کردبوو بۆ ئەو وڵاتە و جوابی وەرگرتبوو خوا پاداشتی بداتەوە ڕێنیشاندەری کردم کەچۆن سەفەر بکەم تاوەکو لە کۆنترۆڵ و گرتن پارێزراوبم بەویستی خوا!، سەرەتا چوومە گەراجی پاسی گەورەی شاری(بێرمینگ هام) بلیتێکم بڕی بۆ شاری(بلفاست)ی پایتەختی(ئێرلەندا)ی شیمالی سەر بە وڵاتی (بەریتانیا) کەوا دە توانی لە نێوان ئەو وڵاتانەی(ئینگلتەرا)داگیری کردوون هاتووچۆ







بکەیت بە یەك ناسنامە ئەگەر جوابیشت نەبێت پێکەوە پێیان دەوترێت(بەریتانیا) کەئەوانیش بریتین لە (ئینگلتەرا)و(وێڵز) و(سکۆتلەندا)و (ئیرلەندای شیمالی).

سەرەتای مانگی دەی ساڵی(٢٠٠٥) بوو گەشتبووینە مانگی پیرۆزی ڕەمەزان شەوێك پێش سەفەرەکەم لەبەر ئاشکرانەبوونی پەنجەمۆرەکانم دووبارە بەسمارتە و چەند شتێکی تایبەتی بۆ گۆڕینی پەنجەمۆرەکەم دەستکاری دەستم کردەوە بەڵام بەڕاستی تەنها ئازاردانی دەستی خۆمم بۆ مایەوە!، چونکە دواتر زانیم کە هەرگیز پەنجە دەستکاری ناکرێت و چەندێك هەوڵی لەگەڵ بدەیت پاش چەند ڕۆژێك وەك خۆی لێ دێتەوە کە ئەمەش زیاتر دڵنیایی پێ بەخشیم کە پەنجەمۆری کەس لەکەس ناچێت!، بەپێی بەڵگە قورئانیەکە و فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت:(بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُ)[1] واتە: بەڵێ ئێمە بەتوانایین کە تەنانەت نەخشە و خەتی سەر پەنجەکانیشی وەکو خۆی ڕێك و پێك بکەینەوە بە هەموو نەخش و نهێنیەکانیەوە لەکاتێکا نەخشەی سەرپەنجەی هیچ کەسێ لەهی کەسێکیتر ناچێ!

پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر پاش ماڵئاوایی کردن لەو برا بەڕێزانەم کە وەك قەڵایەکی پتەو پێکەوە بووین هەرچەندە یەکیان زۆر بێتاقەت بوو بەسەفەرەکەم بەڵام ئیتر ژیان ئاوایە و دابڕان هەردەبێ ڕووبدات جا ئەمڕۆبێت یان سبەی! پاشان بە پاس بەڕێکەوتم بۆ کۆتا سنوری وشکانی نێوان هەر دوو وڵاتی(ئینگلتەرا)و (ئیرلەندا)ی شیمالی پاسەکە تا شاری(ستران رایر)ی(ئینگلتەرا) هات و لەوێ دەبوایە بەکەشتی بپەڕاینایەتەوە بۆ وڵاتی(ئیرلەندا)ی شیمالی نزیکەی کاتژمێر و نیوێك بۆ دوو کاتژمێر لەناو کەشتیدا دەبێت لەبەردەم کەشتیەکەدا زۆرجار کۆنترۆڵی پۆلیس هەیە و داوای ناسنامە دەکات منیش هیچ ناسنامەیەکم پێ نەبوو تەنها بلیتێکم پێ بوو وتم: خوای گەورە خۆت دەفەرموویت: هۆکار بگرنە بەر منیش تەنها ئەم هۆکارەم پێیە و پشتیوان بەتۆ دەڕۆم!،

---

1 - (القيامة:٤)







لەوکاتەی سەرکەوتم دوو پۆلیسی مەدەنی لە ڕێڕەوی کەشتیەکەدا وەستابوون دەستم کرد بە خوێندنی زیکر و بۆ چاوبەست تەلەفونەکەم دەرهێنا و نام بەگوێمەوە بۆ ئەوەی وا هەست بکەن قسە دەکەم لەبەر خۆشمەوە بەهێواشی دەموت: خوایە کەسێك تەلەفون نەکات لەم کاتەدا ئاشکرام بکات سوپاس بۆ خوا بەلایاندا تێپەڕیووم و بەوردی سەیریان دەکردم بەڵام من خۆم تێکنەدا و بەبێ پەشۆکان بەلایاندا ڕۆشتم و چوومە ناو کەشتییەکەوە بەو شێوەیە سوپاس بۆ خوا گەشتینە شاری(بلفاست) و لەوێش کەوتمە دوای نەفەرەکانی ناو کەشتیەکە بۆ ئەوەی لەڕێی ئەوانەوە دەرگای چوونەدەرەوەی کەشتیەکە بدۆزمەوە!،
لەگەڵ دابەزینیش بارانێکی بەخوڕ دەستی پێکردبوو هیچ کۆنترۆڵێکم نەبینی لەبەردەم کەشتیەکەش دا پاس وەستابوو لەسەر پارەی هەمان بلیت سواری دەکردیت و دەیبردیت بۆ ناو گەراجی پاسی گەورەی ئەو شارە نزیکی بەرەبەیان بوو گەشتمە شاری(بلفاست)و تا نزیکی کاتژمێر هەشت کە کاتی کردنەوەی شوێنی بلیت فرۆشتنە چاوەڕوانم کرد ئاگاداریان کردمەوە هاورێکانم کەوا نەچمە دەرەوە و نەگەڕێم لەبەر ئەوەی بزوتنەوەی شۆڕشگێری هەیە دژ بە ئینگلیز و داوای سەربەخۆیان دەکرد!
ئینگلیزیش بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات لەو کێشەیە شارەکەی پڕکردبوو لە ئینگلیزی پرۆستانت مەزهەب چونکە ئیرلەندیەکان کاثۆلیکین و بەو شێوەیە جەنگی مەزهەبی خاك داگیرکردنەکەی لەبیریان دەبردەوە زۆرجار!، پاشان پەیوەندیم کرد بە هاورێکەمەوە ڕێنمایی کردم کە ڕاستەوخۆ بلیت نەبرم بۆ شاری(دبلن) کە پایتەختی وڵاتی(ئیرلەندا)ی سەربەخۆیە چونکە کۆنترۆڵ هەیە لە نێوان هەردوو (ئیرلەندا)کەدا تەنانەت بۆ ئیقامەداریش بەبێ فیزە ناتوانێت هاتووچۆ بکرێت بۆیە هەستام بەبرینی بلیت بۆ شارێکی وڵاتی(ئیرلەندا)ی سەربەخۆ بەناوی شاری (سلایگۆ) کە بەدوو پاس دەڕۆیت پاسی یەکەم سەردەکەویت و ماوەکەی نزیکەی کاتژمێر و نیوێك دەبێت تا







دەگەیتە کۆتا ناوچەی سنوری(ئیرلەندا)ی شیمالی داگیرکراو کەناوی(ئێنیسکیلێن)ە، پاشان لەو شوێنەشەوە پاسەکەت دەگۆڕیت و سواری پاسی وڵاتی(ئیرلەندا)ی سەربەخۆ دەبیت هەر لەسەر ئەو بلیتە و دوو کاتژمێر و چارەکێك دەچیتە شاری(سلایگۆ)!

سوپاس بۆ خوای گەورە بۆ نزیکی نیوەڕۆ گەشتمە شارەکە و ئەو هاوڕێیەم کە ڕێنیشاندەری کردم لە گەراجی پاسەکە چاوەڕوانی دەکردم چونکە لە کەمپی ئەو شارەدا تازە جوابی وەرگرتبوو هێشتا خانوی وەرنەگرتبوو هەر لەکەمپەکەدا ژیانی بەسەر دەبرد بە ڕێگەی نایاسایی لەپشتی کەمپەکەدا بەسەر تەلبەند بردیانمە ناو ژوورەوە ئەو شەوە لەو کەمپەدا مامەوە تا ڕۆژی دواتر!، بۆ ئەوەی شوێنی ئەو برایانە ناڕەحەت نەکەم و بەهۆی منەوە توشی کێشە نەبن بڕیارم دا بڕۆم بۆ خۆتەسلیم کردن!، بەڵام دەبوایە تەنها لە دوو شار خۆت تەسلیم بکەیت کە یەکەمیان لەناو شاری(دبلن)ی پایتەختدا بوو! دووەمیشیان لەناو دووەم شاری ئەو وڵاتەدا بوو بەناوی شاری(کۆرك) منیش لە شاری(دبلن)نزیکتر بووم بۆیە بڕیارم دا بڕۆم بۆ ئەوێ!

سەر لەبەیانی زووەکەی بەڕێکەوتم بۆ شاری(دبلن) بەپاس و نزیکەی چوار کاتژمێرێک دەبوو وابزانم، پاشان ناونیشانی شوێنەکەم لەسەر پەڕەیەکی کاغەز نووسیبوو پاشان تەکسیەکم گرت و دامە دەستی و بردمیە بەردەم بیناکە کەدابەزیم بەڕێکەوتم بەرەو ژووری بیناکە لەدەستێکی لاچەپدا بوو لەقاتی خوارەوە لەوێش نوقتەیەکی پۆلیسی لێ بوو هەر نەفەرێك تازە بهاتایە خۆی دەکرد بەو شوێنەدا و پۆلیسێکیش پاش گفتوگۆکردنێکی کەم و پشکنینی پۆشاك و جل و بەرگەکەت پێشوازی لێدەکردیت و دەیبردی بۆ ناو بیناکە ئیتر هۆڵێکی گەورەی تێدا بوو پڕ بوو لەکورسی و چەند نەفەرێکی تازەش گەشتبوون پێش من لەوێ دادەنیشتیت تا بانگیان دەکردیت پاش ئەوە چوومە بەردەمی بیناکە و پۆلیسێکی بەتەمەن بەرەو پیریم هات و کەوتە







پرسیارکردن منیش هەر دەموت کوردش بە ئاماژە وتی: وەرە پێشەوەوە چیت پێیە دەربێنە و داینێ لەسەر ئەو مێزە پاشان بردمیە ژوورەوە لەسەر کورسیەك داینام لە هۆڵەکەدا و وتی: چاوەڕوان بە!، پاش کاتژمێرێك بانگیان کردم بۆ چەند کابینەیەك بەرامبەر کورسی هۆڵەکان بوو بۆ چاوپێکەوتنی سەرەتایی نەفەری تازە دیاری کرابوو!، لەوێ وەرگێڕێکی کوردی سۆرانیان هێنا و هەندێك پرسیاری ناوی خۆم و کەسوکار و چۆنیەتی هاتنیان لێکردم و پاشان بردیانم بۆ پەنجەمۆرکردن شوێنەکە هۆڵێکی گەورە بوو پڕ بوو لە مرەکەبی ڕەش و وەرەقەی پەنجەمۆر سەرەتا دەستت پێ دەشۆن بەدەرمانێکی تایبەت و دواتر لەسەر شوشە پەنجەمۆریان پێ کردم،

لە بەشی پشتیشەوە کۆمپیوتەرێکی گەورە دانرابوو کەسێکی لەسەر بوو پەنجەمۆرەکەتی ڕادەکێشایە سەر شاشەکە و بە ماوسەکەی دەستی سەرجەم خەتە زیادە و ڕوشاوەکانی دەستتی دەسڕیەوە و دەیخستەوە سەر گرێکانی پەنجەی دەستت!، ئەوەیشی دەستکاری دەستی بکردایە ئەوە کۆمپیوتەرەکە دەیوت کێشە لەم پەنجەمۆرەدا هەیە و نەیدەخوێندەوە منیش چونکە دەستکاریم کردبوو لەگەڵ نەفەرێکی کوردی تردا هێشتینیانەوە تا ئێوارە دواتر زانیم کە ئەو کەسە پەنجەمۆری وڵاتی(ئیرلەندا)ی هەیە و ڕەفزی وەرگرتووە!، دووبارە هاتۆتەوە خۆی تەسلیم بکاتەوە و چووە هەردوو دەستی بە تەباخی کارەبایی سوتاندووە و خستویەتیە سەر پلێت و پەنجەمۆری نەهێشتووە!

دواتر هەرکەسێك پەنجەمۆری پێ بکرایە بە دۆڵمشێك دەیانبرد بۆ کەمپ بەڵام من و ئەو کوڕەیان هێشتەوە و گومانیان لێمان هەبوو گەشتە ئێوارە پۆلیسێك هات بۆ لامان و وتی: پەنجەمۆرەکانتان کێشەی تێدایە و کرێمێکی بۆ هێناین و





وتـی: بەکـاری بهێـنن ئەمشـەو تـا بەیـانی دەسـتتان بـاش دەبێـت و دووبـارە بەیـانی پەنجەمۆرتـان پێ دەکەینەوە گەر ئەم جارەش دەرنەچێت لای خۆمان دەتانهێڵینەوە تـا ئەوکاتەی پەنجەتان باش دەبێت و پەنجەمۆرەکانتان دەخوێنرێتەوە!

مانگی ڕەمەزان بوو هەردووکمان بەڕۆژوو بووین و زۆرمان برسی بوو، کاتێك هێنایانیانە کەمـپەکە چەنـد کـوردێکی تریشـی لێ بـوو خـواردنی ئامادەکراویشـیان دەدا بەوانەی بەڕۆژووبـوون لە کـاتی بەربانـگ و پارشێوانیشـدا پـاش نـانخواردن زۆر مانـدووبووم و چـوومە ژوورەکەم و کـرێمەکەم بەکار هێنـا و وتـم: خـوای گەورە خـۆت باشـتر دەزانیـت چی خێری تێـدایە دیـارە ئەم هۆکار گـرتنەبەرەی مـن هەڵەیە و پاشـان خەوتـم! بەیـانی دووبـارە بردیـانمەوە بـۆ پەنجەمـۆر لەگەڵ ئەو بـرادەرەدا و پەنجەمۆریـان پێکـردینەوە و پاش کاتژمێریك ناسنامەی ئایدیەکەی منیان هێنایەوە و وتیان:

تۆ تەواو کێشـەت نەما بەڵام ئەو نەفەرە لامان میوان دەبێت، واتە دەیبەین بۆ زیندان! وتم کاکە بۆ بەکارتنەهێنا کرێمەکە؟، وتی: من پەنجەمۆری ئێرەم هەیە و بەکارمهێناوە بەڵام بەتەباخ سـوتاندومە تـا هەفتەیەکی تـریش بـاش نـابێتەوە، ئیتر پـاش ئەوە لەیەك دابـڕاین و پـاش هەفـتەیەك بینـیمەوە و وتـی تـازە لە زینـدانی تاکەکەسـی بەریانـداوم و پەنجەمـۆرەکەی ئێرەم دەرچـۆتەوە و بەیـانی دەمنێرنەوە بـۆ کەمپەکەی خـۆم و پێیـان وتـووم چاوەڕوانی دادگایی کـردن بکە لەسـەر ئەم کارەت!،بەو شـێوەیە دوو هەفتە لەو کەمـپە کـاتیە هێشـتمیانەوە پاشـان لەگەڵ چەنـد نەفەرێکـدا نقـڵ کـراین بـۆ کەمپی هەمیشـەیی لەشـارێکی بچـوك بەناوی(کلێرنی) کە دەکەوێتە نزیکی شـاری (کۆرك)ەوە!

کەمپەکەمان زۆر خۆش بوو لەناو ئوتێلێکی ئەوشـارەدا بـوو ژوور ژوور بـوو هەر ژوورەو سێ بـۆ چـوار قەرەوێڵەی نەفەری تێـدابوو حەمـام و تەوالێتی تـایبەتی خـۆی تێـدا بـوو تەلەفزیۆنیش لەناو ژوورەکاندا هەبوون خواردنیشمان لەسەر کەمپەکە بوو ڕۆژی سێ




ژەم دەرگای چێشتخانەمان بۆ دەکرایەوە بەڵام بەداخەوە گۆشتەکەی حەلاڵ نەبوو هەموو ژەمەکانیش خواردنی پەتاتەی تێدا بوو بە حەوت شێوە لێیان دەنا!
چونکە کاتی خۆی کە ئینگلیز وڵاتی داگیرکردبوون تەنها پەتاتەیان دەخوارد و بەپێش چاویانەوە دەستدرێژی لەشەرەف و ناموسیان کراوە بە کەشتی گەورە گەنم فڕێ دراوەتە ناو دەریاوە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە و ئەوانیش برسی بوون بۆیە زۆر ڕقیان لە ئینگلیز بوو بەهۆی ئەوەی گۆشتەکە حەلاڵ نەبوو تا سێ مانگ گۆشتم نەخوارد تەنها لەجەژنی قوربانیدا نەبێت کە چەند مسوڵمانێکی ناو کەمپەکە پارەمان کۆکردەوە و لەجێگایەك قوربانیمان کرد و داوامان لە چێشتخانەکەی کەمپەکە کرد بۆیان ئامادەکردین لەوێش کافتریایەکی گەورەمان هەبوو کە سەتەلایتیان تێدا دانابوو هەموو نەفەرەکان لەوێدا کۆدەبووینەوە و سەیری کەناڵی وڵاتەکانمان دەکرد،
بۆ ئەوکەسانەشی ئارەزووی خوێندنیان بکردایە تاقیکردنەوەیان پێ دەکردیت سوپاس بۆ خوا لەناو کوردەکاندا تەنها من وەرگیرام لە قوتابخانەی فەرمیدا لە بەشی پشتەوەی کەمپەکەشدا هۆڵێکی گەورەی وەرزشی تێدابوو بیست و چوار کاتژمێر کراوەبوو ژوورێکیشیان پێدابووین لەمانگی ڕەمەزاندا بۆ نوێژکردن و نوێژە تەرواێحەکانمان لەناو شارەکەشدا مزگەوتێکی مسوڵمانانی بەنگلادیشی لێ بوو ڕۆژانی هەینی دەچووین بۆ ئەوێ نوێژمان دەکرد هەندێك کوردی تێدا بوو ناو کەمپەکە تەنها دووانیان نوێژی دەکرد و زۆربەیان بە ناسنامە مسوڵمان بوون دوانەکەش یەکیان پشتگیری دەکردم تازە خوا هیدایەتی دابوو یارەبی خوا پایەداری بکات وەك قەلا بوو بۆم بەداخەوە هەندێکی بێ دینی تێدا بوو بەردەوام دژایەتیان دەکردم و ئەوانەشی کە بەناو مسوڵمان بوون چونکە لەگەڵ ئەواندا دەچوون بۆ دیسکۆ و باڕ و مەشروبیان دەخواردەوە کاتێك کۆمۆنیستەکان ڕەخنەیان لە دین دەگرت بێدەنگ بون! بەڵام کاتێك من وەڵامی کۆمۆنیستەکانم دەدایەوە و بەفەزڵی خوا لوتیان دەشکا و هچیان پێ نەدەما بابای






بەناو مسوڵمانیش وەك پیشەی هەمیشەییان دەچوونە پاڵ کۆمۆنیستەکان هەتا جارێکیان پێم وتن کاکە خۆتان یەکلاکەنەوە لەم هەڵبەز و دابەزە! هەر بەڕاست ئێوە مسوڵمانن یان بێباوەر؟، وتیان: بۆ کاکە؟،وتم: تخوا ئێوە مسوڵمانن؟ بابای کۆمۆنیست ڕەخنە لە دین دەگرێت بێدەنگن!،بەڵام کاتێك من وەڵامیان دەدەمەوە و ئەوان هیچیان پێ نامێنیت خێرا ئێوە دەچنەوە پاڵیان و پشتگیری شکستەکانیان دەکەنەوە!، وەك دووڕووەکانی شاری مەدینە!،چونکە دەزانن من هاوڕێی سەر مێزی باڕ و دیسکۆکانتان نیم و ئەوان هاوڕێتانن ناتانەوێت لێتان زویربن!

لەو ماوەیەدا سوپاس بۆ خوای گەورە گەنجێکی شاری (ڕانیە) خوای گەورە هیدایەتی دا کەپێشتر دەیانبرد بۆ دیسکۆ و باڕەکان و سەرخۆشیان دەکرد و گاڵتەیان پێ دەکردا، منیش بۆ ئەوەی لەوانی دوورخەمەوە بردمە ژوورەکەی خۆم!

سوپاس بۆ خوا کەلەوان دوورکەوتەوە و تەوبەی کردو دەستی کرد بە نوێژ کردن باوەڕتان بێت هێندە ڕسوایی ئەو نەفەرانەی بۆ باس کردم کە بەچی ڕسواییەك مەشروبی بەرماوەی خەڵکی دەخۆنەوە لە بێ پارەییدا لە دیسکۆ و باڕەکاندا دزی دەکەن! خوا بۆی دام کەوتمە گاڵتە کردن پێیان وایان لێهاتبوو بەیەکیان دەوت هەرچیەك دەکەن با مەلا نەزانێت چی دەکەین بەخوا دەمانکات بەفلیم!، تەنانەت ئەو گەنجەش پێیان ڕاهاتبوو جاران گاڵتەیان پێ دەکرد بەڵام لەوەوپاش ئەو گاڵتەی پێدەکردن و دەهاتە لام و ناوچاوی ماچ دەکردم و دەیوت: سوێند بەخوا غیرەت و ئازایەتی تەنها بە ئیسلامەوەیە!

بێ لەو چەند کوردە ئیتر دوورکەوتمەوە لەوانی تر چونکە چەند جارێك توشی شەڕ هاتم لەگەڵ سێ کورددا کەیەکیان دەیوت زەردەشتیم و یەکیان دەیوت جولەکەم و یەکیان دەیوت: شیوعیم، بەوپەڕی ئەدەبەوە گفتوگۆم دەکرد لەگەڵیاندا کەهیچیان پێ نەدەما یان جوێنیان دەدا بە ئیسلام یان کوفریان دەکرد و ئیتر ناچار دەبووم بیکەم






بەشەڕ لەگەڵیان تا کۆتا جار پێم وتن: نەمن باسی ئیسلام دەکەم بۆتان نە ڕێگەش دەدەم کەستان سوکایەتی بکات!، وای لێهاتبوو هەرکات من بچوومایەتە کافتریاکە ئەوان هەڵدەستان و دەڕۆشتن هەرکات ئەوانیشی لێبوونایە من دەڕۆشتم!
چەند مسوڵمانێکی ڕەشپێست و عەرەبی لێبوو زۆر ڕێزیان لێدەگرتم باوەڕ بکەن مەشروب خۆر و ئەهلی دیسکۆ و چەقۆ کێشیشیان هەبووە کاتێك چوومەتە کافتریاکە تەلەفزیۆن لەسەر شتی خراپ بووە خێرا لایان بردووە و کۆنترۆڵەکەیان دەدایە دەستم وەك ڕێزێك لەکاتێکدا جاری وا هەبوو لێیان توڕە دەبووم لەسەر خراپەکانیان ناوچاویان ماچ دەکردم و دەیانوت بەخوا ڕاست دەکەیت بەڵام بەداخەوە ئەوانەی کە هاوزمانم بوون دەتوت من نامۆم لەناویاندا تا ڕێزم لێبگرتنایە بە گێل و گەمژە سەیریان دەکردیت و کاتێك دەچوومە ناو کافتریاکە بۆ ئەوەی دانەنیشم!
دەچوون دەیانخستە سەر شتی خراپ!، هەر لەوکاتەشدا بوو کە سەدام دادگایی دەکرا و سەرلەبەری دادگاییەکانیم دەبینی لە کەناڵی (جەزیرەوە)و بۆ مسوڵمانانی ئەوڵاتانەم ڕوون دەکردەوە کە نەیاندەناسی و سۆزیان بۆی هەبوو کەوا چی زوڵمێکی کردوە لە مسوڵمانانی (هەرێمی کوردستان)!
جارێکیان کوردێك هاتە لام وتی: سوێند بەخوا مەلا من خراپم بەڵام دەزانم تۆ لەسەر هەقی بەڵام ماوەیەکە ناتبینم بێیتە لای ئێمە و ئێستا زیاتر لەگەڵ چەند کوردێك و عەرەب و ڕەشپێستەکاندا برادەرایەتی دەکەیت!، منیش وتم: هەرکەس ڕێزم لێبگرێت ئەوە ڕێزی خۆی گرتووە و خاوەنی ڕێزیشە لای من و ڕێز لەخۆی دەگرێت بەڵام بەداخەوە هەندێك کەس هەیە چونکە نازانن مانای ڕێز چییە کاتێك ڕێزیان دەگریت وادەزانن گەمژەیت و لێیان دەترسیت بۆیە باش وایە لێیان دووربکەویتەوە.
بەو شێوەیە ماوەی سێ مانگ لە وڵاتی(ئیرلەندا)ش مامەوە و پاشان دووبارە هەردوو پەنجە مۆرەکەی وڵاتی(ئەڵمانیا)و وڵاتی(بەریتانیا)م ئاشکرا بوو بەڵام وتیان: چونکە





یەکەم وڵات لە(ئەڵمانیا) خۆت تەسلیم کردوە دەتنێرینەوە بۆ ئەوێ لە دوای پشووی ساڵی نوێدا! بەداخەوە دووبارە بەهەمان ناوی ئەو کەسەم بۆ هاتەوە کە پەنجەمۆراکەم لە وڵاتی(ئەڵمانیا) تێکەڵ ببوو لەگەڵیدا بەداخەوە لە ڕێکخراوی ڕۆژئاوای (یۆرۆ داك) و(دبلن دەبڵ ئێڵ) چاکیان نەکردبوو پاش ئەوەی چوومە لای پارێزەر و کێشەکەم باس کرد و پاشان سەرجەم کێشەکەم نارد بۆ فەرمانگەی(مافی مرۆڤ) لەو وڵاتەدا بەڵام بەداخەوە هیچیان بۆ نەکردم و وتیان: تازە وڵاتی(ئەڵمانیا) داوای کردویتەتەوە و ئێمە دەبێت بتنێرینەوە و لەوێ دەتوانی کێشەکەت چارەسەر بکەیت!، منیش دەمزانی بۆ داوام دەکاتەوە بۆ ئەوەی وەك جاری پێشوو بابەتەکە دیزە بەدەرخۆنەی بکات و لەسەری نەکەوێت بۆیە بڕیارم دا پێش وادەی سنورداش کردنەوەم بۆ وڵاتی(ئەڵمانیا) بەڕێگەی نایاسایی خۆم بگەیەنمەوە وڵاتی(بەریتانیا)!
بەڕاستی زانایان ڕاستیان فەرمووە مرۆڤ بە گەڕان زیاتر شت فێر دەبێت تا خوێندنەوە!، چونکە تا نەچوومە وڵاتی(ئیرلەندا) و نەچوومە لای پارێزەر نەمدەزانی کەوا گەر پەنجەمۆر کرایت لە هەر وڵاتێك لیستێکی پەنجەمۆرەکەت دەڕواتە ئەو ڕێکخراوەوە کە ئەندامی ئەو وڵاتانەی تێدایە کە مافی پەنابەری دەدەن و دواتر بچیتە هەر وڵاتێکی تر دووبارە لیستی ئەو پەنجەمۆرەشت دەڕواتەوە ئەو ڕێکخراوە و بەزوترین کات ئاشکرا دەبێت کە پێشتر لەچی وڵاتیك و بەچی ناوێك خۆت تەسلیم کردووە هەموویت لەماوەیەکی کەم دا بۆ دێتەوە و زۆربەی پەنابەرانیش بێ ئاگا بوون لەم بابەتانە چونکە لەهەندێ وڵات دا باسی ناکەن تا زانیاریت نەبێت لەسەری.
هەتا مانگی پێنجی ساڵی(٢٠٠٤) ژمارەی ئەو وڵاتانەی ئەندام بوون لە(دبلن) بیست و پێنج وڵات بوون و ساڵ لەدوای ساڵیش ئەندامیان زیاتر دەبێت و وەهەرکەسێکیش لەپاش ساڵی(٢٠٠٣) ەوە پەنجەمۆری وڵاتێکی ئەندامی هەبێت لەبەشی(دبلن) ئەوە بە






ئاسـانی پەنجەمـۆرەکەی ئاشـکرا دەبێـت و سنورداشـی وڵاتـی یەکەمـی پەنجەمـۆری دەکرێتەوە!

پـــاش گەڕانەوەم لای پـــارێزەر لەشـــاری(کۆرك) بـــێ هیـــوا بـــووم لە مـــانەوەم لە وڵاتی(ئیرلەندا)و وادەی سنورداشیشم بۆ وڵاتی(ئەڵمانیا)نزیك بۆیەوە چووینە ناو ساڵی نـوێی(٢٠٠٦) و کۆتـا ڕۆژم بـوو لە کەمپەکەدا پۆستێکم بـۆ هـات بلیتی پاس و فـڕۆکەی تێـدا بـوو بلیتـی پاسـەکە بـۆ شـاری(دبلن)ی پایتەخـت بـوو بلیتـی فـڕۆکەکەش بـۆ شاری(شتوتگارت)ی وڵاتی(ئەڵمانیا) ئیتر منیش ماڵئاواییم لە دۆستان و ئازیزانم کردو لە بـری ئەو شـوێنە گەڕامەوە بـۆ شاری(سـلایگۆ)و دووبـارە بەڕێـگەی قاچـاخ بەرەو وڵاتی(بەریتانیـا) بەڕێکەوتـمەوە و نەچـووم بـۆ ئەو ناونیشـانەی کە دەیانویست لەوێـوە سنورداشـم بـکەنەوە بۆ(ئەڵمانیـا) دواتـر شـەوێك لەمـاڵی ئەو بـرا بەڕێـزە مـامەوە کە ڕێنیشـــاندەری کـــردم و بەیـــانیەکەی دووبـــارە بە دوو پـــاس بەڕێکەوتـــمەوە بـــۆ شاری(بلفاســـت)ی پـــایتەختی (ئیرلەنـــدا)ی شـــیمالی کە هەرێمێکـــی ســـەر بە وڵاتی(بەریتانیا)یە!،

بەڵام ویسـتی خـوا وابـوو پاشـنیوەڕۆ پـاس هەبـوو بـۆ ئەو شـارە تـا گەشـتمەوە شاری(بلفاسـت) شـەوم بەسـەردا هـات و کەشـتی بـۆ پەڕینەوەی خـاکی(ئینگلتەرا) نەمابوو،

پاش پرسیارکردن ئاگاداریـان کـردمەوە کە لە شـوێنێکی دەرەوەی شـارەکە کاتژمێر نـۆی شـــەو کەشـــتیەکی گەشـــتوگوزاری بەرەو شـــاری(لێڤەرپول) ئەو شـــارەی کە کەشتیەکەی(تایتانیك)ی لێوە دەرچووە بەڕێدەکەوێت تەنها نیو کاتژمێرم مابوو بگەمە کەشتیەکە و بەپەلە چوومە دەرەوە و تەکسیەکم گرت و ناونیشانەکەم دایە دەستی و پاش پانزە خـولەك گەشـتمە شـوێنی مەبەسـت پاشـان چـوومە ژوورەوە و شـوێنی بلیت بـڕینم دۆزیەوە پاش ئەوەی داوای بلیتێکی ئاسـاییم کـرد وتم:پێویستم بە ژوور و شـوێنی







خەو نیە لەویا کارمەندەکە داوای ناسنامەی لێکردم لەبەر ئەوەی کەشتیەکە کەشتی تایبەت بوو وە خەڵکی گەورە و بەناوبانگی تێدا بووا،منیش خوای گەورە خستیە سەر زمانم و زەردەخەنەیەکم بۆ کرد و وتم: زۆر داوای لێبووردن دەکەم من قوتابیم و هاتووم بۆ پشوو بەهۆی سەری ساڵی نوێوە ناسنامەم لەیاد کردووە! بەڵام دەتوانم ناونیشانی ماڵەکەمت بدەمێ لەشاری(بێرمینگ هام)دادەنیشم سەیرێکی کردم و وتی: کارێکی باشت نەکردوە کە ناسنامەت هەڵنەگرتووە بۆ ئەم ڕێگە دوورە!،من ناتوانم بلیتت بۆ ببڕم!. منیش داوای لێبوردنم لێکرد و وتم: خوێندنم دەست پێدەکاتەوە تکات لێدەکەم ئەم جارە ڕێگەم بدە بۆ جارێکی تر هەوڵ دەدەم ئەم هەڵەیەم بەسەردا دووبارە نەبێتەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و وتی: بەشێوەتدا دیارە تۆ لەکەسێکی خراپ ناچیت کێشە نیە ناونیشانەکەتم بەرێ بلیتت بۆ دەبڕم هەرچەندە ئەم کەشتیە نابێت بە بێ ناسنامە کەس سەربکەوێت هیوادارم جارێکی تر ناسنامەت بۆ
ئەم ڕێگە دوورانە لەیاد نەچێت!، منیش لەدڵی خۆم دا وتم: خوا دەکات تۆ ئەم جارە بلیتم بۆ دەبڕیت باوەڕ بکە جارێکی تر سەر ناکەمەوە بەم شوێنەشدا ئیتر سوپاس بۆ خوا بلیتی بۆ بڕیم و سواری کەشتی بووم،
بەڵام لەژیانم دا تەنها لە فلیمەکاندا کەشتی وام بینیبوو هێندە گەورە و فراوان بوو گەر زۆر بگەڕامایە ڕێگای چوونە دەرەوەم لێ تێکدەچوو دەتوت شارە هەرچیت بویستایە تێیدابووا چەند کاتژمێرێك لەڕۆشتندا بوو چوومە دەرەوەی کەشتیەکە سەیرێکی ناو دەریاکەم کرد باوەڕتان بێت نەموێرا لە چەند دەقەیەك زیاتر بمێنمەوە شەپۆلی ئەو دەریایە دەتوت شاخی بەرزە دەهات و دەڕۆشت ئاوەکەش ڕەشی دەکردەوە و سامێکی هەبوو پیاو نەیدەتوانی زۆر سەرنجی بدات لەوکاتەشدا هاتەوە یادم کە لەو نێوانەدا کەشتی(تایتانیك) نقوم بووە هێندەی تر پەنام بەخوای گەورە گرت کە بەسەلامەتی بگەینە شوێنی مەبەست چونکە بەدەقی فەرمووده هاتووە کە





دەفەرمووێت: ئاو زەمانی نیە و داوامان لێکراوە بۆ سێ شت نەبێت سەفەر بەناو ئاودا نەکرێت باشترە!، ئەوانیش جیهاد و حەج و عەمرەیە!، لەبەر ئەوەی ژێر ئاو ئاگرە و پاش ئاگرەکەش دووبارە دەبێتەوە بەئاو خوا پەنامان بدات!، ماوەی نۆ کاتژمێر لەو کەشتیەدا بووم و بەرەبەیان گەشتینە شاری(لێڤەرپول) لەناو کەشتیەکەدا سیمکارتەکەی وڵاتی(بەریتانیا)م خستەوە سەر مۆبایلەکەم و هەواڵم دا بەو برایەی کە لای دەژیام لە شاری(بێرمینگ هام) و ئەوان نیوەڕۆ دەچوون بۆ ئیش و کلیلی ماڵەکەیان بۆ بەجێهێشتم لە شوێنێکدا و ئەو برا بەڕێزەم کە لای دەژیام و ناڕازیش بوو سەفەربکەم لەخۆشیا وایدەزانی جوابی وەرگرتووە کە گەڕاومەتەوە بە پێکەنینەوە پێی دەوتم نەموت: دەرۆی بەڵام هەر تێی تۆ منیش بەپێکەنینەوە دەموت: بەڵێ بەڵێ دەزانم سەری گا هەر دۆڵە هێندە چاوتان لەدوام بوو تا هاتمەوە!

پاش ئەوەی گەشتمە شاری(لێڤەرپول) سواری تەکسیەك بووم و چووم بۆ گەراجی پاس و بلیتی شاری(بێرمینگ هام)م بڕی و پێش نیوەڕۆ گەشتمەوە شارەکە کاك حاجی گیانیش کە لەگەڵمان دەژیا قەلێکی حەلاڵیان دەستکەوتبوو دەمێك بوو خواردنی دەستی نەخواردبووم وتی: شێخە گیان تا دێینەوە قەلەکەمان بۆ حازر بکە،

منیش بەڕاستی یەکەم جارم بوو گۆشتی قەل لێبنێم بەڵام باوەڕ بکەن هەر لەخۆوە هێندە خۆش دەرچووبوو دەست و پەنجەتان پێوە دەخوارد بێ ئێوە ناخۆش پاش گەشتنەوەم و یەکتر بینینەوە خوا پاداشتی خێری ئەو برا بەڕێزەم بداتەوە کە جێی کردبوومەوە لای خۆی پەیوەندی کردەوە بە کارگەکەوە بۆ ئەوەی وەرمگرنەوە.

ئیتر لەڕێگەی کوردێکەوە بۆم ئاسان کرا و وەرگیرامەوە خوا هیدایەتی بدات کە بەرپرس بوو لە بەشێکی کارگەکە لەگەڵ ئەوەی کارگەکە کەسی وەرنەدەگرتەوە گەر بڕۆشتایە بەڵام ئەگەرچی دەیوت من بێ دینم منی زۆر خۆشدەویست و پێشتریش کە ئیشم دەکرد بەتایبەتی دەهات بەدوامدا و دەیکردم بە لێپرسراوی هەندێك لاینی

کوردەکان تا زەڵاتە زیادەکانیان فڕێ نەدەن دەموت: باشە بۆ من لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا؟، دەیوت: مەلا گیان دەزانم تۆ لەخوا دەترسیت نایەڵیت زەڵاتەکانیان فڕێ بدەن ئەم هەتیوە بێ ویژدانانە!،منیش دەموت: دەی بەس نیە لێرەشدا دان بەڕاستیەکاندا دەنێن و خواتان دێتەوە یاد؟، ئەوانیش لەگەڵ منیان دەبینی گڵۆڵەیان دەکەوتە لێژی و دەیانوت: بابە هەرکەس دەکەی بەچاودێر بیکە بەس بەخوا مەلا نایەڵێت دەنکێ زەڵاتەش بەفیڕۆ بدەین!، نزیکەی سێ مانگێك ئیشم کردەوە بەڵام بەهۆی خراپی ڕەوشی پەنابەرانی وڵاتی(بەریتانیا) کە گرتن و سنورداشی زیادی کردبوو بڕیارم دا بەیەکجاری بگەڕێمەوە بۆ(هەرێمی کوردستان) هەستام چووم سەردانی ڕێکخراوی(جی سی ئارم)کرد کە یارمەتی کێشەی پەنابەران دەدات باسی پەنجەمۆرەکانم و کێشەکانی خۆمم بۆکردن و داوام لێکردن هاوکاریم بکەن و کارئاسانیم بۆ بکەن لەڕێگەی ڕێکخراوی(ئای ئۆ ئێم)ەوە بمگەڕێننەوە بۆ(هەرێمی کوردستان) بەڵام وتیان: مادەم پەنجەمۆری وڵاتی(ئەڵمانیا)ت هەیە دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ ئەو وڵاتە و لەوێوە داوای گەڕانەوە بکەیت! بە بێ ئومێدی گەڕامەوە و بیرم لەڕێگەی قاچاخ کردەوە بۆ گەڕانەوە بەڵام ئەو ڕێگەیەش هەروا ئاسان نەبوو!. تاخوای گەورە بە موعجیزەیەکی گەورەی خۆی کارێکی بۆ ئاسان کردم و پەردەی دا بەسەر چاوی ڕێکخراوی(ئای ئۆ ئێم)دا و بەگرتنە بەری هەندێك هۆکار و پشت بەستن بەخوای بەدەسەڵاتم خۆشم باوەڕم نەکرد کەوا ئەوکارە وا بەئاسانی سەربگرێت لەڕێگەی فڕۆکەوە لە شاری(لەندەن)ەوە لە کۆتایی مانگی سێی(٢٠٠٦)دا لەگەڵ حەفتا پەنابەری کوردی گەڕاوەی یەکجارەکی گەشتمەوە فڕۆکەخانەی شاری(سلێمانی)کە بۆ دووەم جار بوو لە شاری(لەندەن)ەوە فڕۆکەی بۆ بڕوات چونکە تازە کرابۆیەوە!، هەواڵ و کاتی گەڕانەوەشم بێ لە ماڵی باوکم و ماڵی خەزورم کەس نەیزانی تائێستاش!




لەکۆتـایی ئەم بەشـەدا دەڵـێم: خـوای گەورە زۆر سوپاسـت دەکەم کە سـەرکەوتوت کـردووم و لەم هەمـوو ڕووداو و کارەسـاتانەی کەبەسـەرم دا تێپەڕیـون ئەگەر فەزڵ و گەورەیی تۆ نەبوایە ئەوەهەرگیز منی بەندەی گوناهبار نەمدەتوانی بگەمە ئەم ئاستەی ئێسـتام وە دڵنیـام ئەگەر لە دونیاشـدا ئـازار و نـاڕەحەتیم کێشـابێت گرنـگ ئەوەیە ئیمانەکەمت سـەلامەت کـردووە کە ئەوەیـان گەورەتـرین سـەرمایە و قـازانجی منە بـۆیە دەڵێم: زۆر سوپاسی سەرجەم ناڕەحەتی و بەڵاو تاقیکردنەوەکانی ژیانمت لێدەکەم کە ئەم بەنـدە تاوانبـارەت بەسـەر کـردۆتەوە و ئەم دەرفەتەت بـۆ ڕەخسـاندم کە ئەم ڕووداوانە بـخەمە سـەر پەڕە و وەك یـادەوەری و پەنـد و ئامۆژگـارییەك بیاننووسـمەوە هیـوادارم جێگای ڕەزامەنـدی خـوای گەورە بووبێـت و بشـبێتە تەجـروبەیەك بۆ گەنج و لاوە مسـوڵمانەکانی وڵاتەکەم و سـودمەندبن لێی وە بـاش بـزانن سـەرکەوتن لەهەمـوو کـار و کردارێکـدا تەنهـا پشـت بەسـتنە بەخـوای تـاك و تەنهـا پاشـان هۆکاری شـەرعی گـرتنەبەرە بـۆ ڕێگـا سـەختەکانی ژیـان خۆشی و ناخۆشـیەکانی ژیـانیش بەسـەردەچن و کۆتاییـان پێـدێت گرنـگ خـۆڕاگری و هەسـتانەوەیە لەناڕەحەتیەکان و بەرگەگـرتنە لە بەرامـبەر ئازارەکـانی ژیـان و ئامانجمـان تەنهـا بەدەسـتهێنانی دوارۆژ و بەهەشـتی نەبڕاوەبێت و دڵنیابین یەك هەناسە لەناو بەهەشتەکەی خوادا سەرجەم ئەم ئازار و ناڕەحەتیانەمان لەیاد دەباتەوە!

بەم شـێوەیە سـوپاس بـۆ خـوا کۆتـایی بە سـەفەری نێـوان وڵاتی(بەریتانیـا) بـۆ وڵاتی(ئیرلەنـدا)ی سـەربەخۆ و گەڕانەوە بـۆ وڵاتی(بەریتانیـا)و لەوێشـەوە بـۆ(هەرێمی کوردسـتان)هات و بەم زنجیـرەیەش کۆتـایی بە یەکەم سـەفەرم بـۆ هەنـدەران وسـەفەرەکانی نێـوان وڵاتـانی ڕۆژئـاوا هـات لەسـاڵەکانی(٢٠٠٣ بـۆ ٢٠٠٦) و لەمەوپـاش پشـتیوان بەخـوا دەچینە سـەر چیرۆك و ڕووداوەکانی سـەفەری دووەمم بۆ هەنـدەران کە لەگەڵ خێزانی بەڕێزم دا ئەنجامـمان داوە ئەویش بڕینی ڕێگای سنورە سـەختەکانی




نێوان (هەرێمی کوردستان) و وڵاتانی(ئێران-تورکیا- یۆنان)ە لەپەڕەکانی دواتردا کەبریتیە لە سەفەری دووەمی هەندەران، تیشک دەخەمە سەری إن شاء الله!

**ڕەنج شێخانی**
**١٩ / ١/ ٢٠١٥**
**فینلەندا**

# (سەفەری دووەم)



# ڕێگا سەختەکانی هەندەران

# (کوردستان _ ئێران _ تورکیا_ یۆنان)

# (٢٠٠٦_ ٢٠١١)

# ڕەنج شێخانی

## پێشەکی:

پاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان وە سەڵات و سەلامی خوا بڕژێت بەسەر پێغەمبەری کۆتا زەمان محمد﴿ﷺ﴾.

پاش ئەوەی لەبەرواری(٢٨ / ٣ /٢٠٠٦) بەفڕۆکە لەشاری(لەندەن)ەوە گەڕامەوە بۆ شاری(سلێمانی) لەگەڵ حەفتا پەنابەری گەڕاوەی یەکجاری تری کوردیدا، لەلایەن باوکم و خوشکە گەورەکەم و خێزانی بەڕێزمەوە بە سەیارەی باوك و دایکی بەڕێزی برایەکی ئیمانیم خوا پاداشتی خێریان بداتەوە پێشوازیم لێکرا سوپاس بۆ خوا پاش زیاتر لە چوار ساڵ دابڕان پێیان شاد بوومەوە دایکی خۆشەویستیشم بە ترس و لەرزەوە لەماڵەوە لەچاوەڕوانی کوڕە سەرەڕۆکەی دابوو باوەڕتان بێت کاتێك باوەشی پێدا کردم گیانی وەك شەقشەقە دەلەرزی و ئەوکاتە هەستم کرد ئازاری جەرگ چەند ناڕەحەتە!، کە سوپاس بۆ خوا هەمیشە پشت بەخوا بەبێ چاوترسان هەرکارێکم ویستبێت ئەنجاممداوە ئەویش لە پاش گرتنەبەری هۆکاری شەرعی و نوێژی نیاز و داواکاری و پرس و ڕا بەکەسانی دڵسۆز و شارەزا هەنگاوم ناوە.

بە بێ ئاگاداری خۆم دایکم و باوکم دڵسۆزانە خوای گەورە بەرەکەت بخاتە تەمەنیانەوە بۆ ئەوەی بتوانم خێزانی بەڕێزم لەگەڵ خۆم بەرم،مامەڵەیان لەگەڵ قاچاخچیەکدا کردبوو تا جەوازی عێراقیمان بۆ دروست بکات و برایەکی بچوکیشم




لەگەڵمان بێت تا ئەوانیش کارەکانیان جێبەجێ کرد من و خێزانم ناسنامەمان تازە کردەوە و خانەم بۆ جیا کردەوە لەو ماوەیەشدا بێ لەماڵی خەزورم کەس بە گەڕانەوەکەی نەزانیم هەر بۆیە هۆکاری گەڕانەوەم ئەمجارە لەبەر ڕەوشی ژیانی خێزانداریمان بوو کە وای پێویست دەکرد کەس نەزانێت بۆ مەبەستی گەشتەکەش سەرەتا لەڕێگەی(ئیبراهیم خەلیل)ەوە بەفیزەی وڵاتی(تورکیا) بەڕێکەوتین بەڵام نەمانزانی کە جەوازەکان ساختەن و قەدەری خوا لەوێ گیراین

بەڵام باش بوو پێش ئەوەی ئاسایش بگاتە شوێنەکە ئێمە بەپەلە هەڵهاتین و دواتر زانیمان کە قاچاخچیەکە فێڵی کردبوو لە کاتێکدا ئێمە بە حسابی جەوازی ئەسڵی بۆمان کرابوو!

پاش ئەوە گەڕاینەوە بۆ شاری(سلێمانی) و مشتومڕێکی زۆر لەگەڵ قاچاخچی و تەرەفەکەیدا پێك هاتین لەسەر ئەوەی کەوا فیزەی وڵاتی(ئێران) وەربگیرێت و لەوێوە بەپاس ڕۆشتین بۆ شاری(وان) بەڵام دووبارە لەسەر سنوری نێوان وڵاتی (ئێران) و(تورکیا) لەخاڵی سنوری چوونەناوەوەی وڵاتی(تورکیا) ڕێگەیان نەداین و وتیان: دەبێت هاوڵاتی عێراقی بە فڕۆکە بڕواتە وڵاتی(تورکیا)و گەڕاندینیانەوە بۆ ناوخاڵی سنوری وڵاتی(ئێران) ئیتر ئێمەش بەناچاری لەڕێگەی فڕۆکەوە لەشاری(تەبرێز)ەوە بەڕێکەوتین بۆ شاری(ئەستەمبوڵ) و پاش دوو مانگ مانەوەمان لەو شارە بەڕێگەی پێ سەفەرێکمان کرد لەناو خاکی وڵاتی (یۆنان)دا گیراین وسنورداشی وڵاتی (تورکیا) کراینەوە و پاشان لە ڕێگەی بەلەمی بچوك(یەخت)ەوە لەشاری(ئەرزوم) لەڕێی دەریای(ئیجەوە)کە خەریك بوو بخنکێین بە شەست کاتژمێر گەشتینە وڵاتی (یۆنان) و پایتەختەکەی کە ناوی شاری(ئەسینا) یە!

سەرجەم ڕوداوەکانی ئەم گەشتە پڕ لەخۆشی و ناخۆشی و تولانیە لە پەڕەکانی داهاتودا دەخەمە پێش چاوی خوێنەرانی کورد زمانی بەڕێز کە لەگەڵ خێزانی بەڕێزم دا




لەشاری (سلێمانی) یەوە بۆ شاری(ئەسینا)و پاش پێنج ساڵ دووری لە کەسوکار گەڕاینەوە بۆ شاری(سلێمانی) لەساڵی(٢٠٠٦) بۆ ساڵی(٢٠١١).

# ڕەنج شێخانی
# ساڵی ٢٠١٥
# فنلەندا

## سەفەرکردن بۆ وڵاتی(تورکیا) لەڕێگەی گومرگی(ئیبراهیم خەلیل) و دەرنەچوون و گەڕانەوەمان بۆ شاری(سلێمانی)!

پاش بیست ڕۆژ مانەوەم لەشاری(سلێمانی) جەوازەکانمان بۆ تەواوکرا پاشان فیزەی وڵاتی(تورکیا)ی لێدرا شەوێك پێش سەفەرەکە ماڵئاواییمان کرد لە ماڵی باوکی خێزانم و خوشکە بەڕێزەکانی و چووینە ماڵی ناسراوێکمان و بۆ سەر لەبەیانیش ماڵئاواییمان لە دایك و باوکم و خوشك و براکانم کرد و بە تەکسیەکی مازدا کە لەلایەن قاچاخچیەکەمانەوە ئامادەکرابوو بەڕێکەوتین بەرەو کۆتا سنوری نێوان (هەرێمی کوردستان) کە ناسراوە بە(ئیبراهیم خەلیل) و سەرەتای سنوری کوردستانی(تورکیا) کە ناسراوە بەشاری(سلۆپی)!

لەڕاستیدا زۆرم بەلاوە سەیر بوو کە قاچاخچیەکەمان ئەم شۆفێرەی بۆ گرتبووین بە بڕی چوارسەد دۆلار تا ئەو سەر سنورە! هەستم کرد نهێنیەك لەم سەفەرەدا هەیە بەڵام چونکە باوکی بەڕێزم سەرپەرشتی کارەکانی کردبوو نەماندەزانی چی شتێك لە گۆڕدایە! باوکی بەڕێزیشم زۆر شارەزای فرت و فێڵی قاچاخچیەکان نەبوو نەیزانیبوو جەوازەکان ساختەن! بەهەرحاڵ لەڕێگەی شاری(موسڵ)ەوە دامان بەلای شاری (دهۆك)دا و لەوێشەوە بۆ قەزای(زاخۆ)و پاشان بۆ خاڵی سنوری(ئیبراهیم خەلیل) وا بڕیار بوو شۆفێرەکە بڕواتە ژوورەوە مۆری چوونەدەرەوەمان بۆ بدات لە جەوازەکان و پاشان لەگەڵمان بێتە ناو بەشی پێشوازی کردنی وڵاتی(تورکیا)و لەوێش بە پارە مۆری




چوونەژوورەوەمان بۆ بدات لە جەوازەکان ئیتر پاش ئەوە ماڵئاواییمان لێ بکات! بەڵام چونکە دەیزانی جەوازەکان ساختەن و ئەویش ویستی پارە نەدات جەنابیان خۆی شاردەوە و وتی: کاکە ئێوە بڕۆن با لە بەشی(هەرێمی کوردستان) مۆرەکەتان بۆ لێ بدرێت دواتر بەشەکەی وڵاتی(تورکیا) لەسەر من! بەڕاستی منیش وامدەزانی جەوازەکان بە یاسایی دروستکراون تا ئەوکاتەش بۆیە گوێم پێی نەدا و چووینە ژوورەوە، ئافرەتێکی کارمەندی بادینی بەخێرهاتنی کردین و سەیرێکی جەوازەکانی کردین و وتی: بۆچی دەڕۆن بۆ وڵاتی(تورکیا) منیش وتم: ئەوە خێزانمە و ئەوەش ناسنامەکانمان و بەڵگەنامەی هاوسەرگیریمانە تازە چووینەتە ژیانی هەسەرگیریەوە و دەچین بۆ وڵاتی(تورکیا) بۆ گەشتوگوزار!، وتی: بەڵام کاك ڕەنجدەر جەوازەکانتان ساختەیە و بەداخەوە ناتوانن سەفەرەکەتان بکەن!، ئەگەرچی ناسنامە و ڕەگەزنامە و بەڵگەنامەی هاوسەرگیریەکەتان یاساییە بەڵام جەوازەکانتان ساختەیە! بەڕاستی منیش توشی سەرسوڕمان بووم و خۆم تورە کرد و وتم: تۆ دەزانی بەکێ دەڵێیت: ساختە چی؟ وتی نەخێر؟ وتم: بە کاربەدەستانی بەشی جەوازاتی وڵاتی(عێراق) و (هەرێمی کوردستان)! چۆن دەبێت جەواز ساختە بکرێت لەم وڵاتەدا؟ وتی: دیارە بەڕێزت ئاگاداری ئەو حاڵەتانە نیت و ڕۆژانە دەیان جەوازی لەو شێوەیە بەپارە دروستدەکرێت و ئێمەش دەیانگرین! منیش زیاتر سوور بووم لەسەر یاسایی جەوازەکان و داوای لێکۆڵینەوەی زیاترم لێکرد لەو بارەیەوە!

وتی: باشە دابنیشن ئێستا دێمەوە پاش کەمێك هاتەوە و چووە لای بەڕێوەبەری بەشەکەی و هاتەوە وتی: دەزانیت ئەگەر لەبەر خێزانت نەبوایە ئێستا پەیوەندیم دەکرد بە ئاسایشەوە لەسەر داوای خۆت زیاتر لێکۆڵینەوەیان لەگەڵتا بکردایە وە دڵنیاش بە لەگەڵ خۆیاندا دەتبەن و توشی کێشەش دەبیت! بەڵام من چاکەیەکت لەگەڵ دەکەم تا زووە بڕۆن باشترە چونکە کەمێکی تر هەر دەبێت ئاگادار بکرێنەوە و




بێن! منیش هەر لە خۆمەوە هەستم کرد ڕاست دەکات و زۆر سوپاسیم کرد ڕەگەزنامە و ناسنامە و بەڵگەنامەی هاوسەرگیریەکەی دایەوە دەستم و وتی: بەڵام جەوازەکان لای ئێمە دەبێت! پاش ئەوە هاتینە دەرەوە و پەیوەندیم کرد بە شۆفێرەکەوە و وتی: چی بوو؟ وتم دەڵێن: جەوازەکان ساختەیە و خەریك بوو بشمانگرن!، وتی: باشە ئێستا خۆم دەچمە ژوورەوە.

پاش پانزە خولەك سەیارەیەکی ئاسایشمان بینی هات و بەپەلە شۆفێرەکە هاتە دەرەوە و سواری سەیارەکەی کردین و وتی: خێرا دەبێت بڕۆین بەخوا هاتوون بتانگرن و ئێستا چوومە لای بەڕێوەبەرەکە ئاگاداری کردمەوە و وتی: کە نەمزانیوە لەگەڵ تۆدان! ، تومەزە ئەمە دەستیان هەیە پێکەوە و کاکی شۆفێریش خیانەتی کرد و ویستی ئەو پارە زیادە نەدات و بیخوات بۆیە ئێمەی کردە ناو تەڵەکەوە بەڵام دواتر بەپارەش چارەسەر نەکرا و پێی وتبوو تازە سەرەوەی خۆیان ئاگادار کردۆتەوە ئێستاش ئاسایش بەڕێوەیە و دەبێت زوو بڕۆن تا نەگیراون!

ئیتر بەتەواوی بۆم ڕوونبۆیەوە کەوا جەوازەکان ساختەیە و پەیوەندیم کرد بە قاچاخچیەکەوە کەمێك دابەزیمە سەری و وتم هەر ئێستا دەبێت ئەو پارەیەی کە بەفرت و فێڵ وەرتانگرتوە ئامادەی بکەیت تا دەگەمەوە شاری(سلێمانی) خەریکە خێزانێك توشی کارەسات دەکەن و ئاگاداریشمان ناکەنەوە کە ساختەیە لەکاتێکدا من پارەی جەوازی یاساییم داوە کە ئەوکاتە پێی دەوترا جەوازی(S) پاش ئەوەی تەلەفونەکەم داخستەوە لەڕێگەی شاری(هەولێر)وە گەڕاینەوە و چووینە چێشتخانەیەک بێ ئێوە ناخۆش خواردنێکی باشمان خوارد دواتر بەڕێکەوتین و لەڕێگەی قەزای(دوکان)ەوە گەشتینەوە شاری(سلێمانی) بەڵام بڕیارمان دا کە هیچ کەس لە کەسوکار بێ لەوانەی ئاگاداری کارەکەن پێمان نەزانن تاوەکو توشی خەم و خەفەتیان نەکەین بۆ سەرلەبەیانی لەگەڵ قاچاخچیەکەدا لەماڵی خۆیان کاتمان




دیاری کرد پاش دابەزینە سەری و ڕەزیل کردنی داوای لێبوردنی کرد و بەڵێنی دا گەر یەك دەفتەریشمان تێدا سەرف بکات بمانگەیەنێتە شاری(ئەستەمبوڵ)! بەڵام من سوور بووم لەسەر ئەوەی کە دەبێت جەوازی یاسایمان بۆ دەربکات و بەڕێگەی فەرمی بڕۆم بۆ وڵاتی(تورکیا) نەك جەوازی ساختە!

ئەویش سوێندی خوارد کە خۆی دروستی نەکردووە و کەسێکی تر دروستی کردووە!، پاش ئەوە پەیوەندیمان پێوە کرد و هات پیاوێکی بەتەمەنی کەمێك سەر ئیسڵاح بوو بەڵام بەداخەوە ڕوو لە خوا نەبوو لەڕێگەشدا لەبەر خوا زۆرم ئامۆژگاری کرد کە تەمەنێکی بەڕێ کردووە و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا بەڵام بێ سوود بوو دوای ئەوەی گەشتینە شاری(ئەستەم بوڵ) دایکی بەڕێزم هەواڵی پێدام کەوا جەڵدە لێی داوە و مردووە! بەڵام ئەم پیاوە زۆر زیرەك بوو سەری دەکرد بە هەموو کونێکدا و فرت و فێڵی باشی دەزانی بەناوی نەخۆشی و جەڵدەوە خۆی ڕزگار دەکرد لە زۆر بازگە و خاڵەکانی پشکنین دا دوای ئەوەی گەشتە لامان و گفتوگۆمان کرد دانی بەوەدا نا کە جەوازەکان ساختەن و ئیتر لەویا زانیمان تەرەفەکەی خۆمان فێڵی لێ کردبووین نەك ئەو! بەڵام بەڵێنی پێداین بە پارە جەوازەکان وەرگرێتەوە و بەهەمان جەواز بە پارە و بەرتیلدان فیزەی وڵاتی(ئێران)مان بۆ وەربگرێت و لە وێوە بڕۆینە ناو خاکی وڵاتی(تورکیا)وە!

چونکە فیزەی ئەوێشی بە پارە لێدابوو! هەرچەندە من سووربووم لەسەر وەرگرتنەوەی پارەکە بەڵام لەسەر وتەی دایك و باوکی بەڕێزم بڕیارم دا بڕۆم بەو شێوەیە تەرەفەکە بە کراسێك و بۆنێکی خۆشەوە چووە (ئیبراهیم خەلیل)و زۆر بەئاسانی جەوازەکانی وەرگرتەوە و لەگەڵ خۆی بردی بۆ شاری(بەغداد)و بە پارە فیزەی وڵاتی(ئێران)یشی لێدا و هاتەوە بۆ شاری(سلێمانی) و بەو مەرجە مامەڵەکەمان تەواو کرد کە دەبێت خۆشی لەگەڵمان بێت و تا نەمانگەیەنێتە ناو خاکی وڵاتی(تورکیا) نەگەڕێتەوە! ئەو






ماوەیەش لەبەر ئەوەی کەسوکارم نەیاندەزانی گەڕاومەتەوە زۆر نەدەچووینە دەرەوە و لەماڵی نزیکێکی خۆم دا ماینەوە تا سەرجەم کارەکانمان تەواوکرا و دووبارە خۆمان ئامادە کرد بۆ سەفەرکردن!

## سەفەرکردن بۆ وڵاتی(ئێران) لەڕێگەی گومرگی(مونزریە)ی(خانەقین)و گەشتنە شاری(کرماشان) و لەوێشەوە بۆ شاری(ڕەزایە)ی سنوری وڵاتی(تورکیا)!

پاش نوێژی بەیانی بوو تەرەفەکە هات بەدوامان دا بەسەیارەکەی خۆی بەرەو شاری (خانەقین)ی بردین چونکە لەوکاتەدا بەجەوازی (عێراق)ی و فیزەی (ئێران) تەنها دەتتوانی لە مەرزی(مونزریە)وە بڕۆیتە ناو خاکی(ئێران)ەوە پاش ئەوەی کەوتینە ڕێ لە قەزای(کەلار) لامان دا بێ ئێوە ناخۆش سەرو لەفەی جگەری مریشکمان خوارد پاشان بەڕێکەوتین بەرەو(خانەقین) هەڵبەتە پێش ئەوەی بگەینە شارەکە لادانت دەداتێ کەبەرەو مەرزی(مونزریە) بڕۆیت بەڵام چونکە خۆشی دەهات لەگەڵماندا دەبوایە سەیارەکەی لە گەراجێك دابنایە لە(خانەقین) خۆشترین نوکتە و ڕووداوی ئەو ڕێگەیە ئەوە بوو کە پێش ئەوەی بگەینە شاری(خانەقین) تابلۆیەکی پێدااین لەسەر ڕێگەکە کە بە دوو هێڵی جیاواز ئاماژەی کردبوو بۆ شاری(خانەقین)و مەرزی(مونزریە) بەڵام کاتێك چووە سەر هێڵی جادەی(خانەقین) کەمێك دەرچوو لەپڕدا وەستا و گەڕایەوە دواوە!، منیش وتم: کاکە بۆ کوێ دەگەڕێیتە دواوە؟ مەگەر سەرەتا تۆ ناڕۆیت بۆ(خانەقین)؟، وتی: بەرێ وەڵا باوکەکەم بەڵام تۆ مناڵی ئەم ناوە ناناسی چی لەو تابلۆیانە دەکەن؟ جاری واهەیە دەچن دەستکاری تابلۆکان دەکەن و هەڵیدەگێڕنەوە لەجیاتی ئەوەی بڕۆیت بۆ شاری(خانەقین)دەچیتە مەرزی(مونزریە) گەر نەشارەزا بیت ئیتر هەمووماندەستمان کرد بەپێکەنین پاش ئەوەی گەشتینە شاری (خانەقین)





سـەیارەکەی خسـتە گەراجێـك و بەسـەیارەی نەفەرات بەڕێکەوتـین بـۆ مەرزی(مـونزریە)و لەگەڵ گەشـتینە ئەوێ هێشـتا کـاتی کـردنەوەی مەرزەکە مـابووی کاتێکم زانی ئەو پیاوەی لەگەڵمان هاتبوو دەستی گرت بەدڵیەوە و وتی: حاڵم خراپ بـوو بمگـرن وابـزانم جەڵـدەکەم نزیـك بـۆتەوە!، باوەڕتـان بێـت فلیمێکی دروسـت کـرد کاتێکم زانی بەپەلە دەرگایان کردەوە و خێرا مۆری چوونەدەرەوەیان دا لەجەوازەکانمان و چووینە ئەودیو! لەوێش هەر حاڵی خۆی بەخراپی هێشتەوە تا مۆری هاتنەناوەوەمان بۆ لێدرا! کاتێك چووینە دەرەوە بۆ گەراجی سەیارەکانی شاری(کرماشان) من و براکەم لەژێـر باڵیـا بـووین تـا ئەویـاش کەچی وتی: تەواو بەرمـدەن خـۆ هـیچ عەیـبم نـیە ئـاوام نەکـردایە لێکۆڵینەوەیـان لە جەوازەکـان بکـردایە دەرنەدەچـووین! منـیش: وتـم : تخـوا ئەوە بەڕاسـتە؟ وەڵا کـڵاوت بـۆ هەمومـان دووری مـاڵتم ئـاواکرد وات لەخـۆت کـرد منیش وامزانی بەڕاستیتە خەمی دونیام لێ هاتبوو!، کەچی وتی: کاکە گیان ئەوە ئیشی خـۆمە گەر وانەکەم ئیشـەکانم سـەرناگرێت پـاش ئەوەی گەشـتینە شاری(کرماشـان) چووینە گەراجی پاسی گەورە کە ناسراوە بە(ترمینـاڵ) و بلیتی شاری(ڕەزایە)مان بڕی بۆ سـەر لە ئێـوارەکەی پاشـان چـووینە چێشـتخانەیەك و نانمـان خـوارد و لەپـاش ئەوە نوێژەکانمـان بە کـورتکردنەوە و کـۆکردنەوە کـرد پاشـان چـووینە شـوێنێکی خۆشـی گەشـتیاری شـارەکە کە ئـاوێکی جـوان بە شـاخە بەرز و جـوانەکەی ئەو شـارە کوردیە خۆش و ڕازاوەدا دەهاتە خوارەوە، بەڕاستی شارێکی زۆر خۆش و دڵڕفێنە(کرماشان)!

سـەر لە ئێـوارە سـواری پـاس بـووین و بەڕێکەوتـین بەرەو شـاری(ڕەزایە) لەڕاسـتیدا ئەوە یەکەم جـارم بـوو لە ژیـانم دا بە ڕێگەی یاسـایی بچـمە نـاو خـاکی(ئێران)ەوە لەڕابـردوودا هێنـدە بە قاچـاخ و نایاسـایی ڕۆشـتبووم ئەم جارەیـان لە خـاڵی پشـکنینەکاندا حەزم دەکـرد داوای ناسـنامەم لێ بـکەن لەداخی ڕابـردوو کەبە قاچـاخ و تـرس و لەرزەوە دەڕۆشـتینە(ئێران) لە ڕێگەکەمانـدا بەنـاو زۆر شـاری دڵـڕفێن و دڵگیـری کوردسـتانی




ڕۆژهەڵاتدا ڕۆشتین لەوانە شارەکانی(کامیاران،سنە،دیواندەرە،سەقز، بۆکان،سێ ڕای مهاباد) کە شارەکە دەکەوتە دەستە چەپتەوە ئیتر درەنگانێکی شەو گەشتینە شاری(ڕەزایە) کەناسراوە بە(ئورومیە)، تەکسیەکمان گرت و چووین بۆ ئوتێل و ئەو شەوە لە ئوتێلداماینەوە تا بەیانی و پشوویەکی باشمان دا

پاشان تەرەفەکەش بە حساب قاچاخچیمان بوو کەچی دەبوایە خۆم ڕێنیشاندەریم بکردایە و وەرگێڕیم بۆ بکردایە چونکە نە ئەو ڕێگەوبانەی بینیبوو وەك من!، نە زمانی فارسیشی دەزانی دواتر پەیوەندی کرد بە تەرەفێکی خۆیەوە و لە نووسینگەیەك بلیتی شاری(وان) ی وڵاتی (تورکیا)ی بۆ بڕین بە ڕێگەی پاسی گەورە بۆ ڕۆژی دواتر بەڵام بەداخەوە دووبارە تەرەفەکەی شاری(سلێمانی)مان فێڵی لە هەردوولامان کردبوو بە ئێمەی وت ئێوە دەست ناکەن بەگیرفانتاندا لەڕێگەدا هەموو خەرجیەکی ڕێگە لەسەر کاك ئەوە ، لای ئەویش وتبووی ئەوان خەرجی خۆیان و تۆش دەدەن! خەریك بوو ببێتە کێشەمان بەڵام دواتر هەردوولامان ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی بە هاوبەشی خەرجی ڕێگە بدەین!

بەو شێوەیە سواری پاس بووین و بەڕێکەوتین بۆ شاری(سەڵماس) و لەوێشەوە بۆ مەرزی سنوری نێوان وڵاتی(ئێران) و وڵاتی(تورکیا)، لە خاکی ئێراندا مۆری چوونە دەرەوەمان بۆ لێدرا و ماڵئاواییمان کرد لە تەرەفەکە بەڵام ویستی خوا وابوو لەگەڵ چووینە ناو خاکی وڵاتی(تورکیا) سەیری جەوازەکانیان کردین و وتیان: هاوڵاتی (عێراق)ی دەبێت بە فڕۆکە بێتە ناو خاکی (تورکیا)وە! دواتر زانیمان لەترسی پەکەکە بوو! هەرچەندە هەوڵماندا و وتمان کەوا فیزەی وڵاتی(تورکیا)شمان پێیە بەڵام بێ سوود بوو گەڕاندینیانەوە ناو خاکی(ئێران) لەوێش خەریك بوو توشی کێشەمان بکەن چونکە لە یاسای فیزەدا وایە گەر کەسێك بە فیزە چووە ناو وڵاتیك و پێش تەواوبوونی فیزەکە چووە دەرەوە و فیزەی چوونەدەرەوەی بۆ لێدرا ئیتر ناتوانێت بێتەوە ناو خاکی



ئەو وڵاتە مەگەر فیزەیەکی نوێ لە سەفارەتی وڵاتەکە وەربگرێتەوە لە وڵاتی خۆی هەرچۆنێك بێت لەگەڵ بەرپرسێکی خاڵە سنوریەکەی وڵاتی(ئێران)دا گفتوگۆم کرد و پاش پرسیار و وەڵامێکی زۆر و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ڕازی بوو کە مۆری چوونەدەرەوەکە هەڵبوەشێنرێتەوە ، پاشان هاتینە دەرەوە بەپەلە بۆ ئەوەی فریای ئوتێلەکە بکەوم و تەرەفەکەم لەدەست نەچێت، گەڕاینەوە بۆ شاری(ڕەزایە)و لە خاڵی پشکنینی شاری(سەڵماس) دایانبەزاندم و هەندێك گفتوگۆیان لەگەڵ کردم ئەفسەرێك بوو وتی چۆن فارسی فێربوویت؟ منیش:بە پێکەنینەوە وتم: ئاخر ماوەیەکی زۆر بە نایاسایی لەوڵاتەکەتاناد ماومەتەوە و ئیشم کردوە بۆیە فێربووم، ئەوجا ئێزنیان داین!

گەشتینەوە ئوتێلەکە و سەیردەکەین تەڕەفەکە خۆی ئامادە کردبوو بۆ ڕۆشتن، لەبەردەرگای ئوتێلەکەدا گرتمان و کاتێك چاوی بە ئێمە کەوت ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و وتی: ئەوە چی دەکەن لێرە؟ منیش چی ڕوویدابوو بۆم باس کرد و فەقیرە ئەم جارەیان بەڕاستی دەستی گرت بە دڵییەوە و وتی: بەخوا وابزانم ئەم جارە جەڵدەکە دەبێتە ڕاستی!،وتم: بیکە لەڕێی خوا کاکە وەختی جەڵدە و مردن نیە بە پێکەنینەوە!، وتی: دەی چی بکەین باشە؟، وتم: پێیان وتوم تەنها لە دوو شار فڕۆکە هەیە بۆشاری(ئەستەمبوڵ) ئەوانیش شاری(تاران)ی پایتەخت و شاری(تەبرێزە)! ئێمەش شاری(تەبرێزمان) لێوە نزیك بوو بۆیە بڕیارمان دا لەوێوە بلیت ببڕین و سەفەر بکەین!

هەر ئەو ڕۆژە ویستمان بلیتی فڕۆکە بکڕین بەڵام کات بەرەو ئێوارە دەڕۆشت و نوسینگەکانی بلیت فرۆشتن داخرابوون خاوەنی ئوتێلەکەمان پەیوەندی کرد بە فڕۆکەخانەی شاری(تەبرێز)ەوە بۆ ڕۆشتنی کاتی فڕۆکە پێیان ڕاگەیاندین کەوا سەر لەبەیانیەکەی کاتژمێر شەش فڕۆکە دەردەچێت بۆ شاری(ئەستەمبوڵ) بەڵام بەڵێنی بلیتیان نەداینێ و وتیان: ئەگەر نەفەری نەهاتووی تێدا بوو یان جێی خاڵی مابوو ئەوکاتە دەتوانین بلیتیان بدەینێ و سەفەر بکەن ئێمەش بەپەلە هەر ئەو شەوە







پەیکانێک(تەکسی) مان بەکرێ گرت و بەڕێکەوتین بەرەو شاری(تەبرێز) لەڕێگەیەکی خێراوە بردینی کە جادەیەکی ئۆتۆبانی گەورەبوو لەناو ئاودا دروست دەکرا لەنێوان هەردوو شاری(ڕەزایە)و(تەبرێز)دا ،
پرۆژەی دروستکردنی جادەکە لەو کاتەدا هێشتا تەواو نەببوو لە نیوەی ڕێگە سەیارەکان دەچوونە ناو کەشتی و بەو ڕێگەیە دەیانپەڕاندینەوە بۆ بەشی ئەوبەری دەریاچەکە، درەنگانێکی شەو بوو گەشتینە شاری(تەبرێز) کە شارێکی تورك نشینی وڵاتی (ئێران)ەو چووینە فڕۆکەخانە تا نزیکی بەرەبەیان چاوەڕوانمان کرد چەند جارێك هەوڵی بلیتمان دا بەڵام ویستی خوا وابوو بەپارەیەکی زۆریش دەستمان نەکەوت و نەفەرێکی زۆر سەفەری دەکرد و هیچ جێیەکی خاڵیمان دەست نەکەوت بەناچاری بە هەمان پەیکان گەڕاینەوە بۆ شاری(ڕەزایە) بۆ ئوتێلەکە و ماوەی دوو ڕۆژی تر ماینەوە لەو شارە و کەسوکاریش لەو ماوەیەدا هیچ هەواڵێکیان نەدەزانین و ئێمەش بۆ ئەوەی دڵیان تەنگ نەبێت و خەفەتمان بۆ نەخۆن حەزمان نەدەکرد جارێ هیچ هەواڵێکمان بزانن تا نەگەینە شاری(ئەستەمبوڵ)!، لەگەڵ خێزانی بەڕێزم دا گەشتوگوزارێکی خۆشمان کرد بە نێو شاری(ڕەزایە)دا کەناسراوە بە بوکی (ئێران) ئەگەرچی ئەم شارە لە بنەڕەتدا شارێکی کوردییە بەڵام لە ئێستادا بۆ ئەوەی دابڕێت لە کوردستان دانیشتوانێکی تورکی زۆری تێدا نیشتەجێیە و ناوەکەشی گۆڕاوە بۆ شاری(ئورومیە)!
پاش ئەوەی دوو ڕۆژەکەمان تەواوکرد دووبارە بەهەمان پەیکان بەڕێکەوتینەوە بۆ شاری(تەبرێز) لەگەڵ کاك تەرەفەکەدا بەڵام ئەم جارەیان لە نووسینگەیەك بلیتمان کڕی و ترسمان نەبوو وەك جاری پێشوو!، بەهەمان ڕێگە گەشتینەوە فڕۆکەخانەی شارەکە کاتی فڕۆکەکەمان نزیك بۆیەوە و جانتامان تەسلیم کرد و چووینە بەشی چوونەناو فڕۆکە و دووبارە خەریکی ماڵئاوایی بووین لە تەرەفەکەمان کاتێکمان زانی بەڕێوەبەری فڕۆکەخانەکە هات بۆ لامان و وتی ببورە دەبێت ئێوە جارێ چاوەڕوان بن!






ئیتر کاکی تەرەف لەشوێنی خۆیدا دانیشت و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا باوەڕتان بێت وتم ئەم جارە جەڵدەکە لێی دەدا و دەبێ بەڕاست!، بەرپرسەکە ڕووی تێ کرد و وتی: ئەوە چیەتی؟،

منیش وتم: نەخۆشی دڵی هەیە و لەبەر ئێمە هاتووە کە بۆ ئەم سەفەرە ئاگای لێمان بێت و ماڵئاواییمان لێ بکات بەڵام بەم کێشە و گرفتانەی لە وڵاتی(ئێران)دا بۆمان دروست کراوە لەکاتێکدا سەرجەم بەڵگە و فیزەکانیشمان ڕاستەقینەن تەواو کاریگەری لەسەر ئەو دروست کردووە خێرا کاکی تەرەف بەکوردی کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ بەرپرسەکە و کۆمەڵێك وەرەقەی دکتۆر و داو و دەرمانی دەرهێنا و وتی: حاڵم زۆر خراپە قوربان بۆ وامان لێدەکەن بەبەڵگەی ڕێپێدراو هاتووینەتە وڵاتەکەتان منیش بۆم وەرگێڕا و بەرپرسەکە وتی: بێخەم دابنیشن تەنها لێکۆڵینەوە لەڕاستی و ناڕاستی بەڵگەکان و فیزەکان دەکەین و ناهێڵم فڕۆکەکە بڕوات گەر بێ کێشە بن مۆڵەتتان دەدەم فڕۆکەخانەکەش بچوك بوو لەوکاتەشدا تەنها ئەو فڕۆکەیەی لێ بوو لە تەنیشتمانەوە لەبەشی دەرەوە وەستابوو!

هەموو نەفەرەکان سەرکەوتبوون و نزیکەی نیو کاتژمێرێك ڕۆشت هیچ دەنگ نەبوو کاکی تەرەفیش زوو زوو دەچووە لای پرسگەکە و پرسیاری دەکرد لەڕاستیدا بێ ئومێد بووین چونکە تەنها دە دەقەمان لەبەردەم دا مابوو کە فڕۆکەکە بڕوات! لەوکاتەدا بەرپرسەکە هاتە دەرەوە و وەتی: بەداوای لێبوردنەوە سەرجەم بەڵگەکانتانمان سەیرکرد خۆشبەختانە هەموویان ڕاستەقینەن و فەرموون دەتوانن بڕۆن و زۆر داوای لێبوردنیشی کرد لەوەستانمان لەوکاتەدا تەرەفەکەمان دەستی گرتەوە بەدڵیەوە و وتی: قوڕکە بەسەرما ئەوە چی دەڵێت؟ منیش بۆ خۆشی کەمێك دەموچاوی خۆم تێك دا و وتم: وەڵا کاکە گیان دەڵێت: تا زووە سەرکەون ئەگینا بەجێ دەمێنن و دەستم کرد بە پێکەنین و وتم سوپاس بۆ خوا ئیزنیان داین وتی: دەی تخوا کاکە ئێستا وەختی




گاڵتەکردنە من خەریکە دەمرم؟ باوەڕ بکەن وا پەلاماری ئەو بەرپرسەی داوە و ماچی کردووە و بەکوردی گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد ئێمە هەر مردین لە پێکەنین دا!،

ئیتر منیش باوەشم پیاکرد و وتم: هیوادارم ئەم فەزڵانەت لەیاد نەچێت کەخوای گەورە بەفریامان گەشتووە و تەوبە بکەیت و دەست بکە بە ئەنجامدانی نوێژەکانت نەوەك مردن ئێخەت پێ بگرێت!

بەو شێوەیە سوپاس بۆ خوا ماڵئاواییمان کرد و سواری فڕۆکەکە بووین و پاش دوو کاتژمێر و نیو گەشتینە فڕۆکەخانەی ئەتاتورك لەشاری(ئەستەمبوڵ)و لەلایەن ناسراوێکی خۆشەویستی نزیکمەوە پێشوازیمان لێکرا و بەسەلامەتی گەشتینە ولاتی(تورکیا).

بەڵام ویستی خوا وابوو پاش یەك هەفتە هەواڵی کۆچی دوایی ئەو پیاوەمان پێ گەشت کە لەگەڵمان دا هاتبوو بەڕاستی زۆر بەداخ بووم بۆی چونکە بەئاواتەوە بووم کە تەوبەی بکردایە پێش مردنی بەڵام دیارە خوای گەورە خۆی باشتر بەندەکانی دەناسێت دڵنیاشم پێش مردنیش بێت کەسێك دەکاتە ڕێنیشاندەر وەك زەنگێکی وریاکەرەوە بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە و هەر خۆشی باشتر دەزانێت کێ شیاوی هیدایەتە و کێش لەهیدایەت ڕادەکات!







## ژیانی ناو شاری(ئەستەمبوڵ) و مانەوەمان و نەخۆش کەوتنم لەو شارەدا!

پاش ئەوەی گەشتینە شاری(ئەستەمبوڵ) برا گەورەکەم هات بەدوامان‌دا و بردینی بۆ ماڵەکەی خۆی خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە زۆر ماندوو بوو لەگەڵماندا، چونکە نزیکەی دوو مانگ لەلای ماینەوە و تا ئەو ڕۆژەشی لەو وڵاتە بووین هاوکار و پشتیوانمان بووە و ئاگاداری کردووین،بەڵام بەهۆی خراپی ڕێگە و نەبوونی پارەوە توانای سەفەرمان نەبوو، ئەویش ناچار بوو بەڕێگەیەکی ئاسان بماننێرێت کە کەمترین پارەی تێ بچێت!

لەوماوەیەدا ڕۆژانە دەچووینە دەرەوە لەگەڵ خێزانم دا بەپێ دەگەڕاین بەناو شاری(ئەستەمبوڵ)دا کە ماشاءالله دیمەنی ئەوشارە زۆر دڵڕفێنە کە ماوەی چەندین سەدە پایتەختی خەلافەتی ئیسلامی بووە لەوکاتەی عوسمانیەکان دەسەڵاتدار بوون ئێمەش لەگەڵ نەبوونی مادده و چاوەڕوانی سوپاس بۆ خوا خۆشبەخت بووین و دایك و باوکی بەڕێزم و براگەورەکانم هەمیشە دەستیان پێمانەوە بووە و بەردەوام پارەیان بۆ ناردووین و برا گەورەکەشم جێگە و ڕێی بۆ دابین کردبووین و هەستمان بەغەریبی و ناڕەحەتی نەدەکرد!

ڕۆژێکیان لەگەڵ خێزانی بەڕێزم دا بەیەکێك لەشەقامەکانی شاری(ئەستەمبوڵ)دا دەگەڕاین گەشتینە شوێنێك کە نازانم ناوی چی بوو کۆمەڵێك دیواری بەردینمان بینی کە وەك شورایەك دروستکرابوو دواتر کە پرسیارمان کرد پێیان وتین ئەو دیوارە کاتی خۆی بەدەوری(ئەستەمبوڵ)دا کێشراوە!

ئەوەی بەلای منەوە سەرنجڕاکێش بوو ئەو هەموو دار زەیتونەیە کە لەو شارەدا هەیە شارێکی بەناوبانگە لە زۆری داری زەیتون دا باوەڕتان بێت تەزوویەك بە لاشەم دا هات کاتێك تەماشای دار زەیتونەکانم دەکرد و ڕووم کردە خێزانی بەڕێزم و پێم وت:







بەڕاستی خوای گەورە و میهرەبان ڕاستی فەرمووە وە شایەتیش دەدەم کەوا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بەوپەڕی ئەمانەت و ڕاستگۆیی ئەو پەیامەی پێ گەیاندووین!،
خێزانم وتی: چی بووە ئازیزەکەم؟،
منیش وتم: ئایا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەرگیز شاری(ئەستەمبوڵ)ی بینیوە؟، وتی: بێگومان نەخێر!، وتم: دەی گوڵەکەم بزانە کەوا لەڕێگەی نیگای خوای گەورەوە باسی ئەم شارەی بۆکردووین وەك ئەوەی بەچاوە گەش و جوان و پیرۆزەکانی بینیبێتی!
وتی: چۆن چۆنی؟، وتم: لەباسی نیشانەکانی قیامەتدا خوێندومەتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾دەفەرمووێت: لەپاش ئەوەی مسوڵمانان لەجەنگە گەورەکەی بەرامبەر ڕۆم کە لە ناوچەی(ئەعماق)و(دابق)ی وڵاتی(سوریا) ڕوودەدات و ئەو جەنگەش تەنها چوار ڕۆژ دەخایەنێت و لە بەرەبەیانی چوارەم ڕۆژدا ئەو لەشکرە گەورەیەی ڕۆم دەشکێت و پاش ماوەکەی هەڵدێن بۆ شاری(قستنطین) کە مەبەستی ئەم شاری(ئەستەمبوڵ)ەیە، بەشێوەیەك وەسفی کردووە دەڵێی وەك ئێمە ئێرەی بینیوە!، چونکە لەدرێژەی فەرموودەکەدا دەفەرمووێت: حەفتا هەزار لەنەوەکانی(ئیسحاق) پێغەمبەر(علیه السلام) دوایان دەکەون و هێرشیان دەکەنە سەر ، کە گەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزە(علیه السلام) بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا پێغەمبەری ڕۆمیەکان بووە کاتی خۆی و پێ دەچێت مسوڵمانێکی زۆری وڵاتانی ڕۆژئاوا کاتێك هەواڵی هاتنی ئیمامی مەهدی دەبیستن(علیه السلام) کۆچ بکەن بۆ وڵاتی شام و پاش تێکشکاندنی ڕۆمیەکان ئەوان بگەڕێنەوە بۆ ڕزگارکردنی شاری(ئەستەمبوڵ) تەنها بە سێ تەکبیر و الله اکبر دەروازەی شارەکەیان بۆ دەکرێتەوە و ڕزگاری دەکەن بە بێ جەنگ!،هەر بۆیە کاتێك پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ وەسفی ئەو شارەمان بۆ دەکات دەفەرمووێت: بەشێکی لە ئاودایە و بەشێکی لەوشکانی!،وتم: گوڵەباخەکەم ئێستا جوان دیقەت بدە بزانە چۆن شاری(ئەستەمبوڵ) دوو بەشە و







ئاو لەیەکی جیا کردونەتەوە و بە پردێکی هەڵواسراو بەیەکەوە بەستراونەتەوە، بەشێکیان پێی دەوترێت بەشی(ئاسیا)و بەشێکیشیان پێی دەوترێت بەشی(ئەوروپا)!، ئایا بەچاوی خۆت ئەم ڕاستیە نابینی؟، وتی: بەڵێ بەقوربان زۆر ڕاستە،وتم:
پاشان دەفەرموێت: مسوڵمانان دەستکەوتێکی زۆریان دەستدەکەوێت و شمشێر و تیروکەوانەکانیان بە دار زەیتونەکانی ئەو شارەوە هەڵدەواسن!، ئایا ئەم هەموو دار زەیتونە بەڵگەی ڕاستەقینەی ئەو فەرموودە و وتە جوانانە نین؟، وتی: سبحان اللّٰه بەڕاستی زۆر ڕاست و ڕەوان و تەواوە بەڕاستی زۆر جوان ڕوونی کردۆتەوە تا هیچ گومانێك لەدڵی مسوڵمانان و خەڵکیدا نەهێڵێت کاتێك باسی ڕووداوێکی قیامەتی کردووە چەند شتێکیشی لەگەڵدا باس کردوە کە پێش ڕوودانی ڕووداوەکان لەو شوێنانەدا بوونیان هەیە!
بەو شێوەیە ئەو ماوەیەمان بە خۆشی بەسەربرد ئەگەرچی پارەیەکی زۆرمان خوارد و قەرزار بووین بەڵام بێ هیوا نەبووین لە ڕزق و ڕۆزی خوای گەورە و دڵنیا بووین کە زۆر بەئاسانی لەسەرمان سوك و ئاسانی دەکات پاش ئەوەی چەند جارێك هەوڵی سەفەرکردنمان دا بەڵام یان پارەی زۆری دەویست یان ڕێگاکە ئاسان نەبوو تا کۆتا جار ئەو کەسە نزیکەمان بڕیاری دا بەڕێگەی پێ بماننێرێت لەگەڵ کەسێکی باشدا ئیتر کاتی سەفەرکردنمان نزیك بۆیەوە بەڕێگەی پێ بڕۆین بۆ وڵاتی(یۆنان) بەڵام ویستی خوای گەورە وابوو نەخۆشیەکی زۆر سەختم گرت کە لەرزوتا و قورگ ئێشەیەکی بەئازار بوو ئەویش هۆکاری کەشوهەوا گۆڕینێکی زۆر بوو کە لەماوەی چەند مانگێکدا چەند وڵاتێکم بینیبوو بەو هۆیەوە لەجێگادا خستمی و ماوەی هەفتەیەکی خایاند و نزیکەی چوارده دەرزیان لێدام لەو ماوەیەدا!
پاش هەفتەکە حاڵم بەرەو ئاسایی بوونەوە هات و سوپاس بۆ خوا هەستامەوە سەر پێ ناسراوەکەمان ئاگاداری کردینەوە کەوا ئەو قاچاخچیە باشە وەجبەیەك بەڕێ





دەخات و وتی: ئەگەر دەزانی حاڵت باشە و ڕێگەت پێ دەبڕێت ئەوە تەنها دوو ڕۆژ لەوبەری ئاوەوە ڕێتان پێدەکات و دواتر سواری شاحینەتان دەکات تا(ئەسینا)و خۆشم لەگەڵتان دێم تا سواری شاحینەکان دەبن و دواتر دەگەڕێمەوە!

منیش لەبەر ئەوەی زۆر مابووینەوە و مەسروفاتی وڵاتی(تورکیا)ش زۆر گران بوو پارەیەکی زۆرمان سەرف کردبوو هەمووشی قەرز بوو لەسەرمان، زانیم بە مانەوەمان هیچ سودێك نابینین بۆیە بڕیارم دا سەفەر بکەین هەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ خێزانم دا چووینە بازاڕ و جانتا و کیسەخەو و پۆشاك و هەندێك خواردنی ئامادەکراوی ناو قوتومان کڕی بۆ ڕێگە پاشان خۆمان ئامادەکرد کە لەکاتژمێری سفردا پەیوەندیمان پێوە بکرێت و بڕۆینە شوێنی مەبەست و لەڕێگەی دۆڵمشەوە بەڕێبکەوین بۆ سەر ئاوی گەورە کەدەکەوێتە سەر سنوری وڵاتانی(تورکیا)و(یۆنان).

## سەفەری یەکەم: ڕۆشتن بەڕێگای پێ بۆ وڵاتی(یۆنان) و دەستیگر کرانمان لەلایەن کۆماندۆی یۆنانیەوە!





پاش ئەوەی لە لایەن قاچاخچیەکەمانەوە پەیوەندیمان پێوە کرا پاش نوێژی عەسر بەرەو مەغریب چووینە شوێنی مەبەست و لەوێ بووین بە سی و پێنج نەفەر و سواری دۆڵمشێکی گەورەیان کردین بۆ لەخێزانم براگەورەکەم و برایەکی بچوکیشم لەگەڵدابوو کە زۆر هاوکاریان کردم خوا پاداشتی خێریان بداتەوە چونکە ئافرەت لەو ڕێگایانەدا توشی کارەسات زۆر بووە و منیش گەر ئەوان هۆکار نەبوونایە هەرگیز بەڕێگەی پێ خێزانم نەدەبرد بەڵام بێ پارەیی و قەرزاری هۆکاری سەرەکی بوون پاشان بەڕێکەوتین بەرەو شاری(ئەدرنە)ی سنوری و لەوێشەوە بۆ نزیك گوندی(مەریج)ی وڵاتی (تورکیا) کە دەکەوێتە سەر ئاوی گەورەی نێوان هەردوو وڵاتی(تورکیا)و(یۆنان) ، لەبەشی ئەوبەریشەوە شاری(سۆفلی) وڵاتی (یۆنان) بەرامبەرمان بوو پاش چەند کاتژمێریك سوپاس بۆ خوا بەسەلامەتی گەشتینە شوێنی مەبەست و بەپەلە لە دۆڵمشەکەدا دابەزین و ئەو شەوە تا بەرەبەیان ڕێگەمان بڕی بەڵام لەبەر کەمینی جەندرمە زۆر دوور دایبەزاندین سەرەتا زۆر ناڕەحەت و ماندوو بووین چونکە کاتی کشتوکاڵ بوو زەویەکان بەهۆی ئاودانەوە زۆر قوڕاوی و ناخۆش بوو وە کاتەکەش هاوین بوو مێشولە دەتوت ئێف شانزەیە پێوەت دەدات گیزەکەی لە پێوەدانەکەی ناخۆشتر بوو.

لەڕێگە توند دەستی خێزانم گرتبوو وە خستبومە پێشی خۆمەوە و براکانیشم لە پێش و پاشی ئێمەوە دەڕۆشتن جاری وا هەبوو لەکاتی لابردنی دارەکانی ڕێگەمان دا گەر وریا نەبوویتایە و کەسی دوای خۆتت ئاگادار نەکردایەتەوە چاوی یەکێکت کوێر دەکرد هێندە بەناو توترك و زەل و قامیشدا ڕۆشتین بەهۆی دووری ڕێگاکەوە نزیکی بەرەبەیان گەشتینە سەر ئاوی گەورە و پێش ئاوی گەورە ئاوێکی پیس دێتە بەردەمت وەك لە باسەکانی ڕابردوودا بەدرێژی باسم کردوە ،




لەوێدا نەفەرێکی بەلاشەیان نارد و ڕێگەی تاقیکردەوە سوپاس بۆ خوا کەمینی جەندرمەی لێ نەبوو بەپەلە بەسەریدا ڕۆشتین و خۆمان گەیاندە سەر ئاوی گەورە بەلەمە چوپەکانیان پڕ کرد لە هەوا و بەهۆی کەمبوونەوە و دابەزینی ئاوەوە لەکاتەکانی هاوین دا زۆر بە ئاسانی و سەلامەتی سێ نەفەر سێ نەفەر پەڕاندینیانەوە و چووینە دوورگەیەکی نێوان هەردوو وڵاتی(تورکیا)و(یۆنان)و لە ناو کۆمەڵێك داری چڕوپڕدا خۆمان شاردەوە خێزانم بردە شوێنێکی دوور لەنەفەرەکان و کەپرێکی بچکۆلەم دروستکرد بۆ هەردووکمان لەوکاتەدا بانگی بەیانی دا نوێژەکانمان کرد و چووینە ناو کیسە خەوەکانمان خەوتین بەیانی کاتێك خەبەرمان بۆیەوە دەمەو نیوەڕۆ بوو وردە وردە گەرمی کرد و مێشولەش دەتوت فڕۆکەیە گیزەی دەهات و دەبوایە جار جارە زرمەیەکت لە دەست و دەموچاوت و پشتە ملت هەڵساندایە هەرچەندە دەرمانی مێشولەشمان لەخۆمان دابوو بەڵام بێ سوود بوو باوەڕتان بێت بەسەر جل و بەرگەوە پێوەی دەدایت و چزەی لێ هەڵدەستانیت!

بێ ئێوە ناخۆش نانمان خوارد و پاشان چوومە لای قاچاخچیەکە و پێم وت بێزەحمەت ئەم ناوە هیچ ترسی هەیە بۆ گیران؟، وتی: جار جارە جەندرمەی تورکی دێنە ئەم شوێنانە بەڵام کۆماندۆی یۆنانی ناوێرێت و تەنها بە دووربین سەیر دەکات!،بەڵام دواتر بۆ کاتی پەڕینەوە کەمین دەردەکات وە جار جارەش ڕاوچیە تورکەکان دێنە ئەم نێوانە و بەپارە دەمیان چەور دەکەین و هیچمان لەسەر ناڵێن منیش وتم:دەی کەوایە خۆت دەزانی کەشوهەوا زۆر گەرمە و مێشولەش تەنگی پێ هەڵچنیوین و ئاوەکەش زۆر دابەزیوە تا ئەژنۆمان دێت و ترسی خنکانمان نیە و گەر ئیزن بدەیت دەڕۆم بۆ مەلە و لەلایەکی چەپەوە بەتەنها خۆم و خێزانیشم دەڕۆین مادەم ناوچەی قەدەغەیە دەمەوێت بۆ مێژووش بێت لەداهاتوودا بڵێم لە نێوانی هەردوو وڵاتی(یۆنان)و (تورکیا)دا مەلەمان کردووە!، ماڵی ئاوا بێت ڕێگەی داین و ڕێگەی پیشانداین بەتەواوی




دوورکەوتینەوە لە خەڵکەکە و مەلەیەکی باشم کرد و دواتر هاتینەوە تا گەشتینە نزیکی ئێوارە و پێش تاریك بوون دووبارە هەوایان کردەوە ناو چوپەکان و پەڕاندینیانەوە بۆ ناو خاکی(یۆنان) ویستی خوا وابوو بەسەر شەقامێکی خاکی دا دەڕۆشتین لە دوورەوە سەیارەیەکی جێپی کۆماندۆمان بینی خێرا هەمووماان خۆمان دا بەزەویدا،قاچاخچیەکە وتی: بەخوا وابزانم بینینی،بەڵام ئێستا دوامان ناکەون و هیچ ناڵێن!، فێڵبازن لەپێشەوە کەمین دادەنێن بەهەرحاڵ ئەو شەوە زۆر نارەحەت بووین چونکە لەچەند شوێنێکی تر لایتمان لێ درا و هەستمان کرد کە ئاشکرا بووین بۆیە بەناچاری ڕێگەی دوور خستینەوە بەسەر دار و دیوار و تەلبەندا بازمان دەدا جاری وا هەبوو گوێت لە دەنگی دڕانی قوماشی پۆشاکی نەفەرەکان دەبوو کە دەگیرا لە تەلبەندەکانی زەویە کشتوکاڵیەکان ئەو تەلبەندانەش بۆیە دروستکرابوو تا ڕێگە بگرێت لە نەفەرات هاتووچۆ بەناو زەویەکانیان دا بکەن چونکە لە ڕابردوودا زەرەر و زیانی زۆریان لێ درابوو!

منیش بەهۆی ئەوەی کەوا تازە لە سەر نەخۆشیەکەم چاك ببوومەوە و هەستابوومەوە بۆ یەکەم جارم لە ژیانم دا لەناو ڕێگەی قاچاخدا پەکم بکەوێت سەرەتا خەمی خێزانم بوو چونکە تەنها گورچیلەیەکی هەیە!، چەند دەبەیەك ئاوی زیادەمان هێنابوو دەترسام ئەو پەکی بکەوێت بەڵام ویستی خوا وابوو ماشاء الله ئەو زۆر لە من ئازاتر و بەگورڕتر بوو تا ئەوەی ئیتر توانای ڕێگەکردنم نەما چونکە یەك دووجارێك کەوتینە ناو کەمینەوە ڕامانکرد لەدەستیان ئیتر بەتەواوی توانام لێ بڕا براکانم هاتنە ژێر باڵم و کەوتینە ڕێگەکردن و هەرچۆنێك بێت خۆمان گەیاندە ناو دارستانە چڕوپڕەکە و لە ئاوادەنی دوورکەوتینەوە و دونیا ڕۆشن بۆیەوە قاچاخچیەکەمان وتی: هەرچەندە ئەم ناوەش باش نیە و ئاشکراش بووین و دڵنیام بەدوامانەوەن بەڵام دەزانم تۆ هیچ توانای ڕێگەکردنت نەماوە و خۆشمان زۆر ماندوو




بووین بۆیە لێرەدا دەخەوین ، ئەگەر خوا کردی بەیانی نەگیراین لەکاتی خەودا چونکە کۆماندۆکان دەیانزانی نەفەر بەشەودا ڕێدەکات و بەرۆژدا دەخەوێت دەهاتن و لەناو کیسە خەودا دەیاندا بەسەرتا بۆ ئەوەی کەس فریای ڕاکردن نەکەوێت! ئیتر وتی: خوا ویستی لەسەر بێت سبەی شەو دەگەینە نوقتەی شاحینە و سەرتاندەخەم و دوو بەیانی لە شاری(ئەسینا)ی پایتەختی وڵاتی(یۆنان)دەبین إن شاء الله بەڕاستی پیاوێکی ڕاستگۆ و بەهەڵوێست بوو لەگەڵماندا ئیتر بەتەیەموم نوێژی بەیانیمان کرد و لەگەڵ خێزانم دا لەدەستە چەپێکدا خەوتین ، کاتێك خەبەرمان بۆیەوە دەورمان گیرابوو یەك یەك هەڵیاندەستاندین لەخەو لەویا چەند نەفەرێك ڕایانکرد بەڵام دواتر ئەوانیشیان هێنایەوە بۆ لامان کاتێك کۆماندۆکان سەیری من و خێزانمیان کرد و سەیریان کرد سەرپۆش بەسەرە بەجیا دایان ناین و ڕێزێکی باشیان لێگرتین وەك ئەوانەی تر لێیان نەداین و جوێنیشیان پێ نەداین و هێنانیانە خوارەوە لە ناو دارستانەکە بۆ سەر جادەیەکی خاکی و پاش نیو کاتژمێر دوو سەیارەی جێبی کۆماندۆیان هێنا و بردینیان بۆ زیندانی شاری(سۆفلی)!

پاش ئەوەی بردینیان بۆ زیندانی شاری(سۆفلی)لەوێ ئەوانەی خێزاندار بوون جیایان کردەوە و بەجیا خستنینیانە هۆڵێکی گەورە و نەفەرە ڕەبەنەکانیشیان دەخستە هۆڵێکی گەورەی ترەوە، ماوەی دوو شەو و سێ ڕۆژ لەو زیندانەدا هێشتینیانەوە، لەوماوەیەدا وەجبە لەسەر وەجبە دەگیرا و دەهاتە لامان تا نزیکەی دوو سەد نەفەر زیاتر کۆبۆیەوە!، پاشان دەمەو ئێوارەیەك شاحینەیەکی گەورەی زیندانی گواستنەوەیان هێنا و بردینیانەوە سەر ئاوی گەورە و دوو کۆماندۆمان لەگەڵدا بوو بە بەلەمێکی دار دە نەفەر دە نەفەر دەیانپەڕاندینەوە بۆ ئەوبەر ئاوی گەورە لە نێوان هەردوو ئاوایی(ئیبسەڵە)و(مەریج)پەڕاندینیانەوە بەڵام سەرنجم دا کۆماندۆکان زۆر دەترسان لە جەندرمەی تورکی بۆیە زوو زوو بەدەست ئاماژەیان دەکرد کە بێدەنگ بین




چونکە بەڕێگەی نایاسایی دەیانخستینەوە ناو خاکی(تورکیا)و چەندین کۆماندۆ بە فیشەکی جەندرمە کوژراون لەوکاتانەدا پاش ئەوەی گەشتینەوە ناو خاکی(تورکیا) ئەو هەموو نەفەرە زۆرە! یەکێك لە ناسراوەکانم شارەزای ڕێگە بوو خێرا جیای کردینەوە و بەڕێگەی پێچەوانە بردینی بۆ ئەوەی لەنەفەرەکانمان جیا بکاتەوە و نەکەوینە ناو کەمینی جەندرمەوە بەهۆی زۆری نەفەرەکانەوە و نەشارەزاییانەوە زۆرێکیان بەسەر شەقامی سەرەکیدا دەڕۆشتن تا کاتێکمان زانی لە دوورەوە گڵۆپی سەیارەی کۆماندۆکانمان بینی و دایان بەسەر زۆرێك لە نەفەرەکاندا، ئێمەش لەو کاتەدا لە چاڵێکدا خۆمان شاردەوە تا بەتەواوی کەمینەکە دوور کەوتەوە و ڕۆشتن! چونکە خوانەخواستە لەوێدا بگیرایتایە دەیانبردیت بۆ قەرەقول و جاری وا هەبووە سێ مانگ نەفەریان گرتووە و ڕەزیل کردوە دواتریش سنورداشی (ئیبراهیم خەلیل)یان کردۆتەوە!
دەستمان کرد بەڕێگە کردن بەرەو تەرەفی گوندی(ئیپسەڵە) چونکە نزیکتر بوو بەهۆی چاڵ و جۆگەی مەرەزەی برنجەوە تەواو شەکەت ببووین وجاری وا هەبوو خەریك بوو ئاو تا ناوقەدمان دەهات و گەر وریای خۆمان نەبووینایە تیایدا دەخنکاین!، ئیتر بگەشتینایەتە سەر هەرچاڵە مەرەزەیەك بەناچاری خێزانم دەدا بەسەر شانم دا و دەمپەڕاندەوە بۆ ئەوەی نەکەوێتە ناو چاڵ و جۆگەکانەوە، هەرچۆنێك بێت پاش چەند کاتژمێرێك خۆمان گەیاندە ئاواییەکە و لەپێش ئاواییەکەوە بەسەر پردی ئاوە پیسەکەی وڵاتی(بولغاریا)دا پەڕینەوە و پاشان بەسەر جادەی قیری نێوان گوندی(ئیبسەڵە) و گوندی(مەریج) بەپێ کەوتینەڕێگە کردن و نەمانوێرا بەهۆی کەمینەکەی پێشەوە بچینە ناو گوندی(ئیپسەڵە)باشی لەوەدا بوو سوپاس بۆ خوا مانگەشەو دەرکەوت و جادەکەش چۆڵ بوو جار جارە سەیارە دەهات و هەرکاتێك گڵۆپی سەیارەمان بەدی بکردایە بەپەلە خۆمان فڕێدەدایە قەراغ جادەکە و خۆمان دەدا بەزەویدا تا سەیارەکە تێپەڕ دەبوو، بەو شێوەیە بەردەوام بووین لەڕێگە کردن تا






نزیکی بەرەبەیان ،نزیك بووینەوە لە گوندی(مەریج) بەڵام لەبەر ئەوەی کاتەکە زوو بوو وە نەفەرێکی زۆریش سنورداش کرابووینەوە لەترسی کەمین سەرەتا نەچووینە ناو شارۆچکەکە و لەدەرەوەی شاردا چووینە ناو زەویەکی کوشتوکاڵی خۆمان شاردەوە و زۆر ماندوو ببووین و خەومان دەهات بەڵام لەبەر ئەوەی گیانمان هەمووی تەڕ بوو سەرمامان بوو نەماندەوێرا بخەوین ئەو پۆشاکە تازانەشی کە پێمان بوو دەمانویست کاتێك چووینە ناو گوندەکەوە لەبەری بکەین خێزانم زۆر خەوی دەهات و ماندوو بوو بەڕاستی هەرچۆنێك بوو سەری خێزانم خستە سەر ڕانم و چاکەتێکم پێدادا و وتم کەمێك بخەوە خۆشم لەوکاتانەی کە قاچاخ بووم هەرگیز نەخەوتووم و بەردەوام ئێشکگریم کردووە و لەحاڵەتی ئامادەباشیدا بووم.

بەو شێوەیە تا نزیکی خۆرکەوتن لەو شوێنەدا ماینەوە و پاشان خێزانمم هەستاند و لەو نزیکانە جۆگەیەکی ئاومان دۆزیەوە دەست و دەموچاومان شۆرد و پۆشاکەکانمان گۆڕی و چووینە ناو گوندەکە زۆرمان برسی بوو بەهۆی کەمی و خراپی ئەو خواردنەشی لە زیندانەکە دەیاندا پێمان تێرمان نەخواردبوو بۆ ئێوە ناخۆش خۆمان کرد بە چایخانەیەکدا نانێکی بەیانی باشمان خوارد پاشان بەڕێکەوتین بۆ گەراجی پاسی شاری(ئەستەمبوڵ) بەڵام کابرایەکی توركی ڕەگەزپەرستی جاشمان لێ پەیا بوو داوای جەوازی کرد بۆ سەرکەوتنمان ئێمەش جەوازەکەمان هەر پێ مابوو بەڵام فیزەی تەواو ببوو هەرچەندە کابرا زۆر گێل بوو لەوشتانەی نەدەزانی بەڵام کە زانی ئەو ناسراوەم و هاوڕێکەی پێیان نییە تەلەفونی کرد بۆ بنکەی قەرەقولی جەندرمە و هەواڵی لێدایـن و دەستی کرد بەجوێن دان و وتی: ئێوە نەفەری قاچاخن و نابێت بڕۆن لەگەڵ وای وت ئێمەش حسابمان بۆ نەکرد و خێرا گەراجەکەمان بەجێهێشت و نەمانهێشت سواری پاسە گەورەکە ببین و بە ناچاری بەرەو دەرەوەی گوندەکە بەخێرایی کەوتینە ڕێگەکردن و پاسەکە یای بەلاماندا بەڵام خوای گەورە لەوکاتەدا پاسێکی بچوکی بۆ





ناردین کە پاسی نەفەربەری نێوان گوندی(مەریج) و شارۆچکەی(کیشان)بوو ئێمەش بۆ ئەوەی نەگیرێین و پێش گەشتنی جەندرمە دەمانویست هەرچۆنێك بێت بچینە دەرەوەی گوندەکە ماڵی ئاوابێت وەستا و سواری کردین پاش پێنج دەقە ڕێگەکردن کاتێکمان زانی جەندرمە بە دۆڵمشێکی سوورەوە دایان بەلاماندا و لە پێش ئێمەدا کەمینیان دانابوو وە پاسە گەورەکەیان لە پێشمانەوە ڕاگرتبوو وایانزانیبوو نەفەرەکان سواری ئەو پاسە بوون!، کاتێك ئێمەش گەشتین بەدەست ئاماژەی بۆکردین و ئیزنی داین سوپاس بۆ خوا بەڵام لەگەڵ دەرچووین دوو جەندرمە سواری دۆڵمشەکە بوون و دوامان کەوتن و ڕایان گرتین!

ئیتر دەستم کرد بە زیکر خوێندن و پاڕانەوە و خێرا بەخێزانم وت ئەو ئایەتە بخوێنە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَجَعَلْنَا مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ) خوا بۆ خۆی ئاگادارە ئێمە لە بەشی کۆتایی و دواوە سەرکەوتبووین دوو دەرگای هەبوو پاسەکە یەکیان لەبەردەمی مندا بوو ئەوی تریشیان لای شۆفێرەوە بوو لە هەردوولاوە جەندرمەکان سەرکەوتن و سەیرێکی ناو پاسەکەیان کرد و دابەزین و دایان بە پاسەکەدا و وتیان بڕۆن! براگەورەکەم گوێی لێ بوو کە ئایەتەکەم خوێند وتی: وەڵا برا خوا پاراستینی بە زەردەخەنەیەکەوە بەو شێوەیە سوپاس بۆ خوا گەشتینە شاری(کیشان)و لەوێش بلیتی پاسی گەورەمان بڕی بۆ شاری(ئەستەمبوڵ)و پاش چەند کاتژمێریك بەسەلامەتی گەشتینەوە ماڵەوە بەهۆی ماندووبوونی ڕێگە و نارەحەتیەکانی بڕیارماندا پارە قەرز بکەین و بەڕێگەی یەخت لەڕێگەی شاری(ئیزمیر) و بە دەریای(ئیجە)دا بڕۆین بۆ شاری(ئەسینا)!

## بەڕێکەوتن بۆ شاری(ئیزمیر)و سەفەرکردن بە یەخت بەناو دەریای(ئیجە)دا بۆ شاری(ئەسینا)!




پــاش گەشـــتنەوەمان بـــۆ شاری(ئەســـتەمبوڵ) و بــێ هیوابـــوون لەگەشـــتنمان بۆ(ئەسینا)ی پایتەختی وڵاتی(یۆنان) بەڕێگەی پێ ئەم جارەیان براگەورەکەم پەیوەندی کــرد بە قاچــاخچیەکەوە کە بەڕێــگەی یەخــت و دەریــا نەفەری دەردەکــرد بــۆ ئەو مەبەســتەش پــارەیەکی زۆرمــان قەرز کــرد و لە نووســینگەیەك خەوانــدمان لە شــاری سلێمانی!

پاش ئەوەی کاتمان بۆ دیاری کرا چووینە ئەو ناونیشانەی بۆمان دیاری کرابوو سواری دۆڵمشێکی گەورەیان کردین و بێ لە ئێمە دۆڵمشێکی تریشمان لەگەڵدا بوو بەمناڵەوە ژمارەمــان دەگەشــتە پەنجــا نەفەر چەنــد خێزانێکــی کــورد و عەرەب و ئێزیدیشــمان لەگەڵـدا بـوو لە پێشیشـمانەوە سـەیارەیەکی ڕێـگە تـاقیکردنەوە دەڕۆشـت و هەرکات کۆنترۆڵ هەبـوایە پەیوەنـدیمان پێـوە دەکـرا و لە شـوێنێکدا لامانـدەدا تـا کـۆنترۆڵەکە هەڵدەگیرا و پاشان دەکەوتینەوە ڕێ!

بەو شـێوەیە بەرەبەیـان گەشـتینە سـەر ڕۆخی دەریـاکە و لە لاچەپـێکەوە یەخـتەکە وەستابوو سێ قوبتان و شۆفێری تورکی تێدابوو ئیتر هەموومانیان سەرخست بەچەند پـلەیەك دەچـوویتە خـوارەوەی یەخـتەکە وەك هـۆڵێکی گەورەی تێـدابوو لەگەڵ دوو ژووری بچـوکی نووسـتنی دوو نەفەری تەوالێـت و مەتبەخێکی بچـوکیش کە لە ئەسـڵدا بـۆ چەنـد نەفەرێـك دروسـتکرابوو بـۆ گەشـتوگوزار بەڵام نـزیکەی پەنجـا نەفەریـان سەرخستبوو ژوورەکانیش یەکێکیـان تایبەت بـوو بە شـۆفێر و قوبتانەکان و کەس بۆی نەبوو بچێتە ناوی جار جارە یەکێکیان دەهاتە خـوارەوە و دەخەوت و یەکێکیشـیان لای ئـێمە بـوو بێـدەنگی دەکـردین و یەکێکیشـیان لەسـەرەوە یەخـتەکەی لێ دەخـوڕی و شـۆفێری دەکـرد و ڕێگەشـیان نەدەدا کەس لە ئـێمە سـەر دەربکـات و بچێـتە سـەر یەخـتەکە ئیتر لەبەشی وڵاتی(تورکیـا) ئاڵای(تورکیا)یـان هەڵواسـیبوو کە گەشـتە نـاو ئاوی وڵاتی(یۆنان) ئاڵاکەیان لابرد و ئاڵای(یۆنانیان) پێوە کردا!




سەرەتا کە بەڕێکەوتین چونکە ڕۆژ بوو دەریا شەپۆلی نەبوو وە هێشتا نە چووبووینە ناو قوڵایی دەریاوە ڕێگە و ڕۆشتنمان زۆر خۆش بوو بەخێزانم وت وەڵا گەر وا بڕوات زۆر بێ مەترسیە و بەوشێوەش نەبوو کەدەیانترساندین بە زەردەخەنەوە! تا شەویشمان بەسەردا هات حاڵمان هەر باش بوو بەڵام شەوی یەکەم کەمێك شەپۆل هێنایی و بردینی و ڕشانەوەی مناڵ و گریان دەستی پێ کرد هەرچۆنێك بێت زەیتونیان پێداین و ئەو شەوەمان بەڕێکرد و ڕۆژەکەش شەپۆلی دەریا کەمی کردەوە جار جاریش لەنزیکی هەندێك دوورگەدا دەوەستان بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك لە ترسی پۆلیسی گەڕۆکی نێو دەریا ویستی خوا وابوو بۆ شەوی دووەممان مانگە شەو دەرکەوت و ئاو هەستا و شەپۆلی دەریا دەستی پێکرد و ئێمەش لەناوەڕاست و قوڵایی دەریای(ئیجە)دا بووین بەشێوەیەك خوای گەورە ئاگادارە دەتوت شاخە ئاو دەدات بەسەرماندا و یەختەکەمانی ژێرەوژوور دەکرد بەڕاستی ئاویش بەشەودا زۆر سامناك و ڕەشە هەر خوا خۆی بەفریامان دەکەوت ئەگینا کەسمان بە نیازی دەرچوون نەماین و خێرا بە خێزانمم وت شایەتومان بێنێت و خۆشم بەردەوام شایەتومان و پاڕانەوە و ئیستغفار لەسەر زوبانم بوو!

قوبتان و شۆفێرەکانیش تەواو شپرزە بوون و سەیرم کرد پۆشاکی چوپیان لەبەرکردبوو هەستم کرد کە حاڵەتەکە زۆر خراپە بەهۆی شەپۆلیشەوە چەند جارێك ماتۆڕی یەختەکەمان کوژایەوە تا وای لێهات کۆتا جاریان زۆر هەوڵیان دا نەکەوتەوە کار و بەنیازی هەڵهاتن بوون! بەڵام سوپاس بۆ خوا کۆتا هەوڵیان لەگەڵی دا و کەوتەوە ئیش کردن لەوکاتەدا ئافرەتێکی ئێزیدی هاواری کردە مەلیکە تاوس(شەیتان) خێرا هاوارم کرد بەسەریدا و وتم(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) نەفرەتی خوا لەشەیتان بێت جارێکی تر هاوار نەکەیتە شەیتان وەڵاهی خوا دەمانخنکێنێت بۆ خاتری خوا وتی چ بێژم؟، وتم: بێژە خوای تاك و تەنها فریامان بکەوە وتی خودێ ڕاست دەبێژیت ،

خـودێ ڕزگاری مە بێ، وتـم: ئەوە باشـە چی عەیبی نینە لەلایەکەوە پێکەنینم دەهـات و بیـری ئەوەم دەکەوتەوە چـۆن خـوای گەورە کاتێـك باسـی ئەو کـۆمەڵە هـاوبەش پەیدەکەرانەمان بۆ دەکات کە کاتێك بەناو ئاودا دەڕۆن سـەرەتا دڵیان خۆشـە کاتێك شەپۆلی دەریا هەڵدەکات هاوار دەکەنە خوای گەورە بە نیەت پاکی و دڵسۆزی و تاك و تەنهایی لێی دەپاڕێنەوە بەڵام لەگەڵ ڕزگاریان دەکات دووبارە موشریك دەبنەوە سوێند بەخوا بەچاوی خۆم ڕاستەقینەی ئەو ئایەتەم بینی ئەوەی کە بێتاقەتی کردم ئەوە بوو دەمـوت خـوایە دەزانـم خنکان شـەهیدیە بـۆ مسـوڵمان بەڵام لێت دەپارێمەوە لەگەڵ ئەم شەیتانپەرستانە گیانمان مەکێشە و مەمانخنکێنە! خێزانم پێدەکەنی و لەوکاتەدا خسـتبوومە باوەشـم و تونـد گرتبـووم و هەردووکمـان تەواو ناڕەحەتیمـان بـۆ هـات و ڕشـانەوەی هەرچی نەفەرە دەسـتی پێکـرد بەخۆشـمانەوە بە هـۆی جـوڵە و شـەپۆلەوە یەختەکەی زۆر ئەم دیو ئەو دیو پێ دەکرد وە دەرگاشمان لێ داخرابوو هیچ هەوامان بـۆ نەدەهـات تـا هاوارمـان لێ هەسـتا و بەزۆر دەرگاکەمـان پێ کـردنەوە گریـانی گەورە و منـاڵ دەسـتی پێکـرد باوەڕتـان بێـت پیـاوی وای تێـدا بـوو سـمێڵی دەتـوت دەسـکی مـاتۆڕە سـەرەتا خەریکی فشـە فش بـوو بەڵام لەوکاتەدا گریانی ڕۆژەڕێیەك دەڕۆشـت و هـاواری دەکردە خوا ڕزگاری بکات!

لەگەڵ هەمـوو ناڕەحەتیەکانـدا کە سـەیری وەزعەکەم دەکـرد پێکەنـین و تـرس تێکەڵ بـوو بـوو لام دڵـم خـۆش بـوو کە مسـوڵمانم و مردنم شـەهیدیە بە خنکان لە نێـو ئاودا، لەلایەکـیش دەمـوت ئـاخر چی وەڵامـی خـوا بـدەمەوە و بڵـێم: لەڕێـگەی هەندەرانـدا خنکام؟ بەو شێوەیە تا بەرەبەیان شەپۆل هێنایی و بردینی ،

نەفەر نەفەر ڕێگەیـان دەدایـن بچیـنە سـەرەوە کەمێك هەوا لێمـان بـدات بەڵام بـاوەڕ بکەن یەك دەقە نەمـوێرا لەسـەرەوە بمێنمەوە!




لەگەڵ ئەو ئاوەم بینی ڕەشی دەکردەوە و وەك شاخ و چیا بەرز دەبۆیەوە و دەیدایەوە بەسەرماندا و تەنها مانگەشەوە دیار بوو بەپەلە هاتمەوە خوارەوە و هەزار جار پەنام گرتووە بەخوای گەورە سەر لەبەیانی سوپاس بۆ خوا شەپۆل نەما و یەختەکە کەوتەوە سەر ڕۆشتنی ئاسایی بەڵام ژوورەوە بۆگەنی کردبوو لە میز و ڕشانەوەدا خێزانم زۆر ڕشایەوە و حاڵی باش نەبوو داوام کرد لە یەکێك لە قوبتانەکان کە کەمێك بچێتە دەرەوە هەوا هەڵمژێت، باش بوو ڕێگەی داین و حاڵی باش بۆیەوە سوپاس بۆ خوا ئەو ڕۆژە سێیەم ڕۆژمان بوو وتیان:لە مەترسی ڕزگارمان بووە و ئێوارەکەی دەگەین و داتاندەبەزێنین و ئێستا ناتوانین لەبەر ئەوەی ڕۆژە و ئاشکرا دەبین وتیان: بەڵام دەبێت ئەمڕۆ هیچ دەنگتان نەیەت و سەریشتان بە خێمە دادەپۆشین چونکە لە دوورگەیەك دەوەستین و یەخت و بەلەمی گەشتوگوزاری لێیە نابێت پێمان بزانن باوەڕتان بێت پاش چەند کاتژمێرێك خۆر دەرکەوت و وا گەرمی کرد بەهۆی ئەوەی هەموو گیانمان تەڕ بوو و وەك باسم کرد ڕشانەوە و میز و ئارەق ناوەوەی تەنی بوو توانامان نەما و بانگمان کردن و وتمان گەر لێرە نەڕۆن ئەوە هاواردەکەین و دێینە دەرەوە ئیتر باش بوو سەمون و تەماتەیان بۆهێنایین لەگەڵ نەفەری دەبەیەك ئاو وە بردینیانە شوێنێکی دەستە چەپ و خێمەکەیان لابرد لەسەرمان و کەمێك هۆشمان هاتەوە بەبەردا و کەمێك خەومان لێکەوت لەو وەزعە ناهەموارەدا!

پاش یەك دوو کاتژمێر دووبارە بردینیانەوە بۆ نزیکی دوورگەکە و دووبارە خێمەکەیان دایەوە بەسەرماندا کەشوهەوا بەتەواوی گەرمی کردبوو حاڵمان زۆر خراپ بوو قوبتان و شۆفێرەکانیش خۆیان چوون بۆ نان خواردن و مەلەکردن و دەرگایان لەسەرمان داخست ، گریانی ژن و مناڵ دەستی پێکرد ئەو بێ ویژدانانە شروبی خەویان پێ بوو هەرکات منداڵ بگریایە لێیان دەدان و بەزۆر دەیاندایە و دەیانخەواند بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەو جارە لەوێ نەبوون!،منداڵەکانیش بەشێوەیەك دەگریان وتمان




ئیستا نا ئێستا ئاشکرا دەبین و هەرچۆنێك بێت بێدەنگمان کردن و چەند بانگمان کرد کەس وەڵامی نەدایەوە لەدەرەوە زۆر بێ ویژدان بوون بە ئارەزووی خۆیان پاش دوانیوەڕۆ و نزیکی ئێوارە گەڕانەوە چەند نەفەرێکمان بەتەواوی پەکیان کەوتبوو هێزیان لێ بڕابوو بەتەواوی لاواز ببوون یەکێك لەوانە برا بچوکەکەم بوو چووە ژوورێکەوە کەمێك پشوو بدات و کەمێك لەو بۆگەنەدا دوورکەوێتەوە، بەڵام یەکێك لە قاچاخچیە تورکەکان بەتوندی پاڵێکی پێوەنا و کردیە دەرەوە بەتوڕەییەوە ئەویش لەبەر بێهێزی کەوت باوەڕتان بێت لەگەڵ ئەو زوڵمەم بینی چاوم ڕەش بوو هەستامە سەر پێ و بەبێ یەك و دوو بە بۆگز کەوتمە گیانی ڕێگەم نەدا دەست بکاتەوە تا هاواری کرد بۆ دووانەکەی تر بەپەلە هاتنە ژوورەوە بە سێ کەسی گەورە و بەهێز کەوتنە پەلاماردانم

لە سێ لاوە شەق و بۆگزم بۆ دەهات تا بۆگزێکیان بەر پێش چاوم کەوت و دواتر کەمێك شین بۆیەوە چاوم هیچی نەبینی لەوکاتەدا ئیتر بوو بە گریان و قیژە و هاواری ئافرەت و مناڵ و خێزانیشم توند باوەشی پیا کردبووم و دەگریا و فەقیرە ئەویش چەند بۆگزێکی بەرکەوتبوو ئیتر کۆمەڵە نەفەرێك هاتنە نێوانمان!، لەبەر دەنگە دەنگ و هاوار و لەترسی ئەوەی نەگیرێین بەپەلە یەختەکەیان خستە ئیش و بەرەو قوڵایی دەریاکە گەڕانەوە و هەرسێکیان لەترسا چووبوونە دەرەوە و دەرگایان داخست و نەفەرێکیان بانگ کردە دەرەوە خەڵکی شاری(کەرکوك)بوو تورکی باش دەزانی هاتەوە ژوورەوە و وتی: کاکە وەڵا ترساون و دەڵێن یان ئەوەتا دەبێت ئەو نەفەرە فڕێ بدەینە ناو ئاوەکە تا توشی کێشەمان نەکات یان ئەوەیە دەگەڕێینەوە بۆ دواوە منیش وتم: دوور لەڕووی بەڕێزت منەتیان بە پێڵاوەکانی بەڕێزت بەڵام خێزانم کە ئەوەی بیست دەستی کردە گریان و وتی: منیشی لەگەڵدا فڕێ بدەن ئیتر پیاوێکی بەتەمەن هات بۆ لام و وتی: براکەم تۆ خاوەنی خێزانیت و کەسێکی تریشت بە ئەمانەت دراوەتە دەست






و ئەمانەش خوێڕی و تلیاك كێشن و هیچ ترسی خوا لەدڵیاندا نیە زۆریشن و پێم باشە ئەم خەڵكە لە چاوەڕوانیدا نەهێڵیتەوە و خۆت دەزانی حاڵی هەموومان چۆنە و چەند كاتێكی كەممان ماوە تخوا بیكە لەڕێی خوا برۆ داوای لێبوردنیان لێ بكە!
بەڕاستی منیش هەرچەندە زوڵمم لێكرابوو بەڵام لەبەر خاتری خوای گەورە و پاشان خێزانم و خەڵكەكەش لەدەرگام دا و كردیانەوە و ئەو كوڕە وەرگێڕی بۆ كردم و چووم تەوقەم لەگەڵ كردن و داوای لێبوردنم لێكردن ئەوانیش وتیان: دڵنیا بین كە توشی كێشەمان ناكەیت؟ منیش وتم: ئەگەر ئێوە توشی كێشەمان نەكەن من هەرگیز ئامادەنیم كەس توشی كێشە بكەم! بەو شێوەیە بردینیانەوە بۆ سەر شوێنی چاوەڕوانی كە دامانبەزێنن لەكاتی تاریكیدا لەوكاتەدا پەیوەندیان كردبوو بە قاچاخچیەكەوە و بە كێشەكەی زانی و تەلەفونی كردا!،تەلەفونەكەیان دایە دەستم و پاش گێڕانەوەی باسەكە وتی: دەزانم بێ ئەخلاقن بەڵام كاكە گیان لەبەر نەفەرەكان هیچ مەكە و ئەوان دەترسن بگیرێن! منیش وتم: كاكە تۆش بەو شێوەیەت لێ بكەن هەر بەرگری لەخۆت دەكەیت و بێخەمبە داومەتە دەستی خوا و چاوەڕوانم لەخوای گەورە تۆڵەیان لێ وەرگرێتەوە بۆم!
هەر ئەوكاتە پەیوەندی كرابوو بەبراگەورەكەمەوە لە شاری(ئەستەمبوڵ) كە هەواڵەكەی بیستبوو نەفەری كۆكردبۆیەوە و چووبۆیە سەر قاچاخچیە كوردەكە لە(توركیا)و هەڕەشەیان لێكردبوو ئەویش تەلەفونی داخستبوو و خۆی شاردبۆیەوە لەڕێی هاوڕێیەكیەوە هەرچۆنێك بێت ژمارەی ناو یەختەكەی پەیدا كردبوو تا دڵنیابێت لەسەلامەتی من و گفتوگۆی لەگەڵدا كردم و منیش زانیم شتەكە گەورە بووە و بۆ ئەوەی كێشە دروستنەبێت وتم: نا برا گیان هیچ ڕووی نەداوە و شتێكی سادە بووە، ئیتر وتی: دەی باشە مادەم هیچی وانەبووە سوپاس بۆ خوا وا ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە!







کاتی دابەزینمان هات و یەختەکە نەیوێرا نزیك بێتەوە لە قەراغی دەریا و لەشوێنێکی چۆڵەوانیدا لەدەرەوەی شاری(ئەسینا) بەلەمی بچوك هاتە لامان و کۆمەڵ کۆمەڵ پەڕاندینیانەوە لەترسا کۆتا نەفەر منیان نارد پاش دابەزینمان بردینیانە ناو دارستانێکی چڕوپڕەوە چاو چاوی نەدەبینی پاش کەمێك چەند تەکسیەك هات بەدوامان‌دا و پێنج نەفەر پێنج نەفەر بردینیان بۆ شوقەی ڕاگیراو و داخراو لەناو شاری(ئەسینا) چونکە تا پارەکەت نەدرێت ناتوانیت بچیتە دەرەوە لەو شوقەیەدا!
هەر ئەو شەوە نەفەرەکانیان کردە دوو شوقەوە نەمزانی ئەو قاچاخچیە تورکەی لەگەڵمان کردی بەشەڕ بە نیازی وڵاتی(ئەڵمانیا)یە و دابەزیوە بەڵام خوای گەورە هەر ئەو شەوە تۆڵەی سەندینەوە و لە شوقەکەدا بەرپرسی شوقەکە لێدانێکی باشیان لێدابوو کە بیستبویان تورکە و لە کوردی داوە!،نەیانزانیبوو خزمی قوبتانە تورکە گەورەکەیە و وایانزانیبوو نەفەری سادەیە! تا قەواڵەی خوێندرابۆیەوە میرازێکی باشی خواردبوو پاش ئەوەی چووینە ناو شوقەکە سەیرم کرد پیاوەکانیان کردە ژوورێك و دەرگایان لەسەر داخستین و ئافرەتانیشیان کردە ژوورێکی ترەوە کە ژووری بەرپرسی شوقەکەبوو! چەند گەنجێکی تلیاککێشی مەشروب خۆربوون منیش خێرا بە پیاوەکانم وت: ئەرێ غیرەتتان هەیە بەڕاستی؟ دەرگایان لەسەر داخستووین و خێزان و ئافرەتەکانیان خستۆتە لای خۆیان و ئێوەش بێخەم دانیشتوون لێرە! باوەڕتان بێت یەك پیاو غیرەتی نەبوو قسە بکات لەو بارەیەوە بەتەنها هەستام لەدەرگاکەم دا و کردیانەوە وتم: بێزەحمەت خێزانم بۆ بێنن بۆ ئێرە!، وتیان: نابێت کاکە ئافرەت و پیاو پێکەوە بن! وتم بۆ قوربان بۆ جەنابتان پیاوەتیتان بڕاوە و بۆ ئێوە ئاساییە ژن و کچی خەڵکتان لابێت بەڵام مال بە ساحێب ماڵ حەرامە؟لەگەڵ وام وت دەرگاکەیان داخستەوە ئەوجا بەشەق کەوتمە دەرگاکە و وتم خوا شاهێدە نەیکەنەوە ئێستا دەیشکێنم ئیتر زانیان سوورم لەسەری کردیانەوە و خێزانمیان هێنا بۆ لام و وتیان:





کاکە ئاخر عەیبە ئافرەت لەناو ئەو هەموو پیاوەدا بێت!، وتم: گرنگ ئەوەیە لای خۆمە و خۆ من دڵم لە خێزانم پیس نیە دڵم لە ئێوە پیسە کە ئەو هەموو ئافرەتەتان کردۆتە لای خۆتان و دەرگاشتان لەسەر ئێمە داخستووە! خێزانی بەڕێزم خستە لای خۆم و زۆر ماندوو بوو بەتانیەکم پیادا و وتم بخەوە بەقوربان بە ئیسراحەتی خۆت!

پاش کەمێك بەرپرسی شوقەکە دەرگاکەی کردەوە و هاتەوە بۆ لام و زانی کە سوپاس بۆ خوا دیندارم وتی: براڕۆ ئێوە خەتەرن وەرە کاکە تۆش لای خێزانت بە و وەرە ئەو دیو حەیامان مەبە بڕۆ لەسەر جێگەکەی خۆشم بخەون بەو شێوەیە چووینە ژوورەکەی ئەودیو سەیرم دەکرد دەسبازی و گاڵتەیان دەکرد لەگەڵ ژن و کچی ئەو نامەردانەی ژوورەکەی تر ئەوانیش بێخەم بۆی دانیشتبوون و ڕووم کردە خێزانی بەشەرەفم و پێم وت: سوێند بەخوا لەناو سەد پیاودا داتنێم دڵم خورپە ناکات بۆت بەڵام ئەمانە ناکەس بەچەن و هەرکات سەرخۆش بوون یان بۆی هەیە حەپێکتان بۆ بکەنە ناو ئاوەوە و دواتر ئافرەتەکان بێ هۆش بکەن و ئەتکیان بکەن و دەیان نمونەی واش ڕوویداوە لەم ڕێگە و بانانەدا!

سەرلەبەیانی پارەکەمان درا و قاچاخچیەکە ویستی خێزانم سەرپۆشەکەی لادات و وتی: کاکە لەم وڵاتە خەتەرە سەرپۆش و ئێوەش وەرەقەتان پێ نیەدەتوت تەقلە بۆ کوێر لێ دەدات نەیدەزانی ئەوە جاری دووەممە کە دێمە شاری(ئەسینا)!، بۆیە وتم: کاکە ئەوە تۆ قسە بۆ کێ دەکەیت من چوار ساڵ لەمەوپێش لێرە بووم و دەیان مزگەوت و هەزاران ئافرەتی مسوڵمانی سەرپۆش بەسەری لێیە ئێوە خۆتان چاوتان بەو سەرپۆشە هەڵنایەت و ئەم قسانە دەکەنە بیانو! خۆشم و خێزانی بەڕیزیشم ڕازی نەبووین و ڕەتمان کردەوە بەتوندی تا کەمێك بوو بە دەنگە دەنگمان و کەمێك وەستاندینیان و پاشان بەرپرسی شوقەکە وتی: کاکە بەخوا ئەمە تا ئێوارە قسەی بۆ بکەیت حسابت بۆ ناکات و باشتر وایە بیانبەیتە دەرەوە،






بەو شێوەیە بردینیە پارکی(کۆماندۆرۆ)و تەسلیمی هاوڕێیەکی براگەورەکەمیان کردین و هات بەدوامانـدا سـەیرم کـرد تـوتکە سـەگێکی ڕەشی بچـوکی پێـیە سڵاوێکی سادەی لێکردین و بردینیەوە بۆ ماڵەکەی شوقەیەکی زۆر کۆن بوو پاش یەکتر ناسین پرسیارم لێکـرد کە خێزانـی هەیە یـان نـا؟، وتـی: نـا خێـزانم نـیە بەس کچـێکم هەیە!، منـیش وتم:چۆن چۆنی کچت هەیە و خێزانت نییە؟، کەچی سەیر دەکەم دەست ڕادەکێشێت بـۆ تـوتکەکە و بەوی دەوت ئەوە کچەکەمە و ماچی ناو دەمی دەکـرد!، وتـم: ئەی هاوار ئەوە چی دەڵێیت تۆ؟، تخوا توتکە سەگ دەبێتە کچ بە پێکەنینێکەوە؟، بەڵام دیار بوو کـاریگەری مـادەی هۆشـبەری لەسـەر بـوو وە هەڵسـوکەوت و ڕەفتـاری تەواو ببـووە ڕۆژئاوایی!

پـاش گفتوگـۆیەکی دوور و درێـژ هەنـدێك ئامۆژگـاریم کـرد و ئەویـش بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە گوێی بـۆ گرتبـووم و هیچی نەدەوت و سـەری ڕادەوەشـاند، وتـی: بەخـوا کاکە ئێمە تەواو فەوتـاوین تـازە مەگەر خـوا ڕەحممـان پێ بکات ئیتر هەر ئەو ئێـوارەیە لای ئەومـان بەجێهێشـت و چـووینە لای برادەرێکی تـر ئەویـش تـوتکە سـەگێکی هەبـوو لەخۆی زیاتر خۆشی دەویست ناوی لـۆکس بـوو گیرمان خواردبوو بە دەستیەوە نـازانم ئەم میللەتەی ئێمە بـۆ هێنـدە چاولێکەریە و بچێـتە هەر شـوێنێك بە بـای ئەوێ شـەن دەکات؟ وە خێزانی هەبـوو خێزانەکەی خەڵکی وڵاتی(ئەلبانیـا)بوو منـاڵێکی لێی هەبـوو بەڵام خێزانی بەسەردان گەڕابـۆیەوە بـۆ وڵاتەکەی خـۆی و ماوەی هەفـتەیەك بـردینیە لای خـۆی تـا شـوێنێکی ترمـان پەیـدا کـرد پاشـان چـووینە خـانوی برادەرێکـی تـر لەگەڕەکی(پەرستێری) بەڵام لەبەر ئەوەی کرێی ئاوی نەدابوو پارەیەکی زۆر قەرزار ببوو ئاوی ماڵەکەیان بڕیبوو خۆی لەوێ نەدەژیا و لەشوێنێکی تر دەژیا بۆ ماوەی دووهەفتە لەو مـاڵەش مـاینەوە بە دەبە ئـاوی خواردنمـان دەهێنـا لە مـاڵێکی دراوسـێمان تەنیشتەکەشـمان جـۆگەیەك ئـاو بـوو لەوبەر جـۆگەکەوە کـارگەیەکی لێبـوو بە







سـۆندەیەکی گەورە ئـاوی فرێـدەدایە سـەر جـۆگەکە نەمانـدەزانی چی بـوو بەڵام پـاك دیـاربوو خـوا بـۆ ئـێمەی ڕەخسـاندبوو بـۆ قـاپ شـۆردن و خۆشـۆردن دەمانهێنـا و بەکارمانــدەهێنا! پــاش ئەوە کــابرای خــاوەن مــاڵ هــات و بەهــۆی کــرێ نەدانەوە خانوەکەیان تەسلیم کردەوە و بردینیان بۆ ماڵێکی تر لە گەڕەکی(دافنی) بەڵام دوو سێ زگـورتی تێـدا دەژیـا و ڕوو لەدینـیش نەبـوون ئیتر ئەوێشـمان بەجێهێشـت و ئەم جـارە کەسێکی دینـدارمان لێ هەڵکەوت و بردینی بۆ ماڵی برادەرێکی ڕەبەنی خـانویەکی هەبوو بەتەنها خـۆی تیـا دەژیا پاشـان ماڵیـان ئاوا بێت کلیلی ماڵەکەی دایە دەستم و خۆشی چـوو بۆ لای کەسێکی تـر ئەم ماڵ گواستنەوە و ناڕەحەتیە هەمووی هۆکاری بێ پارەیی و قەرزاریمـان بـوو کە نـزیکەی(١٧٠٠٠)دۆلار قەرزار ببووین لە (هەرێمی کوردستـان)ەوە تـا شـاری(ئەسینا)ی وڵاتی(یۆنـان)!، تـا دواتـر خـوای گەورە پاداشـتی خێری بـرا گەورەکەم بـداتەوە زۆر هاوکاری کـردین و زۆربەی قەرزەکەی بـۆ دایـنەوە و بەردەوامـیش دەسـتی پێوەمان بووە و پارەی بۆ ناردوین!

نزیکەی مانگێکیش لەو ماڵە ماینەوە و دواتـر کرێمان بۆ حسـاب کـرد بەڵام هێشتا لەو مـاڵەدا مـابووین بڕیـار دەرچووبـوو لەلایەن پۆلیسـەوە کە هەر کەسـێك بگیرایە بەبێ وەرەقە و ناسـنامە مـاوەی سێ مانـگ زینـدانی دەکـرا و لەو کاتەشـدا زۆر بە نـاڕەحەتی کارتێك دەردەکرا بەنـاوی کارتی سـوور بـۆ مـاوەی شـەش مانـگ و دواتـر تـازە دەکـرایەوە هــاوڕێیەك ئاگـاداری کــردینەوە کەوا ئەگەر کـاتژمێر دوانــزەی شــەو بچیــنە بەردەمـی فەرمانگەی پەنـابەران کە ناسـرابوو بە(ئەلەذاپۆن) تـا کاتژمێر شـەشی بەیانی چاوەڕوان بـین ئەوە دەمـانکەنە ژوورەوە و کارتەکەمـان بـۆ دەکرێـت،منیش هەسـتام خێزانم و بـرا بچـوکەکەم بـرد و کاتژمێر یـانزەی شـەو بە کۆتـا پـاسی ناوشـار چـووینە ناونیشـانەکە و تـا نزیکی کاتژمێر شەشی بەیانی لەویادا ماینەوە و سەرەمان گرت،





باوەڕتان بێت وابزانم نزیکەی پێنج سەد نەفەر زیاتر هاتبوون بەڵام باش بوو ئێمە لە سەرەی بیستەم دا بووین ئیتر کاتی کردنە ژوورەوە دەستی پێکرد و بوو بە شەڕە پاڵ و چەند پۆلیس و کۆماندۆیەك بەدار و لێدان نەفەریان دەردەکرد و بەویستی خۆیان هەندێکیان کردە ژوورەوە!، سەرەتا باش بوو من و خێزانم و ناسراوەکەمان بەرکەوتین بەڵام دواتر زۆر بێ ویژدانانە یەکێکیان هات منی هێنایەوە دەرەوە هەرچەندە وتم: ئەوە خێزانم و برامە سوودی نەبوو!

لەوکاتەشدا خێزانم ویستی بێتە دەرەوە وتم: کێشە نیە لەگەڵ براکەم دا بڕۆنە ژوورەوە با هیچ نەبێت ئێوە تەواو ببن من سبەی شەو دێمەوە إن شاء الله سوپاس بۆ خوا ئەوان بۆیان کرا و منیش خۆم ئامادەکرد بۆ سبەی شەو کاتی دیاری کراو هاتە پێش وخێزانم بەجێهێشت و ماڵئاواییم لێکرد و بەڕێکەوتم بۆ فەرمانگەکە بەڵام ویستی خوا وابوو پاس نەمابوو لە سەنتەری شارەوە کە پێی دەوترێ(ئەمۆنیا)بە پێ ڕۆشتم تا تەنها پانزە خولەکم مابوو بگەمە فەرمانگەکە کاتێکم زانی سەیارەیەکی پۆلیس لە تەنیشتم دا وەستا و بانگی کردم!، پاش داواکردنی وەرەقە منیش ئەو بەڵگانەی ئامادە دەکرێن بۆ پۆلیس پیشانم دان و وتیشم بۆ فەرمانگەکە دەچم بەڵام وتیان: دەبێت سەرکەوی لەگەڵمان و بتبەین بۆ بنکەی پۆلیس!، لەڕاستیدا نەمزانی بۆ دەستبەسەرکردنم دەبەن ئەگینا هەڵدەهاتم لەدەستیان!

پاش ئەوەی بردیانم بۆ بنکەکە وتیان مادەم وەرەقەت پێ نیە دەبێت لامان بمێنیتەوە و منیش هەرچەندە وتم: ئاخر من خێزانم هەیە و بۆ کردنی وەرەقەش ڕۆشتووم و لەڕێگەدا ئیوە گرتوتانم!،بەڵام بێ سوود بوو چونکە ئەوەی ناوی ویژدان و ڕەحم بێت لەدڵیاندا نەبوو!،تەنها ڕێگەیان دام کە خێزانم بە تەلەفون ئاگادار بکەمەوە کە گیراوم!، بەڕاستی زۆر بێتاقەت بووم و تەنها هاوارم کردە خوای گەورە کە بەزووترین کات ڕزگارم بکات چونکە خێزانم و برا بچوکەکەم بەتەنها بوون!



وە لەژیانیانـدا غەریبیـان نەبینیبـوو زمانیشـیان نەدەزانـی و خێزانێکـی کوردیشـمان نەدەناسی لەو کاتەدا تا هاوکاری بکەن و دڵی بدەنەوە بەهەرحاڵ لەگەڵ نەفەرێکی تردا خستینیانە ژوورێك و سەرلەبەیانی بردیانم بۆ فەرمانگەی پەنابەران و لەوێش لەگەڵ چەند نەفەرێکی تـردا بردینیـان بـۆ دادگا و لەکاتی دابەزیـن دا دوو دوو کەلەپچەیـان کـردین بەیەکەوە، پێش نیـوەڕۆ سـەرەی کاتی دادگایم هـات و دادوەر وتی: تەنها پێـنج دەقەت بۆ هەیە قسە بکەیت منیش بەپەلە باسەکەم بە وەرگێڕەکە وت و ئەویش خێرا وەریگێڕا بە کورتی! بەڵام دادوەر گوێی بۆ قسـەم نەگرت و بەتۆمەتی بێ وەرەقەیی سێ مـانگی حـوکم دام لەگەڵ بـڕی(١٥٠٠) یـۆرۆ سـزای مـاددی لەبەر ئەوەی بە ڕێـگەی نایاسایی هاتومەتە وڵاتی(یۆنان)ەوە!

سوپاسـی خـوای گەورەم لەسـەری کـرد و دووبـارە بە کەلەپچەکـراوی هێنایـنیـانەوە بـۆ زینـدانی فەرمـانگەی پەنـابەران پـاش پەنجەمـۆر پێکـردن و لێسـەندنی سـەرجەم شـتومەکەکانمان بردینیـان بـۆ زینـدانێك کە نـزیکەی هەزار نەفەر زیـاتر پەنـابەری تێـدا بـوو کە لە هەمـوو وڵاتێکـی ئاسـیایی و ئەفریقـاییەوە بەڕێـگەی نایاسـایی هـاتبوونە وڵاتی(یۆنـان) و گیرابـوون! ماوەی هەفـتەیەك لەو زینـدانەدا مامەوە چـوار نەفەر چـوار نەفەر لە ژوورێکـدا بـووین دەرگامـان نەبـوو بەڵکو شـیش بـوو بە جیهاز دەرگاکانمـان بـۆ دەکرایەوە ڕۆژانە چەند جارێك بۆ گەڕان و تەوالێت و خـۆ شـۆردن شـەو ڕۆژێکیش سێ جار خواردنیان دەهێنا بەڵام چی خواردنێك؟!،بێزت نەدەهات سـەیریشی بکەیت و تەنها لەناچاریـدا دەمـانخوارد تـا نەمـرین لەبرسـا ڕۆژانە لەڕێـی کـابینەی تەلەفـونەوە لەنـاو زیندانەکەدا پەیوەندیم دەکرد بە خێزانمەوە و ناونیشـانم پێی دا ماڵی ئاوابێت برادەرێك لەگەڵ خێزانە ڕۆژئاواییەکەیدا جارێك هێنـای بـۆ سـەردانم هەسـتم کـرد زۆر بێتـاقەت بـوو فەقیرە! منیش دڵـم دایەوە و وتـم: دڵنیـابە پـاش هەمـوو نـاڕەحەتیەك خۆشی دێـت بەویستی خوا!، سوپاس بۆ خوا لەڕێگەی چەند مسوڵمانێکەوە قورئانێکم دەستکەوت







و بەدەنگی بەرز قورئانم دەخوێند لە ژوورەکەی خۆمەوە هەموو زیندانیەکان گوێیان لێی دەبوو دەبو به الله اکبر کردنێك پۆلیسەکان بەلایانەوە سەیربوو! لەگەڵ ئەوەشدا کاتی هەموو بانگەکان بانگم دەدا سوپاس بۆ خوا ڕۆژێکیان گەنجێکی قژ درێژی خەڵکی وڵاتی(جەزائیر) که هەموو گیانی تاتۆ و شوێنەواری کەتەر و چەقۆ بوو! پێشتر دەرمان کێش و مەشروب خۆر و دوور لەدین بوو زۆربەی خەڵکی زیندانەکە لێی دەترسان و خۆیان لەشەڕی دەپاراست تەنانەت پۆلیسەکانیش حسابێکی تایبەتیان بۆ دەکردا!

هات بۆ لام و وتی: تۆ بوویت قورئانت دەخوێند؟ منیش سەرەتا وامزانی بێزاری کردووە و بۆ شەڕ هاتووە!، وتم: بەڵێ من بووم، وتی: دەی دەبێت هەر ئێستا بێیت بۆ ژوورەکەم و کەمێك قورئانم بۆ بخوێنیت وەڵاهی دڵم هاواری قورئان دەکات!

باوەڕتان بێت دڵم پڕ بوو خێرا هەستام و چوومە ژوورەکەی و دەستم کرد بە خوێندنی سەرەتاکانی سورەتی(بەقەرە) گەشتمە تەواوکردنی ئایەتەکانی سیفاتی(نیفاق) دەستی کردە گریانێکی زۆر سەرسوڕهێنەر و ژوور و ناوەوە پڕ بوو لە خەڵك تەنانەت پۆلیسەکانیش هاتبوون سەیریان دەکردین هەستا و وتی: من زۆر تاوانبارم و بێ دینم دەمەوێت تەوبە بکەم چی بکەم ئێستا خوا لێم خۆش بێت؟، منیش بەدەنگی بەرز وتم: الله اکبر وەڵاهی هەر ئێستا شایەتومان بێنە و هەستە بڕۆ خۆت بشۆ و دوو ڕکات نوێژی تەوبە بکە خوای گەورە لەسەرجەم تاوانەکانت خۆش دەبێت بەو مەرجەی تەوبەکەت یەکجارەکی بێت و نەگەڕێیتەوە سەر خراپە بەو شێوەیە سوپاس بۆ خوا ئەو گەنجە بەڕێزە خوا هیدایەتی دا و ئەوجا زانیم حیکمەتی گیرانەکەم چی لەپشتەوە بووە!، بۆ بەیانیەکەشی ڕۆژی هەینی بوو ، بەنیاز بووم خێزانم سەردانیم بکات و داوای هەندێك شتم لێکردبوو بۆمی بێنێت کاتەکەی کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ بوو بەڵام کاتێکم زانی پێش کاتی سەردانی کردن ناوم خوێندرایەوە و وتیان: دادگا بڕیاری ئازاد







بونتی دەرکردوە و لەسێ مانگەکەت خۆش بوون ئیتر سوجدەیەکی شوکرم بۆ خوا برد و ئازادیان کردم و هەستام ماڵئاواییم لە هاوڕێ و دۆستەکانم کرد کە لەوێدا یەکمان ناسی لە لایەك بێتاقەت بوون بە ئازاد بوونم لە لایەکیش دڵخۆش بوون چوومە لای کوڕە تەوبەکارەکەو توند باوەشی پێدا کردم و وتی: وەڵاهی تۆ خوا بۆ منی ناردیتە ئەم زیندانە تا لەسەر دەستت هیدایەت وەرگرم!

لەگەڵ هاتمە دەرەوە وەرەقەیەکی یەك مانگیم بۆ کرا و مۆبایل و ئەشیاکانیان دایەوە دەستم و خێرا پەیوەندیم کرد بەخێزانمەوە و موژدەی ئازادبوونم پێدا سوپاس بۆ خوا بەخۆشی و کامەرانی گەڕامەوە لای و پاش یەك ڕۆژ برا گەورەکەم پارەی بۆ ناردین بۆ خانووگرتن پاش گەڕانیش برایەکی بەڕێزم دۆزیەوە کەساڵی(٢٠٠٢) بەخزمەتی گەشتبووم لەیەکەم سەفەری هەندەران دا و بەڕێزیان لەوێ مابوونەوە و ئەویش چەند خێزانێکی بەڕێز و چەند مسوڵمانێکی پێ ناساندم و پاشان خانویەکی خۆشیشی بۆ دۆزینەوە لە گەڕەکی(ئاگیۆ یوانی) لەنزیك میترۆی ئەو گەڕەکەوە بوو ماڵمان چووە ئەو گەڕەکە و تا ماوەی چوار ساڵ لەو گەڕەکەدا نیشتە جێ بووین لەهەمان خانوودا

سوپاس بۆ خوا خۆشم وەرەقەی کارتی سوورم بۆ کرا و دوو ئیشیشم دەستکەوت کە یەکیان بۆیاخچێتی ماڵان بوو یەکێکیشیان دارتاشی و دروستکردنی دۆڵاب و مەتبەخی ماڵان بوو لەماوەی یەك ساڵدا بە هاوکاری براگەورەکەم سوپاس بۆ خوا قەرزەکانیشمان لەسەر ئاسان بوو لەوکاتەشدا خوای گەورە خاتو(ئەسماء)ی پێ بەخشین کە بووە نووری چاومان پاش ئەوەی نزیکەی سێ ساڵمان بەسەر برد لە وڵاتی(یۆنان)دا بەخۆشی و لە کەشوهەوایەکی ئیمانیدا بەهۆی خزمەتکردنی مسوڵمانانی کورد و مزگەوتەکانەوە و کۆمەڵێك خێزانی باشی کورد و برای باشی کورد هەستمان بە غەریبی نەدەکرد! تا ئەوکاتەی وڵاتی(یۆنان)باری ئابوری بەرەو داڕووخان ڕۆشت و وردە وردە ئیش و کار لەو وڵاتەدا بەرەو کزی ڕۆشت منیش ئیش و کارم نەما و







ژیان بەسەربردنیش لەوڵاتی(یۆنان) بەبێ ئیش زۆر سەخت و ئەستەمە بەتایبەتی بۆ کەسێکی خێزاندار چونکە هیچ هاوکاریەك بۆ پەنابەر نەبوو لەلایەن کاربەدەستانی ئەو وڵاتەوە لەوکاتەشدا تاکە وڵات کە بمانتوانیبایە سەفەری بۆ بکەین وڵاتی(سویسرا)بوو لەبەر ئەوەی من پەنجەمۆرم هەبوو ئەو وڵاتەش لەساڵی(٢٠٠٩)ەوە هاتۆتە ناو ڕێکخراوی(دبلن)و لەوکاتەوە پەنجەمۆر دەخوێنێتەوە، ئەگەرچی وەرگرتنی ئیقامە لەو وڵاتەدا زۆر سەختە و بەئاسانی ئیقامە نادات بەڵام ئێمە ناچار بووین سەفەری بۆ بکەین لەگەڵ خێزانم دا بڕیارم دا بەنهێنی سەفەر بکەین و تەنها چەند خێزانێك و برایەکمان ئاگادار کردەوە بۆ ئەوەی کەس هەست بەوە نەکات کە لەڕوانگەی ماددەوە ژیانمان باش نیە تا ئەومسوڵمانە بەڕێز و خۆشەویستانەی متمانەیان بەم برا تاوانبارەیان هەبوو توشی بێتاقەتی و دڵگرانی نەبن و دواتر نەبنە ڕێگر لەبەردەم سەفەرەکەمان دا بەڵام وەك کوردەواری دەفەرمووێت: ئەوەی لای بەندە خەیاڵە لای خوا بەتاڵە! بۆیە لەیەکەم سەفەردا لەڕێگەی قاچاخچیەکەوە پاسپۆرتمان بۆ دروستکرا و بلیتی وڵاتی(ئیتاڵیا)مان بڕی بەڵام قەدەری خوا لە فڕۆکەخانەی(ئەسینا) لەبەشی بۆردین کارت و شوێنی تەسلیم کردنی جانتاکان ناوی (ئەسماء) خاتوون نەهاتبۆیەوە و بەو شێوەیە یەکەم جار دەرنەچووین! ئەو شەوە گەڕاینەوە بڕیار وابوو بەیانی دووبارە بلیتمان بۆ ببڕدرێتەوە بەڵام چەند برایەکی دڵسۆز پاش مشتومڕ و گفتوگۆیەکی زۆر سەفەرەکەیان پێ هەڵوەشاندینەوە و بەباشیان نەزانی سەفەر بکەین بۆ وڵاتی(سویسرا) خوا پاداشتی خێریان بداتەوە لەپاش ئەوە هەرچۆنێك بێت ساڵێکی ترمان بەڕێکرد بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ باری ئابوری وڵاتی(یۆنان) بەرەو خراپتر دەڕۆشت بەشێوەیەك ئەوەشی کە ئیش و کاری بەردەوامی هەبوو ئیشی نەدەما و بەناچاری یان سەفەری دەکرد بۆ وڵاتانی تری ڕۆژئاوا یان دەگەڕایەوە بۆ(هەرێمی کوردستان)، ئێمەش دووبارە بڕیارمان دا لەگەڵ





خێزانم سەفەر بکەینەوە بۆ وڵاتی(سویسرا)، بەڵام ئەم جارەیان لەساڵی(٢٠١٠) مانگی حەوت کاتی گەشتوگوزار بەڕێگەی کەشتی لەشاری(کۆمۆنیزیا)وە، ئەم جارەیان بلیتی کەشتیمان بڕی بۆ شاری(ڤێنسیا)ی وڵاتی(ئیتاڵیا)، چووینە بەردەمی کەشتی دیار بوو ئەم جارەشیان ڕێگەمان لێ هەڵەبوو تا گەشتینە بەردەم کەشتیەکە خەریك بوو بڕوات و لەوێش کەچووینە بەردەمی کۆنترۆڵ جەوازەکەمان جەوازێکی وڵاتی (میسر) بوو ئاشکرا بوو کە ساختەیە و دەرنەچووین و نەیانهێشت سواری کەشتیەکە بین و دووبارە گەڕاینەوە بۆ شاری(ئەسینا).

جا لەهەمووی خۆشتر دووبرا بەسەیارە بردینیان بۆ ئەوێ لەڕێگە دوعایان دەکرد دەرنەچین و لەگەڵ خۆیان دا بمانبەنەوە و دیاربوو خوای گەورە دوعاکەی گیراکردن و ئەو تەماتە و خەیار و شوتیەی کە کڕیبوویان پێکەوە لەڕێگەی گەڕانەوە خواردمان.

ماوەی شەش مانگی تر لە(ئەسینا) ماینەوە و ئیتر بەهۆی خۆپیشاندان و نەمانی ئیش و کار و داڕووخانی باری ئابوری ئەو وڵاتەوە، زۆرینەی پەنابەرانی کوردی ئەو وڵاتە دەگەڕانەوە بۆ(هەرێمی کوردستان)و چیتر کەسوکاری بەڕێزیشمان توانای چاوەڕوانی و دووریمانیان نەمابوو بۆیە بڕیارمان دا پاش پێنج ساڵ ژیان لە غەریبی بە یەکجاری بگەڕێینەوە بۆ (هەرێمی کوردستان) و لەبەرواری(٢٠١١/٤/٢٢) لەڕێگەی فڕۆکەخانەی شاری(ئەسینا)ی پایتەختەوە بە فەرمی گەڕاینەوە بۆ فڕۆکەخانەی شاری(هەولێر)ی پایتەختی(هەرێمی کوردستان)، ئیتر لەوێش لەلایەن دایك و خوشك و برا بەڕێزەکانمەوە بەگەرمی پێشوازیمان لێکرا و پاش ئەو هەموو دابڕانە سوپاس بۆ خوا شادبوینەوە بەکەسوکاری ئازیز و خۆشەویستانمان.

لێرەدا کۆتایی بە سەفەری دووەمیشمان هات سوپاس بۆ خوای گەورە و میهرەبان کە بەفەزڵ و گەورەیی خۆی دین و ژینی پاراستین و ئەم جارەیان لەگەڵ خێزانی بەڕێزم دا




بـۆ مـاوەی پێـنج سـاڵ لەکەس و کـار دوورکەوتیـنەوە، ئەگەرچی لەڕووی مـاددەوە هیچمـان نەهێنـایەوە بەڵام بەسـەری بەرز و ئیمـانی پـتەوەوە پاشـانیش ئەو بەخششـە جـوانەی خـوای گەورە کەپێی بەخشـین ئەویش بەخـاتوو (ئەسـماء) ەوە گەڕاینەوە نێـو باوەشی کەسوکاری سەربەرز و خۆشەویستمان سوپاس بۆ خوا.
کۆتـایی بە سـەفەری نێـوان (هەرێمی کوردسـتان) بـۆ وڵاتـانی (ئێران _ تورکیـا _ یۆنـان) و لەوێشـەوە دووبـارە گەڕانەوە بـۆ(هەرێمی کوردسـتان)هات و بەم زنجیرەیەش کۆتـایی بە دووەم سـەفەرم بـۆ هەنـدەران هـات لەسـاڵەکانی(٢٠٠٦ بـۆ ٢٠١١) ، لەمەوپـاش پشتیوان بەخوا دەچینە سەر چیرۆك و ڕووداوەکانی سەفەری سێیەمم بۆ هەندەران کە لەگەڵ خێزانی بەڕێزم و خاتوو ئەسمائی کچە گەورەم دا ئەنجاممان داوە،ئەویش گەشتکردنمان بوو لە(هەرێمی کوردستان)ەوە بۆ وڵاتی(سوید)و وڵاتی(فنلەندا) لەڕێی فـڕۆکە و کەشـتیەوە لەپەڕەکانی دواتـردا کەبـریتیە لە سـەفەری سـێیەمی هەنـدەران، تیشك دەخەمە سەری إن شاء الله!
ڕەنج شێخانی
١٣ / ٩/ ٢٠١٥
فینلەندا

# (سەفەری سێیەم)






# ڕێگا سەختەکانی هەندەران (کۆتایی) (کوردستان _ سوید _ فنلەندا _ نەمسا _ئیتاڵیا _ سویسرا _ ئەڵمانیا _ دانی مارك) (٢٠١٣_ ٢٠١٩)

## ڕەنج شێخانی

پێشەکی:

پاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان وە سەڵات و سەلامی خوا بڕژێت بەسەر پێغەمبەری کۆتا زەمان محمد ﷺ.







پاش ئەوەی لە ناوەڕاستی بەهاری ساڵی(٢٠١١) لەڕێگەی فڕۆکەوە لەشاری(ئەسینا)ی پایتەختی وڵاتی(یۆنانە)وە بەشێوەیەکی فەرمی و یەکجاری گەڕاینەوە بۆ (هەرێمی کوردستان) لەفڕۆکەخانەی شاری(هەولێر) لەلایەن کەسوکاری بەڕێزمەوە پێشوازیمان لێکرا، ماوەی ساڵێك و دە مانگ لەگوندی(بەردەکەڕ)ی نزیك شاری(سلێمانی) نیشتەجێ بووین بەخێزانەوە و خوای گەورە فەزڵی ئەوەی پێ بەخشیم کەوا ببمە پێشنوێژ و وتاربێژی مزگەوتی دووەمی ئەو گوندە بەشێوەیەکی خۆبەخش ئەویش لەسەر داواکاری و پشتگیری خەڵکی بەڕێزی ئەو ناوچەیە چونکە مزگەوتەکەیان بێ پێشنوێژ و وتارخوێن بوو وە سوپاسی خوای گەورە دەکەم تاوەکو ئەو ماوەیەشی لەو گوندە ماینەوە زۆر ڕێزمان لێگیراوە لەلایەن دانیشتوانی بەڕێزیەوە وە تا ئەو کاتەشی کەگوندەکەمان بەجێهێشتووە ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستی هەبووە لە نێوانمان دا کە ببووە مایەی دڵخۆشی و شادوومانیمان چونکە بە کۆمەڵێك خێزانی باش و برا و خوشکی ئیمانی ئاشنابووین کەجێگەی فەخر و شانازیمانن و هەرگیز ئەو ساتانەش لەیاد ناکەم کە لە خزمەتی ئەو خەڵکە باشەدا بووین داواکارم لەخوای گەورە سەرجەم خزمەت و هەنگاوەکانمانی بە پاداشت بۆ نووسیبێتین و لە هەڵە و کەموکورتیەکانیشمان خۆشبووبێت، پاش ئەوەی زروفێکی تایبەتیم بۆ هاتە پێشەوە ناچاربووم کەوا بۆ جاری سێیەم بیر لەگەڕانەوەی هەندەران بکەمەوە و جارێکی تر بەخێزانەوە(هەرێمی کوردستان) بەجێ بهێڵین و بۆ تەواوکردنی پەڕتوکەکەشم بەپێویستم زانی چۆنیەتی گەشتەکەم و چیرۆك و ڕووداوەکانی ئەم گەشتەش بخەمە پێش چاوی خوێنەرانی بەڕێز. **ڕەنج شێخانی ٢٧ / ٧ / ٢٠١٩/ فینلەندا**

**بەڕێکەوتن لە(هەرێمی کوردستان)ەوە بەرەو وڵاتی (سوید)و لەوێشەوە بۆ وڵاتی(فنلەندا).**







پاش ئەوەی بڕیارمان دا جارێکی تر سەفەری هەندەران بکەینەوە دەستم کرد بە پرسیارکردن و بەدوداچوون بۆ ئەوەی بزانم چی وڵاتێك باشە کە مۆڵەتی مانەوە و مافی پەنابەران دەدات دیارە لەو کاتەدا وڵاتی(فنلەندا) باشترین وڵات بوو بۆ پەنابەرانی(هەرێمی کوردستان) و مۆڵەتی مانەوەی دەدا و بەو هۆیەوە ئێمەش بڕیارمان دا سەفەربکەین بۆ ئەو وڵاتە ئەوەبوو لەنیوەی مانگی یەکی ساڵی(٢٠١٣) خوای گەورە کارئاسانی بۆ کردین کەوا توانیمان بەشێوەیەکی فەرمی لەڕێی فڕۆکەوە هاوکات لەگەڵ خێزانی بەڕێزم کە سکپڕ بوو بەخاتوو ئیسرائی کچی دووەمم خاتوو ئەسمائی کچە گەورەشمان لەگەڵدابوو بەڕێکەوتین بەرەو وڵاتی(سوید) و لەدووەم شاری ئەو وڵاتە کە ناوی(گۆتین بۆرگ)بوو دابەزین و لەوێشەوە لەڕێگەی شەمەندەفەرەوە ڕۆشتین بەرەو شاری(ستۆکهۆڵم)ی پایتەختی ئەو وڵاتە هەر ئەو ڕۆژەش تکتی کەشتیمان بڕی و بۆ ئێوارەکەی بەڕێکەوتین بەرەو دووەم شاری وڵاتی(فنلەندا) کەناوی شاری(تورکۆ) یە و ماوەی نێوانیشیان نزیکەی دووانزە کاتژمێرە وە بێجگە لەو شارەش ئەگەر بتەوێت بەرەو شاری(هێلسنکی) پایتەختی وڵاتی(فنلەندا) بڕۆیت ئەوە بەکەشتیەکی تر دەچیت و ماوەی نێوانیشیان نزیکەی بیست و چوار کاتژمێرە بەڵام ئێمە وامان بەباش زانی بۆ شاری(تورکۆ) بڕۆین.

ئەو کەشتیەشی کە سەفەرمان پێ کرد کەشتیەکی گەورەی هەشت نهۆمی بوو کە هەر نهۆمەو پێکهاتبوو لە کۆمەڵێك ژووری زۆر بۆ نەفەرەکان کە وەك ئوتێل وایە چونکە بێ لەجێی نووستن تەلەفزیۆن و مێزی خواردن و تەوالێت و حەمامیشی تێدایە ئەو ژوورەشی ئێمە گرتبوومان بەکرێ دوو جێگەی نووستنی تێدا بوو لەنهۆمی چوار بوو وە ژووری گەورەتریشی تێدابوو بەڵام تا جێی نووستنی زیاتر بوایە کرێکەشی گرانتر دەبوو، ئەو ژوورە بۆ ئێمە کیفایەت بوو ، لەگەڵ سەرکەوتنیشمان بۆ ناو کەشتیەکە هەر







کەسەو بەپێی ئەو بلیتەی کە بڕیوەتی کارتێکی دەدرێتێ و ژمارەی ژوورەکەی لەسەرە و لەجیاتی کلیل بەو کارتە دەرگای ژوورەکەت بۆ دەکرایەوە .
هەر لەناو کەشتیەکەدا کۆمەڵێك کارمەند و سیکیوریتی تێدایە کەوا ڕێنماییت دەکەن دوکان و بازاڕی هەمەجۆری زۆری تێدایە هەر لەپۆشاك و جلوبەرگەوە تا دوکانی جوانکاری و سوپەرمارکێتی خواردەمەنیشی تێدایە بەڵام شتومەك کڕین تیایدا گرانە و ئێمەش پێشتر لە شاری(ستۆکهۆڵم) لە خواردنگەیەکی کوردی خواردنی سەفەریمان کڕیبوو تەنها هەندێ پێداویستی کەممان کڕی لەناو کەشتیەکەدا بێجگە لەوە کافتریا و بارِ و مەلەوانگە و سینەما و شوێنی یاری مناڵانیشی تێدا بوو ئیتر خاتو ئەسمامان خستە ناو بەشی یاری مناڵەکان و ماوەی نیو کاتژمێر یاری کرد لەپاش گەڕانێکی خێرا بەناو کەشتیەکەدا چووینە بەشی دەرەوەی کەشتیەکە تا دیمەنی دەریاکە ببینین ، بەڵام سبحان الله دیمەنێکی زۆر سامناکی هەبوو چونکە ئەو کاتەی ئێمە گەشتمان کرد سەرەتای چلەی زستان بوو ئەو دەریا گەورەیە بەستبووی وە کەشوهەوایەکی سارد و تەمومژاوی هەبوو چاو چاوی نەدەبینی و شەپۆلی ئەو دەریایەش ڕەشی دەکردەوە و دەتوت چیایە بەرزدەبێتەوە.
ئەو کەشتیانەی لەوڵاتانی ئەسکەندەنافی هاتووچۆ دەکەن بەشێوەیەك دروستکراون لە ڕووکاری پێشەوە و ئەملاولایەوە بەفر و سەهۆڵ شکێنی پێوەیە بۆ ئەوەی سەرجەم ئەو بەربەستانە بشکێنن کەدێنە ڕێیان لەناو دەریادا هەربۆیە کاتێك چووینە دەرەوە بێ لەساردی و سەرمایەکی بەهێز گوێمان لەدەنگی شکانی سەهۆڵەکان بوو کە تەکانی دەدا بە کەشتیەکە سامێك لەدڵمان دا دروست بوو بەپەلە چووینەوە ژوورەکەی خۆمان و لەڕێی کامێرا ڕاستەوخۆکەی تیڤییەکەمانەوە سەیری ناو ئاوەکەمان دەکرد ئەویش بەهۆی تەمومژ و تاریکییەوە هیچمان نەدەبینی بەجوانی.







دوای نووستنمان و هەستانەوەمان بۆ نوێژی بەیانی کاتژمێرمان تەوقیت کرد بۆ کاتژمێرێك پێش گەشتنی کەشتیەکە تا خۆمان ئامادە بکەین بۆ دابەزین بەڵام کاتێك زەنگی تەوقیت لێیدا و هەستاین لە خەو سەیرێکی تیڤیـیەکەم کرد بینیم وا کەشتیەکە وەستاوە و ئەشیا و شتومەك سەردەخات بەپەلە دەرگای ژوورەکەم کردەوە سەیر دەکەم کارمەندی پاککەرەوە خەریکی پاککردنەوە و گسك لێدانن و سەرجەم نەفەرەکان دابەزیون!

منیش چوومە لای یەکێکیان و پرسیارم کرد کەوا ئایا کەشتیەکە گەشتوە یان هێشتا کاتی ماوە، لە وەڵامدا وتی: بەڕێزتان دواکەوتوون لەدابەزین و دەبێت بەپەلە دابەزن چونکە پاش کەمێکی تر نەفەری وڵاتی(سوید) سەردەکەوێت و کەشتیەکە دەگەڕێتەوە باوەڕبکەن هەر نەمزانی چۆن خۆمان کۆکردۆتەوە و دابەزیوین کاتێك چووینە هۆڵی چاوەڕوانی هیچ کەسێکی لێ نەمابوو هەمووی ڕۆشتبوو وە ئەو پاسەش کە لە دەرەوە چاوەڕوان دەکات نەفەرەکان ببات بۆ ناوشار ڕۆشتبوو دواتر زانیم کەوا لەنێوان وڵاتی(سوید)و وڵاتی(فنلەندا) کاتژمێرێك جیاوازیان هەیە لەگەڵ یەکدا و کاتژمێرەکەی من لەسەر کاتی وڵاتی(سوید) بوو بۆ ئەوەی خێزانم و خاتوو ئەسماء سەرمایان نەبێت لە هۆڵی چاوەڕوانی دا بەجێمهێشتن چونکە ئەوپۆشاکەی ئێمە لەبەرمانکردبوو بۆ سەرمای زستانی لای خۆمان بوو نەك وڵاتانی ئەسکەندەنافی سەرەتا بەتەنها خۆم چوومە دەرەوە تا سەیارەیەك پەیا بکەین و بڕۆین بۆ ناو شار وە لەو کاتەش دا پلەی سەرما زیاتر لەبیست پلە لەژێر سفرەوە بوو سەرلەبەیانیش بوو ئێمەش بۆ یەکەم جارمان بوو سەرمای ئاوا ببینین باوەڕتان بێت تا سەیارەم پەیا کرد و هاتمە ژوورەوە هەردوو کونە لوتم بەستبووی و هەناسەم بۆ نەدەدرا، سوپاس بۆ خوای گەورە ئەم جارە جیاواز لە سەفەرەکانی ڕابردوو لەماوەی چەند ڕۆژێکی کەم دا بەسەلامەتی گەشتینە وڵاتی(فنلەندا)





لەبەرواری(٢١ / ١ / ٢٠١٣) کات کاتژمێر یەکی شەو بوو کە گەشتینە شاری (ڤاسا)و لەڕێی پرسیارکردنەوە لە سەنتەری شارەوە بەڕێکەوتین بۆ بنکەی پۆلیس چونکە دەبێت لەوێ خۆت تەسلیم بکەیت و نزیکەی یەك کاتژمێر لەدەرگامان داوە و لەزەنگی بەردەرگامان دەدا دەرگایان بۆ نەدەکردینەوە منیش ئەسمائم بەسەر شانەوە بوو هەستم دەکرد تەواو سەرما خەریکە لەجوڵەی دەخات و وردە وردە دەنگیشی نەما و خەویشی دەهات و حەزم نەدەکرد بخەوێ چونکە ئەوکاتە تەمەنی تەنها پێنج ساڵ و نیو بوو وە خێزانی بەڕێزیشم لەگەڵ ئەوەی سکپڕیش بوو خاوەنی یەك گورچیلەیە هەستم دەکرد حاڵمان زۆر بەرەو خراپبوون دەڕۆشت چونکە تا بەرەو سەرەوە بڕۆیت لەو وڵاتەدا کەشوهەوا ساردتر دەبێت!

کارمەندە پۆلیسەکان هێندە بێ هەست و بەزەیی بوون هیچ گوێیان پێ نەدەداین ئیتر نازانم هۆکار چی بوو وا دەرگایان نەدەکردەوە دواتر زانیم کە ئەوە سیفەتێکە لەناو ناخی زۆربەیان دا هەیە کەبێ سۆز و بەزەیین و خۆپەرستی لەناو خوێنیان دا چەکەرەی کردووە ئەگەرچی بەکامێراش سەیریان دەکردین و کاتێکیش لەزەنگی دەرگاکەمان دا وەڵامیان داینەوە و خۆشمان ناساند پێیان کە ئێمە پەنابەرین و خەڵکی(هەرێمی کوردستانین)بەڵام دەرگایان لێ نەدەکردینەوە و تەواو بێ هیوایان کردین تا بەناچاری بۆ ئەوەی پەنایەك بدۆزمەوە بۆ خێزانم و مناڵەکەم کە تۆزێ گەرمیان بێتەوە و خوێنیان نەیبەستێت و ڕەق نەبینەوە لەسەرمادا ڕێڕەوێکی پلەکانەم بینی بۆ ژێر بینای بنکەی پۆلیسەکە دەڕۆشت و چووینە ئەوێ تا شوێنێکی باشترمان دەست بکەوێت ئەسمائم لەسەر شانم داگرت و خستمە باوەشم و دەستم کرد بە دەست پێداهێنان بۆ ئەوەی کەمێك گەرمی بێتەوە پاش کەمێك گوێم لەتەپەی پێی کارمەندێك بوو بەسەگێکی گەورەی پۆلیسییەوە هات دەرگاکەی کردەوە و دوای دڵنیابوون لەوەی کەوا جێی مەترسی نین بانگیان کردین کە بچینە ژوورەوە ، ئیتر سوپاس بۆ خوا






چـووینە ژوورەوە تەنها منیـان پشـکنی و کەشـفی نـاو جانتاکانیـان کـردین و هەنـدێك پرسـیار و وەڵامیـان لێکـردین کە خەڵکی کـوێین و لە کوێـوە هـاتووین و پاشـان ناویـان نووسـین و دوای ئەوەی وەڵاممـان دانەوە پەنجەمۆریـان پێکـردین دیار بـوو پۆلیسـێکیان زۆر داخ لەدڵ بـوو بەرامبەرمـان وابزانم لەخەومـان کردبـوو یەك شـوکلاتە و شـەربەتی هێنـا بۆ خـاتوو ئەسمائ و وتی ئێـوە کەسـتان بۆتـان نیە لێی بخـۆن تەنها بـۆ مناڵەکەتانە لە پـاش ئەوە پەیوەنـدیان کـرد بە بەشـی سۆشـیالەوە بـۆ ئەوەی شـوێنمان بـۆ دابـین بکرێـت لەدوای کاتژمێرێـك کارمەنـدێکی ئـافرەت لە کەمپی شـارۆچکەی(ئۆرەڤایس) ەوە کە نـــزیکەی چـــل کیلـــۆمەتر لەشاری(ڤاســـا)وە دووره و لەوێ کەمپێکـــی گەورەی پەنابەرانی لێیە هات بەدواماندا و بردینی بۆ ئەوکەمپە و لەوێ شـوێن و جێگە و ڕێگە و خانویـان پێـدراین پـاش ئەوە ناونیشـانی بینـای سۆشـیالی کەمـپەکەی پێـدراین داوای لێکردین بۆ بەیانی کاتژمێر نۆ بەدواوە سـەردانیان بکەین لەو شـوێنە تاوەکو سـەرجەم هاوکاری و ڕێنماییەکانی پەنابەری و کەمپمان بۆ ڕوون بکرێتەوە.

دوای ئەوەی کە بەیـانیەکەی ڕۆشـتم بـۆ سۆشـیال و سـەرجەم ڕێنمـایی و بابەتەکـانی تـایبەت بەپەنابەرانیـان بـۆ ڕوونکـردمەوە وتیـان ئەم کەمپە کەمپی بەردەوامیە بۆتـان و بـۆ هـیچ شـوێنێکی ترتـان نقـڵ نـاکەن تـا کارەکانتـان لێـرە یەکلایـی دەبێـتەوە لەنـاو کەمـپەکەدا کۆمەڵێکی زۆر خێزانی تێـدا بـوو کە خەڵکی وڵاتانی(چیچـان و ئۆکرانیـا و ئەفغـانی و ئێرانـی) و کـوردی باشـورو ڕۆژهەلاتیشـی لێ بـوو هەرلەوێ چەنـد خێزانێکی بەڕێزمان ناسی و پێکەوە هاتووچۆی یەکمان دەکرد و وەك کەسوکاری یەکتری وابووین بـۆیەك سـوپاس بـۆ خـوا تـا ئێسـتاش لەگەڵ هەنـدێکیان دا هەر پەیوەنـدی و هەواڵپرسینمان ماوە ژیانی کەمپ نارەحەتی و خۆشیشی تێدایە بەڵام نارەحەتییەکانی زیاترە چونکە تۆ بەویستی خۆت دانەنراویت لەو شوێن و جێیەدا و





ناشتوانیت بە ئارەزووی خۆت شوێن و جێگە بگۆڕیت یان بڕۆیتە ئەو شارەی کە تۆ ئارەزووت لێیەو مافەکانیشت سنورداره!، لە وڵاتە ئەسکەندەنافییەکانیش بەگشتی کەمپەکان دوورن لەشاری گەورەوە و لەناو دارستان و دەرەوەی ئاوەدانی کەمپەکانیان دروستکردووە بەشێوەیەك ئێمە لەنێوان دوو شاردا بووین کەهەریەکێکیان چل کیلۆمەتر لێمانەوە دووربوو مارکێت و بازاڕیش لەو شوێنەی ئێمە لەگەڵ ئەوەی سێ بۆ چوار کیلۆمەتر لێمانەوە دووربوو شت و مەکیشیان گران بوون هەرزانترین مارکێت بۆ پەنابەران کە خواردن و خواردنەوەی لێ بکڕن مارکێتی لیدڵە ئەویش تەنها لەو دوو شارە دوورە هەبوون بۆیە مانگی یەك جار بە دۆڵمشی خۆیان بە بڕە پارەیەکی کەمتر لە پاسی نەفەرات دەیانبردین بۆ شاری(ڤاسا) سێ کاتژمێر مۆڵەتیان پێ دەدایین تا ئەشیا و شتومەکی مانگێکمان بکڕیایە وە بۆ دەستخستنی گۆشتی حەڵاڵیش دوو مارکێتی شەرقی هەبوون لەو شارە بەڵام زۆر گرانجان بوون ئیتر هەندێ جار ئەو مسوڵمانە چیچانیانەی کەمپەکە دەچوون لەلادێکان دا خۆیان ئاژەڵ و مەڕیان پەیدادەکرد و بەحەڵاڵی سەریان دەبڕی و دەیانهێنا و لەناو خێزانە مسوڵمانەکاندا دەیانفرۆشتەوە وە مانگی جارێکیش کوردێکی بێ ویژدانی ڕۆژهەڵاتیش بە سەیارە کاتی موچەی مانگانە دەهات ئەشیای شەرقی بەچەند قات پێ دەفرۆشتین و ئێمەش بەناچاری لەبەر دوورەدەستی لێمان دەکڕی.

سەبارەت بە کەمپەکەش ئەگەرچی دوور بوو لەئاوەدانیەوە بەڵام خزمەتگوزاری تەواوی بۆ دابینکرابوو هەرخێزانەو خانویەکی سەربەخۆی پێدرابوو بەپێی نەفەرەکانیش گەورەیی و بچوکی دیاری دەکرا مانگانەش موچەیان پێ دەدایین و خۆمان خواردنمان ئامادە دەکرد بۆ کڕینی پۆشاك و جل و بەرگیش زیاتر لەدەستی دوو یان لەو کاتانەی کە مارکێتەکان داشکاندنیان دەکرد دەمانکڕی بەهۆی ئەوەی فنلەندا یەکێکە لە وڵاتانی ئەسکەندەنافی کاتی شەو و ڕۆژی لە هاوین و زستان دا زۆر جیاوازن






لەیەك کەبەشێوەیەکە هاوینان ڕۆژگارەکەی زۆر درێژە و تەنها یەك دووکاتژمێر شەوە، ئەویش وەك بەرەبەیان وایە کە دونیا ڕۆشنە و لەبەشی خۆرئاواشەوە زەردەی خۆر هەر دەبینرێت وە لەکاتی زستانیش دا شەوگارەکەی زیاترە و تەنها چەند کاتژمێرێك خۆر دەردەکەوێت ئەویش ئەگەر بەفر و باران نەبێت هەرچەندە لەدوای مانگی دووانزە بەدواوە لەهەندێ شوێن دا تەنها بەفر دەبارێت و باران نابینیت هەتا مانگی سێ و چوار وە لەهەندێ شوێنی بەشی سەرەوەی دا شەش مانگ شەوە و شەش مانگ ڕۆژ.
بۆ دیاریکردنی کاتەکانی ژیان لەو وڵاتەدا پێویستە بە کاتژمێر بەرنامە و پیلان دابنێیت بۆ ئیش و کارەکانت و وەك لای خۆمان نیە بەشە و ڕۆژ دیاریبکرێت هەرچەندە تا لەکەمپ دا بیت سەرقاڵی و ئیش و کارت کەمە و تەنها ڕێگەت پێدراوە کۆرسێکی دوو کاتژمێری بکەیت ئەویش هەفتەی دوو جارە و باقی کاتەکانی تر دەستبەتاڵیت و دەبێت خۆت هەوڵبدەیت بەرنامەڕێژی بکەیت تا وەك بەشێك لەو کەسانەی کە لە کەمپەکان دا زۆر ماونەتەوە و بەهۆی وەڵامنەدانەوەیان یان ڕەتکردنەوەی کەیسەکانیان توشی بێ هیوایی و نەخۆشی دەروونی بوون بێ لەوەی کە دانیشتوانی ئەو وڵاتە بەشێکی زۆری خۆشیان نەخۆشی دەروونیان هەیە بەشێوەیەك کە ڕێژەی دانیشتوانی وڵاتی(فنلەندا) پێنج ملیۆن و نیوە زیاتر لە پێنج سەد هەزاریان نەخۆشی دەروونیان هەیە و لەژێر چاودێری پزیشکی دەروونیدان. بەپێی سەرژمێری ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە کۆرسی زمان دەمانخوێند لە وانەی کلتوری ئەو وڵاتەدا وە ڕۆژانە سێ کەس خۆی دەکوژێت و ساڵانە ئەم ڕێژەیە دەگاتە سەدان کەس هۆکاری ئەم حاڵەتەش دەگەڕێتەوە بۆ تەنهایی تاکی ئەو وڵاتە و کەمی ڕێژەی دانیشتوانەکەی و نەمانی پرۆسەی هاوسەرگیری و هەڵوەشاندنەوەی ژیانی خێزانداری لەسەرووی هەمووشیەوە بێ دینی زۆرێك لەهاوڵاتیانی ئەو وڵاتە!



کە باوەڕیان بە ئاینی مەسیحیەتیش نیە و ڕۆژانەش دەیان و سەدان کەس ناویان لە کەنیسە دەسڕنەوە و داوا دەکەن کاتێك کە مردن نەبرێنە کەنیسە و لە گۆڕستانی مەسیحیش دا نەیاننێژن بەڵکو یان لاشەکەیان لە کورەی ئاگردا بسوتێنن یاخود لە تاقیگەی پزیشکی دا وانەیان لەسەر بخوێندرێت.

ئەگەرچی وڵاتی(فنلەندا) ناسراوە بە وڵاتێکی پێشکەوتوو لە ڕوانگەی سیستەمی خوێندن و سیستەمی سەرمایەداری جیهانیەوە و داهاتی تاکی ئەو وڵاتە زۆرە و بە وڵاتێکی خۆشگوزەران و دەوڵەمەند ناسراوە بەڵام لەناخەوە خەڵکەکەی دڵخۆش نین چونکە چۆن لاشە پێویستی بە خۆراکە بۆ بەرگریکردن لەمانەوەی بەجوانی ئاواش ڕۆح و دەروونی مرۆڤ پێویستی بەخۆراکی ڕۆحە کە ئەویش بە پابەندبوون بەدینداریەوە ئەو بۆشاییە ڕۆحیەت بۆ پڕدەبێتەوە و ئارامی و ئاسودەی باڵ دەکێشێت بەسەر ئەو کەسەدا بەڵام چونکە هاوڵاتیانی ئەو وڵاتە لێی دوور و بێبەشن ،چەندێك لەناو خۆشی و خۆشگوزەرانی دا ژیان بەسەربەرن هێشتا ناتوانن خۆشبەخت و بەختەوەربن و هەمیشە ئارەزوو دەکەن بەتەنهایی بژین و تێکەڵ بەکەس نەبن و گیانی خۆپەرستی و ڕق لێبونەوەشیان زۆرە بەرامبەر کەسێك کە خەڵکی ئەو وڵاتە نەبێت، لە لایەکی ترەوە کاریگەری کەشوهەوای ساردی ئەو وڵاتەیە کەوا ئەو کەسەی لەوێ ژیان بەسەر ببات بەردەوام ڕۆژانە پێویستی بە خواردنی حەپی ڤیتامین دی یە تاوەکو ئەو توانا و وزەیەی کە لە کەمی خۆرەوە بەدەستی نەهێناوە لەڕێی ئەو حەپەوە بەدەستی بهێنێتەوە بەکورتی لە ڕووکاری دەرەوەدا شێوەیەکی زۆر دڵڕفێن و جوان پیشان دەدات و کەسانێکی زۆریش کاتێك وڵاتی(فنلەندا) دەبینن ئاواتەخوازن بەهەرشێوەیەك بێت خۆیان بگەیەننە ئەو وڵاتە!، بەڵام کاتێك دەگەنە ئەوێ پاش ماوەیەك پەشیمان دەبنەوە بەتایبەتی ئەوکەسانەی کەوا وەڵامی کەیسەکانیان نەرێنیە و لە کەمپە دوورەدەست و دوور لە ئاوادانییەکان دا دەیانهێڵنەوە.






لە وەرزی هاوین دا لە دەوروبەری کەمپەکەدا هەندێ زەوی و زاری لێ بوو دانیشتوانی کەمپەکە خەریکی چاندنی تۆوی سەوزە و سەوزەوات بووین چونکە بەهۆی سەرماوە سەوزە کەمە و ئێمەش ئەو چەند مانگەی کە هاوین بوو خۆمان بە زەوی و زار و ڕاوەماسی و بێ لەوەش لەو کاتەدا هەندێ میوە پێ دەگەشت وەك سێو و ڕێواس و موستیکا و توترك دەمانهێنا و دەمانخوارد و خۆمان پێوە سەرقاڵ دەکرد و لە وەرزی زستانیش دا کاتەکانمان بە خوێندنی کۆرسی زمانی فنلەندی و وەرزشی وەك یاری ئاسن و تۆپی پێ لەناو هۆڵی داخراودا بەسەردەبرد بەهۆی دووریمان لەشار و ئاوەدانیەوە گەورە و بچوك و پیاو و ئافرەت فێری پاسکیل سواری ببووین و بە سواری پاسکیل دەڕۆشتین بۆ گەڕان و بازاڕکردن ئەگەرچی ژیان لە غەریبی و لەوێش دوور لە ئاوەدانی زۆرسەختە بەڵام سوپاس بۆ خوا لەگەڵ چەند خێزانێکی مسوڵمانی باش دا هەوڵمان دابوو کەوا هەست بەغەریبی نەکەین.

پاش ئەوەی کاتی کردنەوەی قوتابخانە نزیك بۆیەوە خاتوو ئەسمائی کچم لە تەمەنی شەش ساڵی دا لەبەشی فێربوونی زمانی فنلەندی وەرگیرا و لەوێ تا بەتەواوی فێری زمان دەبێت ئامادە دەکرێت بۆ قۆناغی سەرەتایی ئەمەش ساڵێك دەخایەنێت وردە وردە کاتی چاوپێکەوتنمان نزیك بۆیەوە لە شاری(ئۆڵۆ) کە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی وڵاتی(فنلەندا) و نزیکی سنوری وشکانیە بە وڵاتی(سوید)ەوە ئەو کاتەی ئێمەش تەنها لە دوو شاردا چاوپێکەوتن لەگەڵ پەنابەران دەکرا یەکەمیان شاری(هێلسنکی) پایتەختی ئەو وڵاتە بوو وە دووەمیان شاری(ئۆڵۆ) بوو لە سەرەتای مانگی شەشی ساڵی(٢٠١٣) کاتمان بۆ دیاری کرا و لەڕێگەی پاسەوە بلیتمان بۆبڕا و بە پێنج کاتژمێر گەشتینە ئەوشارە و یەکەم جار خێزانی بەڕێزم چاوپێکەوتنی لەگەڵ کرا و پاشان منیش چوومە ژوورەوە بەڵام ویستی خوا وابوو کاتەکەی من زۆری خایاند و تەواو بووین بەڵام دادوەرەکە فریای خوێندنەوەی چاوپێکەوتنەکە نەکەوت.






بـۆ هەفـتەی داهـاتووش پشـووی هـاوینەی دەسـتی پـێ دەکـرد بـۆیە کـاتەکەی بـۆ درێژکردمەوە بۆ(٢٠ / ٨ / ٢٠١٣) و وتی دەبێت ئەوکاتە جارێکی تریش تەنها تۆ بێیتەوە بۆ ئەوەی ئەوەی کە ماوە تەواوی بکەین و پێویست بەخێزانت ناکات چونکە ئەو تەواو بـووە پـاش ئەوەی لەو بەروارەی کەدیـاری کـرا ڕۆشـتمەوە و چـاوپێکەوتنی منـیش تەواو بوو داوایان لەمن و خێزانیشم کردبوو کە دەتانەوێت بەیەکەوە وەڵامی کەیسـەکانتان بـدرێتەوە یـان بەجیـا؟ ئـێمەش بیسـتبوومان کە یەکێـك لەخراپترین سـیفاتی وڵاتـانی ئەسـکەندەنافی هەوڵـدانە بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی ژیـانی خێزانـداری و چاویـان لەسـەر منداڵەکانی ئەو خێزانانەیە کە مسوڵمانن و خەڵکی وڵاتانی ئیسلامین ڕەتمان کردەوە کە بەجیا وەڵامـان بدرێتەوە و وتمان هەردووکمان خاوەنی یەك کەیسین و دەشمانەوێت بە یەکەوە وەڵامـان بـدرێتەوە و سـوپاس بـۆ خـوا تائیسـتاش نەیـانتوانیوە ئەو درزە دروسـتبکەن و پشـتیوان بەخـوا تـا ماویشـن نـاتوانن وەك بەشـێکی زۆر لەو خێزانـانەی کەوا بێ لەجیابونەوەی ژن و مێردەکان منداڵەکانیشیان لەدەستداوە.

لەبەرواری(٢٣ / ٨/ ٢٠١٣) خـاتوو ئیسـرائی کچـی دووەمیشـم هـاتە دونیـاوە لە نەخۆشخانەی لەدایکبوونی شاری(ڤاسا).

لە نیـوەی مـانگی یەکی سـاڵی(٢٠١٤) پۆسـتمان بـۆ هـات کەوا بـڕۆین وێـنەی ئیقـامە و پاسـپۆرت بگـرین بـۆ ئیسـراء و تەسـلیمی پۆلیسـی بکەیـن ئەوەش یاسـایەکی تـازەبوو لە سـەرەتای سـاڵی(٢٠١٣) دەرچووبـوو بۆ ئەوپەنـابەرانەی کە تـازە دەهـاتنە ئەو وڵاتە ئەو وێنانەیـان پـێ دەگیـرا تـا کاتێـك وەڵامیـان هـاتەوە ئیقامەیـان بـۆ ئامادەبکرێـت و دوانەکەوێـت و پاشـان بانـگ دەکـران بـۆ پـۆلیس و لەوێ ئیقامەکەیـان دەدانـێ بەڵام پێشتر تا جوابەکەیان بۆ نەهاتایەتەوە داوای وێنەیان لێ نەدەکرا ئێمەش لەبەر ئەوەی هی خۆمان گیرابوو پێشتر، تەنها خاتوونی تازەلەدایکبوو نەیبوو نامەیەکمان لەلایەن دادوەرەکەمانەوە بۆ هات و داوای لێکردین کەوا وێنەی ئیقامە و پاسپۆرتیش بۆ ئەو







بگرین لەگەڵ خێزانێکی تردا بەیەکەوە پۆستمان بۆهات بۆ وێنەی مناڵەکانمان کە ئەوانیش کوردی ڕۆژهەڵات بوون لای هەمان دادوەری ئێمەبوون و ماوەی پێنج ساڵ بوو لەو کەمپەدابوون و دوای چەند جارێك ڕەفزیان وەرگرتبوو لە کۆتایی دا پارێزەرەکەیان ئاگاداری کردنەوە کەوا جوابیان بۆ هاتۆتەوە و ئەوانیش تەنها ئەوە مابوو وێنە بۆ مناڵەکەیان بگرن پێکەوە بردینیان و وێنەکانمان گرتن و پاشان تەسلیمی پۆلیسمان کرد و ئەوانیش وتیان چاوەڕوانی جواب بن لەم یەك دوو مانگەدا. پاش مانگ و نیوێك ئەو ماڵە جوابەکەیان بۆ هاتەوە و ئیقامەی چوارساڵیان وەرگرت بەڵام بەداخەوە ستەمێکی گەورەیان لە ئێمە کرد و هیچ حسابێك بۆ دادگا و دادوەرەکەیان نەکرا و جوابەکەی ئێمەیان گۆڕی و لەمانگی دەی ساڵی(٢٠١٤)ە بانگیان کردین بۆ پۆلیس و پێیان وتین کەوا ڕەفزتان بۆ هاتۆتەوە بەبێ ئەوەی هیچ ڕوونکردنەوەیەك بدەن لەسەر هۆکارەکەی!، بەهەرحاڵ سوپاسی خوای گەورەمان لەسەر کرد و زانیمان هیچ شتێك بەبێ ویستی خوای گەورە ڕوونادات و کەسیش ناتوانێت زەرەر یان سوودمان پێ بگەیەنێت بەبێ ویستی خوا و ڕازیش بووین بەو بەشەی کە خوا بۆی دیاریکردووین، لەپاش ئەوەی ساڵێك و دە مانگ چاوەڕوانمان کرد ئەوجا جوابەکەشیان کردین بەڕەفز، ئێمەش دوای ئەوە داوای نقلمان کرد بۆ شارەکانی خوارتر چونکە ئەو بەشەی ئێمە زۆر سارد بوو وە نزیکەی چوارسەد و پەنجا کیلۆمەتر لە پایتەختەکەیەوە دووربووین ویستی خوای گەورەش وابوو خێزانی بەڕێزیشم دووبارە سك پڕبوو بە خاتونی بچکۆلەمان خاتوو ئایەوە زۆرینەی ئەو خێزانە باشانەشی کە لە گەڵمان بوون سوپاس بۆ خوا جوابیان وەرگرت و ڕۆشتن و ئێمە تەنها ماینەوە و زانیشمان کە ئەمە ستەمێکی گەورەیە و لە پشتی یاسا درۆینەکانیانەوە لێمان کراوە بەباشمان زانی کە نقڵ بین بۆ شوێنێکی تر، چونکە دواتر زانیمان کەوا کوردێکی ڕۆژهەڵاتی خۆفرۆش و دین فرۆش کە بۆ ئیقامە ببوو بە مەسیحی لەگەڵ بێ





ئابڕویشـی کە پەلامـاری ئـافرەتی گەنجـی دەدا دزیـش بووا!، چەنـد جـار گیرابـوو لە مارکێتەکـان لەگەڵ ژنەکەی دا بە دزی کـردنەوە! وە دووجـاریش ڕەفـزی وەرگرتبـوو لەگەڵ کەنیسـەدا دەسـتی تـێکەڵ کردبـوو لەبەرئەوەی ئـێمە پابەنـدبووین بە دینـەوە پـێکەوە قسـەی خراپیـان لەسـەرمان کردبـوو چـونکە بەردەوام کەنیسـە سـەردانی دانیشـتوانی کەمپەکەیـان دەکـرد بەنـاوی جـواب بـۆ وەرگـرتن دەیانویسـت ئەو خەڵـکە بکەن بە مەسیحی دیارە ئەوەی کە شـوێنیان دەکەوت پێشـتریش هەر مسـوڵمان نەبـوو ئەوانیش چـونکە بازاڕیـان نەمـابوو ڕقیـان لێمـان بـوو وە دژایەتیشـیان دەکـردین بەبێ ئەوەی هیچ خراپەیەکیشمان هەبووبێت بۆیان.

ئەم هەواڵەشم لەلایەن دوو گەنجی بەڕێزی دانیشتووی کەمپەکەوە پێ گەشت کە ئەو خۆفرۆشـە چووبـۆیە لایـان و پێی وتبـوون ئەگەر دەتانەوێت جـواب وەرگـرن وەکـو مـن بـڕۆن خۆتـان بکەن بە مەسیحی و دواتـریش بـڕۆن لەڕێی کەنیسـەوە شکات لەو کەسـە بکەن و بڵێن ڕێگەمـان لێ دەگرێت ببین بە مەسیحی!، ئەوانیش پشـتگیریتان دەکەن و دواتـر جـواب وەردەگـرن بەڵام ئەو گەنـجە بەڕێـزانە ئەگەرچی شـوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووەکانیـان بـوون دووربـوون لە دینـداری بەڵام بـێ سـفەت و بـێ نـمەك نەبـوون بەهـۆی ئەوەی نـانی ماڵیـان خواردبـووین تێر جوێنیـان کردبـوو وە دواتـریش هـاتن بە منیـان وت و ڕووبەڕووشـیان کـردەوە لەگەڵـم دا و شـەرمەزاریان کـرد ئەویـش لە ڕوورەشی زیـاتر هیچی تـری بـۆ نەمـایەوە هەرچەنـدە ئەو گەنـجە بەڕێـزانە وتیـان بـڕۆ شـکاتی لێ بـکە لەسـەر ئەو کـارە قێزەونەی کە کردویەتـی تـاوەکو ڕسـوابێت وە وتیـان ئێمەش شـایەتی دەدەین کە ئەو ئێمەی هانداوە بۆ ئەوکارە کە تۆمەت لەسـەر بەڕێزت دروستبکەین بەڵام من سوپاسی هەردووکیانم کرد و وتم من حەواڵەی خـوای گەورەی دەکەم و بە زەردەخەنەیەکەوە پـێم وتـن دڵنیـابن شـکاتی لێ دەکەم بەڵام لە دادگـای خـوای گەورە، چـونکە ئەو کەسـانەی ئەو پشـتی پێ بەسـتوون دەزانـن درۆدەکات! بەڵام







دیارە ئەوانیش ئێمەیان ناوێت چونکە ئەویش وەك خۆیان بێباوەڕە زیاتر پشتگیری ئەو دەکەن تاوەکو من!،لێیان گەڕێ دڵنیام کە لە دادگای خوایی هیچ شتێك ون نابێت و خۆی تۆڵەمان بۆ دەستێنێ لەو کەسانەی کەوا بەناهەق ستەمیان لێکردووین تەنها ئەوە ناخۆش بوو کەوا کاتێك تۆ بەڵگەیەکی تاوانت لەسەر نەبێت و لەژێرەوە ستەمت لێ بکرێت دواتر ئەو ڕووڕەشە چەند جارێك لەگەڵ ژنەکەی دا دەیانویست پاساو بۆ کارە قێزەونەکەیان بهێننەوە بەڵام حەواڵەی خوام کردن و گوێم بۆ نەگرتن چونکە تا ئەوکاتەشی لەو کەمپەدا بووین ڕێزمان لێگرتبوون و ڕۆژێك لە ڕۆژان خراپەیەکمان نەبووە بۆیان ئەگەرچی خەڵکێکی زۆری کەمپەکە بە خراپی باسیان دەکردن و ڕقیان لێیان بوو لەسەر کارە قێزەونەکانی بەردەوام قسەیان پێ دەوت بەڵام دیارە خوای گەورە بەڵێنی خۆیەتی کەوا بەندەکانی تاقیبکاتەوە و هەندێك دەکات بە فیتنە بۆ هەندێکی تر و پاداشتی ئارامگرانیش لای خوای گەورە ون نابێت.

پاش ئەوەی نقڵ کراین بۆ شاری(لامی) وە پارێزەرمان گۆڕی بۆ کەسێکی باشتر لەشاری(لاهتی) لەبەرواری( ١٦/ ٣/ ٢٠١٥) لەشاری(هامێن لینا)خاتوو ئایەش هاتە دونیاوە و پاش ماوەیەکی کەم دووبارە پارێزەرە تازەکەمان وتی بەداخەوە ڕەفزێکی ترتان بۆ هاتووە ئەو کاتەش کاتی لێشاوە زۆرەکەی پەنابەران بوو کە وڵاتانی ڕۆژئاوا دەرگایان بەڕووی پەنابەران دا کردەوە و وڵاتی(فنلەندا)ش بۆ یەکەم جار لەمێژووی دا سی و چوار هەزار پەنابەر ڕووی تێکرد ئیتر هاواری لێ هەستا پارتێکی ڕەگەزپەرستیش ئیش و کاری فەرمانگەی کۆچیان بەڕێوە دەبرد ناویان(فینلەندیە ڕەسەنەکان) بوو سوپاس بۆ خوا لە ماوەی ڕابردوودا ئەو پارتە دووبەرەکییان تێکەوت و هەڵوەشانەوە کاتێك لەگەڵ پارێزەرەکەم دا دانیشتین وتی بەپێی بڕیارێك کە لە ساڵی(٢٠١٤) دراوە ئەو کەسەی دوو ڕەفزی هەبێت دەتوانێت ئیقامەیەکی کاتی دوو ساڵی جۆری(B) وەربگرێت بەڵام دەبێت بە پارەی خۆتان بیکەن و پاش سێ مانگ بۆتان دێتەوە بەڵام هیچ







زەمانێکی هەبێت بۆ تازەکردنەوە و لە هەندێك مافیش بێبەش دەبن لە کۆمەکی یارمەتیەکان وەك ئیقامەی جۆری (A) نیە، ئێمەش وتمان هیچ کێشەیەکمان نیە و قەرزی بۆ دەکەین کە بە هەموومانەوە کردیە(١٦٠٠) یۆرۆ وتمان خۆ لەوە باشترە ئێمە هەر لەناو کەمپ دا چاوەڕوان بین و نەتوانم بەدوای ئیش و کارێکدا بگەڕێم و لانی کەم ماڵ و منداڵەکەم نزیك دەبێتەوە لەناو شار کەمێك دڵخۆش دەبن.
لەڕێی سۆشیالەوە فۆڕمەکانمان وەرگرت و پڕمان کردەوە و کاتمان بۆ وەرگیرا لە پۆلیس بۆ(٢٠ / ٥/ ٢٠١٥) ، پاشان چووین وێنەمان گرت و لە ڕۆژی دیاریکراو چووین بۆ پۆلیس و پارە و وێنەکانمان لێ وەرگیرا و پەنجەمۆری ئیقامەکەیان پێکردین و وتیان تا سێ مانگی تر بە پۆست بۆتان دێتەوە یان بانگتان دەکەین لە بنکەی پۆلیس دەتاندرێتێ بەڵام قەدەری خوا بوو بەسێ مانگ و نیو ئەوجا پۆستمان بۆ هات پانزە ڕۆژیش کاتەکە دواکەوت وە کاتێك چووین بەنیازی ئیقامەکان ڕۆشتین بەڵام کاتێك چووینە ئەوێ درۆیان لەگەڵدا کردین و وتیان ببورن ئێوە نەدەبوایە جارێ داوای ئەم ئیقامەیە بکەن چونکە ئێوە نزیکترن لە وەرگرتنی ئیقامەی (A) یەوە و یەك ڕەفزیشتان هەیە جارێ پەلەتان کردووە!
لەڕاستیدا توشی شۆك بووین چونکە ڕەفزی دووەمەکەشم پێ بوو کە مانگی سێ ناردبوویان و پاشانیش وتم خۆ لەمانگی سێ تا نیوەی مانگی پێنج ئێمە کاتمان بۆ دیاری کرابوو وە پارێزەر و سۆشیالیش ئاگادارتانی کردبۆیەوە و ڕەفزی دووەمەکەش ئەوەتا وە ئەگەر شمولی نەدەکردین لەوماوە زۆرەدا بۆ ئاگادارتان نەکردینەوە؟، یان بۆ کاتێك هاتین بۆ مەوعیدەکە و کاتی پارەدانەکە نەتانوت ئەمە شمولتان ناکات؟، ئیتر من زۆر توڕەبووم و داوای گەڕانەوەی پارەکەم لێکردن بەڵام وتیان پارەکەشت فەوتاوە و ئیقامەکەشت نادرێتێ بەوهۆیەوە منیش ئیمزام نەکرد و هاتمە دەرەوە لەبنکەی پۆلیس دووبارە لە پاش مانگێکی تر دیسان ڕەفزی سێیەمیش هات و وەك یاری منداڵان





خۆشیان نەیاندەزانی خەریکی چین تا ئەوەی لەکۆتاییدا پارێزەرێکم گرت لەڕێی برایەکەوە بۆی پەیا کردم کەوا قەشە بوو خوا هیدایەتی بدات زۆر بەدەم کەیسەکەمەوە ڕۆشت و زیرەکیش بوو وتی ولاتی(فنلەندا) ولاتێکی بێ دینە و نەك بۆ ئاینی ئیسلام بەڵکو بۆ ئاینی مەسیحیش خراپە وە ئەوان کاتێك ڕەفزەکان دەدەن بە تۆ هیچ بەڵگەیەکیان پێ نیە کە بتوانن بە درۆت بخەنەوە یان تۆمەتێکت لەسەربێت بەڵکو تەنها جەنگێکی دەروونیت لەگەڵ دا دەکەن و دەیانەوێت خۆت ولاتەکەیان بەجێبهێڵیت و بەناوی ئەوەی کەوا ولاتەکەت بێ شەڕ و کێشەیە بگەڕێیتەوە بۆ(هەرێمی کوردستان)، پاش ئەوەی زانیان سوپاس بۆ خوا ئەو جەنگە دەروونیانە هیچ کارێکمان لێ ناکات و هەر ئارامگرین لەسەری ئەوجا بڕیارێکی قورستریان دەرکرد کە ئەویش دەرکردنمان بوو لە خانودا و وەرگرتنەوەی سەرجەم ئەو کۆمەك و هاوکاریانە بوو کە وەك مافی سەرەتایی هەموو پەنابەرێك دەیدرێتێ لە ولاتانی ڕۆژئاوا هەر لە موچەی مانگانە تا سەردانی پزیشك و قوتابخانەی منال و ئیش و کاریش کە پێشتریش هەر نەمدەتوانی ئیش بکەم، پاش ئەوەی پۆستێکم بۆ هات لە پۆلیسەوە و وتیان ئەگەر دەتەوێت بڕۆیتەوە هەندێك پارە هاوکاریت دەکەین ئەگەریش ناڕۆیتەوە ئەوە لە بەرواری(٢ / ٥ / ٢٠١٦) بەدواوە هەموو کۆمەکی و هاوکاریەکانت لێ وەردەگیرێتەوە و گەر لەو بەروارەش نەڕۆشتبێتی دەتخەینە سەر شەقام لەگەڵ منداڵەکانت دا.

هەڵبەتە لای هەرکەسێك ئەم بابەتەم باس دەکرد باوەڕی بەشتی وا نەدەکرد هەموو ئەوانەش کە شارەزای یاسابوون بە خەڵکی شارەزا و پارێزەر و وەرگێڕەکانیش دەیانوت باش وایە ئارام بگریت و لەناو خانوەکەدا بمێنیتەوە هەرگیز شتی وا ڕوونادات لە ولاتی(فنلەندا)و نەشبووە هیچ کات منال بخرێتە سەرشەقام!، بەلام بەپێچەوانەوە ئەوان زۆر بێ منەتانە لەو بەروارەدا بەچوارکەسی ڕەگەزپەرست هاتن و کلیلەکانی





ماڵەوەیـان لـێ وەرگـرتین و سـەرجەم کەلوپەلەکانیشـیان خسـتینە سـەر شـەقام بەمناڵەکانیشـمەوە و مـافی مـرۆڤیش لەو وڵاتەدا لە گەرمەی خەودا بـوون تـا ئێسـتاش بەئاگا نەهاتوون!

ئەوەی کە پێی دڵگران بووم زیاتر وتەی ئەو خەڵکە بێ ویژدانە بوو کە بەبێ ئاگا لە حاڵ و ژیانمان هەریەکەو تۆمەتێك یان بوختانێکیان بۆ دەکردین یەکێك دەیوت دیارە کرێ خانوی نەداوە یەکێکی تر دەیوت بەخوا دیارە شتی یاساغ لەماڵیدا گیراوە یەکێکی تر هەر باوەڕی بەوە نەبوو لە وڵاتێکی وەك(فنلەندا) مناڵ بخرێتە سەر شەقام تا دەیان تۆمەتی بێ بنەمای تر کە هەموویانم حەواڵەی لای خوای گەورە کردووە، سوپاس بۆ خـوا پـاش ئـێمەش ئەو خەڵـکە نەزانە بەچـاوی خۆیـان بینیـان کەوا چـۆن دەیـان و سەدان خێزان بە سەرما و سۆڵەی زستان خێمەیان لەبەردەم پەرلەمانی ئەو وڵاتەدا هەڵـدا و زۆرینەیـان هەمـوو کـۆمەك و هاوکاریەکیـان لێ سـەندرایەوە وەکـو ئـێمە بەڵام ئێمە سەرەتابووین بۆیە خەڵکێك تۆمەتی بێ بنەمای دەدایە پاڵمان لەکاتێکدا ماوەی ئەو چەنـد سـاڵەی کە لەو وڵاتە بـووین بە دانپێـدانانی پۆلیسـیش مـن و خێزانم هـیچ شـتێکی خراپمـان لەسـەر نەبـووە لە چـاکە زیـاتر تەنهـا هۆکـاری ڕەتکـردنەوەی مـافی پەنابەرێتیمانیـان بـۆ ئەوە دەگێـڕایەوە کە ئـێمە کـوردین و دانیشـتووی(هەرێمی کوردسـتانین) هەرێمـیش لای ئەوان و زۆربەی وڵاتـانی ڕۆژئـاوا بە نـاوچەیەکی ئـارام حسابی بۆ دەکرێت و ئەو کوردەشی کە ئیقامە وەردەگرێت لەسەر ناوچەی جێ ناکۆکە یـان بەخەڵکی شـوێن و نـاوچەیەکی تـر و کەیسـی تـر جـوابی وەرگرتـووە بەو شـێوەیە خراینە سەرشـەقام و لە پاش ئەوەش هیچ کەس و لایەن و ڕێکخراوێك ئامادەنەبوون بەدەممانەوە بێن و جێیەکمان بۆ دابین بکەن.

لەپـاش دەرکردنمـان لەلایەن کۆمەڵێـك بـرا و خێزانـی بەڕێـزەوە بەدەممـانەوە هـاتن و جێگایـان بـۆ دابینکـردین خـوای گەورە پاداشـتی خێری یەك بەیەکی ئەو دڵسـۆزانە




بداتەوە بەباشترین پاداشت پاش ئەوە لەلایەن پارێزەرەکەمەوە ئاگادارکرامەوە کەوا دەتوانم بۆجاری دووەم خۆم تەسلیم بکەمەوە و لەسەر پێشنیاری برایەکی بەڕێزیش کە خێزانی خەڵکی ئەو وڵاتە بوو وە لە بەشی مناڵپارێز کاری دەکرد وتی باش وایە خۆتان تەسلیم بکەنەوە چونکە دانیشتنی ئێوە ئێستا نایاساییە و بۆی هەیە مناڵەکانتان لێ وەربگرن و بیانبەن وە مانگی ڕەمەزانیش نزیك بۆیەوە وە بتوانین ئەو مانگە پیرۆزە بەجوانی بەڕێبکەین.

بڕیارمان دا لەبەرواری(١ / ٦ / ٢٠١٦) لە شاری(لاهتی) خۆمان تەسلیم بکەینەوە، پاش خۆ تەسلیم کردنەوە ناردینیان بۆ کەمپێکی زۆر ناخۆش کە شوێنێکی سەربازی بووە پێشتر بەناوی(هێناڵە) و بەهۆی لێشاوی هاتنی پەنابەرانەوە کردبوویان بە کەمپ و بەکەڵکی خێزان نەدەهات و خەڵکێکی زۆریشی تێدا بوو بەڵام ئێمە نەچووینە ئەوێ و داوای گۆڕینی شوێنەکەمان کرد دوای چەند ڕۆژێك بێنەو بەردە نقڵی کەمپێکی تریان کردین کەناوی(تاپانیلا کۆتی)بوو ئەویش پێشتر شوێنی بەخێوکەری بەساڵاچوان بووە ، هەرچۆنێك بێت ئەوێ باشتر بوو لە کەمپە سەربازییەکە بەڵام یەك چێشتخانەی تێدابوو بۆت نەبوو لەژووری خۆت دا خواردن ئامادەبکەیت و بێ لەوەش یاسا و ڕێساکانی توندبوون پاش تەواوکردنی مانگی ڕەمەزان و تا گەشتنە جەژنی قوربانیش چەند مانگێکی خایاند بەبێ ئەوەی چاوپێکەوتنمان لەگەڵدا بکرێتەوە ڕەفزێکی نوێمان بۆهاتەوە چونکە داوایان لە خێزانم کرد کە ئایا دەیەوێت بەجیا لەگەڵ مناڵەکان وەڵام بدرێتەوە؟، ئەویش ڕەتی کردبۆیەوە لە منیان جیابکەنەوە بۆیە ئەم جارەشیان پێیان ڕاگەیاندین کەوا دەبێت تا کۆتا ڕۆژی مانگی نۆ کەمپەکە بەجێبهێڵین ئەگەر تا ئەو کاتە نەڕۆین ئەوە دووبارە سەرجەم کۆمەکی و هاوکاریەکانمان لێ وەردەگیرێتەوە و لەوێش تازە خاتوو ئەسمائی کچە گەورەم لە پۆلی سێی سەرەتایی وەرگیرابۆیەوە بەڵام دووبارە خوێندنەکەی ماوەیەکی کەمی خایاند ئێمەش ویستمان وەك جاری یەکەممان لێ




نەیەت بڕیارمان دا خۆمان سەفەربکەین و وڵاتەکەیان بۆ بەجێبهێڵین بۆ ئەو مەبەستە لەڕێی سۆشیالی کەمپەوە داوای چاوپێکەوتنی پۆلیسمان کرد لە بەرواری (١٨ / ٩ / ٢٠١٦) پاش دیاریکردنی کات خۆم و خێزانی بەڕێزم چووین بۆ چاوپێکەوتنەکە و بەکورتی سوپاسی ئەو وڵاتەمان کرد کە ماوەی چەند ساڵێکە جێیان کردوینەتەوە پاش گفتوگۆیەکی یەك کاتژمێری پێمان وتن کەوا وەك ستەمتان لێکردوین و مافتان پێ نەداوین ئێمە بڕیارمانداوە بچین بۆ وڵاتێکی تری ئەوروپا و داوامان لێ کردن کەوا نەمانگەڕێننەوە بۆ وڵاتی(فنلەندا)!

بەڵام لە وەڵامدا کارمەندی پۆلیسەکە وتی ئێوە تەنها ڕێگەیەکتان لەبەردەمدایە ئەویش گەڕانەوەیە بۆ وڵاتی خۆتان و بچن بۆ هەر وڵاتێکی تری ئەوروپی دەتانهێنینەوە بۆ ئێرە و ئەو کاتەش هاتووچۆتان سنوردار دەکەین تا دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان!، منیش بە زەردەخەنەیەکەوە وتم ئێمە ناگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمان بەڵام کاتێك تۆ بە من دەڵێی دەتانهێنینەوە بۆ ئێرە دەی من نامەوێت ئەو ئەرکە زیادەی کرێی فڕۆکە و گەڕانەوەتان بکەوێتە سەر باشتر وایە بە بڕیارەکەتاندا بچنەوە خۆ ئەگەر ئەو کاتەش بمانهێننەوە هەر دەبێت هاوکاری و شوێن و جێمان بۆ بگەڕێننەوە؟، کەچی هیچ وەڵامێکی پێ نەبوو تەنها وتی نە دەتوانین بەزۆر بتاننێرینەوە نە هیچ هاوکاریەکیشتان بۆ دەگەڕێنینەوە ، منیش وتم دەی باش بزانە وەك چۆن بەڕاستگۆیی هاتوومەتە وڵاتەکەت ئاواش بەڕاستگۆیی پێت دەڵێم کەوا (٢٢ / ٩/ ٢٠١٦) وڵاتەکەت بەڕێی نایاسایی بەجێدێڵم وە خۆم و منداڵەکانم تەسلیمی ئەو خوای گەورەیە دەکەم کە هیچ کاتێك پشت لەبەندەکانی ناکات!،

ئیتر لەگەڵ خێزانم هەستاین و بنکەی پۆلیسمان بەجێهێشت و ئەوانیش بەلایانەوە سەیر بوو کەوا ئێمە زۆر بێ منەتانە پێیان دەڵێین بەڕێی نایاسایی دەڕۆینە دەرەوە، بەڵام هیچ وەڵامێکیان پێ نەبوو بۆمان!






بەوشـێوەیە لەو بەروارەی کە ئامـاژەم پێکـرد ماڵئاواییمـان کـرد لە مامۆسـتایانی قوتابخـانەکەی خـاتوو ئەسمائـ و سۆشـیال و کارمەنـدانی کەمپەکەمـان و کلیلـی ژوورەکانمان تەسلیم کردنەوە و ئەگەرچی زۆریان پێ ناخۆش بوو بەڵام ئەوانیش هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو تەنها ئەوەندە نەبێت کە هەستی شەرمەزاریان تێدا بەدی دەکرا و بەردەوام دەیانوت: بەداخەوە لەم وڵاتە زۆرجار کەسانێك کە پێوستن مافیان پێ بدرێت ستەمیان لێ دەکرێت و بەپێچەوانەشەوە کەسانێکی خراپ کە شیاونین بمێننەوە لەم وڵاتەدا و هەمیشە سەر بەکێشەن بۆمان، مافیان پێ دەدرێت!، بەڵام دیارە ئێمە بەهۆی پابەندیمان بەدینداریەوە ئەو مافەمان پێ ڕەوانەبینرا!

لە پاش پرس و ڕا و بەدواداچوون بۆ ئەوەی بزانین چی وڵاتێك باشە و لایەنی مرۆڤ دۆستی زۆرە، گەشتینە ئەو ئەنجامەی کە بڕیارماندا بەرەو وڵاتی(ئیتاڵیا) بەڕێبکەوین و لەوێ داوای مافی پەنابەرێتی بکەین.

**بەڕێکەوتن لە وڵاتی(فنلەندا)وە بەرەو وڵاتی(ئیتاڵیا)بەڕێگەی پاس و شەمەندەفەر و کەشتی بەناو هەرسێ وڵاتی (سوید _ ئەڵمانیا _ نەمسا).**







پاش ئەوەی بۆ جاری دووەم لە وڵاتی(فنلەندا)سەرجەم کۆمەك و هاوکارییەکانمان لێ وەرگیرایەوە و جارێکی تریش کاتمان بۆ دیاریکرا بۆ چۆڵکردنی کەمپەکەمان، ئەم جارەیان پێش ئەوەی کاتەکەمان تەواو بێت، کەمپەکەش و وڵاتەکەشمان بۆ بەجێهێشتن و لە بەرواری (٢٢ / ٩/ ٢٠١٦) کاتژمێر نۆی شەو لە شاری(لاهتی)یەوە بە پاسی گەورە بەڕێکەوتین بۆ کۆتا شاری سەر سنوری وشکانی نێوان هەردوو وڵاتی(فنلەندا و سوید) کە شارێکی تێکەڵە لە دیوی وڵاتی(فنلەندا) پێیدەوترێت(تۆرنیۆ)و لەدیوی وڵاتی(سوید)یش پێی دەوترێت(هاپەراندا) تەنها پردێکی بچوك لەیەکتریان جیا دەکاتەوە،لە ڕێگە جارێك پاسمان گۆڕی و نزیکەی یانزە کاتژمێر لەناو پاسدا بووین و ئەگەرچی ئێمە تەنها تا بەشەکەی وڵاتی(فنلەندا) بلیتمان بڕیبوو بەڵام لەکاتی وەستانی پاسەکەدا نەمانزانی کەوا دەبێت دابەزین، ویستی خوای گەورە وابوو کەوا دانەبەزین هەتا چووە ناو خاکی وڵاتی(سوید)و شۆفێری پاسەکەش لەیادی چووبوو کە ئێمە تا کۆتا سنوری وڵاتی(فنلەندا) بلیتمان بڕیوە، دیارە ئەمەش یەکەم پشتیوانی خوای گەورە بوو بۆمان چونکە کاتێك سواری پاسەکە بووم سەرم بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و وتم خوای گەورە خۆت باشتر دەزانیت چۆن ستەم لەم بەندەیەت و ماڵ و منداڵەکەشی کراوە داواکارم لێت خۆت تۆڵەم بۆ بستێنە و هۆکار و ڕێنیشاندەر و پشتیوانیم بۆ بنێرە و سەبر و ئارامی و سەرکەوتنیشمان پێ ببەخشە لەم ڕێگەیەدا!

پاش دابەزینمان لە گەراجی پاسی(هاپەراندا) ڕۆشتم بلیتی شەمەندەفەر ببڕم وتیان لێرەوە تا دەگەنە شاری(لولێیا) کە ماوەکەی دوو کاتژمێر و نیو بوو دەبێت بە پاس بڕۆن و لەوێوە وێستگەی شەمەندەفەر هەیە، ئیتر خوای گەورە گەنجێکی مسوڵمانی سوری کرد بە یارمەتی دەرمان و بەبێ ئەوەی خۆشمان بچین بۆلای کە بینی ئەو هەموو جانتایەمان پێیە هات بۆ لامان و پاش سەلام و یەکترناسین وتی:





من دەڕۆم بۆ وڵاتی(ئەڵمانیا) و هاتووم یارمەتیتان بدەم، خوا خێری بنووسێت هەتا جیابوونەوەی شەمەندەفەرەکانمان لە شاری(ستۆکهۆڵم)ی پایتەخت یارمەتی داوین، پاش ئەوەی بە پاس بەڕێکەوتین بەرەو شاری(لولێیا)و گەشتینە شارەکە شارەزای وێستگەی شەمەندەفەر نەبووین و پێش دابەزین چوومە لای شۆفێری پاسەکە بۆ پرسیارکردن سەیردەکەم شۆفێرەکەش عەرەبە وتی دامەبەزن لەبەر جانتا و مناڵەکانت چونکە لێرەوە وێستگەکە دوورە با نەفەرەکان دابەزن خۆم بە پاسەکە دەتانگەیەنم، بەڕاستی دەتوانم بڵێم ئەمانە هەمووی فەزڵی خوای گەورەبوون کەوا بەبێ داخوازی خۆمان کۆمەك و یارمەتیدەری بۆ دەناردین سوپاس بۆ خوا جانتاکانمان داگرت و دوای پرسیارکردن بۆ بلیت بڕین ناونیشانی نووسینگەیەکیان پێدابن و چووین بلیتی شەمەندەفەرمان بڕی بۆ شاری(مالمۆ)ی سەر سنوری وڵاتی(دانی مارك) و دەبوایە لە شاری(ستۆکهۆڵم) شەمەندەفەرەکەمان بگۆڕین بۆ شاری(مالمۆ).

لە هەندێ وڵاتی ڕۆژئاوایی ئەگەر بە شەو سەفەربکەیت بە شەمەندەفەر ژووری نووستنی تێدایە بەڵام نرخەکەی گرانترە و ئێمەش لەبەر دووری ڕێگەکە کە دەبووایە نزیکەی بیست کاتژمێر لەناو شەمەندەفەردا بوویانە،ژوورێکی سێ سیستەمی خەومان بەکرێ گرت وکاتژمێر چوار و نیوی پاشنیوەڕۆ شەمەندەفەرەکە هات و بەڕێکەوتین بەرەو شاری (ستۆکهۆڵم)و کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی گەشتینە ئەوێ و لەوێش شەمەندەفەرەکەمان گۆڕی بۆ شاری(مالمۆ) و کاتژمێر دووانزەی نیوەڕۆش گەشتینە ئەو شارە و سوپاس بۆ خوا فریای نوێژی هەینی کەوتم و پاش نوێژەکەش نوێژی مردوومان کرد لەسەر لاشەی مسوڵمانێکی عەرەب و تا گۆڕستانیش لەگەڵی ڕۆشتین، لەوێشەوە چووینە ماڵی برایەکی بەڕێز وخۆشەویست،لەگەڵ خێزانی بەڕێزیاندا






میواندارییەکی باشیان کردین و شەو لە ماڵی ئەوان ماینەوە و بۆ سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر بەڕێکەوتین بەرەو شاری(کۆپنهاگن)ی پایتەختی وڵاتی(دانی مارك)،
لەڕێگەی شەمەندەفەرەوە کە ماوەی نیو کاتژمێر بەنێو تونێلێکدا دەڕوات و سوپاس بۆ خوا هیچ کۆنترۆڵێك نەهاتە ڕێگەمان و پردێکی هەڵواسراویش ئەو دوو وڵاتە دەبەستێتەوە بەیەکەوە کە بۆ هاتووچۆی سەیارە بەکاردەهێنرێت، لەم سەفەرەمدا برایەکی بەڕێز و خۆشەویستم ئیش و کارەکانی خۆی بەجێهێشت و هەرچەند ڕێم نەدا بەڵام بە سوێندخواردن هەتا شاری(بۆلزانۆ)ی وڵاتی(ئیتاڵیا) هاوڕێیەتی کردین.
لە شاری(کۆپنهاگن)ی پایتەختی وڵاتی(دانی مارك)ەوە بلیتمان بڕی بۆ شاری(میوشن)ی وڵاتی(ئەڵمانیا)و لە ڕێگە شەمەندەفەرەکە چووە ناو کەشتیەوە ماوەی بیست دەقە بەناو ئاودا ڕۆشتین و هەر لەوێش نوێژی نیوەڕۆ و عەسرمان پێکەوە ئەنجام دا،تا گەشتینە شاری(کیل)ی وڵاتی(ئەڵمانیا)و لەوێش سوپاس بۆ خوا،خوای گەورە پاراستینی لە کۆنترۆڵ و بەبێ کێشە گەشتین،کاتژمێر دەی شەو لە شاری(هامبۆرگ) شەمەندەفەرەکەمان گۆڕی بۆ شاری(میوشن)و لەناو شەمەندەفەرەکەدا ژوورێکی نووستنمان گرت بۆ ئەوەی مناڵەکان ماندوو نەبن و کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی گەشتینە ئەو شارە، لەوێشەوە بلیتی شەمەندەفەرمان کڕی بۆ شاری(بۆلزانۆ)ی وڵاتی(ئیتاڵیا) کە بەناو شاری(ئینسبروك)ی وڵاتی(نەمسا)دا دەڕوات و بە چوار کاتژمێر بەبێ کێشە و کۆنترۆڵ گەشتینە شاری(بۆلزانۆ) بەوشێوەیە لە بەرواری(٢٤ / ٩ / ٢٠١٦) خوای گەورە بەفەزڵ و گەورەیی خۆی گەیاندینیە ئەو شارە و وەك ئەوەی بۆ گەشتوگوزار بڕۆین پاراستینی بەبێ ئەوەی توشی بچوکترین کێشە ببین، پاش ئەوەشی گەشتینە ئەو شارە ڕۆژی یەك شەممە بوو بنکەی پۆلیس و ئەو ڕێکخراوەشی کە جێگە و ڕێی بۆ پەنابەران دابیندەکرد پێی دەوترا(کاریتاس) داخرابوون،







ئـێمەش کەسـمان نەدەناسـی لەو شـارە و لەبەر ئەوەی ئەوبـرایەش ئـیش و کـاری جێهێشـتبوو بەزۆر نـاردمەوە پـاش دۆزیـنەوەی خـواردنگەیەکی کـوردی لەڕێـی کـوردێکی بەرێـزی دانیشـتووی ئەو شـارەوە کە ڕێکخراوێکـی کـوردی هەبـوو هاوکـاری کـراین و پەیوەندی کرد بە پۆلیسەوە و پێی وتن:

خێزانێکی کورد زوبان هاتوون و دەیانەوێت خۆیان تەسلیم بکەن و ئەمڕۆش پشووە و ئەوانـیش منداڵیـان پێـیە، ئیتر ئەوانـیش وتیـان بیـانهێنن بـۆ بنکەی(خـۆبەخش)ی نـاو وێسـتگەی شـەمەندەفەر و لەوێـش لەلایەن دوو کارمەنـدەوە پێشـوازیمان لێکـرا و خـواردن و خواردنەوەیـان پێـداین و پاشـان تـا ئێـوارە لەو شـوێنە هێشـتینیانەوە و بـۆ شـەوەکەی ئوتێلێکیـان بـۆ گـرتین بەکرێ و وتیان بەیانی دەبێت بڕۆن خۆتان تەسلیمی پۆلیس بکەن و ناونیشانی ڕێکخراوی(کاریتاس)یشیان پێداین.

سـەرلەبەیانی(٢٥ / ٩ / ٢٠١٦) کاتژمێر هەشتی سـەرلەبەیانی ئوتێلەکەمان بەجێهێشت و چـووین بـۆ بنکەی(کاریتـاس) و پـاش وەرگرتنی هەنـدێ زانیـاری تاکەکەسـیمان ،کارمەنـدێك هـات لەگەڵمـان و بەتەکسـیەك بردینی بـۆ بـنکەی پـۆلیس بـۆ ئەوەی خۆمـان تەسـلیم بکەیـن چـونکە یاسـای ئەو شـارە و ئەو هەرێمە وایە تـا پـۆلیس نـاوت تۆمارنەکات ئەوان نـاتوانن ڕێ و شـوێنت بـۆ دابین بکەن و پۆلیسـیش تـا ئەو ڕێکخـراوە جێ و ڕێـت بـۆ دابین نەکات وەرتناگرێت، ئەوەش بەهـۆی زۆری پەنـابەر و شـوێنەکەش کە نـاوچەیەکی سـنوریە چەنـد بەشـێك لەو پەنـابەرانەی دەگەنە وڵاتی(ئیتاڵیـا) لەوێـوە سـەفەر دەکەن بـۆ وڵاتـانی تـری وەك(سویسـرا _ نەمسـا_ ئەڵمانیـا)،ئەگەر بشـزانن کەسـێك نایەوێـت لە(ئیتاڵیـا) خـۆی تەسـلیم بکـات ئەوە شـوێن و جـێگەی بـۆ دابـین ناکەن.

پـاش ئەوەی چـووینە بەردەم بـنکەی پـۆلیس زۆر قەرەبـاڵغ بـوو پـڕ بـوو لە پەنـابەر، هەرچۆنێـك بێـت بەهـۆی ئەو کارمەنـدە و منداڵەکـانەوە کردینیـانە ژوورەوە لەوێـش







فۆڕمیان دایە دەستمان و بۆ تۆمارکردنی هەندێ زانیاری تاکەکەسی وەك ناو و ناونیشان و خەڵکی کوێ و چی شارێکیت و زمانی دایکیت ....تاد.
پاش ئەوە گەڕاینەوە بۆ بنکەی(کاریتاس) و لەوێ یەکی کارتێکیان بۆ کردین بۆ ئەوەی بتوانین لەو خواردنگەیەی کە دابینکراوە بۆ خێزانە پەنابەرەکان بتوانین پێی بچینە ژورەوە و نانی پێ بخۆین ، چونکە سەرەتا کە دەگەیتە ئەو شارە تا ماوەی چەند مانگێك گەر خێزان بیت ئەوە دەتخەنە ئوتێلێك و لە دوو خواردنگە کە تایبەتە بە پەنابەران نیوەڕوان و ئێواران دەڕۆیت بەو کارتانە نان دەخۆیت، چونکە لەناو ئوتێلەکەدا بۆت نیە هیچ خواردنێك بخۆیت یان بیبەیتە ژوورەکەتەوە و کارمەندەکان ڕێگەت نادەن بەو شێوەیە وەرگیراین و لە ئوتێلێك بەناوی ئوتێڵ(ئەریستۆن) کە ئوتێلێکی سێ ئەستێرەیی بوو ژوورێکیان بۆ دابینکردین ڕۆژانەش بۆ ژەمی نیوەڕوان پێکەوە لەگەڵ مناڵەکان دەڕۆشتین بۆ چێشتخانەکە بۆ نانخواردن و ئێوارانیش خۆم بەتەنها دەڕۆشتم خواردنەکەم وەردەگرت لەبەر ئەوەی مناڵەکان ماندوو نەبن ئیتر بەنهێنی دەمبردە ژوورەوە و دەمانخوارد.
بەهۆی ئەوەی پەنابەرێکی زۆر لە وڵاتانی ئەسکەندەنافیەوە کە وەك ئێمە ڕەفزیان وەرگرتبوو ڕوویان کردبۆیە وڵاتی(ئیتاڵیا)و بەتایبەتیش شاری(بۆلزانۆ) دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆیەوە کەوا چیتر ڕێکخراوی(کاریتاس) نامێنێت و ئەو پەنابەرانەشی لە ئوتێلدان دەردەکرێن چونکە لە دوورەوە باسی ئەو شارە بەشێوەیەکە کەوا بە باشترین هەرێمی ئەو وڵاتە ئاماژەی بۆکراوە بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەنی خێزان و مناڵن و زۆرینەیان ڕوودەکەنە ئەوێ چونکە دوای ئیقامە وەرگرتن سۆشیال و خانوت بۆ دابیندەکرێت و وەك هەرێم و شارەکانی بەشی خوارووی ئەو وڵاتە نیە کەوا دوای ئیقامە تەنها ماوەی شەش مانگ هاوکاری و کۆمەکی پەنابەرەکە دەکات و دواتر هەموو شتێکی لێ دەستێنێتەوە و داوای لێ دەکات خۆی کرێی خانوو وە بژێوی ژیانی دابین بکات







بەڵام لەڕاستیدا ئەو شارەش بۆ ڕابردوو بووە نەك ئێستا لە ئێستادا یاسا و ڕێساکانی زۆر توندبوون و ژیانی تێدا زۆر سەخت بووە بۆ ئەوانەشی کە لە ڕابردوودا ئیقامە و ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتەشیان وەرگرتووە چی جای ئەوانەی کەوا تازە دەڕۆنە ئەویٚ!
پاش ئەوەی خاوەن ئوتێلەکان بەشێك لە خێزانەکانیان ئاگادارکردەوە کەوا دەبێت ئوتێل بەجێبهێڵن و بنکەی(کاریتاس)یش داخرا بۆ چەند ڕۆژێك لەبەردەم بینای پارێزگای ئەو شارە خۆپیشاندانێك سازکرا لەلایەن پەنابەرەکانەوە بۆ ئەوەی شوێن و جێگایان بۆ دابینبکرێت بەڵام ئێمە بەشداریمان نەکرد.
پاش ئەنجامدانی نوێژی ئیستیخارە لەسەر پێشنیاری برادەرێکی کورد بەڕێکەوتین بۆ شارێکی تری ئەو وڵاتە بەناوی(فۆرلی) کە نزیکەی چوار بۆ پێنج کاتژمێر دوورە لە شاری(بۆلزانۆ)وە و منیش بۆیە بیرم کردەوە بڕۆم چونکە لە بەرواری (٣ /١٠ /٢٠١٦) کاتی پەنجەمۆرمان بۆ دیاریکرابوو وتم ئەگەر لەویٚ وەرگیرام ئەوە نایەمەوە ئێرە و گەر وەریشنەگیراین ئەوە بەپەلە دەگەڕێینەوە تاوەکو فریای کاتی پەنجەمۆرەکەمان بکەوین یاسای ئەو وڵاتەش وایە لەهەر هەرێمێك پەنجەمۆربکەیت دواتر ناتوانیت بڕۆیت بۆ هیچ شوێنێکی تر منیش کە حاڵی شاری(بۆلزانۆ)م بینی زانیم بەوشێوەیە ژیان ناچێ بەڕێوە کە نەتوانرێت کەمترین مافی پەنابەری لە ڕۆژئاوا دابینکردنی  شوێن و جێگەیە بەڵام ئەگەر بەوشێوەیە بێت باشترە بڕۆینە شارێکی تر.
پاش ئەوەی سەرلەبەیانیەکەی بەڕێکەوتین چووینە شاری(بۆلۆنیا)و لەوێشەوە شەمەندەفەرمان گۆڕی بۆ شاری(فۆرلی) بەڵام قەدەرەن درەنگ گەشتین و شەمەندەفەرەکەی خۆمان بەجێهێشتین ئیتر تا کاتژمێرێك ڕاوەستاین و دانەیەکی تر هات  بەڵام پێشتر پێیان وتبووین ئاگاداربن لەو شارانەی خوارەوە وێستگەکانی شەمەندەفەر پڕن لە دز و بەناوی هاوکاریەوە کاتێك بەخۆت دەزانی جانتا و پارە و شت و مەکەکانت دزراون  جا ئێمەش کە گەشتین تەماشام کرد چوار نەفەر هاتن بۆ لامان







بەپێکەنینەوە وتیان هاوکاریتان بکەین وتم ناوەڵا هیچمان پێ نیە تابیبەن چونکە پەنابەری تازەین ئیتر پێکەنین و ڕۆشتن پاش ئەوەی گەشتینە ئەو شارە خوای گەورە خوشکێکی خەڵکی وڵاتی(مەغریبی) کرد بە ڕێنیشاندەرمان بردینی بۆ بنکەی(کاریتاس) و کارمەندێك هات بۆلامان و وتی ناتوانین وەریانگرین تا لە پۆلیس ناویان تۆمارنەکرێت ئیتر بردینی بۆ بنکەی(پۆلیس) ئێمەش پێش گەشتنمان زۆر داوامان لێکرد ئیتر نەیەتە پێشەوە بۆ ئەوەی توشی کێشە نەبێت سوێندی خوارد تا ناو بنکەکەش هات لەگەڵمان و بەپۆلیسی وت لە وێستگەی شەمەندەفەر بینیومن پاش ئەوە ماڵئاوایی لێکردین و دوعای خێرمان زۆر بۆ کرد کە چووینە ژوورەوە سەیردەکەین ئەوێش پڕە لە پەنابەر و تا پاشنیوەڕۆ دایاننایین و دواتر بەڕێوەبەری بنکەی پۆلیسەکە هاتە لامان و پاش هەندێ پرسیار و وەڵام وتی: داوای لێبوردن دەکەین شوێنمان بۆ دابینناکرێت بۆتان هەموو شوێنەکان گیراون ، یان بڕۆن بۆ شارێکی تر یان ئەمشەو شوێنێك بۆ خۆتان پەیدابکەن و بەیانی وەرنەوە بەڵکو شوێنێکتان بۆ دابینبکەین منیش وتم ببورە خۆ ئێمە هیچ ئەوراقێکی فەرمی ئەم وڵاتەمان پێ نیە تا بتوانین بچینە ئوتێلێك یان شوێنێك وتی دەتوانن بڕۆن لە وێستگەی شەمەندەفەر بخەون تا سبەینێ! منیش لەگەڵ وای وت بەخێزانم و مناڵەکانم وت وەڵا باوکم ڕەحمەت لە کفن دز هەتا ئوتێلەکەی تریشمان لەدەستنەچووە با خێرا فریابکەوین و بڕۆینەوە نەوەك کاتی پەنجەمۆرەکەشمان بەسەر بچێت بۆ سبەینێ بەپەلە خۆمان گەیاندەوە وێستگەی شەمەندەفەر و سوپاس بۆ خوا فریای کۆتا بلیت کەوتین بۆ شاری(بۆلزانۆ)و بۆ شەوەکەی گەشتینەوە ئەو شارە.

پاش گەشتنەوە ئوتێلەکە سەیرم کرد هەموو خێزانەکان ئاگادارکراونەتەوە کەوا دەبێت بەیانی ژوورەکان چۆڵ بکەن ، بۆ ئەو مەبەستە چوومە لای کارمەندی پرسگەی ئوتێلەکە و پرسیارم لێکرد کە ئایا ئەو هەواڵە بۆ منیشە؟ کە سەیری دەفتەری







ناوەکانی کرد، وتی نا بۆ تۆ بۆ دوو هەفتە تازەکراوەتەوە، باوەڕتان بێت ئەم شتانە هەمووی لە فەزڵی خوای گەورەوە بوو بۆمان و خەڵکەکەش بەلایانەوە سەیر بوو کە تەنها بۆ ئێمە ئوتێل تازەکراوەتەوە ، ئەوانیشیان برد بۆ هۆڵێکی گەورە هەتا سێ ڕۆژ بەتێکەڵی دایاننابوون لەوێ ، تاوەکو دووبارە بنکەی(کاریتاس) کرایەوە و شوێنیان بۆ دابینکرایەوە و هەموویان گەڕێنرانەوە بۆ ئوتێلەکان ڕێگەی نێوان ئوتێلەکەمان و خواردنگەکە زۆر دوور بوو دەبوایە نیوکاتژمێر بۆ چل دەقە بەپێ بڕۆشتینایە هەموو ڕۆژێك وە لەبەر ئەوەی متمانەمان نەبوو بە حەلاڵی گۆشتەکەی تەنها ئەو خواردنانەمان دەخوارد کە گۆشتی تێدا نەبوو ئەویش مناڵەکان نەیاندەخوارد، تا دواتر وەرەقەی فەرمی مەرکەزێکی ئیسلامیان بۆ هێنایین.بەهۆی گۆڕینی کەشوهەوا و ماندوویێتی مناڵەکان توشی نەخۆشی و ڕشانەوەیەکی زۆر خراپ بوون لەو شارەش تا نەچیتە سەر کەمپ یان شوێنت بۆ دابیننەکرێ لە دوای ئوتێل پارەت نادەنێ مانگانە وە بەهۆی ئەوەی شارێکی گەشتوگوزاریش بوو ئەشیا و شت و مەکەکانی زۆرگران بوون!

تا خوای گەورە کردی لە کاتی چوونمان بۆ خواردنی نیوەڕوان خێزانێکی کوردی بەڕێزی دیندارمان ناسی ئیقامەیان هەبوو لەو شارە دەژیان کاتێك حاڵ و گوزەرانیان بینین خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە هەتا ئەو ڕۆژەی کە ئە وڵاتەشمان بەجێهێشتووە بەدەممانەوە بوون و ئیتر ڕێگەیان نەدەدا بڕۆینە ئەو چێشتخانەیە بۆ خواردن لەگەڵ ئەوەی باری دارایی خۆشیان باش نەبوو بەردەوام خواردنیان بۆ دەکردین و ئێمەش ئەگەرچی زیاتر شەممە و یەك شەممان دەچووین تا نەبینە ئەرك لەسەریان بەڵام ئەوان زیاتر پێداگریان دەکرد بۆ ڕۆشتنمان تا ئەوەی گەر نەچووینایە ئەوە بە پاسکیل خواردنەکەی بۆ دەهێنایین ئیتر پاسکیلێکی دا بەخۆم و ئێواران خۆم دەچووم تا ئەرکەکەیان زیاتر نەبێت سوپاس بۆ خوا پاش ناسینی ئەو خێزانە باشە کەمێك







هاتینەوە سەرخۆ و هەناسەیەکمان بەبەردا هاتەوە پاش ئەوەی پەنجەمۆرمان پێکرا ماوەی دوو مانگ لە ئوتێل(ئەریستۆن) ماینەوە و گەشتینە مانگی دووانزە و دووبارە خاوەن ئوتێلەکان کەوتنە ئێزندانی نەفەرەکان!

چونکە ئیتر سەری ساڵ نزیك دەبۆیەوە و خەڵکانێکی زۆر بۆ گەشتوگوزار دەهاتنە ئەو شارە و پارەی کرێ ئوتێلەکانیش زیاتر گران دەبوون کە جاری وا هەبووە بەگرانیش ئوتێل دەستنەکەوتووە لەکاتی بۆنە و پشووەکاندا، دوای ئەوەی ئیزن دراین، لەناو سەنتەری شاردا لە ئوتێلێکی تر شوێنمان بۆ دابینکرا کە ناوی ئوتێل(کاپێلۆ)بوو خراینە شوێنی کۆمەڵێك لەو خێزانانەی کە پێش ئێمە هاتبوون و ئەوان نقڵی کەمپێکی خراپی تێکەڵ و ناخۆش کران کە بە پەردە نێوانیان بۆ دروستکرابوو وە تەوالێت و حەمامیشیان تێکەڵ بوو بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەم جارەش خوای گەورە بەتەنها ئێمەی پاراست و بەر ئەو کەمپە نەکەوتین و لەو ئوتێلە دوو ژووریان پێدراین کە لەسەر یەك بوو وە باشییەکی تریشی ئەوە بوو کە نزیك بوو لە بازاڕ و شوێنی خواردنەکە و لەوێوە بە پێنج دەقە دەگەشتین و کەمێك ئەرکی سەرشانی ماڵی ئەو برا و خوشکە بەڕێزەمان کەم کردەوە و ئیتر هەفتەی ڕۆژێك دەچووینە ماڵیان.

پاش ئەوەی وەرەقەمان بۆکرا کە پێی دەوترێت(سجوڕنۆ) سەرەتا بۆ سێ مانگە وە تا پەنجەمۆری وڵاتێکی تری ئەوروپیشت لەسەر بێت لەسەری دەنووسرێت(دوبلین) واتە پەنجەمۆری نەشکاوە، هێشتا یەکەم دانەمان بەسەرنەچووبوو،لە بەرواری(٥ / ١٢ / ٢٠١٦) ئاگادارکراینەوە لەلایەن پۆلیسەوە کەوا وڵاتی(فنلەندا) پاش سێ ڕۆژ لە ناردنی ئیمەیڵ بۆیان داوایان کردونەتەوە و ئەگەر تا بەرواری(٥ / ٦ / ٢٠١٧) نەتاننێرینەوە ئەوە پەنجەمۆرەکەتان لەسەر لادەچێت و چاوەڕوانی دادگا بکەن بۆ وەرگرتنی چاوپێکەوتن و ئیقامە ئێمەش لەو باوەڕەدا نەبووین هەرگیز کەوا بماننێرنەوە چونکە زۆرینەی ئەو خەڵکە پەنجەمۆری هەبووە و پاش شەش مانگ لەسەریان لاچووە و







نەشیانناردونەتەوە و هەر هەمووشیان یان وەڵام و مۆڵەتی مانەوەی پێنج ساڵی سیاسی یان مۆڵەت و مانەوەی پێنج ساڵی ئینسانییان وەرگرتووە!

تەنانەت لەم دواییەشدا ئەوانەی کە کەیسیان هەرێمی کوردستانیش بووە هەر مۆڵەتی مانەوەی دوو ساڵیی یان داونەتێ، بەهۆی ئەوەی موچەی مانگانەیان نەدەداینێ و ماوەی حەوت مانگ و نیویشە چاوەڕێین لە ئوتێل و پەنجەمۆریش لانەچووە لەسەرمان و منداڵەکانیش تەواو ناڕەحەت ببوون و خواردنی ئەو شوێنەیان نەدەخوارد یان زۆربەی جار بەهۆی زۆری پەنابەرەوە خواردن نەدەما زەختمان خستە سەر بنکەی(کاریتاس) و داوامان لێکردن شوێنمان بۆ دابینبکەن و نقڵمان بکەن بۆ شاری(میرانۆ) کە بیست و پێنج دەقە لە شاری(بۆلزانۆ)وە دوورە و وەك ئەوەی بیستبوومان باشترین کەمپ کە لەو وڵاتە بێت ئەو کەمپەیە ئەگەرچی چەند خێزانێك لەناو بینایەکدایە و چێشتخانە و هەندێ جاریش بۆ خێزانی کەم وەك ئەوەی ژن و مێردێك بن یان منداڵێکیان هەبێت ، ئەوە تەوالێت و حەمامیان تێکەڵە بەڵام ئەوەی باش بوو موچەیەکت هەبوو خۆت خواردنت دروست دەکرد.

سوپاس بۆ خوا لەلایەن کارمەندێکی(کاریتاس)ەوە زۆر هاوکاریمان کرا و بۆ بەرواری (٥ / ٥ / ٢٠١٧) نقڵ کراین بۆ شاری(میرانۆ)و لە نهۆمی ژێرەوەی شوقەکەدا کە پێکهاتبوو لە چوار ژوور و دوو تەوالێت و حەمام و چێشتخانەیەك، لەگەڵ دوو خێزانی تردا کە ئەوان یەکی ژوورێکیان پێ درابوو و تەوالێت و حەمامیان پێکەوە بوو وە ئێمەش دوو ژوور و تەوالێت و حەمامی خۆمانیان بەسەربەخۆیی پێداین بۆ یەکەم جار موچەیان پێداین بەڵام ویستی خوا وابوو لەبەرواری(٢٢ / ٥ / ٢٠١٧) پۆستێکمان بۆ هات لە پۆلیسەوە و کاتێك چووم بۆ پۆلیس ئاگاداری کردمەوە کەوا وڵاتی(فنلەندا) داوای کردونەتەوە و وتی بۆ شەوی (٢٥ / ٥ / ٢٠١٧) کاتژمێر پێنجی سەرلەبەیانی دەبێت ئامادەبن و پۆلیس دێت بەدواتاندا و دەتانبات بۆ فڕۆکەخانەی(میلانۆ) کە نزیکەی




پێنج کاتژمێر لەو شارەوە دووره و کاتژمێر یانزه و نیوی سەرلەبەیانی سواری فڕۆکه دەکرێن و دەتاننێرینەوە بۆ ئەو وڵاتە،
لەڕاستیدا منیش گاڵتەم بە هەواڵەکە دەهات تا ئەوەی ڕۆژێك پێش کاتەکە لە بنکەی(کاریتاس)ەوە لەلایەن ئەو ئافرەتە باشەی کە زۆر هاوکاری دەکردین بانگیان کردین و بە ئامادەبوونی دووپۆلیس واژۆمان پێکرا کە دەبێت لەکاتی دیاریکراودا ئامادەبین و هەرچەنده ئەو ئافرەتە زۆر عاتفی بوو زۆر گریا و داوای کرد لە پۆلیسەکان نەمانێرنەوە بەڵام ئەوانیش وتیان باوەڕتان بێت ئێمە وەك(ئیتاڵیا) لە مانگی دووانزەوە حسابمان بۆ وڵاتی(فنلەندا) نەکردووە کە داوای ئەم خێزانەی کردۆتەوە تەنها دە ڕۆژی ماوە پەنجەمۆرەکەشیان لەسەر لاچێت بەڵام ئەوان لەڕێی(دوبلین)ەوە شکاتیان لێکردووین و وتویانە لەوکاتەوە داوامان کردوونەتەوە تا ئێستا نەیانناردوونەتەوە بۆمان وە تەنانەت بلیتی خۆشیان ناردووە و ئەو فڕۆکەیەشی کە ئەمانی پێ دەڕۆنەوە فڕۆکەی نەفەرهەڵگری وڵاتی(فنلەندا)یە منیش بەپێکەنینەوە وتم باشە گەر خۆمان بشارینەوە و نەڕۆین چی دەبێت؟ وتیان یاسای دوبلین وایە گەر لەپێش ئەو شەش مانگە ئەگەر بێت و داوا بکرێیتەوە و خۆت بشاریتەوە و نەڕۆیتەوە، تا دووانزه مانگی ترت بۆ تازە دەکرێتەوە!
منیش سوپاسی هەموو هاوکاری و یارمەتیەکیانم کرد بەڵام کارمەندە ئافرەتەکەی(کاریتاس) هەر هەوڵی دەدا ڕێگەیەك بدۆزێتەوە تا سنورداشەکەمان ڕاگرێت تا ئەوەی بەچاوی خۆم بینیم نامەی نارد بۆ بەشی(پۆلیس)ی وڵاتی(فنلەندا) قسەی پێ وتن و بۆی نووسین باشە ئێوەی بەناو وڵاتی دیموکراتی و مافی مرۆڤ وەك ئەم خێزانەتان دەربەدەرکردووە بۆچی داوایان دەکەنەوە ئایا جوابیان دەدەنێ یان بەنیازن چیان لێ بکەن؟، بەڵام دواتر کە وەڵامیان دابۆیەوە وتبوویان ئەوە ئیشی ئێمە نیە و نازانین فەرمانگەی کۆچ چی بڕیارێکیان لەسەر دەدات ئەو زیاتر خەمی ئەوەی



بوو لە(فنلەندا) بخرێینە کەمپی داخراو و سنورداش بکرێینەوە چونکە لەدوای ئێمە یاسا و ڕێساکانی ئەو وڵاتە زۆر خراپ ببوون کەمپی داخراو دانرابوو بۆ پەنابەران، دوای دەرکردن و ڕەفز پەنابەرەکانیان دەستبەسەر دەکرد و چەند جارێکیش پەنابەریان بەوشێوەیە سنورداش کردۆتەوە بەهەرحاڵ ئێمەش سوپاسی خوای گەورەمان لەسەرکرد و ماڵئاوایمان کرد لە بەڕێوەبەر و کارمەندەکانی ڕێکخراوی(کاریتاس) چونکە زۆر باش بوون لەگەڵمان وە ئەوانیش زۆریان خۆش دەویستین لەبەر ئەوەی هیچ کێشەیەکمان بۆ دروستنەدەکردن و بەڕێکوپێکیش ئەو ئەرکانەی دیاریکرابوون بۆمان وەك پاککردنەوە و خوێندنی کۆرسی زمان ، هەندێ جاریش ئیش و کاری خۆبەخش لەناو کەمپەکە و دەرەوەی کەمپ وەك هاوکاری و وەرگێڕی بۆ کەسێك لە ئۆفیس و نەخۆشخانەدا و کێشە دروستنەکردن لەناو کەمپەکەدا.

پاش ئەوەی گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە چەند هاوڕێیەکی خێزانم کە لە بەشی خێرخوازیدا کاریان دەکرد و بەردەوام لەگەڵ خێزانم دا پەیوەندیان هەبوو هاتن بۆ ماڵئاوایی کردن لێمان و زۆر بێتاقەت و دڵتەنگ بوون پاش ئەوان دەستمان کرد بە کۆکردنەوەی جانتا و پۆشاکەکانمان و خۆمان ئامادەکرد کە کاتژمێر پێنجی سەلەبەیانی ئەو کاتەی بۆمان دیاریکراوە لەبەردەم کەمپەکەدا ئامادەبین و پەیوەندیشم کرد بە برایەکەوە کە سەیارەی هەبوو لە وڵاتی(فنلەندا) کە سبەینێ بێت بەدوامانداا بەڵام چونکە ویستی خوا لەسەر نەگەڕانەوەمان بوو کاتژمێر دووانزەی شەو لەلایەن دوو کارمەندی بنکەی(کاریتاس)ەوە داوامان لێکرا بچین بۆ شوێنێکی دەرەوی کەمپەکە تا بمانبینن، ئێمەش وامانزانی بۆ ماڵئاوایی کردنە کەچی وتیان دەبێت کاتژمێر دووی شەو لە کەمپ بڕۆن بەڕاستی ئێمەش توشی شۆك و سەرسوڕمان بووین و سەرەتا من زۆر ئینکاریم کرد و وتم ببورن من کاری واناکەم ئەی دواتر چی؟ من خاوەنی سێ مناڵم و دوای







حەوت بۆ هەشت مانگ تازە لە کەمپێکدا شوێنمان بۆ دیاریکراوە ئێستا دووبارە بۆ کوێ بڕۆین و خۆتان حاڵی پەنابەر لە من باشتر دەبینن لێرە؟
کە چەند سەختە دابینکردنی شوێن و جێگە بۆیان؟،بەڵام دانەیەکیان زۆر پێداگری کرد و بەدڵی پڕەوە وتی ڕەنجدەر تکات لێدەکەم ئێوە خێزانێکی زۆر باشن و بەقسەم بکە و ئێمە بەم کاتە هاتووین بۆڵاتان تەنها خەمی ئێوەمانە و دەترسین ئەو وڵاتە سنورداشتان بکاتەوە وە ئەم وڵاتە کەسانی وەك ئێوەی دەوێت ئێوە ئەمشەو بڕۆن و تەلەفونیشتان داخەن تا کاتێك فڕۆکەکەتان دەڕوات دڵنیابە بە ماوەیەکی کەم پەنجەمۆرەکەتان لادەچێت و شوێنەکەشتان نافەوتێت و دوای ڕۆشتنی فڕۆکەکە دێنەوە شوێنی خۆتان!
جێگەی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەم کەوا بەڕاستی وڵاتی(ئیتاڵیا) زۆرێك لە خەڵکەکەی و ئەو ڕێکخراوانەشی کە هاوکاری و یارمەتی پەنابەران دەکەن زۆر مرۆڤدۆستن و زۆر هاوکاری و یارمەتیت دەدەن و دژ بەو کەسانەشن کەوا ڕەگەزپەرست و دژی پەنابەرن، بەتایبەتی ئەگەر بێت و بزانن کەوا تۆ کەسێکی باش و چاکیت و هیچ کارێکی هەڵە و سەرپێچیەکت نیە سوێند بەخوا هیچ ئازایەتیەکی ئێمە نەبووە ئەوە تەنها لە فەزڵ و گەورەیی خوای گەورەوەیە کەوا خەڵکانێکی ئەوروپی بۆ موسەخەر کردبووین!
پاش پرس و ڕا لەگەڵ خێزانی بەڕێزم دوو ڕکات نوێژی ئیستیخارەم ئەنجامدا و پاشان لە پەنجەرەی نهۆمی خوارەی کەمپەکەوە کە لەسەر پارکێکی یاری مناڵان بوو بەنهێنی چووینە دەرەوە چونکە کەمپەکە کامێرای چاودێری و پاسەوانی هەبوو وە یاسایەکی توند هەبوو بۆ سەرجەم کەمپەکانی ئەو هەرێمە و بگرە لە شوێنەکانی تری ئەو وڵاتەش پەیڕەودەکرێت ئەویش ئەوەبوو کە لەدوای کاتژمێر یانزەی شەوەوە کەس بۆی نەبوو بچێتە دەرەوە تا کاتژمێر شەش و نیوی بەیانی تەنها بۆ سێ حاڵەت کە بریتی بوون لە ئیشی سپی و نەخۆشخانە و چاوپێکەوتنی فەرمانگەی کۆچ،ئەویش بە





وەرەقەی فەرمی، بەڕاستی ئەوەش یاسایەکی توندی ئەو وڵاتە بوو بۆ کەمکردنەوەی شەڕ و دزیکردن چونکە پەنابەری زۆر لێ بوو!
بەتایبەتی ئەو پەنابەرانەی خەڵکی قارەی ئەفریقابوون شەڕ و دزیان زۆردەکرد، بەهەرحاڵ پاش خوێندنی زیکر و ویردەکان بەڕێکەوتین و ئەو شارەش دەوری بەشاخ و چیا و باخات گیراوە و بەپێ بەڕێکەوتین بۆ پارکێکی گەورەی دەرەوەی شارەکە بەناوی(شێنێ)مۆبایلەکانمان داخست هەتا کاتژمێر دووانزەی نیوەڕۆ تا کاتی فڕۆکەکە بەسەرچوو مۆبایلەکانمان هەڵنەکردەوە پاش ئەوەی کە نەڕۆشتین خێزانم پەیوەندی کرد بە خێزانی یەکێك لە دراوسێکانمان کە خەڵکی وڵاتی(سۆماڵ)بوون وتیان ئەم شەو پۆلیس هاتووە نیو کاتژمێریش ئەم دەورە گەڕاون بە دواتان دا و تەسویری ژوورەکەیان کردوون و دواتر ڕۆشتوون لەدوای ئەو پەیوەندیە منیش پەیوەندیم کردەوە بەبنکەی(کاریتاس) و ئاگادارم کردنەوە کە نەڕۆشتووین و ناشمانەوێ بڕۆینەوە گەر وڵاتی(فنلەندا) ڕاست دەکات و داوامان دەکاتەوە با بەڵێنی ئەوەمان پێ بدا کە مۆڵەتی مانەوەمان پێ دەدات وە وتم ئەگەریش بەڕێزیشتان هیچتان پێ ناکرێت و ناتوانن شوێنەکەمان بۆ بگەڕێننەوە ئەوە خۆمان دەڕۆین بۆ وڵاتێکی تر لێرەوە خوا هیدایەتیان بدات خێرا پەیوەندیان کرد بە کەمپەکەمانەوە و بەڕێوەبەری کەمپەکەمان پەیوەندی پێوەکردم وتی با مناڵەکان سەرمایان نەبێت وەرنەوە شوێنی خۆتان دڵنیابن پۆلیس ئاگادارناکەینەوە تا چارەسەری کێشەکەتان نەکەین!، هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم کەوا کەسانێکی ئەوروپی ئاوا خۆیان بخەنە مەترسیەوە لەپێناوی پەنابەردا ئەگەر خوا خۆی دڵی نەرم نەکردبێتن!
بەهەرحاڵ ئەوەی ئەوانە کردویانە بۆمان تەنها فەزڵی خوای گەورە بووە کە ئەگەر ئێمە لەیادی نەکەین ئەوە هەرگیز ئەویش لەیادمان ناکات، سوێند بەخوا کەسی وات بۆ دەکاتە قەڵا و پشت و پەنا هەرگیز بە خەیاڵی هیچ کەسێك دا نەهاتووە سوپاس بۆ






خـوا گەڕایـنەوە بـۆ نـاو کەمـپەکە و سێ ڕۆژ پـۆلیس پەیوەنـدی دەکـرد بەکارمەنـد و بەڕێوەبەری کەمپەکەوە بۆ هەواڵی ئێمە ئەوانیش قسەیان پێ دەوتن و دەیانوت:
چـۆن ڕێ دەدەن مـاڵ و منـاڵ لە پـارك و سـەرشـەقام دا بخـەوێـت؟ تـا ئەوەی دوای دوو ڕۆژ لە بـــنکەی پۆلیســـەوە پەیوەنـــدی کـــرا بە کەمـــپەکەوە و داوایـــان لێکـــردن کە پەیوەنـدیمان پێـوەبکەن و بگەڕێینـەوە بۆ نـاو کەمپ و هیچ ترسێکمان نەبێـت و وتیـان سنورداشیان ناکەینەوە لەکاتێکدا ئێمە لەناو کەمپیش دابووین و نەیاندەزانی!
پـاش ئەوە پۆسـتێکمان بـۆ هـات دووبـارە چـووینەوە بـۆ بـنکەی پـۆلیس و پەنجەمۆریـان کـردینەوە و ئیتر ژیانی ئاساییمان لە وڵاتی(ئیتاڵیا) دەستپێکرد و خـاتوو ئەسـمائی کچم سوپاس بۆ خوا بەساڵ و نیوێك قوتابخانەی سـەرەتایی تەواوکرد و سـاڵی(٢٠١٩) چووە پـۆلی یەکی ناوەنـدی وە دووخـاتونە بچـوکەکەی تریشـم لە بـاخچە وەرگیـران و خـۆم و خێزانـی بەڕیزیشـم دەسـتمانکرد بە خوێنـدنی کۆرسـی زمـانی ئیتـاڵی ، پاشـان چەنـد کۆرسـێکی فێربـوونی ئیشـم خوێنـد و بڕوانامەشـم وەرگـرت لەسـەریان وەك کۆرسـی چـۆنیەتی ئیشـکردن و سـێو لێکـردنەوە و کۆرسـێکی گـرنگیش کەوا پێکهـاتبوو لە کۆمەڵێك ئیشی وەك میکانیکی و بیرکاری و دارتاشی و کۆمپیـوتەر و بەرگـدروو و وێنە کێشـان و ڕێککردنی کەل و پەل بۆیاخ کردن کە سوپاس بۆ خوا پلەی نایاب و یەکەمم بەدەستهێنا و لەلایەن پارێزگاری شـاری(بۆلزانۆ)وە پیرزۆباییمـان لێکـرا لەگەڵ پۆلێـك هاوڕێی تردا وە پاش ساڵێك لەلایەن برایەکەوە ئیشێکی سپی بۆ پەیاکردم هەفتەی دوو ڕۆژ لە سۆپەرمارکێتی زارا لە بەشی ڕێکخستنی پۆشاك لەناو مەخزەن دا تا ئەو کاتەشی ئەو وڵاتەمـان بەجێهێشـت بەردەوام بـووم لەسـەر کـارکردن پەیـداکردنی ئـیش و دابینکردنـی بژێـوی ژیـان زۆر سـەختە لە ئیتاڵیـا نەك بـۆ خەڵکی پەنـابەر بەڵکـو بـۆ ئیتاڵیەکانیش بـۆیە ئەگەر ئـیش و کاریشـت نەبـوایە هێنـدە سـەرقاڵیان دەکردیـت بە





تازەکردنەوەی ئەوراقی پۆلیس و دکتۆر و نەخۆشخانە و قوتابخانەی منداڵ..تاد، کاتی بۆشاییت بۆ نەدەمایەوە!

ئەو هەرێمەی لێی نیشتەجێبووین پێی دەوترا (ئاڵتۆ ئادی جی) خەڵکەکەی ئەڵمان بوون و بێ لە زمانی ئیتاڵی زمانی ئەڵمانیش دەخوێندرا،چونکە خاکی ئەو هەرێمە و خەڵکەکەشی لە ئەسڵدا هی وڵاتی(نەمسا)یە و کاتی خۆی لە جەنگی دووەمی جیهانی دا هیتلەر داویەتی بە وڵاتی(ئیتاڵیا) ، تا ئێستاش کێشە هەیە لەنێوانیاندا و هەردوولا بەجیا قوتابخانەیان هەیە تا چەندین شوێنی تریش هەریەکەیان بەجیا بەڕێوەی دەبەن وە ئیتاڵیەکان ناسراون بە مرۆڤدۆست حەزیان بە تێکەڵی بێگانەیە بەڵام زۆر گوێ نادەن بە یاسا و ئەڵمانیەکانیش ناسراون بە خۆپەرست و حەز بەتێکەڵی بێ لەخۆیان ناکەن بەڵام بەجوانی یاسا پەیڕەودەکەن.

جوانترین جیاوازی کە بینیبێتم لەنێوان وڵاتی(ئیتاڵیا)و وڵاتانی(ئەسکەندەنافی) ئەوەیە کەوا لە خەڵکی خۆیانت جیاناکەنەوە و تۆ ئەگەر ئیقامەشت نەبێت ئەوا کارتێکی دە ساڵیت بۆ دەکات وەك پێناسی لای خۆمان وایە و بۆ ناوخۆی ئەو وڵاتە کاری پێ دەکرێت لە سەرجەم دام و دەزگاکانی حوکمەت دا وە بێ لەوەش بەو پێناسە کاتییەی کە شەش مانگ جارێ بۆت تازە دەکاتەوە تا کاتێك ئیقامەت دەداتێ دەتوانیت پزیشکی تایبەتی خۆتت هەبێت و هەر پزیشکێك یان هەرکاتێك بتەوێ مۆڵەت وەرگریت بۆ بینینی پزیشکێکی تایبەت بە نەخۆشیەك یان ئەنجامدانی پشکنین، بەبێ ڕێگری وەك هاوڵاتیەکی ئەو وڵاتە دەتوانیت مۆڵەت و کات وەرگریت وە دەتوانیت ئیش و کاریش بکەیت ، بێ لەوەش هەر نەخۆشییەکت هەبێت یان پێویستت بە نەشتەرگەریش بێت حساب بۆ ئەوە ناکات تۆ هێشتا جوابت نیە بەڵکو زۆر بەجوانی و ڕێکوپێکی هەموو خەرجییەکانی نەخۆشخانەت بۆ دابیندەکات و بەگرنگیەوە هەوڵی چارەسەری نەخۆشیەکەت دەدرێت ، بێ لەوەی ئەو کەسەی کە منداڵی هەیە پزیشکی تایبەت بە



منالانیـان بـۆ دابینکـراوە و دەتـوانم بڵـێم لەڕووی بەدەمەوەچـوون و چارەسـەری پزیشـکییەوە زۆر زیـاتر بەدەم پەنـابەرەوە دەچـن لەچـاو وڵاتـانی ئەسـکەندەنافی، هـیچ کاتێکیش منالّی پەنابەر جیاناکەنەوە لە منالّەکانی خۆیان لە قوتابخانە و باخچەدا،

بەپێی تەمەنی منـاڵەکە لە پلەکـانی ڕەوزە یـان قوتابخـانە دادەنرێـت و دەڵـێن خـۆی فێردەبێـت و ڕادێـت پێویسـت ناکـات شـوینیان بـۆ جیـابکرێتەوە پـاش ئەوەی لەلایەن(کاریتاس)ەوە دووبارە کەیسەکەمان بەرزکرایەوە بەڵام بەداخەوە ویستی خوا وابـوو بەشـی دوبلـین لێمـان کەوتبـوون بە ڕقـدا و بەهـیچ شـێوەیەك چارەسـەری کێشـەکەیان نەدەکردین و لەماوەی ئەو دوو سـاڵ و نیـوەی کە لەو وڵاتە ماینەوە هەر پەنجەمۆرمـان لەسـەر لانەبـرا و تەنـانەت پۆلیسـیش هیچی پێ نەدەکـرا لەگەڵیـان و کەیسەکەیان بەهەڵواسراوی هێشتینەوە لەکاتێکدا زۆر لەو کاتەش زیاتری خایاند کە دیـاریکرابوو هەرچەنـدە چەنـد پارێزەرێکیشـیان بـۆ گـرتین بـێ سـوود بـوو وە هـیچ بەڵێنێکیشـیان نەدەداینـێ کەوا کەی لای دەبەن و هەتـا پەنجەمۆریشـت لەسـەر لانەچێـت لەو وڵاتە سێ مانـگ جارێـك وەرەقەت بـۆ تـازە دەکەنەوە وە پاش ئەوەشی هەڵبـژاردن کـرا و پـارتێکی توندـڕەو هـاتنە سـەر دەسـەڵات و کەسـێکی ڕەگەزپەرسـت بەناوی(سالڤینی) بوو بە وەزیری ناوخۆی ئەو وڵاتە و کۆمەڵێك یاسای توندی بەرامبەر پەنابەران گرتەبەر و بوو بە ڕێگر لەبەردەم هاتنی ڕێژەی زۆری پەنابەران کە جاران ئەو وڵاتە دەرگای واڵابوو ڕۆژی وا هەبووە هەزار پەنابەر هاتوونەتە ناو خاکی ئیتاڵیاوە!

بەوهـۆیەوە زۆرێـك لەو کەسانەشـی کە ئیقـامەی ئەو وڵاتەیـان هەیە لەبەر نەتوانـایی جێبەجێکردنـی یاسـا تونـدەکانی، ئەو وڵاتە بەجێـدێڵن پێـدانی مـۆڵەتی مـانەوەش سنوردارکراوە و ئێمەش پێیان وتین هەرکات دوبلینیشتان لەسەر لابچێت بەپێی یاسای نـوێی ئەو ڕۆژە مامەڵەتـان لەگەڵ دەکرێـت بـۆیە پـاش پـرس و ڕا بە کەسـانی دڵسـۆز و ئەنجامـدانی نـوێژی ئیسـتیخارە چـووینە بـنکەی پـۆلیس پێمـان وتـن یـان ئەوەیە







بماننێرنەوە بۆ وڵاتی(فنلەندا) یان ئەوەیە یەکلاییمان بکەنەوە بەڵام بەداخەوە وتیان پێشتر بۆ نەرۆشتونەتەوە و ئێستاش تەنها بۆتان هەیە چاوەڕوان بکەن جا هەرچەندی پێ دەچێت دەبێت دانیشن،
ئەگەرچی ئێمە لەو وڵاتە دڵخۆش بووین و فێری زمانی وڵاتەکە ببووین و چەندین بڕوانامەشمان وەرگرتبوو و منیش ئەو ئیشەم دەستکەوتبوو وە لەڕووی یاساییشەوە ئەرکەکانمان جێبەجێ دەکرد و کێشەمان نەبوو و بەڵام لەبەر ئەوەی سەرجەم مامەڵەکانمان پەیوەست بوو بەو وەرەقەیەی کە سێ مانگ جارێ تازەیان دەکردەوە وە ڕۆژ بەڕۆژیش یاسای توندتر دەردەچوو، زانیمان دانیشتن لەو وڵاتە تەنها کات کوشتنە و هیچ هیوایەکی تێدا بەدی ناکرێت وە ویستی خوای گەورە وابوو ئەو کارمەندەی ئیش و کارەکانی ئێمەی لەبەردەستدا بوو لە(کاریتاس) دڵگرانیان کردبوو ئەویش بەیەکجاری وازی لە کارەکەی هێنابوو کارمەندەکانی تریش بە بەڕێوەبەرەکەشیانەوە هیچ شارەزاییەکیان نەبوو وە نەیاندەزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ کەیسەکەماندا بکەن و ئەو پارێزەرانەشی کە دەیانگرت دەیانوت تا پەنجەمۆرەکە لانەبەن ئێمە هیچمان بۆ ناکرێت ئەو حاڵەتەش لە دەستی ئێمەدا نیە، دیارە ئەم ڕووداوانە سەرجەمیان خێریان تێدایە و خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێت چی خێری تێدایە بۆمان و ئێمەش ڕازین بەو قەدەرانەی کە خۆی باشتر دەزانێت بەهۆی چیەوە ئاوامان لێ دەکرێت و هەربۆیە چاوەڕوانی پاداشتیش هەر لەخوای گەورەمان دەکەین!
ڕۆژێك پێش سەفەرکردنمان سەرلەنوێ ئەشیا و کەلوپەلی ماڵەکەمان پێچایەوە و ئەوەی کە دەستمان توانای هەڵگرتنی هەبوو هێنامان لە پۆشاك و پێداویستی بۆ مناڵەکان و ئەوەشی کە توانامان نەبوو بەشێکیمان کرد بە خێر و بەشێکیشیمان فرۆشت ، وەك وەفا و ڕێزێکیش بۆ ڕێکخراوی(کاریتاس) کە لەو ماوە زۆرەدا جێیان کردبووینەوە و ڕێزیان لێ گرتبووین تا ئەوەی ساڵ و نیوێك بەتەنها خانویەکی







سەربەخۆیان پێدابووین لەکاتێکدا ئەو خانووە بۆ دوو خێزان بوو ئەگەرچی ڕێگەکەمان ڕێی قاچاخ بوو دەبوایە بەنهێنی بڕۆشتینایە بەڵام نەمانتوانی بێماڵئاوایی بڕۆین و کاتێك کلیلەکانم برد بۆ نووسینگەی کەمپەکەی شاری(میرانۆ)و وتم:
بە داوای لێبوردنەوە هاتووم بۆ ماڵئاوایی و نیازمان هەیە بچین بۆ وڵاتی(ئەڵمانیا) باوەڕتان هەبێت بە بەڕێوەبەر و کارمەندەوە بۆمان دەگریان و وتیان هەرچەندە لەگەڵ ڕۆشتنەکەتاندا نین بەڵام ناشتوانین ڕێگربین لەبەردەم داهاتووتاندا چونکە ئەوانیش بە چاوی هیواوە نەیاندەڕوانی بۆ ئەم دەسەڵاتە نوێیەی وڵاتی(ئیتاڵیا)و ئەوەشی لە توانایاندا هەبوو درێغیان نەکرد لەبەرامبەرمان دا.
بەوشێوەیە لە بەرواری(٨ / ٣ /٢٠١٩) شاری(میرانۆ)مان بەجێهێشت و بەڕێکەوتین بەرەو وڵاتی(ئەڵمانیا) بەناو خاکی وڵاتی(سویسرا)دا بەڕێگەی پاس و شەمەندەفەر.

## بەڕێکەوتن لە وڵاتی(ئیتاڵیا)وە بەرەو وڵاتی(ئەڵمانیا)بەڕێگەی پاس و شەمەندەفەر بەناو خاکی وڵاتی(سویسرا)دا.

لە بەرواری(٨ / ٣ /٢٠١٩) شاری(میرانۆ)مان بەجێهێشت و بەڕێکەوتین بەرەو سنوری خاکی وڵاتی(سویسرا)، ئەگەرچی ئەو ڕێگەیە دوورتر بوو، بەڵام ڕێگەیەکی سەلامەت بوو وە نەفەری پەنابەر بەو ڕێگەیەدا سەفەرناکەن و تەنهاش یەك خاڵی پشکنین هەیە لەنێوان هەردوو وڵاتدا کە ڕێی سەیار و پاسە، چونکە ڕێگایەکی دوورە و کەم کەسیش شارەزایە کە لەو ڕێگەیەوە بڕوات وە پارەی وڵاتی(سویسرا)ش فرانکە و کرێی پاس و شەمەندەفەر گرانترە لەچاو وڵاتانی دراوسێی،هەربۆیە کاتێك زۆربەی پەنابەران لە وڵاتی(ئیتاڵیا)وە سەفەردەکەن بەناو وڵاتی(نەمسا) یان وڵاتی(فەرەنسا)دا خۆیان دەگەیەننە وڵاتانی ناوەڕاست و بەشی سەرەوەی ڕۆژئاوا.
پاش ئەوەی سەرلەبەیانی زووەکەی گەشتینە کۆتا ئاوایی لە سنوری وڵاتی(ئیتاڵیا) کە ناوی(توبرە)بوو لەپێش خاڵی پشکنینی نێوان هەردوو وڵاتدا دابەزین و بەرەو ئەو







گـردۆڵکە و چیـایەی کە لە بەشـی سـەرەوەی کـۆنترۆڵەکەدا بـوو بەپـێ بەڕێکەوتـین ، لەبەرئەوەی وڵاتی(سویسـرا) لە یەکێتی ئەوروپـادا نـیە و دەبێـت هاوڵاتیـانی خـاوەن ئیقـامەی وڵاتـانی دەرەوەشـی بە فیزەوە بچـنە نـاویەوە بەوهـۆیەوە کـۆنترۆڵی بەهێزە و داوای مۆڵەتنــامە لە ســەرجەم نەفەرەکــان دەکــات ئــێمەش بەنــاو کــۆنترۆڵەکەدا نەڕۆشـتین ئەگەرچی مـانگی سێ بـوو بەڵام کەشـوهەوایەکی سـارد و بەفـراوی هەبـوو ، چـونکە ئەو نـاوچەیە نـاوچەیەکی شـاخاوی بەرز و سـارد و بەفـراویە و شـوێنی یـاری خلیسکێنەی سەربەفرە.

پـاش ئەوەی نیوکاتژمێر بەپێ ڕۆشـتین بە پشـتی خـاڵی پشـکنینی نێـوان هەردوو وڵاتـدا و گەشتینە ناو یەکەم لادێی خاکی وڵاتی(سویسرا) کە ناوی(موستەیر)بوو ئەوەی جێگای باسـە ئاماژەی پێ بکەم بۆ ئەم سـەفەرە و سـەفەرەکانی داهاتووشـمان تەنها بەڕێگەی بەرنامەی ئەپی(ماپ)و جی پی ئێسی نێـو مۆبایل سـەفەرمان کـردووە کە لە ئێسـتادا بێ لە دەستنیشـانکردنی ڕێگەی پێ و سەیارە و پاسکیل،

کاتەکانی پاس و شەمەندەفەریشت بۆ دیاریدەکات و لە شـار و شـوێنەکەی خۆتەوە بۆ هەر شار و وڵاتێکی ڕۆژئاوایی تریش کە بتەوێت سەفەری بۆ بکەیت.

پــاش ئەوەی گەشــتینە یەکەم لادێــی وڵاتی(سویســرا) چــووینە وێســتگەی پــاس و چاوەڕوانی ئەو پاسە سویسریەمان دەکرد کە لە شارۆچکەی(مالز)ی ئیتاڵیاوە دەهات و بەرەو شــاری(زێرنز)ی سویســری دەچــوو تــا ئەو شــارەش شــەمەندەفەر نامێنێـت بەهـۆی ئەوەی ئەو نـاوچەیە زۆر شـاخاوی و سـەختە و تەنها ڕێگەی سـەیارەی هەیە، لە ڕێگەدا بەنـاو ئەو سروشـتە جـوان و شـاخاوی و چیـا بەفـراوی و سـەختانەدا دەڕۆشـت بەنـاو سـەرجەم گونـد و ئـاواییە دڵڕفێنەکانی ئەو وڵاتەدا و لە چەنـد وێسـتگەیەکیش دەوەستا، ئەوەی کە سەردەکەوت کۆمەڵ کۆمەڵ بوون و یاری خیلیسکێنەیان پێ بوو







وە لەو شوێنانەدا دادەبەزین کە ئامادەکرابوون بۆ یاری سەربەفر لەدوای کاتژمێرێك و پانزە خولەك گەشتینە ناو شاری(زێرنز)و لای وێستگەی شەمەندەفەر دابەزین.
پاشان چوومە ناو وێستگەی شەمەندەفەر و تکتی شاری(فرای بۆرگ)ی وڵاتی(ئەڵمانیا)م بڕی ئیتر لە چەند ناوچە و شارێك شەمەندەفەرەکانمان دەگۆڕی کە بریتی بوون لە شارەکانی(لانکوارد،زوریخ،بازل)ی وڵاتی (سویسرا) و نزیکەی پێنج کاتژمێر لەناو خاکی ئەو وڵاتەدا بووین و تەنها تێپەڕین و لامان نەدا لە هیچ شار و ناوچەیەك تا گەشتینە سنوری نێوان هەردوو وڵاتی(سویسراو ئەڵمانیا) لە شاری(بازل)ی سویسری دابەزین و بەنێو کۆنترۆڵی هەردوو وڵات دا تێپەڕین کە دوو سەیارەی پۆلیسی هەردوو وڵات بەتەنیشت یەکەوە وەستابوون و سەیری خەڵکیان دەکرد گومانیان لە هەرکەسێك بکردایە بانگیان دەکرد و داوای ئیقامە و پاسپۆرتیان لێدەکرد بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێمە بێ کێشە سواری شەمەندەفەری شاری(بازل)ی سەر بەوڵاتی(ئەڵمانیا)بووین و بە شەش خولەك گەشتینە ئەوێ، لەپاشاندا دابەزین و شەمەندەفەرمان گۆڕی بۆ شاری(فرای بۆرگ)،
پەیوەندیم کرد بە پوری بەڕێزمەوە کە نیشتەجێی ئەو وڵاتەن و ڕۆشتم تکتی شارەکەیانم بڕی بەڵام لەبەرئەوەی گۆڕینی شەمەندەفەرەکەمان دەکەوتە شاری(هامبورگ)و کاتژمێر یەك و نیوی شەویش دەگەشتین ،کە نزیکەی پێنج کاتژمێر و نیو بوو بە شەمەندەفەری خێرا پاشان لەوێشەوە بەرەو شارەکەی ماڵی پورم بەڕێکەوتین و پاش سیانزە ساڵ دابڕان سوپاس بۆ خوا بە پوری بەڕێزم شادبوومەوە.
ئەو شەوەی کە ئێمە گەشتین شەممە و یەك شەممەی بەسەردا هات و پاشان بۆ ڕۆژی دووشەممە بەرواری(١١ / ٣ / ٢٠١٩) بە هاورێیەتی پوری بەڕێزم ڕۆشتین بۆ کەمپی شاری(نۆیمنیستەر) کە کەمپێکی پێشوازی گەورەی کاتی ئەو هەرێمەیە و بۆ خۆ تەسلیم کردن دەبێت بچیتە ئەو شارە و پاش خۆ تەسلیم کردنمان سەیر دەکەین







زیاتر لە حەوت سەد بۆ هەزار کەسی تێدایە و یاساکانیان زۆر توند کردووە بۆ ئەوانەی پەنجەمۆری وڵاتی تریان هەیە،چونکە ئەو کەمپە کەمپی پێشوازی بوو پێشتر تەنها ماوەی مانگێك پەنابەریان هێشتۆتەوە و دوای چاوپێکەوتنی سەرەتا و پەنجەمۆرکردن و دروستکردنی پێناس کە پێی دەوترێت (ئۆزبایز)و پشکنین و کوتانی نەفەری تازە، نقڵی شوێنی بەردەوام دەکرا جا بۆ خێزان زۆر باش بوو، یان لە لادێ سنورییەکان خانوی بۆ دەردەچوو یان دەخرایە هایمەوە کە ئەویش کەمپە بەڵام هەموو خێزانێك بەسەربەخۆیی جێ و ڕێ و چێشتخانە و تەوالێت و حەمامی بۆ دابینکراوا و لەجیاتی خواردن موچەی دەدرێتێ کە خۆی خواردن ئامادەبکات، یان دەخرایە ناو کەرەڤانە ئەویش هەر بەسەربەخۆیی پێت دەدرا ، بەهۆی زۆری پەنابەر لەو کەمپەدا شوێن و ڕێگە زۆر خراپ بوو کەمپەکەش کەمپێکی سەربازی گەورەبووە پێشتر ژوور و هۆڵەکان هێندە گەورەبوون دەنگی دەدایە و پشوو و ئیسراحەتی لێ بڕیبووین و ئێمەشیان خستبۆیە شوێنێك کە ژوورەکانی تەنیشتمان هەمووی کەسی زگورت و ڕەبەن بوون و خەڵکێکی زۆر خراپ و تاوانکاریشیان تێدابوو وە تەوالێت و حەمامەکانیش تێکەڵ بوون!

دەبوایە پاسەوانی مناڵەکانت بکردایە گەر بیانویستایە دەست بە ئاو بگەیەنن، بێ لە پیس و پۆخڵی حەمام و تەوالێتەکان کە نە دەتتوانی خۆت بشۆیت نە دەست بە ئاو بگەیەنیت تیایاندا بۆ کاتی خواردنیش چێشتخانەیەکی گەورەیان هەبوو کە ڕۆژانە سێ جار دەکرایەوە بەڵام هێندە قەرەباڵغ بوو جاری وا هەبوو بە نیو کاتژمێر تا چل و پێنج خولەك سەرەی چوونەژوورەوەت بەرنەدەکەوت و بێ لەوەش بەیانیان و ئێواران تەنها پەنیر و سەمونی تۆستیان دەدا و نیوەڕوانیش یەك ژەم خواردنیان دەدا، وە ڕێگەشیان نەدەدا هیچ خواردنێك ببەیتە ژوورەوە و خۆشت بۆت نەبوو خواردن دروستبکەیت، مامەڵەی پاسەوان و کارمەندەکانی کەمپیش زۆر خراپ و ناشرین بوو.





کاتێك خۆت تەسلیم دەکەیت هەر نەفەرە و کارتێکت بۆ دروست دەکرا و بۆ هاتووچۆ و چوونەدەرەوەی کەمپ و کاتی خواردن و سەردانی پزیشکی ناو کەمپەکە بەکاردەهات و هەتا یەکلایش نەبوویتایەتە و نقڵی شوێنی بەردەوام نەکرایتایە بۆت نەبوو لە سنوری ئەو شارە بچیتە دەرەوە، بەڕاستی ئێمەش زۆر ناڕەحەت بووین چونکە پڕبوو لە خەڵکی پەنابەری خراپ کە دەبووایە لەو ژوورەی کە زەویەکەی تەختەیەکی پیسی پڕ لە حەشەرات بوو نەچوویتایەتە دەرەوە و ژورەکەش تەنها سیستەمی خەو و چەند دۆلابێکی تێدابوو بۆ پۆشاك و جل و بەرگ ئەمەش بۆ خێزانێکی منداڵدار زۆر سەخت بوو چەند بینایەکی پاکوخاوێن هەبوون کە زیاتر خێزان و منداڵیان تیا دانابوو لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا چەند جار لەگەڵ خێزانی بەڕێزم دا داوای گۆڕینی ئەو شوێنە خراپەمان کرد بەڵام بەداخەوە لەلایەن دووکارمەندی ڕەگەزپەرستەوە ڕێگری دەکرا بۆمان بگۆڕن پێمان وتن ئێمە پەنجەمۆری دوو وڵاتی ترمان هەیە و لێرەش یاسای تازە وایە تا پەنجەمۆرەکەت یەکلایی نەبێتەوە نقڵ ناکرێیت و تەنها داوای گۆڕینی شوێنەکەمان دەکەین بۆ ئەو بینایانەی کە خێزانەکانی لێن و پاکوخاوێنترن لێرە وەك ئاگاداریش بووم کەسی وای تێدابوو شەش مانگ بۆ ساڵێك زیاتر مابۆیەوە لەوێدا، هەشبوو پاش ئەو ماوە زۆرەش هەر سنورداش کراوەتەوە بۆ وڵاتی یەکەمی پەنجەمۆری هەربۆیە کاتێك ئەو حاڵەم بینی داوای سنورداش کردنەوەی وڵاتی یەکەمم کردەوە کە(فنلەندا)بوو بۆ ئەوەی وەك وڵاتی(ئیتاڵیا)مان بەسەر نەیەت کە پاش ئەو هەموو مانگ و کاتە زۆرەش هەر داوای کردینەوە وتمان با ئەم جارە خۆمان داوای گەڕانەوەی بکەین و کاتمان بەفیڕۆ نەدەین چونکە وتیان هەردەبێت یەکێك لەو دوو وڵاتە وەرتانبگرێتەوە، بۆ یەکەم جار لەتەمەنم دا لەناوکەمپدا بوو بە دەنگەدەنگم لەگەڵ کارمەندێکیان ڕەزیلم کرد و پێم وت وانەزانن ئەوانەی دێن بۆ وڵاتەکەت لەبرسا هاتوون بەڵکو زۆر لە تۆ خوێندەوارتر و چاکتری تێدایە ئەگەر تۆش







ناتوانیت ئیش و کاری پەنابەر بەڕێوە ببەیت ئەوە بڕۆماڵەوە و لێی گەڕێ بۆ کەسی شیاو ئیتر زۆر بێ منەتانە کلیلەکانم تەسلیم کردنەوە و کەمپەکەمان بەجێهێشت و وتمان دەڕۆین بۆ وڵاتێکی تر پاش ئەوەی پەیوەندیم کرد بە پوری بەڕێزمەوە و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە و ئەویش قسەی لەگەڵ کارمەندێکدا کرد و داوای لێکردن کە وەك ئەوەی شوێنەکەیان بۆ ناگۆڕن ناونیشانی ماڵی خۆیانی پێدان و وتی مۆڵەتیان پێ بدەن با بێن بۆ ئێرە ئەگەر بۆ چەند ڕۆژێکیش بێت تا کەمێك پشوو بدەن و هەرکاتێك پۆستێکیشیان بۆهات من خۆم دەیانهێنمەوە.

بەڵام کارمەندەکە لە وەڵامدا وتی هەتا ئیشیان یەکلایی نەبێتەوە ناتوانن نە بۆ سەردانی نە بۆ مانەوەش بچن بۆ هیچ شوێنێك ئیتر منیش گوێم پێ نەدان و هاتمە دەرەوە لە کەمپەکە و بەنیاز بووم سەفەر بکەم بۆ وڵاتی(هۆڵەندا)و وتیان هەرچۆنێك بێت شوێن و ڕێگە بۆ خێزان لەوێ باشترە بەڵام دوای ئەوەی پەیوەندیم کرد بە برایەکی بەڕێزەوە کە پێشتر ئەوانیش لە وڵاتی(فنلەندا) وەك من دەربەدەرکرابوون ویستم ماڵئاوایی لێ بکەین بەڵام بەڕێزیان سوێندی خوارد کە نابێت بڕۆین و هات بەدواماندا و پاش چەند ڕۆژێك گفتوگۆ و وتووێژ لەگەڵ چەند کەسێکی دڵسۆز و شارەزا و پوری بەڕێزمدا ڕازیان کردین کەوا بڕۆینەوە بۆ کەمپەکە بەڵام ڕۆشتنەوەمان بەنابەدڵی بوو نەك ڕای خۆمان چونکە ئەوان ئاگاداری یاسا تازە توندەکانی کەمپەکە نەبوون و ئێمە خۆمان حاڵی خۆمانمان باشتر دەزانی، پاش ئەوەی پورم پەیوەندی کرد بە کەمپەکەوە و کەمێك سەرزەنشتی ئەو کارمەندەی کرد کە کلیلەکانی لێ وەرگرتین ئەویش بۆ خۆدەربازکردن وتی ئەوان خۆیان ڕۆشتوون و ئێستاش دەتوانن بگەڕێنەوە، ئێمەش لەسەر داوای ئەو کەسە دڵسۆزانە ڕۆشتینەوە بەڵام دووبارە لە هەمان بینای خراپ دا شوێنیان دایەوە پێمان و جەنگێکی دەروونیان لەگەڵدا دەکردین تا ئەوەی







لەگەڵ کارمەنـدێکی تـردا کە لە بەشـی خـاچی سـوور کـاری دەکـرد گفتوگـۆم کـرد کە بتوانێت کارئاسانیمان بۆ بکات بۆ گەڕانەوەی وڵاتی(فنلەندا).
ئەویـش پـاش چەنـد پەیوەنـدیەك بە فەرمـانگەی کۆچەوە وتـی نـامە نێردراوە و جـارێ وەڵامیـان نەداونەتەوە ئەم بـابەتە درێـژەی خایانـد تـا نزیـك بـووینەوە لە مانگێـك لەو وڵاتە، هەرجارێـك دەچـووم پرسـیارم دەکـرد دەیـانوت هێشـتا وەڵامـی نەداویـنەتەوە درۆیان لەگەڵ دەکردین و وەڵامیشی دابۆیەوە دواتر ئاماژە بەو فرت و فێڵەیان دەکەم کە بـۆچی پێیـان نەدەوتـین و چـاوپێکەوتنی دووەمیشـمان بـۆ نەدەهـاتەوە کە دەبـووایە پاش هەفتەیەك بهاتایە، ئێمەش کە زانیمـان مامەڵەی ئەوان زۆر خراپە لە نزیکی ئەو شارەوە بێ لە ماڵی پورم چەند برایەکی بەڕێزی خێزانداریش دەیانبردین بۆلای خۆیان وە هەفتـانە یەك دووجـار خـۆم دەگەڕامەوە بـۆ پۆسـت خـوا خێریـان بنووسـێت ئەگەرچی ئـێمە قبوڵمـان نەدەکـرد ببـین بە ئەرك بەسـەریانەوە بەڵام لە چـاکی خۆیـان دا بەزۆر نەیاندەهێشت بڕۆینەوە بۆ کەمپەکە پاش ئەوەی کە زانیان حاڵ و گوزەرانی کەمپەکە بەوشـێوە خـراپەیە پـاش مـانەوەی مانگێـك لە چـاوەڕوانی و وەڵام نەدانەوەمـان و نزیکبـوونەوەی مـانگی پیـرۆزی ڕەمەزان بـۆ ئەوەی مـانگی ڕەمەزانەکەم لە شـوێنێکدا بەسەربەرم کەوا سەرقاڵی ئیش و کارە دونیاییەکانم نەبم و لانی کەم شـوێنێکی جێگیر بێت کە سوپاس بۆ خـوا هەمـوو سـاڵێك هەوڵمداوە لەپێش هاتنی ئەو مانگە پیرۆزەدا سـەرجەم ئـیش و کـارە دونیایەکانم تەواوبـکەم و ئەو مـانگە بە پەرسـتش و عیبـادەت بەڕێبکەین بڕیارم دا کە خۆمان بگەڕێینەوە بۆ وڵاتی(فنلەندا) لەڕێی وشکانییەوە نوێژی ئیستیخارەم ئەنجامدا و دەستم بەرزکردەوە بۆ لای خـوای گەورەم کەوا وەك سـاڵانی ڕابـردوو لە شـوێنێکدا جێگیرمـان بکـات تـاوەکو بتـوانین بەشـێوەیەکی جـوان مـانگی ڕەمەزان بەڕێـبکەین پـاش پـرس و ڕای دڵسـۆزان بـۆ کۆتـا جـار چـوومەوە کەمـپەکە و پرسیارم کرد کە ئایا هۆکاری دواکەوتنی ناردنەوەم چیە بۆ وڵاتی(فنلەندا)




بەڵام وەك پیشەی هەمیشەییان دووبارە بە درۆ وەڵامیان دایەوە و وتیان کەوا پێویست ناکات هێندە بێیت هەرکات وەڵامی دایەوە بە پۆست ئاگادرت دەکەینەوە بەڵام ئەسڵی بابەتەکە ئەوەبوو کە ئەمە تەنها پیلان بوو بۆ ئەوەی من لەژێردەستیاندابم و نەڕۆم چونکە وڵاتی(فنلەندا) ڕەتی کردبۆیەوە کە وەرمانبگرێتەوە و ئەوانیش پاش ئەوێ نامەیان ناردبوو بۆ وڵاتی دووەمی پەنجەمۆرم کە(ئیتاڵیا)یە و دەیانویست ئەوێ وەڵامی ئەرێنی بداتەوە و پاشان بدەن بە سەرماندا و سنورداشی( ئیتاڵیا)مان بکەنەوە، بەڵام ویستی خوا وابوو پیلانەکەیان سەری نەگرت و پێش ئەوەی وڵاتی(ئیتاڵیا) وەڵام بداتەوە خوا خستیە دڵمەوە کە ولاتی(ئەڵمانیا) بەجێبهێڵم و دوای سەفەرکردنیشمان بۆ وڵاتی(دانی مارك) ئەو کاتە وڵاتی(ئیتاڵیا) وەڵامی ئەرێنی بۆ وڵاتی(ئەڵمانیا)ناردبۆیەوە کە ئامادەیە وەرمانبگرێتەوە!، ئەم ڕاستیانەشمان لە وڵاتی(دانی مارك) پێ وترا و بۆ ڕوونکرایەوە.

## بەڕێکەوتن لە وڵاتی(ئەڵمانیا)وە بەرەو وڵاتی(فنلەندا)بەڕێگەی شەمەندەفەر و کەشتی بەناو هەردوو خاکی وڵاتی(دانی مارك و سوید) و دەستگیرکردنمان لەناو کەشتی دا لە سنوری وڵاتی(سوید).

لە بەرواری(١٣ / ٤ / ٢٠١٩) لەڕێگەی شەمەندەفەرەوە وڵاتی(ئەڵمانیا)مان بەجێهێشت و لە کۆتا شارۆچکەی سنوری وشکانی ئەو وڵاتەوە کە ناوی(نیبوڵ) بوو چووینە ناو سنوری خاکی وڵاتی(دانی مارك) و یەکەم شارۆچکەی کە ناوی(تۆندەر)بوو لەو سنورەوە بە کاتژمێر و نیوێك گەشتینە شاری(برامینگ) و لەوێش شەمەندەفەرەکەمان گۆڕی و بەشەمەندەفەرێکی خێرا کە ماوەکەی سێ کاتژمێر و دە خولەك بوو گەشتینە شاری(کۆپنهاگن)ی پایتەختی وڵاتی(دانی مارك)، بەڵام ویستی خوای گەورە وابوو بەهۆی زۆری نەفەرەوە تکتی شەمەندەفەری نێوان شاری(کۆپنهاگن) و شاری(مالمۆ)ی وڵاتی (سوید) نەبوو وە ڕێگەکەش مەترسیدار بوو




چـونکە کـۆنترۆڵی بەهێز بـوو بەتـایبەتی لە چوونەنـاوەوەی وڵاتی(سـوید)دا وە بەهـۆی ئەوەی کە ئەو نێـــوانە ئـــاوە و بە پردێکـــی هەڵواســـراو و تونێلێـــك بەیەکەوە بەستراونەتەوە، ناچاریت بەوشێوەیە بڕۆیت.
پـاش ئەوەی تکتی ئەو ڕۆژەمـان دەسـتنەکەوت پرسـیاری ڕێـگەی تـرم کـرد و ناونیشـانی ڕێـگەی کەشـتییان پێـداین لە شـارێکی نزیکی(کۆپنهـاگن) کە ناوی(هێلسـینگۆر)ە یـان لەڕێی شـەمەندەفەرەوە دەچێـتە نـاو کەشـتیەکە یـان دەتـوانی بەبێ شـەمەندەفەریش تکـت ببڕیـت و بچیـتە نـاو کەشـتیەکە و بە بیسـت خـولەك دەتپەڕێنێـتەوە بـۆ شـاری (هێلسـینبۆرگ)ی وڵاتی(سـوید)، ئـێمەش بەوشـێوەیە بەڕێکەوتـین و تکتمـان بـڕی و لەکاتی سـەرکەوتنماندا لە بەشی(دانی مـارك)ەوە هـیچ کۆنترۆڵێك نەبـوو بەڵام لەکاتی دابەزیـن کە گەشـتینە بەشی وڵاتی(سـوید) لە ڕێـڕەوی کەشـتیەکە بـۆ چـوونە نـاو ئەو وڵاتەوە دوو ژووری لێبـوو لە بەشـی دەرەوەش شـەش پـۆلیس وەسـتابوون دەبـوایە هەمـوو کەسـێك پاسـپۆرتەکانی پیشـان بـدات ئەوکـات دەرگـای چـوونەدەرەوەی بـۆ دەکرایەوە ئێمەش هیچمـان پێ نەبوو بێجگە لەو پێناسـانەی کەمپ کە کاتی خـۆی لە وڵاتی(فنلەنـدا)،بۆمان کرابـوو وە ڕێگەی گەڕانەوەشـمان نەبووا!،بەناچاری چوومە لای پۆلیسـەکان و پـێم وتـن کەوا هـیچ پاسـپۆرتێکمان پێ نـیە و پەنـابەری نایاسـایین پـاش ئەوەی گفتوگۆمـان لەگەڵ کـرا و منـیش بەڕاسـتەقینە پـێم وتـن کەوا پەنجەمـۆری وڵاتی(فنلەنـدا)مان هەیە و دوای ڕەفـز چـووینەتە وڵاتی(ئیتاڵیـا)و لەوێـش بەهـۆی پەنجەمۆری فنلەنداوە هیچمـان بۆ نەکراوە و پەنجەمۆرەکانیشـمان لەسـەر لانەچووە بۆیە خۆمان بەنیازین بگەڕێینەوە بۆ ئەو وڵاتە و ناشمانەوێت ئێوە ماندوو بکەین گەر ڕێمان بدەن سوپاستان دەکەین، سـەرەتا بردینیانە ژوورێکەوە و پاش پشکنینی خۆمان و پۆشـاك و جانتاکانمان وتیان پارەی ئەوەندەتان پێیە بگەڕێنەوە بۆ فنلەندا؟، منیش




جـزدانەکەم دەرهێنـا بـڕە پـارەیەکی تێـدابوو کە دەمـانتوانی پێی بگەیـنەوە و بەشـی تکتەکانی دەکرد پاشان وتی بەچی ڕێگەیەك دەتانەوێت بڕۆنەوە؟
وتمان لەبەرئەوەی ئیقامەمان پێ نیە بەڕێگەی شەمەندەفەر و وشکانی بەنیازین بڕۆین ئەگەر ئێوەش ڕێگەمان بدەن سواری کەشتی بین ئەوە بۆ ئێمە باشترە لەبەر مناڵەکان سوپاسی هاوکاریتان دەکەین!
پـاش نیـو کـاتژمێر دوو پـارچە کاغەزیـان هێنـا و واژۆیـان بە منـیش و خێزانیشـم کـرد ، وامـانزانی مـۆڵەتێکی چەنـد ڕۆژیـیە کە دەبێـت خـاکی ئەو وڵاتە جێبهێڵـین کەچی پـاش واژۆکە درۆیـــان لەگەڵ دا کـــردین و وتیـــان دەبێـــت ئێـــوە سنورداشـــی وڵاتی(دانـــی مـارك)بکرێنەوە چـونکە لەوێـوە هـاتوون ئـێمەش کە زانیمـان قسـەکردن بـێ سـوودە هیچمـان نەوت و بە سـەیارەیەکی دۆڵمـش کە سێ پۆلیسـمان لەگەڵ هـات سنورداشی وڵاتی(دانی مارك) کراینەوە و لەکاتی دابەزینیشمان تەسلیمی پۆلیسی وڵاتی(دانی مارك) کـراین و ئەوانـیش بردینیـان بـۆ بنکەیەکی پـۆلیس پـاش پەنجەمـۆر و گفتوگـۆ لەڕێی وەرگێڕێکەوە بە تەلەفـون پێیـان وتـین کەوا لەبەرئەوەی سـنوری خـاکی ئەم وڵاتەتـان بڕیـوە بە نایاسـایی ئەوا بـۆ مـاوەی سێ ڕۆژ دەبێـت تـۆ دەستبەسـەربیت لە کەمپێکی داخـــراودا کە ناوی(ئێلێبیـــك)ە و خێـــزان و مناڵەکانیشـــت دەبـــرێن بـــۆ کەمپـــی پێشوازی(ساند هۆڵم)،پاش ئەو سێ ڕۆژە تۆش دەبرێیتەوە بۆ لای خێزان و مناڵەکانت بەڵام بەداخەوە ویستی خـوای گەورە وابـوو ئەو سێ ڕۆژە بـوو بە هەشـتا و سێ ڕۆژ وە کەمپیش نەبوو بەڵکو زیندان بوو.

**هەشتاو سێ ڕۆژ دەست بەسەرکردنم لە زیندانی (ئێلێبیك) لەوڵاتی(دانی مارك)**

پاش ئەوەی خێزانم و مناڵەکان زۆرپێداگریان کردو دەگریان و داوای ئەوەیان دەکرد کەلەیەکمان جیانەکەنەوە بەڵام پۆلیس سوربوو لەسەر بڕیارەکەی خۆی و ئەوکەسەی گفتوگۆی لەگەڵدا کردین کارمەندێکی ئافرەت بوو هاتە لای خێزانم و دڵ






دانەوەی کردو ، وتی تەنها سێ ڕۆژەو دوواتر دێتەوە بۆلات و ئەمڕۆش ڕۆژی شەممەیەو بەیانیش پشووە بۆیە دەبێت هەر بیبەن بۆ ئەوێ، ئیتر هەر ئەو ڕۆژە ئێوارەکەی کەبەرواری(١٣ / ٤ / ٢٠١٩) بوو بەسەیارەیەکی گەورەی پۆلیس هەموومانیان برد ، پاش نیو کاتژمێر گەشتینە کەمپی پێشوازی پەنابەران(ساندهۆڵم) و لەوێ خێزانم و منداڵەکانیان دابەزاندو ماڵئاواییمان لەیەك کردو لەوماوەیەی ڕێگەکەش دا کەمێك دڵ دانەوەی خێزانم کردو داوام لێکرد کەوا خۆڕاگربێت و ئەوەم یادخستەوە کەوا پێش ئەوەی سواری کەشتی یەکە بین دووڕکات نوێژی ئیستیخارەم کردو داوام کرد لەخوای گەورەم گەرخێری تێدایە ئەوە بەبێ کێشە وەك باقی ڕێگەکانی ڕابردوو دەربچین و گەرخێریشی تێدانەبێت ئەوە چی خێری تێدایە بیکاتە نسیب و پێم وت سوێند بەخوا ئەم گرتنە خێرەکەیە، ئەگەرچی پێمان ناخۆشە بەڵام لەداهاتوودا زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

بەڕاستی لەناخیشەوە دەکوڵام بۆ خێزانی بەڕێزم و منداڵەکانم کەوا بێ لەخوای گەورە کەسم شك نەدەبرد لەوکاتەدا،وە بۆیەکەم جاریشە ئاوا لێیان دابڕێم و کەسمان ڕانەهاتبووین بەدووری لەیەك و هیچ کاتێکیش بێ یەك ناتوانین بژین، لەلایەکی تریشەوە بیرم لە بەهێزی و پتەوی خێزانی بەڕێزم دەکردەوەو سوپاسی خوای گەورەم دەکرد کەوا خوای گەورە خێزانێکی خاوەن ئیمان و ڕەوشت جوانی پێ بەخشیوم کەلەنەبونی من دا دەوری دایك و باوکیش بۆمنداڵەکان ببینێت ئەگەرچی ئەرکەکەی سەرشانی قورستر ببوو بێ لەوەش نەك وەك ژن و مێرد بەڵکو وەك دووهاوڕێی گیانی بەگیانیش مامەڵە دەکەین لەگەڵ یەکدا بۆیە هەتا ماوم شانازی پێوەدەکەم کەبەردەوام بێ ماندووبوون وەك قەڵاو پشتیوانێك لەپشتمەوە بووەو تائێستاش ڕۆژێك لەڕۆژان سکاڵایەکی نەکردووە بەرامبەرم جا هەرچۆنێك بنوسم لەسەری بەڕاستی ناتوانم مافی خۆی پێ بدەم خوای گەورە زیاتر دامەزراوی بکات.







پاش ماڵئاوایی کردن لەمناڵەکان سواری سەیارەی پۆلیسەکەیان کردمەوەو بردیانم بەرەو زیندانی(ئێلێبیك) و لەو چەند کاتە کەمەی ڕێگەدا بەدڵێکی پڕەوە داوام کرد لەخوای گەورە کەوا خێزانم و مناڵەکانم بپارێزێت و خۆی پشتیوان و کۆمەکییان بۆبنێرێت لەم بێ کەسی و نەبونی یەی من دا ئەگەرچی زیندانەکە دەکەوێتە تەنیشتی کەمپی پێشوازی(ساند هۆڵم)ەوە بەدیوی لای چەپی داو لەنێوانیان دا دەرگای تایبەتی هەیە بۆهاتوو چۆکردن بەڵام دەرگای چونە ژوورەوەی دەکەوێتە لایەکی ترەوەو بەسەیارە چەند خولەکێکی پێ دەچێت و بەپیادەش پانزە بۆ بیست خولەك دەبێت و ڕێگەکەش دەکەوێتە سەر ڕێگای فێرگەیەکی سەربازی کەلەتەنیشتی زیندانەکەوەیە و بەوشێوەیە زیندانەکە دەکەوێتە نێوان کەمپەکەو سەربازگەکەوە و دەوری زیندانەکەش بەدیوارێکی تەختەی بەرزگیراوەو بەچەند مەترێك دووای ئەویش تەلبەندێکی بەرزە کەلەبەشی سەرەوەیدا بێ لەوەی تەلی دڕکاوی شێوە بازنەیی بۆدانراوە لەسەروی ئەویشەوە بەپێچەوانەی یەکەوە چەند تەلێکی تەختی تیژی وەك کەتەر بۆ دروست کراوە کەئەگەر کەسێك بگاتە ئەویاش بۆ هەڵهاتن ئەوە بەئاسانی ڕزگاری نابێت و وەك چەقۆ لاشەی دەبڕێت و وەك هەندێك لە زیندانی یەکانیش دەیان وت کە پێدەچێت تەزووی کارەبایان خستبێتە سەر بەڵام نازانم تاچەند ئەو وتەیە ڕاست بووە! ،دووای ئەویش بەچەند مەترێك دیوارێکی تری تەلبەندە بەڵام ئەمیان تەنها دوو مەتر بەرزەو دووای ئەویش یاریگایەکی چیمەنی گەورەی وەرزشی یەو لەکاتی هاوین دا هەفتانە چەند جارێك زیندانی یەکان دێنن بۆ یاری کردن تیایدا.

بۆچونە ژوورەوەی زیندانەکەش دوو دەرگای ئاسنی گەورەی بەرزی ئاسنی بۆ دروست کراوە بەکۆنترۆڵ دەکرێتەوەو ماوەی نێوانی هەردوو دەرگاکەش چەند مەترێکەو تاوەکو دەرگای یەکەمیش دانەخرێت دەرگای دووەم ناکرێتەوە،پاش پێنج دەقە گەشتینە بەردەم زیندانەکەو بردمیانە ژوورەوەو تەسلیمی پاسەوانی پرسگەکەکرام و







ئەوانیش ناویان تۆمارکردم و هەندێك ئەشیاو پێداویستی ناو زیندانیان پێدام و بردمیان بۆ ئەوهۆڵەی کە کوردەکانی لێ یەو پاش چونە ژوورەوە لەلایەن چەند نەفەرێکی کوردی بەڕێزەوە پێشوازیم لێکراو شوێنێکیان بۆ دیاری کردم لەناو زیندانەکەدا.

پاش گفتوگۆو یەکترناسین سەرجەم یاساو ڕێساکانی ناوزیندانەکەیان بۆ ڕونکردمەوە، لەوکاتەش دا سێ کوردی لێ بوو کەدووانیان خەڵکی شاری سلێمانی بوون بەناوەکانی کاك شاهۆو کاك ئاواتی فەرە ڕەش و ئەوی سێ یەمیش خەڵکی شاری زاخۆبوو بە ناوی کاك زێرەڤان و برادەرێکی تورکمانیشیان لەگەڵ دابوو بەناوی کاك عیمادو لەوماوەیەش دا کەسانێکی تر دەهاتن و سنورداش دەکرانەوە  کە دوو برای بەڕێز بەناوی کاك حەمزە مەرزانی بوو خەڵکی شاری هەولێر بوو لەگەڵ خێزانی بەڕێزی دەستگیرکرابوون بەڵام جیایان کردبونەوە لەیەك خێزانی لەبەشی ئافرەتان و خۆشی لای ئێمە بوو ئەوانیش پەنجەمۆری سێ وڵاتیان هەبوو بۆیە دەستگیرکرابوون وە لەبەر ئەوەی منالّیان نەبوو خێزانیشیان هێنابۆیە زیندان من بەهۆی منالّەکانەوە الحمدللە خێزانمیان نەخستبۆیە زیندانەوە!، وە لالە ئیبراهیمیش برایەکی بەڕێز بو لەکۆتاییەکەکانی زیندانیمدا هێنایان و ئەو شەوەی بۆ بەیانی من ئازاد کرام ئەویشیان سنورداشی نەمسا کردەوە هەڵبەتە ناوی هەمووانم لەیاد نەماوە زۆر سوپاسیان دەکەم کە ئەو ماوەیەی پێکەوە بووین ڕێزێکی باشیان لێگرتوم بەتایبەتی کاك شاهۆ کۆمەڵێك هەڵوێستی پیاوانەی نوواندووە بەرامبەرم و بەڵێنیشم پێدان لەکاتی نوسینەوەی  ڕووداوەکانی ناو زیندان ناویان بهێنم بەڕاستی ئەو زیندانە بۆمن بوو بە تەجروبەیەکی زۆر بەهێز لەژیانم دا چونکە کاتێك چومە ناو زیندانەکە ئەو بەشەی ئێمەی تێدابووین نزیکەی بیست تا سی نەفەری تیابوو لەهەموو گەل و نەتەوەیەك ، وەمن بەدووای کەسانێك دا گەڕام کە دین داربن جا بەلامەوە گرنگ نەبوو خەڵکی







هەر شوێنێك بن و بەدووای قورئانێکیش دا دەگەڕام الحمدلله شێخێکی جەزائیری تێدا بوو کەپەنجەمۆری ئەڵمانیای هەبوو کاتی سنورداش کردنەوەی نزیك بوو قورئانێکی لابوو بەدیاری پێی بەخشیم لەگەڵ بەرماڵێك دا لەناو زیندانەکەدا کتێبخانەی تێدابوو بەڵام یاساغ بوو کەوا هیچ کتێبێکی ئیسلامی و دینی تێدا بێت وە ژووری نوێژ یان بانگەوازی دینیش یاساغ بوو هەموو ئەو کتێبە کوردیانەشی کەتیای بوون هی ساڵەکانی هەشتاو نەوەدەکان بوون زۆرینەی نوسەرەکانیشیان نوسەرە چەپ و کۆمۆنیستەکانی سوید بوون کە کەس کتێبەکانی نەدەخوێندنەوە الحمدلله بەڵکو ئەوانەشی کەوا عەلمانی بوون نەیان دەخوێندنەوەو گاڵتەیان پێ دەکردن چونکە زۆر بێ مستەواو لاواز بوو لەگەڵ ئەو ڕێگریەش دا الحمدلله ئێمە ژوورێکمان کرد بەژووری نوێژو لەگەڵ مسوڵمانانی ناو زیندانەکە نوێژە فەڕزو تەراویح و جومعەکانمان دەکرد و کەکاتی بانگیش دەهات هەر قاوشەو لای خۆیەوە دەنگی بانگ بەرز دەبۆیەوە گەورەترین نیعمەت کە الله سبحانه وتعالى پێی بەخشیم ئامۆژگاری ئەو گەنجە سەر لێشێواوانەبوو کەدوورکەوتبونەوە لەدین و دەستیان دابۆیە حەشیش کێشان و دەرمان خواردن هەر لە کوردی خۆمان تا خەڵکی چەند وڵاتێکی تر وە لەفەزڵی الله تعالى بەزیادبێت هەندێکیان بە بێباوەڕی هاتبونە زیندانەوەو دوواتر بە تەوبەو گەڕانەوەو ئیمانەوە چونە دەرەوە یان سنورداس دەکرانەوە تا ئەوەی یەکێکیان ناوی خلیل بوو خەڵکی فەلەستین بوو بەڵام ئاوارەی وڵاتی ئەردەن بوون لەپێش من سنورداش کرایەوەو وتی: وەڵاهی خوای گەورە بۆیە تۆی نادرە ئێرە تا ببیتە هۆکاری هیدایەت و گەڕانەوەی من بۆ لای خوا کەسوێند بەخوا تەوبەی ئەو گەنجەو چەند گەنجێکی تری کوردو ئەفغانی ناو زیندانەکە لەدونیاش و ئەوەشی تیایدایە خۆشتربوو بۆمن و دوواتر حیکمەتی ئەوزیندانیەم زانی کەبۆچی الله تعالى خستومیەتە ئەوشوێنە ،







ئەگەر خوای گەورە دەرفەتی ڕەخساند ئەوە لەکاتی تردا سەرجەم وردەکاری و ڕووداوەکانی ناو زیندانەکە باس لێوەدەکەم بەوردی إن شاء اللّه.
پاش ئەوەی سێ ڕۆژەکەم تەواو کرد بردیانم بۆ شاری(هێلسینگۆر) و لەجیاتی ئازادکردنم دادگایی کرام و هەرچەندە دادوەرەکە ئاماژەی بەوەدا کەوامن هیچ تاوانێکم لەسەر نی یەو تەنها تاوانم ئەوەیە کەوا بەنایاسایی هاتوەتە خاکی وڵاتەکەیان و پێیدا تێپەڕیوم و دەبێت بگەڕێتەوە لای خێزانی و منداڵەکانی بەڵام پۆلیس ڕەتی کردەوەو وتی لەبەرئەوەی پەنجەمۆری وڵاتی(فنلەندا)ی هەیە دەبێت تا ئەو ماوەیەی کەسنورداش دەکرێتەوە بۆ ئەو وڵاتە کەماوەکەی دوو هەفتەیە لەزیندانی(ئێلێبیك) بمێنێتەوەو هەر لەوێشەوە دەیبەین بۆ فڕۆکەخانە لەکاتی دیاری کراوی دا کە ئەو وڵاتە ڕەزامەندی وەرگرتنەوەیانی وەرگرت بەوشێوەیە دادگایی کۆتایی هات و هێنامیانەوە بۆ زیندانەکەو منیش لەو چەند ڕۆژەدا هیچ هەواڵێکی ماڵ و منداڵم نەدەزانی و ژمارە دانی مارکیەکەشم کەتازە کڕیبووم و لای خێزانم بوو لەبەرم نەبوو بەڕاستی زۆرپەرێشان بووم ، ئەگەرچی پۆلیس ڕێگەی دا بەوەی کەدەتوانم ڕۆژانە خێزانم و منداڵەکانم ببینم بەڵام کارمەندو پاسەوانانی زیندانەکە بەشێکیان مامەڵەیان زۆرتوندو خراپ بوو هیچ هاوکاری و کۆمەکی یەکی زیندانیەکان ناکەن تا ئەوەی بەهۆی سوربونی خێزانمەوە لەڕێی کارمەندانی کەمپەکەوە پاش چەند جارێ پەیوەندی کردن و هەوڵێکی زۆر سوپاس بۆ خوا کاتی یەکتر بینیمان بۆ دیاری کراو هەتا ڕۆژی ئازادبوونم ڕۆژانە کاتژمێرو نیوێك خێزانم و منداڵەکانم دەهاتنە لام و یەکتریمان دەبینی.
بەوشێوەیە دوو هەفتەکەشم تەواو کرد هیچ دەنگێك نەبوو دووبارە بردمیانەوە بۆ دادگایی کردن بەڵام ئەم جارە هەر لەناو زیندانەکەدابوو لەڕێی شاشەی تەلەفزیۆنەوە دادوەرەو پۆلیس گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکردی ئەگەرچی ستەمێکی زۆرمان لێکرا لەو ماوە زۆرەدا بەڵام ئەم ناڕەحەتیە بوو بە گەورەترین خێر بۆمان و لەکۆتاییدا





پەنجەمۆری سەرجەم ئەو وڵاتانەمان لەسەر لاچوو ئیتر کێشەی پەنجەمۆرمان یەکلایی کرایەوە بەتەواوەتی و هیچ کام لەو وڵاتانەی کە پێشتر داوای مافی پەنابەرێتیمان کردبوو لێیان ئامادە نەبوون وەرمانبگرنەوە و ئیتر بەناچاری لە وڵاتی(دانی مارك) وەرگیراین و پاش هەشتاو سێ ڕۆژ ئەودوو پۆلیسەی هاتن بەدووام دا لەناو سەیارەکەیان دا وتیان تۆ پیاوێکی زۆر بەڕێزی بەئینگلیزی خۆیان وتەنی وتیان(جینتل مان) ی دووای تەواو زانیاری وەرگرتن لەسەرت بۆمان ڕون بۆیەوە تۆ هیچ کێشەیەکت ئەنجام نەداوە لەو وڵاتانە بۆیە ئاواش درەنگ ئازادمان کردیت لێکۆڵینەوەمان کردووە لەسەرتان بەڵام نازانین بۆ ئیقامەیان نەداوە پێتان لەو هەموو وڵاتە؟، منیش وتم مادەم دەزانن کەوا جێنتل مانم پێشتان بوتنایە هۆکاری چی بووە واجوابتان نەداونەتێ؟ بەهەرحاڵ سکالای ئێمە بۆلای خوای گەورەیەو خۆی باش دەزانێت بۆچی جوابیان نەداوە پێمان و ئێمەش سوپاسی دەکەین لەسەری و ئەو جوابەمان لەخۆی دەوێت کەوا مۆڵەتی هەمیشەیی ناو بەهەشتەکەیمان پێ ببەخشێت و وە سوێند بەخوا ئێستا بەتەواوی بۆمان ڕون بۆتەوە کەوا چەند خێری گەورەی تیابووە جوابمان وەرنەگرتووەو خێر لەوەدابووە کەوا وەری نەگرین و الحمدلله خوای گەورە لەشوێنێکدا گیرساندینیەوە کەوا تام و چێژ لەدین داریەتی بکەین تیایدا و دین و ژینیشمان پارێزراوبێت بەپێچەوانەی بیرکردنەوەی خۆمان کەوامان هەست نەدەکرد بەوشێوەیە بێت پاشان بەبێ تاوان ئازاد کرام و بەماڵ و منداڵم شاد بومەوە الحمدلله بەڵام ویست و قەدەری خوای گەورە لەسەر ئەوەیە کەوا لەم وڵاتەش کەیسەکەمان قبوڵ نەکراو ڕەفزیان پێداین و ئێمەش پشتیوان بە الله تعالی پاش پرس و ڕاو نوێژی ئیستیخارە ئەم وڵاتە دەکەینە دووا وێستگەی سەفەری وڵاتانی ڕۆژ ئاواو گەر ویستی لەسەر بێت دەمانەوێت ئەو تەمەنە کەمەی




کەماومانە لەناو خاك و ئاوی خۆمان دا بەسەری بەرین مەگەر قەدەرێك بێتە پێشەوەو گۆڕانکاری بەسەر بڕیارەکەمان دا بهێنێت.
هەڵبەتە وەك هەمیشە داوای ئەوە دەکەین لە خوای گەورە ئەگەر خێری تێدایە ئەوە بۆمان ئاسان بکات و خێریشی تێدایە نیە ئەوە لە شەڕ و فیتنەکەی بمانپارێزێت.
ئەگەرچی کۆمەڵێك براو کەسی دڵسۆز پێشنیاری چەند وڵاتێکی تریان بۆکردووین ئامادەی هاوکاریشمانن بەڵام بەڕاستی هەموویانمان ڕەفز کردۆتەوەو ئەوشوێنەی ئێمە کەدەیان و سەدان کەس بەئاوتەوەن پێی بگەن ئێمە بەپێچەوانەی ئەوانەوە بەئاوتەوەین بگەینەوە بەکەسوکارمان و بەمسوڵمانان لەکوردستان پشتیوان بەخوای گەورە ئەگەر ئەم سەربازە بچوکەی الله تعالی کەناوی کۆرۆنایە دەرفەتی دووبارە بەگەشت و گوزارو سەفەر بدات.
لێرەدا کۆتایی بەسەفەری ڕێگە سەختەکانی هەندەرانم هات و جێی خۆیەتی لێرەوە دست و خۆشی و دوعای خێر بکەم بۆ سەرجەم ئەو براو خوشك و کەسە دڵسۆزانەی کەوا لەنەبونی من دا بێ ئاگا نەبوون لەخێزان و منالەکانم وە بەردەوامیش بەپێی توانایان بەدەممانەوە هاتوون و دەنگیان لێ دانەبڕیوین و باری سەرشانیان سوك کردوین ئەگەر بەدڵ دانەوەو ئامۆژگاریەکیش بوبێت ، ئێمە هیچمان نیە بۆ ئەوان غەیری ئەوە نەبێت کە دوعای خێریان بۆ بکەین و داوا بکەین لە الله تعالی کەوا خوای گەورە بیان پارێزێت و کۆڵی قورسی ڕۆژی قیامەتیان سوك و ئاسان بکات.

تێبینی: جێی خۆیەتی ئاماژە بەهەوڵ و ماندووبونی کاکە بروا زەڵمی بدەم کەوا ماندووبوە لەپێداچونەوەی کتێبەکە لەگەڵ بەڕێزێکی تردا،وە زۆر لەهەوڵی بەچاپ کردنی کتێبەکەدا بووە بەڵام دیارە ویستی خوای گەورە لەسەر ئەوەیە کەوا جارێ هیچ






چاپ خانەیەك لەئەستۆی نەگرتوە بۆیە بەپێویستم زانی لەسەر داخوازی زۆری برایان و خوشکان بیکەین بەپی دی ئێف و بڵاو بکرێتەوە.

**لە کۆتاییدا:**

جێگای خۆیەتی لەپاش سوپاس و ستایشی خوای گەورە و میهرەبان شانازی بکەم بەخێزانی بەڕێزمەوە کە هەمیشە وەك قەڵایەکی پتەو و بەهێز لە پشتمەوە ڕاوەستاوە و هیچ کاتێك سکاڵایەکی بەرامبەرم بەرز نەکردۆتەوە، هەمیشەش ورە و توانام پێ دەبەخشێت داواکارم لە خوای گەورە پێکەوە لەگەڵ مناڵەکانم و ئازیزان و خۆشەویستانم لە بەهەشتی پان و بەرین کۆمانبکاتەوە.

تەنها ئەوە ماوە کە بڵێم: بەڕاستی ژیانی دونیا بە خۆشی و ناخۆشیەکانیشیەوە سەرجەمیان تاقیکردنەوەی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی وە دەبێت باش بزانین کە ئێمە لەم ژیانەدا ڕێبوارین و لە سەفەرداین و نازانین ئایا ئەم سەفەرەمان هەر بەردەوامە یان ئیتر لێرەدا کۆتایی پێ دێت؟ وە ئایا دەمێنینەوە لە ڕۆژئاوا؟،یان خوای گەورە بەیەکجاری دەرفەتی گەڕانەوەی ناو کەسوکارمان بۆ ئاسان دەکات و بەبێ کێشە بە دڵسۆزان و ئازیزانمان شاد دەکاتەوە، یان ئەو کاتەی بۆمان دیاریکراوە لە ژیانی دونیا کۆتایی پێ دێت و سەفەری هەمیشەیی دەکەینەوە بۆ لای خوای گەورە.

هیوادارم نووسینەوەی ئەم ڕووداو و چیرۆکانەی ژیانم لەجێی ڕەزامەندی خوای گەورەدا بووبێت و سەرجەم دەربەدەری و ناڕەحەتییەکانی ژیانمان بەخێر و پاداشت بۆ نووسرابێت و لە هەڵە و کەموکورتییەکانیشمان خۆش بووبێت وە پاشان سوودی هەبێت بۆ خوێنەرانی بەڕێز، بەتایبەتی ئەو گەنج و لاوانەی کە دەیانەوێت ڕووبکەنە هەندەران بۆ باشترکردنی ژیان و گوزەرانیان ئامادەن ئەو هەموو دۆزەخ و ناڕەحەتیانە ببڕن و دواتریش کە گەشتنە ڕۆژئاوا هەرزوو پەشیمان دەبنەوە ، چونکە دەکەونە ناو







کۆمەڵێک کێشە و تاقیکردنەوەی سەختی چاوەڕواننەکراو کە هەرگیز بیریشیان لێ نەکردۆتەوە.
وە ئەگەرفەزڵ و منەتی خوای گەورەش نەبوایە لەسەر ئەم بەندە تاوانبارە و ماڵ و مناڵیشمەوە ئەوە هەرگیز نەماندەتوانی بەئاسانی زاڵ و سەرکەوتوبین بەسەر ئەو هەموو کێشە و نارەحەتیانەی کە لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا بەسەرمان هاتووە لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیام لە پشتی ئەم تاقیکردنەوانەدا گەورەترین خێر و حیکمەت بوونی هەیە و ئێمەی بەندەی لاواز دواتر هەستی پێ دەکەین و سوێند بە گەورەیی خوا هەمیشە ڕازین بەوەی کە خوا بۆی هەڵبژاردووین چونکە هەر ئەو باشتر دەزانێت چی خێری دونیا و قیامەتی تێدایە بۆمان و کام جێ و ڕێش بۆ دونیا و قیامەتمان خێرترە کەتیایدا بژین، ئێمەش خۆمان تەسلیمی ئەو خوایە کردووە کە هیچ کاتێک پشت لەبەندە سەرراستەکانی ناکات و ئەویشمان بەسە پشت و پەنامان بێت.
جێگای خۆیەتی کەوا سوپاسی ئەو برا و خوشکە دڵسۆزانەشم بکەم کەوا هاندەر و پشتیوان و یارمەتیدەرم بوون لە نووسینەوەی ئەم پەرتووکەدا داواکارم لە خوای گەورە پاداشتی خێری سەرجەم هەوڵ و ماندووبوونیان بداتەوە.

بەندەی موحتاجی دوعای خێر: ڕەنج شێخانی
٩ی شەوالی ١٤٤١ کۆچی، بەرامبەر بە ١ /٦ /٢٠٢٠ ی زاینی

**{ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ }**





